# دەیەی کارەسات ١٩٨٠–١٩٩٠

**(٩ ساڵ ئیختیفا لە عێراقدا: یادەوەری و شیکاریی)**


- نووسینی: عەدنان کەریم (ئەحمەد موعین)
- بەرگ: باسم ڕەسام
- چاپ: یەکەم – ٢٠٢١
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٨٠٠٠ هەزار

# دەیەی کارەسات ١٩٨٠–١٩٩٠

## (٩ ساڵ ئیختیفا لە عێراقدا: یادەوەری و شیکاریی)

عەدنان کەریم
(ئەحمەد موعین)

**پێشکەشە بە:**

دوایین هەناسەی دایکم

بە یادی عادل وئیحسانی برام

بە گیانی نەجات و نەسرین و جەبار

**سوپاس**

سوپاســـــی زۆرم بـــۆ ئەو هاوڕێیـــانەی کە کۆمەکیـــان کـــردم لە بیرهـاتنەوەی هەنـدێ لـە لاپەڕەکـانی ئەم یـادەوەریە. سـوپاس بـۆ: هاوڕێیان "میقداد هادی" و "دیدار بەکر" و "وەستا جەلال" بۆ سەرنج و تێبینیـەکانیان. سـوپاس بـۆ "ئـاکۆ قـادر حەمـە" بـۆ چـاوگێڕانەوە بە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا و یارمەتیدانی لە هەڵەچنی و سەرنجەکانی.

سوپاس بۆ جێنیی هاوسەرم، بۆ یارمەتیەکانی لە ماوەی چەند مـانگی نووسینەوەی ئەم یادەوەریە.

# پێشەکی

**تەورەکان**

**خەونەکانی ئێمەیان لەت وپەت کرد**

**کردیان بە دەیان پارچەی ورد**

**ورد**

**شاعیری عێراقی: هاشم شەفیق**

ساڵی ١٩٦٣ کە بەعسیەکان بە هاوپەیمانی لە گەڵ عبدالسلام عارف و باڵی قەومیە عەرەبیەکانی ناو سوپای عێراقدا کودەتا خوێناویەکەیان لە دژی عبدالکریم قاسم بەرپاکرد، تەمەنی من نەگەیشتبوو بە ٦ ساڵ. باوکم کرێکاری کۆمپانیای **I P C** واتە کۆمپانیای نەوتی عێراق بوو لە کەرکووک. ماڵمان لە شۆڕاو لە پەنای گڕە هەمیشەییەکەی بیرە نەوتەکانی باوەگوڕگوڕەوە بوو (النار الازلیة)، کە لە ساڵی ١٩٢٧ هەڵکەندرابوون و لەو کاتەوە کڵپەی ئاگرەکەی نێڵە دەکات. لە کاتێکدا کە مافی دەرهێنانی نەوت لە کۆمپانیاکە بە دەست بەریتانیاوە بوو، بەڵام بەڕێوەبردنی بەدەست عێراقەوە بوو. کودەتاچیەکان بەشێکی زۆری کرێکار و کارمەندە کوردەکانیان لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووک لە کار دەرکرد، بۆیە باوکم تا ساڵی ١٩٧٠ لەکار دەرکرا و بەقەولی ئەوکاتەی خۆیان فینیش کران Finish. زۆربەی کرێکارەکان و خێزانەکانیشیان وشەی ئینگلیزیان بەکار دەهێنا (زۆر جاریش بەهەڵە وەکوو ئەو فینیشە)، چونکە هێشتا کۆمپانیای نەوتی کەرکووک بەدەست ئینگلیزەکانەوە بوو وزۆر کارمەند و تەکنیشینی

ئینگلیزی تیا مابوو. چەند ڕۆژی نەبرد کە فەرمانی سەربازی دەرکرا بۆ چۆڵکردنی شۆراو و ڕووخاندنی هەموو خانوەکانی. من ئێستاش بە وردی ڕۆژی دەرکردنەکەمانم لە بیرە.

باوکم ڕۆیشت بۆ ناو شار تا پێش کۆتایی ئەو ماوەیەی بۆ گوێزانەوەی ماڵەکان دایان نابوو، لۆرییەک بگرێت بۆ گوێزانەوەی ماڵ وحاڵمان بۆ ماڵی خاڵم، خالۆ (ساڵح) لە گەڕەکی ئازادی تا دواتر ماڵێک بە کرێ دەگرین.

چەند دیمەنی ئەو ڕۆژە بە هەموو مانا و دەلالەتە سیمبولیکەکانیەوە وەکوو نەخشی سەر بەرد لە بیرمدا هەڵکەندراون و ناسڕێنەوە.

بەردەم ماڵەکەمان تەنرابوو بە پەرژینی ڕووەکی (یاس) و لە دامێنیشیدا بە گوڵ ڕازابۆوە. لەو شپرزەیی و شڵەژاویەی ماڵ گوێزانەوە و بەو هەموو ئەرک و داهاتووە نادیارەوە کە چاوەڕوانی باوکمی دەکرد وەکوو لێپرسراوی خێزانێکی ٧ کەسی، کەچی ئەو پێش دەرچوونی لۆریەکە دابەزی و چەپکێک گوڵی هەمەڕەنگی لێکردەوە و لەگەڵ خۆیدا بردیە پێشەوەی لۆریەکە.

ئەو ڕۆژە بۆ من، بە پێچەوانەی باوک و دایکمەوە، ڕۆژێکی خۆش و پڕ لە یاری و جموجۆڵ بوو. ئەوەی بۆ من گرنگ بوو ماڵ گوێزانەوەکە و ئەو گۆڕانکاریە بوو کە لە ستایلی ژیانماندا ڕووی دەدا، جا نرخەکەی بۆ باوکم و دایکم چیە، ئەوە بابەتی بیرکردنەوە وجێی بایەخی من نەبوو.

منی تەمەن ٦ ساڵ، ئەوکاتە ڕەوتی هۆش وبیرم ئەوەندە بڕی نەدەکرد کە مانای سیمبولیکی ئەو کردەیەی باوکم بزانم، بەڵام کە گەورە بووم و فامم کردەوە و بیری ئەو ڕۆژەم دەکردەوە، یەکەم شت دیمەنی ئەو چەپکە گوڵەم بەخەیاڵدا دەهات و لە خەیاڵدانی خۆمدا دەیان مانا و شیکردنەوەم بۆی دەکرد، بێ ئەوەی ڕۆژێک لە پاڵەوانی ڕووداوەکە، کە باوکمە، بپرسم کە مانا و دەلالەتەکانی ئەو چەپکە گوڵە چی بوو؟ ڕەنگ بێ ئەوەی لە خەیاڵدانی مندا سەبارەت

بەو ڕووداوە چنرابێت هیچیشیان ئەنگێزەی بیر و هۆشی باوکم نەبووبن، بەڵام چەپکە گوڵەکە، و بەتایبەتیش لەوکاتە ناسکەدا، بابەتی هاوبەشی نێوان کردەکەی باوکم و خەیاڵدانەکەی منن.
کە لۆریەکە کەوتە ڕێ دیسان وەستایەوە و باوکم هاتە خوارەوە و ڕووی کردە ئێمە، کە بە سەر لۆریی لە ماڵ بارکراوی ئاوارەییەوە یاری و گۆڵمەزمان بوو، پرسیی: ئەرێ سەلمان لای ئێوەیە یا نا؟
ئێمەش بەسارد و سڕییەکەوە وتمان: لای ئێمە نییە. تومەز سەلمانی برام کە تەنها حەوت مانگ تەمەنی هەبوو، لە بەر شپرزەیی دایک و باوکم ونارەحەتیی ئەو ڕۆژە لە ناو ماڵەکەدا بە تەنیایی بەجێماوە. باوکم رۆیشت ئەویشی هێنا و لە گەڵ خۆیدا بردیە پێشەوەی لۆریەکە.
سێیەمین دیمەنی دواتری ئەو ڕۆژەش کە لە ناخ و مێشکمدا هەڵکەندراوە، دیسانەوە درێژەی ڕەهەندە سیمبولیکەکانی ئەو ڕۆژە تراجیدیەی ژیانی خێزانیمان بوو. کە گەیشتینە گەڕەکی شاترلوو تا لەوێوە بەناو شاردا لە پردی تەبەقچەلیی سەر ڕووباری خاسەوە ڕوو بکەینە گەڕەکی ئازادی، مەفرەزەی حەرەس قومیەکان (الحرس القومي) کە میلیشیایەکی چەکداری دڕندە و تاوانکاری بەعسیەکان بوو، لۆریەکەیان ڕاگرت و پاش هەندێ بگرە و بەردە لە گەڵ باوکمدا نەیان هێشت بەو ڕێگایەدا بپەڕینەوە بۆ بەری ئازادی و گەڕاندمانیانەوە بەرەو دوا و بەناچاری ڕوومان کردە گەڕەکی ڕەحیم ئاوا. لەکاتی گەڕانەوەی لۆریەکە و پێچکردنەوەیدا کەسێک لەناو مەفرەزەکانی ئەو حەرەس قەومیانەوە بەناو، بانگی باوکمی کرد، بەڵام وەکوو دواتر باوکم گێڕایەوە وتی: ئەو کابرایە برادەرم بوو ویستی ڕێگەمان بدا کە تێپەڕین، چونکە لە دوورەوە باوکمی ناسیبۆوە، بەڵام باوکم بە شۆفێری لۆریەکەی وتبوو بڕۆ و مەوەستە، چونکە نامەوێ چاوەخواری پیاوەتیی ئەو کابرا حەرەس قەومیە ببم. ئەو هەڵوێستە ڕەق و بێدەربەستی و بێمنەتیەی باوکم، دواتر بوو بە

پەند و پێشینەیەکی باش لە ژیانی دوای کامڵ بوونم دا و هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە.
ئەو ژینگە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریە پڕ لە هەوراز و نشێوە، چی بە هەموو ڕەهەندە کات - شوێنەکەیەوە، واتە عێراق، کوردستان، کەرکووک، ئەویش لە سەروبەندی کودەتای خوێناویی ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ دا، و چی بە مانا کۆمەڵایەتیەکەی وەکوو کوڕی کرێکارێکی کۆمپانیای نەوت واتە خێزانێکی کرێکار، و هەم ماڵێک کە بە هۆی کوردبوونی باوکمەوە لە کار دەردەکرێت و سەرچاوەی گوزەرانیان لێ وشک کردن، کاریگەریی تەواوی دانا لە سەر ڕەوتی ژیانی تا ئێستای من.
پاش جێگیربوونمان لە گەڕەکی ئازادی، دەوامی ساڵی ١٩٦٣-١٩٦٤ی قوتابخانەی سەرەتاییم دەستپێکرد و لە باوردۆخێکی دژواری هەژاری و کەم دەرامەتیدا دەژیاین.
ڕۆژێک دایکم دەستمی گرت و بردمی بۆ قوتابخانەی سەرەتایی (الایمان) کە لە گەڕەکی ئیمام قاسم بوو. فەڕاشی قوتابخانەکە ناوی کاک ساڵح بوو و یارمەتیی داین و بۆ ناونووسین بردمانی بۆ ژووری بەڕێوەبەر کە ناوی "صدرالدین" بوو. صدرالدین پیاوێکی تورکمان بوو. دایکم پێی ووت کە ئەم کوڕەم چەند مانگێکی پۆلی یەکەمی خوێندوە. ئەویش چەند پرسیارێکی لێکردم، بەڵام من وەڵامەکەیانم نەزانی. بەڕێوەبەر کە پیاوێکی کورتەبنەی مرچ و مۆن بوو، لەبەردەم دایکم و یاریدەدەرەکەی خۆیدا هەتا هێزی تیابوو شەقازلەیەکی توونـدی تێ سرەواندم. گەرچی ئازارێکی زۆرم پێگەیشت، بەڵام لەوکاتەدا دڵم لای دایکم بوو وبیرم لەوە دەکردەوە، کە ئەبێ چەند دڵی بەو دڵڕەقی و کردەوە چاوەڕوان نەکراوەی صدرالدین ئەفەندی داخورپابێت.
ئەو سەردەمە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی کەرکووک، بەئەنقەست، سیاسەتێکی تایفیی قێزەونیان پەیڕەو دەکرد. لە زۆربەی قوتابخانە

کوردیەکانــدا مامۆســتای ڕەگەزپەرســتی تورکمانیــان دادەمەزرانــد. نیــوەی زیــاتری ماموســتاکانی ئەو قوتابخــانەیە تورکمــان بــوون، بە مەرجێک هەموو قوتابیەکان کورد بوون. کێشەکە ئەوە بوو هەر لەو قوتابخانەیەی ئێمەدا چەندین مامۆستای تورکمانی تری وەکوو ئەو صــدرالدینە هەبــوون کە بەهەمــان چــاوی ڕقــی نەتەوەپەرســتیەوە مــامەڵەی ئــێمەی قوتــابیی بــێ ئاگــا لە نەتەوە وکێشــەی نەتەوەییــان دەکرد. عەقلی شۆڤێنیش لەناو زۆرێک لەو مامۆستایانەدا بەهێز بوو. بەو جۆرە کێشە و نەفرەتی نەتەوەییان لەنێوان کورد و تورکماندا برەو پێدەدا. پێدەچوو بەشێک لەو ڕەگی بەهێزی شۆفێنیزمە لە نێوان کــورد و تورکمانــدا ڕەنگــدانەوەی ئەو کوشــتارەی نێــوان هێــزە سیاسیەکانی هەردوو بەرەی کورد و تورکمان بێت کە ئەوکاتە تەنها ٤ ساڵ بوو ڕوویدابوو[١].

---

[١] ڕووداوەکانی تەمووزی ١٩٥٩ لە کەرکووکدا برینێکە لە یادەوری ئەو شارەدا کە تا ئێستا شوێنەوارەکانی سارێژ نەبۆتەوە، ڕواڵەتی ڕووداوەکە بەمجۆرە بوو: بۆ یادی یەک ساڵەی ١٤ ی تەمووز کۆمیتەیەکی هاوبەش پێکدێت بۆ سازدانی ئاهەنگ بۆ ئەو یادە. پارتی دیموکراتی کوردستان وحیزبی شیوعی و چەندین ڕێکخراوی دیموکراتی و پیشەیی ئەبنە ئەندام لەو کۆمیتەیە، بەڵام لایەنە تورکمانیەکان ئامادە نابن تیا بەشدار بن و پێیان باش ئەبێ کە بە شێوازی سەربەخۆی خۆیان و بە ڕێپێوانێکی جیا لە ڕێپێوانە سەرەکیەکە ئەو یادە بکەنەوە. ڕۆژی یادکردنەوەکە کە ڕێپێوانی جەماوەریی ئەو کۆمیتەیە ئەگاتە ناوەڕاستی شار لە بەردەم گازینۆی (١٤ی تەموز) کە هاوڵاتیانی تورکمان زیاتر هامشۆی دەکەن لەو دەوروبەرەوە دەدرێنە بەر دەسڕێژی گولە ولەوێوە پێکدادان دەست پێ ئەکات وزۆربەی گەڕەکەکانی شارەکە بۆ ماوەی چەند ڕۆژ ئەبێت بە شانۆی شەڕ و کوشتار کە هەر زوو قاڵبی کوشتاری نێوان کورد و تورکمان ئەگرێتە خۆ، زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بە کوژرانی ٣١ کەس وبرینداربوونی زیاتر لە ٧٠ کەس ئەکەن، قسەی زۆر کراوە سەبارەت بە هۆکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ئەو شەڕ یا کوشتارە ناوخۆییەی شاری کەرکووک، بەڵام هێشتا نەئەو کاتە لێکۆڵنەوەیەکی پرۆفیشناڵ کرا و نەک شیکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و کەلتوری و سیاسیی سەربەخۆی هەمەلایەنە بۆ ئەو ڕووداوە خوێناوی و دڵتەزێنە کراوە،

پێمخۆشه له پهراوێزی ئهم یادهوهریهدا چهند كۆمێنتی كورت لهو بارهوه یادداشت بكه:

یهكهم: ئهو شاره پێكهاتهیهكی ڕهگهزی ( ئیسنییكی) سهییال و بزۆز و ههمیشه له ئاڵوگۆڕی ههبوو، كورد، توركمان، عهرهب و كلدۆئاسوری له دێرزهمانهوه پێكهوه ژیاون. لهبهر زۆر هۆكار ڕێژهی زیادبوونی كوردهكان له كۆی دانیشتوانی ناو شارهكه و سهرجهم لیواكه زیاتر بوو، (ئهو كاته ئهوترا لیوا وپاشان كرا به پارێزگا، (ئهو زیادكردنی خێراتری شتێكی پلان بۆ داڕێژراو نهبووه، بهڵكوو ئاكامی هۆكاری تر بوون وهك: فراوان بوونهوهی شار و پێویستیی گهشهی ئابووری بههێزی كار و كۆچی جوتیاران له لادێوه بۆ شار و و فراوان بوونهوهی چالاكیی ئابووریی كۆمپانیای نهوت له شارهكهدا، ئهو فاكتهرانه، له ناو كوردی قهزا وناحیه ودێهاتهكانهوه وهكوو موگناتیس هێزی مرۆیی بۆ ناو شارهكه ڕائهكێشا كه ئهوێ ناوهندی چالاكیه پیشهسازی و ئابووریهكان بوو. كۆمیونیتیی كوردی له لیوای كهركووكدا زیاتر جهزبی ئهو ئاڵوگۆڕانه ئهبوو، بۆیه له سهرهنجامی سی ساڵ له ئاڵوگۆڕی سروشتیی لهو چهشنهدا، شانبهشانی ئهو ئاڵ وگۆڕه له ستایڵی ئابووری كۆمهڵایهتیدا و ڕووكردنی زیاتر بهرهو ژیانی شارنشینی، ڕێژهی دانیشتوانی كورد (له ناو ناوهندی شاری كهركووكدا) بهرهو سهر ئهچوو، له كاتێكدا ئهوانهی ئهم كۆچه ئهیگرتنهوه بۆ ناو شار له سنووری ههمان لیوا نهك له لیوای ترهوه دههاتن.

دووهم: گهر تهبایی كۆمهڵایهتی له شار و وڵاتهكهدا بهرقهرار بوایه و یاسا سهروهر بوایه، دهوڵهت لهسهر بنهمای هاووڵاتی بوون پێناسهی ئهرك ومافهكانی بكردایه له كهركووك و عێراقدا، ڕێژهی ڕهگهز ونهتهوهكانی ئهو شاره ههرگیز نهئهبوو به كێشه، و یهكسانیی هاوڵاتیان لهبهرانبهر یاسادا ئهیتوانی ڕیشهی ئهو جۆره كێشانه چارهسهر بكات و دهرفهت به ڕوودانی كارهساتی خوێناویی لهوجۆره نهدات.

سێیهم: دهمێك بوو ناحهزیی نهتهوه پهرستانه و دنهدانی حهساسیهتی نهتهوهیی لهلایهن زۆر لایهنهوه ئاگری بۆ خۆش ئهكرا. لهو سهروبهندهی دوای ١٤[1]ی تهمووزی ١٩٥٨ دا ڕیزبهندیهكی سیاسیی نوێ پێكهاتبوو. نهسیمێكی ئازادیخوازی ههڵی كردبوو كه كورد بهگشتی و به كهركوكیهكانهوه پێی خۆشحاڵ بوون، بهڵام لهناو توركمانهكاندا به چاوی دوودڵی و گومانهوه تهماشای ئهم قۆناغه نوێیه ئهكرا، توركمانهكان چینێكی ئهرستۆكرات و سهرمایهدار به حساب دههاتن و گومانیان لهو بزوتنهوه و گۆڕانكارییانه دههات كه ڕهوتی چهپ بانگهشهی بۆ دهكرد له دوای له ناوچوونی پاشایهتیهوه.

چوارهم: خهڵكی ههموو عێراق لهو قۆناغه گهرماوگهرم وشۆڕشگێڕانهیهدا كه هێزی تازه و داینهمۆیهكی تر ورووژابوو، بهسهر دوو بهرهی ڕاست وچهپدا دابهش

بوبــوون کە بەرەی چەپ حیزبــی شــیوعی ســیمبولەکەی بــوو. ڕەنگــدانەوەی ئەم دابەشـبوونە لە کەرکووکدا بەجۆرێک بـوو کە زۆربەی زۆری لایەنگـر و ئەنـدامانی حیزبـی شـیوعی کـورد بـوون و زۆر بە دەگـمەن چەپ و شـیوعیەکان پێگەیەکیـان لەناو پێکهاتەی تورکمانی شارەکەدا هەبوو. ئەوەش ببوو بە فاکتەرێکی سـەربار بۆ لاوازیی ئەو هارمۆنیە کۆمەڵاتیە پێویستەی نێوان پێکهاتە ئیسنیەکانی ئەم شـارە کە بەبێ ئەوە پێکەوە ژیانیانی ئەخستە بەر هەڕەشـەیەکی تر.

پێنجـەم: نە حکوومەتی عبدالکریم و نە هێزە سیاسـیە کاریگەرەکـانی نـاو شـەقامی سیاسـی، وەکـوو شـیوعی وپـارتی و حیزبـی الـوطني الـديمقراطي و الاسـتقلال نە لە ئاستی عێراقدا و نە بە تـایبەتی بۆ ئەم شـارە، هـیچ بەرنامەیەکیـان نەبـوو تـا ببێ بە پردێک بۆ بەهێزکردنی جەمسەری هاوپشتی و دۆستایەتی و یەکڕیزی لەناو پێکهاتە جیاوازەکانی وڵات و شارەکەدا.

شەشـەم: لێپرسـراوانی کۆمپانیـای نەوت و تەنـانەت لایەنـی دەرەکیش بەهـۆی لێدان لەبەرژەوەنـدیانەوە لە عێراقـی تـازەدا، ڕۆڵیـان بـوو لە دنەدان ویـاری کـردن بە سـۆزی نەتەوەیـی ورەگەزی و چانـدنی تـۆوی دووبەرەکـی لەنـاو دانیشـتوانی شارەکەدا. لە ڕووداوەکانی مووسڵ و کەرکووکدا ڕۆڵی حکوومەتی قـەومیی میسـر زۆر ئاشکرا و ئاماژەگەلێکیش هەبوون بۆ ڕۆڵی تورکیا.

گەرچـی زۆربەی کوژراوەکـانی ئەو کوشـتارە کەسـانی تورکمـان بـوون، بەڵام دەمارگیریی نەتەوەیی لە ڕیزی تورکمانەکان و کوردەکانـدا هۆکـاری سـەرەکیی ئەو فیتنە خوێناویە بوو، هێزە سیاسیەکان نەک ڕۆڵی ئەرێنیان نەبینی بۆ پێشگرتن بەو ڕووداوە، بەڵکوو ڕۆڵی تەماشاچی و هەندێجاریش هاندەریان ئەگێڕا، کێشـەکە ئەوە بوو لە بەرەی کوردەکاندا هەسـتی سـەرکەوتن و خاوەنداریێتیی شـۆڕش و لەبەرەی تورکمانەکانیشـدا هەسـتی دوودڵی و نیگەرانـی بەرانـبەر بە عێراقـی تـازە زاڵ و بـاو بوو، بۆشـایی هێز و سیاسـەتێک کە سـەرکەوتنی شـۆڕش و دەسکەوتەکانی بکا بە ئاسۆیەک و هەردوولا لەوێدا یەکانگیر بکات، هۆکاری سـەرەکیی ئەو تراجیدیە بـوو. ئەو نیگەرانیـانەی نـاو ڕیزەکـانی تورکمانەکـان نە ئەبـوو بکـرێ بە بیـانوو بـۆ کوشـتاریان، لە هەمـان کاتیشـدا ئەو ئـاڵوگۆڕە پێشـکەوتنخوازانەی عێراقـی دوای تەمووزیش نەک هەڕەشەیەکی بۆ سەر گەلی تورکمـان نەبوو، بەڵکوو سـەرەتایەکی بـاش بـوو بـۆ هەنگاونـان بەرەو بنیاتنـانی پـردی تەبـایی و پێکەوەژیـانی برایـانە، ڕووداوەکانی دوای ٢٠٠٣ دەریان خست کە ئەو مەترسـی و مینـانەی لە کۆڵانەکـانی ئەو شارەدا لەسـەر ڕێی پێکەوە ژیـانی برایـانە چێنـراون، هێشـتا مـاون وفتیلەکانیـان دەرنەهێنراوە، سەرباری جیاوازیی هاوکێشـەکان و یاریکەرەکانی گەمەی سیاسـی لە عێراق و کەرکووکدا.

ڕۆژی ١٤ نیسانی ساڵی ١٩٦٦ لە ناکاو قوتابخانە شڵەژا و مامۆستاکەمان وتی: هەموو بڕۆنەوە بۆ ماڵەوە و قوتابخانە داخرا. دواتر لە ماڵەوە زانیم کە (عبدالسلام عارف)ی سەرۆکی عێراق لە فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەر لە بەسرە کەوتۆتە خوارەوە و مردووە. من بەو منداڵیە هۆش و بیری سیاسەتم نەبوو، بەڵام ئەو ڕووداوە بەوە دڵخۆشی کردم کە ئەو ڕۆژە دەوامیمان نەکرد و بەڕاستیش ئەوکاتە زۆر ڕقم لە خوێندن و قوتابخانە بوو. هەرچی باوک و دایکم و خەڵکی شارەکە بوو زۆر دڵخۆش بوون بە مەرگی سەرۆکی وڵات، چونکە نەتەوەپەرستێکی عروبیی سەرسەخت و هاوپەیمانی بەعس بوو لە کودەتا و کوشتارە بەناوبانگەکەی ١٩٦٣دا. لە خۆشی مەرگی ئەو سەرۆکە دیکتاتۆرەدا خەڵکی عێراق دڵخۆشیی خۆیان دەرئەبڕی و ئەیانووت (صعد لحم، رجع فحم)، واتە بە زیندوویی ڕۆیشت و بەخەڵووزی گەڕایەوە!

باوکم گەرچی بە ئینتیمای حیزبی پارتی بوو، بەڵام عبدالکریم قاسمی خۆش دەویست. هەموو کات ئەو ڕووداوەی دەگێڕایەوە کە دوای کودەتای قومیە عەرەبییەکان بەسەر عبدالکریم قاسمی ناسراو بە چەپ و لایەنگری هەژاراندا، لە تەنیشت ڕێپێوانێکی بەعسیەکاندا لە بازاڕی جووت قاوە، کاتێ کەسێکی بەعسیی وەکوو تەوس پێکردن لە ناو ڕێپێوانەکە پەنجەی بۆ باوکم درێژکردبوو نەڕاندبووی (وحدة)، کە ئەو وشەیە یەکێک لە دروشمەکانی قومیە عەرەبەکان بوو، باوکمیش وەکوو گاڵتەجاڕی دووپەنجەی بۆی درێژکردبوو وتبوو(اثنین).

ساڵی ١٩٧٠ وەکوو بەشێک لە ڕێکەوتنی ١١ی ئازار، باوکم گەڕایەوە سەر کارەکەی جارانی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووک و گوزەرانی خێزانیمان بەرەو باشتر چوو.

بەهـۆی ئەو ڕێکەوتـنەوە کـرانەوەیەک لە ژیـانی سیاسـیی ئەوکـاتەی عێراق بە گشـتی و کوردسـتانیش بەتـایبەتی هـاتە ئـاراوە. دەرچـوونی چەنـدین ڕۆژنـامە و گۆڤـار و بڵاوکـراوەی پـارتی بە هەردوو زمـانی کـوردی و عەرەبـی لە پـاڵ دەزگـا زەبەلاحەکەی بـواری ڕۆشـنبیری و چاپەمەنیی دەسـەڵاتدا، تەکـانێکی باشـی دا بە ژیـانی چەقبەسـتووی تـا ئەو کاتەی کوردستان و ئەو ئاڵوگۆڕە تا ڕادەیەک عێراقیشی گرتەوە.
گرێـــدانی بەرەی نیشـــتیمانیی نێـــوان حیزبـــی شـــیوعی عێـــراق و بەعسـیەکانیش ڕۆڵـی خـۆی هەبـوو و ئەوەنـدەی تـر فەزای سیاسـیی عێراقی ئاوڵاتر کرد و تەکـانێکی تـری دا بە ژیـانی ڕۆشـنبیری و چەند جەمسەریی سیاسی و فکری لە وڵاتدا.
هەر لە حەفتاکانــدا، دوای پتــەوکردنی جــێ پێــی خۆیــان لە ڕێــگەی ئیمزاکردنی ڕێکەوتنی ١١ی ئازار لە گەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و گرێدانی بەرەی نیشتیمانی لەگەڵ حیزبی شیوعیدا، بەعس دەسـتی کــرد بە جێبەجێکردنــی گەورەتــرین پــرۆژە بــۆ مــۆدیرنیزەکردنی بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە وڵاتدا. ئەم پرۆسـەیە گەرچی بە هـۆی هەڵگیرسـانەوەی شـەڕی یەک سـاڵە لە کوردسـتاندا پچڕانێکـی تـێکەوت، بەڵام ڕۆڵێکـی مێژوویـی گێـڕا بـۆ مـۆدێرنیزەکردنی شـار و لادێکـانی کوردسـتان و تەکـانێکی گەورەی دا بە ژیـانی شارنشـینی و ڕەنگــدانەوەکانی بە قــووڵی هەســت پێــدەکرا لە بوارەکــانی وەکــوو خوێنـدن، خزمەتگـوزاریی گشـتی، کارەبـا و ڕێگەوبـان، ڕۆشـنبیری، ئاستی گوزەران و خۆشگوزەرانی خەڵک، مۆدێل و تەرزی ژیـانکردنی نوێ و هـاوچەرخ، گەشـت و سـەفەر، وەرزش و هـونەرو گەشـەکردنی ژیـان و فەرهەنگـی سـیکیۆلار وکۆمەڵگـای مەدەنـی و دەیـان دیـاردەی ئەرێنیی تر.
بەڵام لە ڕاسـتیدا لە ڕووی سیاسـیەوە ژینـگەی ئەوکـاتەی کوردسـتان بە گشتی، مۆرکێکی کلاسیکیی هەبوو. ڕەوتی هۆشیاریی کۆمەڵایەتیی زاڵ بریتـی بـوو لە دونیـابینی بەهێـزی نەتەوەیـی کـوردی و هەسـتێکی

لاوازی نیشـتیمانیی کوردسـتانی. پـارتی بە تـایبەتی دوای شکسـتی جەلالیەکان ڕەوتی زاڵ و بێ ڕەقیبی ناو کۆمەڵگا بوو. ڕێکەوتنی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ هێنـدەی تـر شـەرعیەتی دا بە نفـووزی پـارتی و مەلا مستەفا وەکوو نـوێنەری گەلـی کـورد وپـێگەی ئەوانـی بەهێزتـر کـرد. حیزبـی شـیوعیش لە کوردسـتاندا نفـووزێکی ئەوتـۆی نەبـوو و جگە لەوەش بەرنـامەیەکی جیـاواز لەوەی پـارتیی لە بـواری مەسـەلەی کورددا نەبوو، بگرە لایەنگری ڕێکەوتننامەی بەعس و پارتی بوون سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی لە کوردستاندا.

سەرباری ئەو بارودۆخە سیاسیە، بزووتنەوەیەکی ئەدەبی و هونەری چـالاک لە کوردسـتاندا سـەری هەڵـدابوو، بەڵام نـاوەڕۆکەکەی زۆر چوارچێـوەی بیـر و هۆشـیاری و ڕۆشـنبیری تەقلیـدیی نەتەوەیـی و هاوکێشەی سیاسیی زاڵی نەدەترازان و بگرە زۆر جار، ڕەوتی زاڵی نـاو ئەو بـزووتنەوە ڕۆشـنبیریە، ڕۆڵـی خـۆی بەوە دیـاری دەکـرد کە چـۆن بەشـدار بێـت لە باوەشـێن کـردن و بـرەودان بەو عەقلـیەت و هۆشـیاریە فکـری و سیاسـیە بـاوە. بەڵام لەپەنـا و لەنـاو دڵـی ئەو کـارلێکردنە ڕۆشـنبیری و فکـریەی سـەرەتای حەفتاکـانەوە، ڕەوتـی مـۆدێرنیزم و دەلالاتە جۆراوجۆرەکـانی لە بـواری فکـر و سیاسـەت و ڕۆشـنبیریدا چووزەرەیـان دەکـرد و وەکـوو شـەپۆلێکی دژەبـاو سەرەتاتکێیان دەکرد، گەرچی هێشتا لاواز و نەخەملّیو بوون.

ڕێکەوتنـی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠ تەنهـا ئەو خێـرەی دایەوە کە ڕێـگەی خۆشکرد بۆ دەسپێکردنی قۆناغێکی ئاشتی و ئـارامی و گەشـەکردن و پێکـدادانی ڕەوتـی فکـری و سیاسـی و ڕۆشـنبیریی مـۆدرینی جۆراوجۆر. ئەڵبەتە ئەم ڕەوتە ڕۆشنبیریە نوێیە هـیچ لە گەڵ مـاهیەتی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و بەتـایبەتی عەقڵیەتـی مەلا مسـتەفادا نەدەگونجا و بەهیچ چەشنێکیش ئاکامی پلان و نەقشەی ئەوان نەبوو بـۆ ئەم قۆنـاغە. پـارتی وەکـوو هێـزی دەسـەڵاتدار لە کوردسـتان و هاوپەیمـانی بەعـس لە عێراقدا، دژایەتیـی تەواوی خـۆی نەدەشـاردەوە

له گەڵ بیر و هۆشیاری و ڕۆشنبیریی مودریندا و ئەوان بەئاشکرا نوێنەرایەتیی ڕەوتی کۆنسێرڤاتیڤ و بەرەی کۆنی کۆمەڵگایان دەکرد، بەڵام خاوەنی دام و دەزگا و پێگە بوون لە ناو ڕیزێکی فراوان لە ڕۆشنبیرانی بەرەی تەقلیدیی کوردستانیدا.
لەو ٤ ساڵەی ئارامی و ئاسایشی نێوان ١٩٧٠ – ١٩٧٤ دا چەندین ڕەوتی وەکوو مارکسیەت و وجودیەت و ئەدەب و هونەری پێشڕەو و ڕەنگدانەوەی ئەدەب و ڕۆشنبیریی جیهانی مودرین بەهەموو باڵەکانیەوە لە کوردستاندا دەستیان کرد بە نەشونما و بەرانبەرکێ لەگەڵ یەکتردا. بازاڕی کتێب و ڕۆژنامەگەری و چاپ و بڵاوکراوە و وەرگێڕان وشانۆ وبوارەکانی تر ژیانی ڕۆشنبیری لەچاو شەستەکاندا، لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، بەتەواوی برەویان پەیداکرد و بووژانەوە. سەرجەم ئەو ڕەوتانە و کارلێکی توندی نێوانیان، ژێرخانێکی باش و گونجاویان پێکدەهێنا بۆ ئاڵوگۆڕی کایەی سیاسەت و شێوازی سیاسەتکردن، بە پێچەوانەی ئەو شێوازە کلاسیکی وخێڵەکی و سواوەی تا ئێستای ژیانی سیاسی لە کوردستاندا کە پارتی نوێنەرایەتیی دەکرد. بەڵام نەبوونی ئیرادەی بەهێز و قوڵ هەڵماڵینی شۆڕشگێڕانە یا ئامادەیی و دەسپێشخەریی پێویست و تێگەیشتنی ورد لە تایبەتمەندیەکان وهاوکێشە سیاسیەکان و پێویستیەکانی قۆناغەکە جگە لە کزی و لاوازیی پێگەیشتنی هۆشیاریی فکری و سیاسی لەناو ئیلیتی چالاکوانی سیاسیی ئەو سەردەمەدا، ڕێگەیان بە کراوەیی هێشتبۆوە لە بەردەم پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانیدا کە وەکوو تاکە هێزەی سیاسیی بڕیاردەر، هەیمەنەی تەواوی خۆیان بهێڵنەوە لەسەر گەلی کورد و چارەنووسیان بکەن بە قوماری پرۆژەی سیاسیی ناکامڵ و عەقڵی سواو وخێڵەکی و پەیوەندیی گومانلێکراوی خۆیان.
ساڵانی ١٩٧٠ – ١٩٧٥ سەردەمی هەیمەنەی پارتی بوو لە گۆڕەپانی سیاسیی کوردستاندا. ڕاستە حیزبی شیوعیش وەکوو هێزێکی

سیاسی لە کوردستاندا نفووزیان هەبوو، بەڵام لە هیچ قۆناغێکدا و بەتایبەتیش لەو سەردەمەدا، حیزبی شیوعی هیچ ڕۆڵێکی نەدەگێڕا سەبارەت بە ناساندنی ماهیەتی پارتی وەکوو هێزێکی ڕاسترەوی دواکەوتوو و سادەترین ڕەخنەیان نەدەگرت لە سیاسەت و بەرنامە و کردەوەکانی پارتی، بگرە بە پێچەوانەوە نزیکیترین هاوپەیمانی ئەوان پارتی و سەرکردایەتیی بارزانی بوو.

ئەو بۆشاییەی گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان و بێدەنگیی تەواوی کۆمەڵەی مارکسی – لینینیی کوردستان وتەنانەت دەنگ هەڵنەبڕینیان بەرانبەر بە پارتی لە سادەترین ئاستیشدا و سیاسەتی سازشکارانەی حیزبی شیوعیی عێراقی بەرانبەریان، فرسەتی مانەوە و درێژەی هەیمەنەی لە ناوخۆی کوردستاندا بۆ پارتی مسۆگەر کرد.

دیارە من لێرەدا فاکتەری بوونی ڕژێمێکی دیکتاتۆری لەبەرچاو ون ناکەم کە بۆ ڕێکخراو یا گرووپێکی بچوکی وەکوو کۆمەڵە دژوار بوو لە سیبەری وەها بارودۆخێکدا، بتوانێ لە ئاستێکی بەرین و لە سایەی ئەو هاوکێشە نابەرابەرەدا، چالاکیەکی بەرچاو بکا، گەرچی هەم دیکتاتۆریەت هاوکێشەیەکی یەک لایەنە نیە و خەبات و بەرگریی خەڵک و هێزە پێشڕەوەکانی ئەتوانن پاشەکشەی پێبکەن و هەمیش هەمان کۆمەڵە لە ١٩٧٦ دا ولە هەمان بارودۆخ و بگرە لەوەش نالەبارتردا دەستیان دایە خەباتی چەکداری و ڕاگەیاندنی "شۆڕشی نوێ" بە پێی پێناسەی خۆیان.

ڕاستە کۆمەڵەی مارکسی – لینینی هەبوون، بەڵام بە ئێستاشەوە نازانرێ ئەوان لە شەش ساڵی یەکەمی تەمەنیاندا و لە جەرگەی ئەو هەموو ئاڵوگۆڕە گونجاوەی قۆناغی ١٩٧٠ – ١٩٧٥ دا خاوەنی چی پرۆژەیەک بوون. ئەو ڕێکخراوە خاوەنی نە بەیاننامەیەک، نە پرۆژەیەک نە چالاکیەک، چی بە ڕاستەوخۆ و چی لەژێر ناوی تر و بەشێوەی تردا نەبوون. لەباشترین حاڵەتدا نووسەرانێکی نزیک لەوان، ئەویش جاروبارێک، لە گۆڤاری بەیان یا هەفتەنامەی هاوکاریدا،

نووسراوەیەکی گشتییان بڵاودەکردەوە لەسەر بابەتی وەکوو ئیلتیزام لە ئەدەبدا، یا سەبارەت بە ڕیالیزم لە ئەدەب و هونەردا، یا سەبارەت بە خەباتی گەلانی مۆزەمبیق و ئەنگۆلا بۆ سەربەخۆیی.

بەکورتی هەموو کۆمەڵەی مارکسی – لینینی لەو چوار ساڵەدا، بۆ مەبەستی بەراووردکاری، هێندەی ئەڵقەی ئەدەبی (ڕوانگە) کاریگەریان لەسەر ژیانی فکری و ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردی نەبوو.

سەرەڕای بوونی ئەو زەمینە و ژێرخانە گونجاوە ڕۆشنبیری و فکرییەی ئەو ٤ ساڵە، کۆمەڵە هیچ دەرکەوتنێکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیان لەناو ئەو بزووتنەوەیەدا نەبوو، مەگەر وردە کاری دروستکردنی تەونی ئەڵقەی ڕۆشنبیری زۆر تەسک و بچووک نەبێ لە ڕیزی ڕێکخراوەکانی یەکێتیی قوتابیان و لاوانی سەر بە پارتیدا.

ئەو بۆشاییە سیاسیە و پاڵپشتیی سەرانی جەلالیەکان بۆ پارتی و مەلا مستەفا، جگە لە ئەسیر بوون لە ناو قەفەزی کوردایەتی وعەقڵیەتی "یەک دەنگی"ی کورد، کۆمەکی زۆریان کرد تا پارتی و سەرکردایەتیی مەلا مستەفا، بتوانن هەیمەنە بکەن بەسەر چارەنووسی گەلی کورددا و بەبێ هیچ لەمپەر و نەیارێکی سیاسی، بتوانن بە پێی بەرژەوەندی خۆیان و بۆ خزمەتی بەرهەمهێنانەوەی ئەو هەیمەنەیەی خۆیان، ئاراستەی خەباتی خەڵکی کوردستان بکەن.

من لەو ژینگە سیاسی و فکرییەدا، بەهەموو لایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکانیەوە، چاوم بە دونیای فکر و سیاسەت و ژیانی ڕۆشنبیریدا کردەوە.

عادلی براگەرەم کوڕێکی ڕۆشنبیری تەقلیدیی لەو تەیفە بوو. من لەڕێی ئەوەوە فێری خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە بووم. لە ماڵەکەماندا چەند ژمارەیەک گۆڤاری (ڕزگاری)ی جەلالیەکانم بینیبوو و بەپێی عەقڵی ئەو سەردەمەم خوێندبوومەوە. ئەو سەردەمە شیعر و ئەدەب بە گشتی دەروازەی یەکەمی چوونە ناو دونیای فراوانتری فکر

و ڕۆشنبیری بوون. له بیرمه یه‌كه‌مین كتێب كه خوێندمه‌وه ڕۆمانی (ذكریات من بیت الموتی) بوو له نووسینی دۆستویفسكی كه كاریگه‌ریه‌كی قووڵی له هه‌ست و بیرم كرد. هه‌ر له‌و سه‌رده‌مه‌دا واته ده‌وروبه‌ری ١٩٧١ – ١٩٧٢ كتێبی جیڤارای شۆڕشگێڕ (جیڤارا الثائر)م له‌ناو كتێبه‌كانی عادلدا بینی و زۆر به شۆڕ و شه‌وقه‌وه خوێندمه‌وه و دواتریش هه‌مان كتێبم به فلیمێكی سینه‌مایی له سینه‌مای خه‌ییام بینی.

هه‌ر له سایه‌ی ئه‌و ژینگه خێزانی و سیاسیه‌ی ناو كۆمه‌ڵگای كوردستان و عێراقی ئه‌و سه‌رده‌مه‌دا ساڵی ١٩٧٢ بووم به ئه‌ندامی یه‌كێتی قوتابیانی كوردستان. هاوڕێی ئه‌وكاته و ئێستام، (علی زه‌نگه‌نه)ی هونه‌رمه‌ندی ئێستا، كه ئه‌وكات هاوپۆل بووین له ناوه‌ندیی كاوه، كردمی به ئه‌ندام له قوتابیاندا. یه‌كێتیی قوتابیان، بۆ زۆر كه‌سی سه‌رده‌می من، وه‌كوو قوناغی ڕاهێنان وابوو بۆ چوونه ناو ژیانی سیاسی وڕێكخراوه‌یی و ئاماده‌سازی بۆ دیسپلینی حیزبی. ماوه‌یه‌ك (حازم عزالدین) سه‌رۆك شانه‌م بوو و ماوه‌یه‌كیش له‌گه‌ڵ (ساجید علي مه‌عسووم)دا له ناوه‌ندیی كاوه له یه‌ك شانه‌ی قوتابیان بووین. ساجید دواتر بوو به ئه‌ندامی كۆمه‌ڵه و پاشان له‌سه‌ره‌تاوه ده‌بێ به پێشمه‌رگه، به‌ڵام به‌داخه‌وه له كاره‌ساتی هه‌كاریدا به‌ده‌ستی قیاده موه‌قه‌ته گیانی له‌ده‌ستدا.

گه‌رچی یه‌كێتیی قوتابیانی كوردستانی عێراق یه‌كێك له ڕێكخراوه به‌ناو پیشه‌ییه‌كانی سه‌ر به پارتی بوو، به‌ڵام لایه‌نگرانی كۆمه‌ڵه‌ی ماركسی – لینینی تیایدا چالاك بوون. ساڵی ١٩٧٣- ١٩٧٤ له ناوه‌ندیی كاوه له گه‌ڕه‌كی ئیسكانی تازه‌دا بوو، بووم به ئه‌ندامی لیژنه‌ی قوتابخانه‌كه و له ئه‌ندامانی تری لیژنه‌كه ته‌نها ناوی "عه‌دنانی حه‌مه یاروه‌لی"م بیره. هه‌ر ئه‌و كاته‌ش بوو كه خه‌ریك بووم ڕووم له ئایدیۆلۆجیی ماركسیزم ئه‌كرد، به‌ڵام به تێگه‌یشتنێكی پڕ له‌ته‌م و مژه‌وه. پێشتریش ئه‌وه‌م به‌رگوێ كه‌وتبوو كه له‌ناو یه‌كێتیی قوتابیاندا

ڕەوتێکـــی مارکســـی هەیە کە خەریکـــی دراســـەی مارکســـیەت و بڵاوکـردنەوەی نـامیلکەی مارکسـین. "خەلیـل حەسـەن" کە ئەنـدامی نـاوچەی قوتابیـانی کەرکـووک بـوو نـوێنەرایەتیی نـاوچەی ئەکـرد لە پەیوەند بە لیژنەی ناوەندیی کاوەوە. هەستم ئەکرد خەلیل لایەنگر یا ئەنـــدامی کـــۆمەڵە بێـــت. لە ســـەرەتای ســـاڵی ١٩٧٤ لە کۆتـــایی کۆبوونەوەکاندا نامیلکەیەکی وەرگێڕاوی عەرەبیی ماو تسی تۆنگی دا پێم و ڕێنماییشی کردم کە ئەو جۆرە کتێبانە لە کتێبخـانەی هەندرێن لە نزیک کارخانەی مۆبێلیاتی شوکور نەجار دەست ئەکەون و ئەتوانم بیانکڕم.

کە لە ئـازاری ١٩٧٤ دا پەیوەنـدی نێـوان ڕژێـم و پـارتی تێکچـوو و شـەڕی چەکداری لە کوردسـتاندا دەسـتی پێکـردەوە، منـیش چـوومە دەرەوە و ســەرەتا لە چەمچەمــاڵ و دواتــر لە ئۆردووگــای یەکێتیــی قوتابیان لە ئاغجەلەر گیرسـاینەوە. لەوێ دیسـانەوە خەلیلم بینیەوە و ژمارەیەکی زۆری لەو نـامیلکە گیرفـانیە بچووکـانەی هێنـابووە دەرەوە و لەوێش نامیلکە بچووکەکـانی دەدامێ. دیـار بـوو بڵاوکردنەوەی ئەو نامیلکانە و هاندان بۆ خوێندنەوەیان بەشێک بوون لە پلانـی کۆمەڵەی مارکسی–لینینی لە ناو قوتابیاندا.

دواتـر لە ئۆردووگاکـانی تەوێڵە و بیـارە و دەگـا شـێخان ئاشـنایەتیی زیـــاترم پەیـــداکرد بە بیـــری مارکســـی لەڕێـــگەی تـــۆڕی پەیوەنـــدیە فراوانەکانی قوتابیانەوە لە ئۆردووگا.

ئێمە گرووپێکی نـاڕازیی نـاو یەکێتیی قوتابیـانی کەرکـووک بـووین لە ئۆردووگـای سۆسـەکان لە نزیـک تەوێـڵە کە دواتـر گـوێزراینەوە بـۆ بەڵخە و پاشان بۆ دێی دەگا شێخانی تەنیشت بیارە. لەوێ کۆمەڵێکی گونجاوی نـاڕازی لە پارتی بووین کە ژمارەمـان نزیکەی ٢٠ قوتـابی دەبـووین. هەمیشـە کە نـوێنەری قوتابیـان دەهـات بـۆ کۆبـوونەوە بـۆ لامـان ناڕەزایەتیەکـانی خۆمـان ئەخسـتەڕوو سـەبارەت بە ئیـدارەی

ئۆردووگـا و ژیـانی خۆمـان و ئیهمـالکردنی قوتابیـان و گەنـدەڵی و تەنانەت کاری سووکی بەرپرسەکانی پارتی لەناو ئۆردووگاکاندا.

لەدرێـژەی ئەو کێشــە هەمیشــەیانەدا ئاگاداریــان کــردین کە (عــادل موراد)[1]ی سەرۆکی لیژنەی تەنفیزیی قوتابیانی کوردستانی عێراق، کە هاوکات ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی پارتیش بوو، هاتووە بۆ سەردانی ئۆردووگاکان و لە ئۆردووگای قوتابیان لە سۆسەکان مەوعیدی بۆ نوێنەرانی ئۆردووگاکان داناوە بۆ دانیشتن و گفتوگۆ سەبارەت بە سکالاکانیان. لە ئۆردووگاکەی (دەگا شێخان)، نووری حمەسوور و منیان هەڵبژارد وەکوو نوێنەر بڕۆین بۆ کۆبوونەوەکە لەگەڵ عادل موراد. لەوێ ئێمە سکالا و موعاناتی خۆمان لە بواری جیاوازدا و بەنموونەی زۆرەوە بۆ عادل موراد باسکرد، بەڵام ئەو بەو بیانووەی ئەوە شۆڕشە و ئەبێ چاوەڕوانیی ئەو کەم وکوڕیانە بکەن و ئەبێ ئێوە ئەو کەم وکوڕیانە (ئیسلاح) بکەن، پاساوی دەهێنایەوە. نووری حمەسوور کە کوڕێکی خەڵکی قەڵای کەرکووک بوو زۆر بەهەڵوێست و ڕاشکاو بوو لە قسەکردندا تووڕە بوو وتی: کاک عادل ئیسلاحی چـی بکەیـن؟! سـەرلقی پـارتی دێـت بـۆ نـاو ئۆردووگاکـان کـوڕی هەرزەکاری قوتابی ئەبا بۆ دەسدرێژیی سێکسی ئیسلاحی چی بکەین تۆش هەر پاساویان بۆ دێنیتەوە!!!. کۆبوونەوە هیچ ئەنجامێکی نەبوو و بەدەستی بەتاڵ گەڕاینەوە و ئەنجامەکەمان بە هاوڕێکانمان گەیاند.

هەر لەو گوندە بووین کە جەژنی بەسەردا هات، پیاوانی گوندەکە، کە مەلای دێ لە پێشیانەوە بوو، هاتن بۆ دڵنەوایی و جەژنە پیرۆزە.

---

[1] عـادل مـوراد ئەوکـاتە سـەرۆکی لیـژنەی تەنفیزیـی یەکێتیـی قوتابیـانی کوردسـتانی عێـراق بـوو. ئەو سـەردەمە لایەنگرێکـی سەرسـەختی پـارتی و بنەماڵەی بارزانی بوو. پاش ئەشبەتاڵەکەی ١٩٧٥ عادل موراد بوو بە یەکێک لە دامەزرێنەرەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان کە لە حوزەیرانی ١٩٧٦ بە دەسپێشــخەریی جەلال تاڵەبــانی لە چایخــانەیەکی شــاری دیمەشــقی پایتەختی سوریا دامەزرا. چەند ساڵ لەمەوبەر ماڵئاوایی لە دونیا کرد.

کەمێک پاش قسەوباس لە سەر گوزەرانمان و پێش ڕۆیشتنیان مەلا کورتە وتارێکی دا و لە کۆتاییدا بە حسابی دوعا و نزا وتی: نعلة الله علی الکافرین و البعثیین و الشیوعیین والمارکسیین و اللینینیین و الخونة!!!. قادری هاوڕێم کە لەپەنامدا دانیشتبوو وتی: ئەرێ ئەوە چی بوو خۆ مەلا هەمووی تێکەڵ کرد و ئیعلانی شەڕی کرد لەگەڵماندا.

هەر لەو ماوەیەی گوندی دەگا شێخان ڕۆژێکیان "فەرهاد شاکەلی" بە بیانووی سەردانی (فەریق ئەمین)ەوە، کە قوتابیەکی نووسەری خەڵکی کفری بوو، هات بۆ لامان لە قوتابخانەی گوندەکە کە کرابوو بە شوێنی حەوانەوەی ئێمە. شەوێک بەناوی تەعاروفکردنەوە کۆبوونەوەیەکی گشتیی بە هەموومان کرد. فەرهاد کۆمەڵە بوو و بە نیمچە ئاشکرا لە دژی ڕێبازی پارتی و سەرکردایەتیی بارزانی ڕەخنەکانی خۆی دەرئەبڕی. لەبیرمە باسی ئەوەی کرد کە پارتی سەربەخۆیی سیاسیی نەماوە و بووە بە ئامرازی دەستی ئێران و ساواک و بەپێی مەرام و سیاسەت و بەرژەوەندیی ئەوان هەڵئەسووڕێت. ئەو زۆر هانی ئێمەی دا کە هەم ئاگامان لە خۆمان بێت و هەم هۆشیاری خۆمان بەرینە سەر و بڕوا بەم پارتیەی و ڕابەریی ئەم بزووتنەوە چەکدارییە نەکەین. ئەو ماوەیە فەرهاد شاکەلی یەکەم کەسی کۆمەڵە بوو کە ئاوا بە ئیرادە وجورئەت و ڕاشکاویەوە هەڵوێست و ڕەخنەکانی دەرببڕێت. زۆربەی کەسایەتیەکانی تری کۆمەڵە کە سەرپەرشتیی ئۆردووگاکانی قوتابیانیان ئەکرد ودواتر بوون بە سەرکردایەتیی ئەو ڕێکخراوە، بێدەنگ و ڕەنگ بوون و زۆر خۆیان دەپاراست. فەرهاد ئەو کاتە کە ڕایکردبوو قوتابیی بەشی کوردیی کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا و کادرێکی چالاکی کۆمەڵە و شاعیرێکی دیاری بزووتنەوەی شیعریی نوێخوازیی کوردیی ئەو سەردەمەش بوو.

من لە پاش ئاشبەتاڵەکە و دوای مانەوەی چەند مانگ لە ئۆردووگاکانی ئاوارەیی ئێران وگەڕانەوە بۆ کەرکووک، بووم بە

ئەنـدامی (ڕێکخـراوی ڕەنجـدەرانی کوردسـتان). ئەم ڕێکخـراوە لە کۆمەڵەی مارکسی–لینینی جیاببۆوە. لە کێشە و جیاوازیەکانی ساڵانی ١٩٧٥– ١٩٧٦ دا برایم خەلیل کە کادرێکی ڕیزی سەرەوەی کۆمەڵە بوو لەگەڵ هەندێ کادری تردا کەوتنە هەڵوێست وەرگرتن لە دژی سەرکردایەتیی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە. (ڕێکخراوی ڕەنجدەرانی کوردستان)، بە پێی ڕیزبەندیی ئەوکاتە، باڵی ڕاستی کۆمەڵە بوو. ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە پێداگریان لەسەر شوناسی کوردستانی کۆمەڵە ئەکرد. کۆمەڵە ناوی کوردستانی عێراقی بەڕەسمی نەلکاندبوو بە ناوی ڕێکخراوەکەوە. جگە لەوەش ڕەنجدەران دژی هەیمەنەی جەلال تاڵەبانی بوون بەسەر چارەنووسی کۆمەڵەدا.

مەبەستی من لەم پێشەکیە وێناکردنی ئەو ژینگە و فەزا سیاسی و ئایدیۆلۆجی و کۆمەڵایەتیە بوو کە منی ڕاکێشایە ناو بازنەی خەباتی سیاسیی دواترمدا.

لە ڕاستیدا ناوەڕۆکی ئەم کتێبی یادەوەری و شیکردنەوەی قۆناغی هەشتاکانی سەدەی پێشوو ئەگرێتەوە، بەڵام بە هۆی پەیوەندیی بەهێزی ئەو دوو دەیەیە و ڕووداوەکانی، هەروەها وەکوو باکگراوەندێکی ژیان و کامڵ بوونی هۆشیاری فکری و سیاسیی خۆم و بەشێک لە پشتخانی یادەوەریەکانم، ئەم پێشەکیەم بە پێویست زانی.

---

بەومانایە، ئەوەی لێرەدا ئەیخوێنیتەوە شایەدی (شهادة Testimony)ی منە لە سەر قۆناغێکی زۆر تایبەت بەو هەموو ئاڵۆزی و ناوەڕۆکەوە کە تەنیا سەرتایتڵەکەیم باسکرد.

**لە ساڵانی ڕابووردوودا زۆر وتراوە و نووسراوە لەسەر تاوانەکانی ڕژێمی پێشووی عێراق و سەدام حسێن. من نیازم نیە شتێکی ئەوتۆ بڵێم لەو بارەوە، چونکە هەرچی بڵێم ڕەنگبێ دووبارەکردنەوەی**

**زانیاری و گێرانەوەی ڕووداوگەلێک بن کە زۆر وتراونەتەوە. ئەوەی من تیشکی دەخەمە سەر یادەوەریەکانی خۆمە وەکوو کەسێکی چەپی چالاک لە بزووتنەوە و خەباتی ئەو قۆناغە و ڕاکردوو لە دەستی دەزگا داپلۆسێنەرەکانی ڕژێمی عێراق و داواکراو لە لایەن دەزگای مرۆڤکوژی ئەمنەوە. لەلایەکی تریشەوە بەهۆی بیروڕای جیاواز وچالاکیی سیاسیمەوە وەکوو هەڵسووڕاوێکی سیاسیی چەپی ڕەخنەگر لە ڕێباز و کردەوە سیاسیەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، زوو کەوتمە بەر پەلاماری ئەوانیش کە لەژێر ناوی شۆڕش و پێشمەرگایەتیدا لە ساڵانی هەشتاکاندا، دەیان وەکوو من بوون بە ئامانجی ڕاونانیان.**

**لەپاڵ ئەوەشدا هەوڵ ئەدەم لە پەنای گێڕانەوەی وێستگە و قۆناغەکان و سەرگوزەشتەی چالاکیی خۆمدا، بەدیدگایەکی ڕەخنەگرانەی تەواوەوە، کە ڕەنگدانەوەی ئاڵوگۆڕە فکری و سیاسیەکانی دواتری ژیانی منە، ئەو قۆناغەی بارودۆخی سیاسیی عێراق و کوردستان و بزووتنەوەی چەپی مارکسی کوردستان، بخەمە ژێر نەشتەری شیکردنەوەوە.**

نووسینەوەی یادەوەری، ئەویش سەبارەت بە قۆناغێکی پڕاوپڕ لە ئاڵوگۆڕ و بەرزونزمیی وەکوو هەشتاکانی سەدەی بیستەم و لە وڵاتێکی سیخناخ بە گۆبەند و پیلان دا، لە چەندین لاوە نووسەر ئەخاتە بەردەم دژواری و گرفتی گەورەوە.

لە دوای تێپەڕینی ٤٠ ساڵ و بەبێ لەبەردەستدا بوونی بەڵگەنامە و ماتریاڵ و تەنها بە پشتبەستن بە زاکیرە و بیرکردنەوە و یادهاتنەوەی ڕووت، کارێکی وا چەندان بەرامبەر سەختتر ئەکاتەوە.

ئەوە تەنها لایەنی تەکنیکی ڕیسکی نووسینەوەی یادەوەریە. کێشەی لەوە قورستر لەبواری ئەدەبی یادەوەریدا، بریتیە لە پەتای جڵەوخۆشکردن بۆ هەست و سۆز، چونکە گەر زۆر بە وردی ئاگادار نەبیت، هەست وسۆز، نەوەک سەردی بابەتی، ڕەوتی ڕووداوەکان و

شـیکردنەوەیان ئەسـەپێنێت بەسـەر نووسـەری ئەمجـۆرە لە کـاری ئەدەبیدا. ئەو جۆرە میتۆدە لە نووسـینەوەی یادگاری، وات لێ ئەکات ببیت بە ئامێرێکی ڕیکۆردکردن وبە شـەرمەزارکردنێکی قۆنـاغەکە بە چەنـد فۆرمۆڵبەنـدیەکی ڕادیکـاڵ وبڕوخـێ و بـژی و نەفـرەت لەم و پیاهەڵدان بەو، دواپین لاپەڕەکان ڕەش بکەیتەوە و هیچی تر.

ئەو ئیشـکالیەتە کاتێـک زیـاتر بـۆ مـن بەرجەسـتە ئەبێـتەوە کە خـۆم دەرگیـری کێشـە سیاسـیەکان بـم وەکـوو کاراکتەرێـک نەک ڕۆڵـی چاودێرێکی بێلایەنم بووبێت، بگرە بە پێچەوانەوە خاوەنی بڕوایەکی ڕادیکالی مارکسی بووبم و دڵچەسپی هیچ گۆشە یا لایەنێکی بچووکی سیستمی دەسەلاتدار نەبووبم وجگە لەوەش هێزە نەیارەکانی ڕژێمی ئەو سـەردەمەش لە کوردسـتان بە سـێبەرێکی شـێواوی هەمـان سـتەم وسیستەم بزانم.

ئەوە بـۆ نووسـەرێک یـا ئەکادیمیسـتێک یـا مێژوونووسـێک یـا بـۆ (مـدون)ێکی ڕۆژگارەکـانی ژیـانی سیاسـیی عیـراق و تاوانەکـانی دەسەلاتی ئەوکات، ئاسانترە.

لە عێراقی هەشتاکانی سەدەی پێشوودا، هەمـوو دیاردەیەک فۆرمێکی زۆر ڕادیکـالی گرتبووەخۆ و هەمـوو کایەکـانی ژیـان تیایدا بەتوونـدی ببـوون بە دیـل و یەخسـیری سیاسـەت و ئەویـش چ مۆدێلێـک لە سیاسـەت: دڵڕەقتـرین، زبرتـرین، خوێنـاوی تـرین، توونـدڕەوترین و چەواشەکارانەترینیان.

لەوەش بترازێت، کێشـەی زمـان دێتە ئـاراوە. زمـانی شـیعر، چیرۆک، وتـار، لێکـۆڵینەوە یـا ڕیپۆرتـاژ و زمـانی نووسـینەوەی یـادەوەری جیاوازیان زۆرە.

دوا داویـش کە ئەبـێ لەم سـەفەرەدا لێـی قوتـار بـم و لە پـێم نەئاڵێت بابەتی (فکر)ە.

منێکـی (ئەودەم) تـازە ئـازادکراو لە قەفەزی زینـدانی (ابـو غریـب)، دەرچووی دووساڵ وچەند مانگی کێشە فکری و سیاسیە گەرمەکانی

نــــاو زینـــدانیەکانی ئەوێ. منێـــک کە خـــۆم پێناســـە دەکـــرد بە مارکسیسـتێکی ئەرسەدۆکسی بەقەولی فارس (دوآتشـە) و خاراو بە تێگەیشتنی ئەودەمەی خۆم. کەسێکی تاسەر لێو پڕ لە تین و تەوژم کە هەوای خـۆ بەڕاسـت زانـی یەک لایەنە دابـووی لە کەلەم، تەرەقە سوور وهەمیشە لەسـەرپێ، تینووی جەدەل و هەڵپەی تێهەڵچوونەوە بە ئەندازەی شـەیدایی ڕووەکێک لە بیابانێکی وشکدا بۆ قومێک ئاو، پڕکـراو تـا تەوقـی سـەر لە (یەقینیـات)ی ماتریـالیزمی مێژوویـی و دیالکتیکی وتێرمی سیحرئاسای خەباتی چینایەتی .... تاد؛ ئێستا چۆن چـۆنی، پـاش تەجـاوزکردنێکی دیـالکتیکی تـری نـزیکەی دەیەیەک لەمەوبەری هەمـوو چەشـنە (یـزم) یـاخود (یسـت)ێکی وەکـوو کۆمۆنیست و مارکسیست و ناسیۆنالیست و ڕادیکالیست و....، بتوانم پابەند بم بە مەنهەجیەتەوە لە نووسینەوەی یادەوەری سەبارەت بەو قۆنـاغە؟ چـۆن ئەتـوانم بێلایەنـی خـۆم بپـارێزم لە گێـڕانەوە، و جاروبـاریش بەناچـاری شـیکردنەوە و ڕادەربـڕین، لە بـواری ئەو کێشانەی کە ڕاستەوخۆ سەرێکیان گرێ ئەدرێتەوە بەو ڕەوتە فکری و سیاسـیانەوە؟ هەمـوو ئەوانەش بـۆ منێـک کە ئێسـتا ئەو پاشـگری (یسـت)انەی باسـم کـردن نەک وەکـوو جـاران ڕێنمـام نـین بەڵـکوو بە تەوقێکیان دادەنێم کە لە ملی میتۆدی باس و شیکردنەوەی دیاردەکـان کراون، جا با قۆناغێکیش موریدێکی سەرسـەخت بووبێتم لە میحرابی ئەو ئایدیۆلۆجیەدا.

شایەدی دان لەسەر هەر قۆناغێکی مێژوویی، دوو لایەنی هەیە:

یەکەم: گێـڕانەوەی کرۆنۆلـۆجی وزنجیرەی ڕووداوەکـانی ئەو قۆنـاغە بە پێی بابەتی باسـەکە جا سیاسی یا کۆمەڵایەتی یا هەر شـتێکی تـر بێت.

دووەم: شـــیکردنەوە و ئەنەلایـــزی ئەو ڕووداوانەی کە لە بەشـــی یەکەمدا باسکران.

گەر لە بەشی یەکەمدا بێلایەنی بەهەر ئەندازەیەک گونجاو بێت، لە دووەمیاندا زەحمەتە، چونکە لێرەوە دونیابینی و دیدگا و میتۆد و هەڵویستی نوسەر وتەنانەت سەلیقە و کاراکتەری تاکەکەسیی ئەویش سێبەر دادەنێن لە سەر شیکردنەوەکان.
هەموو شیکردنەوەکانیش سەبارەت بە بابەتە جۆراوجۆرەکانی ناو ئەم لاپەڕانە، بە پێی تێڕوانین و دونیابینیی ئێستای من کراون نەک هی ئەوکاتەم. من باوەرم وایە کە ئەو مێژووە ئەبێ لە بێژنگ بدرێ نەک بکرێ بەتەوتەم و بە پیرۆز ڕابگیرێت. باشی و خراپیەکانی بخرێنە تای تەرازوو. هیچ بیانوویەک نیە بۆ کردنی ئەو ڕابووردووە بە بتێکی پیرۆز، گەر هەڵەکانی ئەو مێژووە نەدرێنە بەر نەشتەری ڕەخنە، نازانرێ بۆ واقیعی ئێستامان وا خەرابات و وێرانەیە.
وتنی ئەو ڕاستیانەی ناو ئەم لاپەڕانە، بۆ منێک کە تەمەنم لەسەر ئەو بزووتنەوەیە دانا، زۆر بە ئازارە و سەروگوێلاکی خۆشم دەگرێتەوە، بەڵام نەوتنیان ئازاری لەوەش گەلێک سەخت ترە. جگە لەوەش، گەرچی من لە بەشێکی زۆری ئەو قۆناغەدا لەناو ڕێکخراوی یەکێتیی تێکۆشانی کارگەراندا لە جێگەی بڕیاردانددا نەبووم، بەڵام خۆم نابوێرم لەهەر کەم و کوڕی و بەرز ونزمییەکی سیاسی، وهیچ نەبێت لە ڕووی ئەدەبیەوە بەرپرسم لێیان، ئەگینا هەر ئەو کاتە ئەم قسانەم دەکرد.
من لە نێوان ساڵانی ١٩٨٢- ١٩٩١ و پاش دەرکردنی فەرمانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئاسایشی شاری کەرکووک و هەڵهاتنم لە گەڵ هەموو خێزانەکەماندا و پاش بەسەر بردنی ماوەیەکی کورت لە شاخ و تا جێگیربوونی کەس وکارم، بۆ درێژەدان بەچالاکیی سیاسی گەڕامەوە بۆ ناوشار و ئەو ماوە درێژەم بە ئیختیفا بردە سەر.
بۆ من هەنگاوی یەکەمی ئەو نۆ ساڵە یەک مانای هەبوو و هەربۆیەش بە هەموو کارەسات و نەهامەتیەکانیەوە، سەرباری هەموو سەختی و دەیەها جار ململانێ لەگەڵ مەرگدا، قابیلی

تەحەممــول بــوو. ئەو مانــایەش ئەوە بــوو کە: ئــازادی و عەدالەت، وەکـوو دوو بەهـای ئەفسـووناویی جاویـدان ئەوە ئەهێـنن کە بۆیـان تێبکۆشیین.

گێڕانەوەی هەموو چرکە و ساتەوەختەکانی ئەو نۆ سالە، دڵەڕاوکـێ، ترس وبیم، گیانی ناکامی، هەستی لە دەستدانی هاوڕێ وهاوسـەنگەر، ژیـان لە سـایەی گـرتن ومەرگـی لە پەنـاگوێ نزیکتـر، ڕاکـردن و خۆحەشاردان و شارەوشار، دڵڕەقیی هـاوڕێ، دابـڕان لە کەس وکار، لێپرســــراوەتی بەرامـــــبەر خێــــزان و منـــــداڵ وهەمـــــوو لایەنە سـایکۆلۆجیەکانی نـۆ سـاڵ ئیختیفـا؛ نەک دژوار، بەڵکـوو تـا ڕادەیەک ئەستەمە. جگە لەوەش زۆر زەحمەتە هەمـوو ورەدەکاریی چـالاکی و کۆبوونەوە و گفتوگۆ و نووسین و هەڵوێستەکانی ئەو قۆناغە بێنمەوە سەرشـــانۆی ئەمـــڕۆ. لەهەمووشـــی ســـەختتر ئەوەیە کە گیـــان بە بەرداکـردنەوەی ئەو هەمـوو ئینفیعـال و هەسـت و خـرۆش و بـارە ئاڵۆزە سایکۆلۆجیانە وزیندووکردنەوەیان، کاری نەکردەنـی و دوورە لە هەر چـــاوەڕوانیەکی عـــاقڵانە. زینـــدووکردنەوەی هەزاران ڕۆژ و سـات و چـرکەی ئەو مـاوە درێـژە و گیـانکردنەوە بەبەریانـدا، کـارێکی نەکـردە و داوایەکـی سـەروو واقیعـیە کە بـۆ خۆشـم، تەنـانەت لەبەر زۆریـی ڕووداوەکـانی وچـڕ وپڕیـی ئەو قۆنـاغە، بەدەگمەن زۆریـانم بیردێتەوە.

مرۆڤی سیاسی و شۆڕشگێڕ و چالاکوانی پیشەییش موحتاجی هەموو پێویستیە ڕۆژانەکانی ژیانە. ئەویش هەمـان ئـاژەڵی عـاقڵی دونیـایە کە ئەبێ وەڵام بەم جۆرە پرسـیارانە بداتەوە: بەچـی ئەژیت؟ چۆن کرێ خانوو دابـین دەکـات؟ دوای تەواوبـوونی کۆبـوونەوەکەی بۆ نووسـتن ئەڕوا بۆ کوێ؟ کـێ جل و بەرگـی بـۆ ئەکڕێت؟ ئەم ژەمەی خـواردنی چۆن دابـین دەکـات؟ گـوێ لەکـام گـۆرانی ئەگرێت؟ نیـازە عاتیفیەکـانی چۆنن؟ کام شـاعیری لا پەسـەندە؟ حەز بەدەنگی کێ ئەکا؟ کـام دیـاری

بۆ دڵدارەکەی دەکرێت؟ بۆ ڕۆژی لەدایک بوونی مناڵەکەی کام دیاری هەڵئەبژێریت؟ و دەیان چەند و چوونی تری لەو بابەتە.
چالاکیی شۆڕشگێڕانە لە ڕوانگەی ئەوکاتە و ئێستاشمەوە تەنها ئەندامێتی لە ڕێکخراوێکی شۆڕشگێڕ و کۆبوونەوە و پلان دانان نیە بۆ ئەنجامدانی کرداری شۆڕشگێڕانە بەمانای کلاسیکی شۆڕشگێڕەکانی سەدەیەک لەمەوبەر. لای من چالاکیی لەو جۆرە بریتیە لە دونیابینیەکی نوێ، ڕادەیەکی بەرز لە ڕوانگەی عەقلانی بۆ دیاردە و پێشهاتەکان، ئاستێکی بەرز لە ڕۆشنبیری لە بوارەکانی تری بەری ئەوبەرەوەی دونیای سیاسەت، جوانناسی و هەستێکی بەرزی مرۆڤدۆستی و ژیان پەرستی؛ وبە هەرحاڵ هەموو ئەو وردەکاریانەی کە زۆر جار لە ژاوەژاو و قەرەباڵغیی دونیای سیاسەتی تەقلیدیدا دەکەونە ژێرپێوە. ئەوانە، بەتایبەتی بۆ چالاکوانی شۆڕشگێڕی خۆتەرخانکردوو بە تەنها بۆ تێکۆشانی سیاسی، ڕاست و دروستن. بەمانایەکی تر سیاسەتکردن بە شێوازی شۆڕشگێڕانە لای من، جگە لە بەرنامە و فکر و تیۆر، ڕەهەندێکی ئەخلاقی و مەعنەوی و ڕووحی وای هەیە کە ڕەنگ بێ سیاسەتکاری ڕووکەشی بەسەریاندا تێپەڕێت بێ ئەوەی ئاوڕیان لێ بداتەوە و بایەخێکیان بۆ دابنێت. ئەو لایەنە بەڕواڵەت نادیارانەی ژیانی کۆمەڵایەتی کە ڕۆژانە بەلایاندا تێ دەپەڕین بێ ئەوەی مەغزا و دەلالەتە سیمبولیک یا واقعیەکانیان دەرک پێ بکەین. ئەو وردەکاریانەی ژیان ڕەهەندێکی گەورەیان لە جیهانبینی مندا هەیە لە بواری تێگەیشتن لە سیاسەتدا.

**کانیەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو**
**لەبنیا بلەرزێ مرواریی زیخ و چەو**
**جوانترە لەلای من لە دەریای بێ سنوور**
**شەپۆلی باتە بەر تیشکی ڕۆژ؛ شڵپ وهوڕ**

لە ڕەوتی گێڕانەوەی یادەوەریەکانمدا هەوڵ ئەدەم کە هەندێ لاپەڕەی ڕۆژگاری پێش ١٩٨٢ بگێڕمەوە تا ڕووداوەکان بە شێوەیەکی لۆجیکی و لە ڕەواڵێکی سروشتیدا پێکەوە گرێ بدەم.

بەکورتیەکەی، ٩ ساڵ ڕاکردن لە دەستی دەزگا داپلۆسێنەرەکانی ڕژێمی بەعس و پاشان ڕاونانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، لە فەزای هەشتاکانی سەدەی پێشوودا بەبێ بوونی هێزێکی مەعنەوی و ئامانجێکی گەورە نەک مەحاڵ بەڵکوو شیاوی ئەوە نیە بیریشی لێ بکەیتەوە. بیر (فکر)، کاتێک ئەبێ بە ڕیتم و فەلسەفەی ژیانی مرۆڤ، لە بوونیکی مەعنەویەوە ئەگۆڕێت و ئەبێ بەسەرچاوەی هێزێکی ماددی ئەوتۆ کە هیچ دژە هێزێکی تر ناتوانێت لە جووڵەی بخات. لێرەدا قسە لەسەر ڕاستبوون یا چەوت بوونی ئەو باوەڕە نیە بە قەدەر ئەوەی قسە لەسەر ڕاستگۆبوونە لە بەرجەستەکردنەوەی ئەو باوەڕە لە پراکتیکدا.

بۆ یەک چرکە ئەوە بێنە بەرچاوت کە تۆ تا ئاستی سەرمەست بوون بڕوات وابێت کە تۆ و هاوبیرەکانی تۆ هەڵگری تەنیا پەیامن کە نەک هەر پەیتان بردووە بەهەموو ڕاستیەکانی گەردوون وکۆمەڵگای مرۆیی، بەڵکوو تەنها شیکردنەوەی ڕەها و قووڵ وڕاست وڕەوان، موڵکی پاوانکراو وتاپۆی تۆیە. ئەوە تۆیت کە ئەتوانی سەرجەم نەیار وڕێگر و ناحەزەکانت، کە تۆ بە ڕێگریان ئەزانی لە بەردەم بەهەشتە سەرزەمینیەکەی بیری تۆدا، بخەیتە لاوە و تەفروتوونایان بکەیت و سەرکەوتنی تۆ تەنیا مەسەلەی کاتە و هیچی تر. گەر ئەو وێناکردنەت لە مێشکدا بەرجەستە کرد، ئەوسا تێ ئەگەیت کە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەموو ڕێگە سەخت و دژوارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەوکاتەی ژێردەسەڵاتی زەبەلاحترین هێزی دیکتاتۆر و دڕندەی ناوچەکە و ... تاد، بۆ تاکەکەسێکی ڕاکردوو، سەرچاوەی لە چ وزەیەکەوە وەرگرتووە. وەڵامەکە بۆم من ڕوونە: هێزی فکر و باوەڕ و عەقیدە سیحری تایبەت بەخۆی هەیە وتا بڵێی

سەرسەخت وگیان سەخت و هەڵگری توانای بەرگرییە، بەتایبەتی بیروباوەڕە شمولیەکان کە مارکسیزم یەکێک لە ڕەوتەکانیەتی.
من لەو سەردەمەدا، (پێموایە ئەوە بۆ هەموو هاوتەمەنەکانی لە چەشنی خۆشم ڕاست بێ)، بە هۆی ئاستی سادەی بیرکردنەوە و مەعریفەی ڕووکەشیی ئەو جیلەی ئێمە و کەمی تاقیکردنەوە وتەمەنمان و بوونمان لە ناو زیندانێکی چوار دەورگیراوی وەکوو عێراقدا، هەلی ئەوەمان بۆ ڕێ نەئەکەوت کە پەی ببەین بە ناکۆکیەکانی فکری مارکسی. ئێمە زۆر بە کەمی ئاگاداری ناکۆکیەکانی ناو بەرەی مارکسیزم و سۆسیالیزمی جیهان بووین. جگە لە مارکسیەت، ئاگاداریەکی ئەوتۆمان نەبوو سەبارەت بە شاخە و لق وپۆپەکانی تری فکری سیاسیی دونیای ئەو سەردەمە. وەکوو ئەمری واقیع، لەنێوانی چەندین بیروباوەڕ ولق وپۆپە فراوانەکانی دونیای فکردا تەنها یەک هەڵبژاردەمان لەبەردەستدا بوو. بەڵام ئەوە ڕاستییەک ناشارێتەوە کە مارکسیەت ڕەواج و نفووزێکی بەربڵاوی هەبوو، گەرچی لە کوردستاندا نوسخەیەکی زۆر ڕووکەش و بێ ناوەڕۆکی ئەم ڕەوتە فکریە هەیمەنەی هەبوو.
ئاخر لەوە سەیرتر ئەبێ چی بێت کە هەزارانی وەکوو ئێمە خۆمان بە لایەنگری ڕەوتی فکری و سیاسیی وڵاتی ئەلبانیا ئەزانی لە پەیوەند بە کێشەکانی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانیەوە؟! لەبیرمە کە یەکەمینجار لە ساڵی ١٩٧٨ دا لە ئەلبانیا تراکتۆرێک لە کارگەیەکدا دروست کرا، چۆن چەندین ڕۆژ ڕادیۆکەیان باس و ڕاپۆرتی دووروودریژی لەسەر ئەو بابەتە بلاوئەکردەوە کە (ئەنوەر خۆجە)[1]ی ڕابەری حیزب خۆی ئەو تراکتۆرەی لێ خوڕیوە وئەم بەرهەمە

[1]ئەنوەر خۆجە سەرۆکی پارتی کاری ئەلبانی بوو کە حیزبێکی کۆمۆنیستی ئەسەردۆکس بوو. لە کێشەی نێوان چین و سۆڤیەتدا، ئەلبانیا لایەنگری لە چین کرد و دواتر لەگەڵ چینیشدا کێشە کەوتە نێوانیان.

بنـاغەی پیشەسـازیی وڵات و قەڵەمبـاز بەرەو قۆنـاغێکی بەرزتـری سۆسیالیزم، فەراهەم ئەکات!!!
هەر لە کۆتایی حەفتاکاندا کە ماویزم بەهێزترین ڕەوتی مارکسیی ناو بزووتنەوەی چەپی کوردستان بوو، تێزێک بە ناوی ماوتسی تۆنگەوە بڵاوبۆوە کورتیەکەی ئاوابوو: (با لێ گەڕێین سەدان گوڵ بپشکوێن و سەدان ڕەوتی فکری بکەونە ململانێ – دع مئة زهرة تتفتح و مئة مدرسة فكرية تتبارى).
گەر بە چاوی ئێستا تێی بڕوانین ئەو تێزە نیشاندەری کرانەوە و فراوانیی ئازادیی بیروڕا و ئاستێکی بەرزی دیموکراتیە کە هەمیشە مارکسیزم و چەپەکان سەرزارەکی سنگی بۆ دائەدڕن و پێیان وایە کە تەنها لە سۆسیالیزمدا و لە سایەی پیادەکردنی مارکسیزمدا ئازادی مانای واقیعی و فراوانی خۆی پەیدا ئەکا و تا ئەو کاتە ئازادیی بیروڕا دیلی دەستی بورجوازیە و لە سایەی سەرمایەداری و پەرلەمانتاریزمدا دیموکراتی جگە لە درۆ و دیکۆر شتێکی تر نیە. بەڵام بە بڵاوبوونەوەی ئەو تێزە سادەیە، ئەویش بەناوی کاریزمای ماوەوە، هەڵایەکی گەورە پەیدا بوو. لە هەموو لایەکەوە لەناو لایەنگرانی تیۆریەکانی ماو لە ناو بزووتنەوەی چەپی ئەو سەردەمەی کوردستاندا ناڕەزایەتی لە دژی ئەو تێزە بەرزبۆوە وئەوترا (ئەوە لادانە لە بنەماکانی مارکسیەت و پێچەوانەی تێزی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریایە و بە پێی بنەماکانی لینینیزم نابێ لە سۆسیالیزمدا ڕێگە بە حیزب و بیروباوەڕی تر بدرێ).
بە کورتیەکەی ئەو ڕستە کورتە بوو بە مایەی مقۆمقۆ وناڕەزایەتی وئیحراجیەکی گەورە لە ڕیزی لایەنگرانی ماویەت لە جیهاندا. بەو پێیەی کە ئێمەش بیروباوەڕی ماویەتمان بە درێژەی بیری مارکسی – لینینی و ڕەنگدانەوەی پێویستیە هاوچەرخەکانی شۆڕشی ئەم سەردەمە دەزانی، خۆمان لەبەرانبەر کێشەیەکی فکری و مەعنەویی گەورەدا دەبینیەوە. هەربۆیەش هەموو هاوڕێیانی ئێمە لەبەرانبەر ئەو

تێــــزەدا وەســــتانەوە و بەوەش دژایەتیـــی خۆمــــان لەگەڵ چەنـــد جەمســــەریی سیاســـی و فکــری و گــرتنەبەری ململانێـــی فکرییـــدا ئاشـکراکرد و بە ئاشـکرا دیـدگای سـڕینەوەی ئەویـدیمان گـرتەبەر. سەرئەنجام وەکوو دەربڕینی هەڵوێستێکی ڕادیکالی ناڕازی بەرانبەر بەو ڕادە کەمە لە جیـــاوازی و تـــۆلیرانس لە ســــایەی دەوڵەتـــی سۆسیالیســتیدا، بەوە بڕانمــانەوە کە ئەو تێــزە دوورە لە نــاوەڕۆکی بیـری مـاو تسـی تۆنگەوە و بـۆیە وەکـوو لادانێـک لەو ڕەوتە فکـریە ناساندمان وبەر نەفرەتماندا!!

نمـوونەیەکی تـر کە ئەوکـات و ئێسـتاش یەکێـک لە ئیشـکالیەتەکانی مارکسـیزم بەزەقی بەرجەسـتە ئەکـاتەوە مەسـەلەی بـوونی ٢ حیزبـی کۆمۆنیسـتە لە یەک وڵاتـدا. یەکێـک لە بـابەتە گەرمەکـانی گفتوگـۆی ڕیزی ئەو سەردەمەی مارکسیەکانی کوردستان ئەم بابەتە بوو.

هەمیشـە سـەبارەت بە ئیشکالیەتی بوونی دوو حیزبی کۆمۆنیست یـا مارکسی لە وڵاتێکدا، بەوە وەڵامی حازری ئەدرایەوە کە لینین وەکوو باڵاترین مەرجەعی فکری و سیاسیمان پێداگری لەسـەر ئەوە ئەکات کە بـوونی دوو حیزبی لەو جۆرە یەک مانـای هەیە: یەکێکیـان لادەرو تەحریفی و گومڕاکەرە!!!

دیسانەوە لە جیاتی پێداگری لە سـەر ڕێزگرتن لە بوونی جیاوازی و قەبـووڵکردنی بـوونی ڕای جیـاواز و پابەنـد بـوون بەوەی کە ئەکـرێ ئەوە وەکوو فـاکتەر و بەڵگەیەک بخـرێتە خزمەتـی فراوان کـردنەوەی هێز و نفوزی مارکسـیزم و شـیوعیەت تـا لە ململانێی نێوان ئەو دوو حیزبەدا و لە سەر ئەرزی واقیع، نزیکی یـا دووریی ئەم یا ئەویـان لە مارکسـیزم و چینـی کرێکـار ئیسـپات بکرێـت، یـا لە بـری ئەوەی کە بەرنـامە وسیاسـەت و هەڵوێسـتەکانی ئەو ٢ حیـزبە بکـرێ بە بنـاغە، کەچی لە پێشـەوە مۆرێکی تەحریفی ئەنرا بە تەوێڵی هەر لایەنێکەوە کە، نەک لە دەرەوەی بــازنە و شوناســی ئــێمە بــۆ مارکســیزم بــێ،

بەڵکوو تەنها تەفسیری جیاواز لە هی ئێمەی لە سەر مارکسیزم هەبێ، یا هەڵوێستی سیاسی یا تەکتیکیی جیاواز لە نێوانیاندا هەبێ.
جگە لەوەش لەبری پەنابردن بۆ ئەرگۆمێنت و فاکت و بەڵگەکان لە دونیای فکر و واقیعدا، یەکسەر لە خورجینی پڕ لە تۆمەت و توونددڕەویی لینیندا، مادده و حوکمێکی حازربەدەست بۆ هەر مەسەلەیەکی وا بە ئاسانی پەیدا ئەکرا.
ئەوەشمان بیر نەچێت کە مارکسیزم وەکوو ڕەوتێکی فکری لە بواری سیاسەتدا ئەفسوون و پۆتانسیێڵێکی (وزە-طاقة) تەعبەوی هەبوو و توانای جۆش و خرۆشدانی جەماوەریی زۆری هەبوو.
بە دیاریکراوتریش و بێ ئەوەی ئێرە بکەم بە بواری شیکردنەوەیەکی سیاسی و سۆسیۆلۆجی سەبارەت بە پێکهاتە و ئاڵوگۆڕی کۆمەڵگای عێراق و کوردستانی ئەو سەردەمە، ئەمەوێ لەسەر چەند خاڵ بوەستم:
یەکەم: شکستی بزووتنەوەی مەلا مستەفا وپارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٧٥دا نیشاندەری پووچی و ڕاستڕەوبوونی مۆدێلی تا ئەوکاتی سیاسەت و حیزبایەتی بوو لە کوردستاندا. واتە تاقیکردنەوەی ٣٠ساڵی ڕابوردووی کوردستان شکستی باڵی ڕاستی بەڕوونی سەلماندبوو. ئەم وەرچەرخانە بوارێکی زێڕینی بۆ چەپ و مارکسیەت خۆشکرد کە بەتەوژمێکی کەم وێنەوە بێتە مەیدانی ململانێکانی ناو کۆمەڵگای کوردستانی ئەو کاتەوە، بە تایبەتی گەر ئەو ڕاستیە بزانین کە حیزبی شیوعیی عێراق لەو قۆناغەدا هاوپەیمانیەکی ستراتیجیی لەگەڵ بەعسدا مۆرکردبوو، و جگە لە ئەندامەکانی خۆیان، جێی هیچ متمانە و ئومێدێک نەبوو لەناو خەڵکدا.
دووەم: لەوەش گرنگتر لەم قۆناغەدا، هەم بە هۆی ئیسلاحاتە ئابووریەکانی سەردەمی ١٩٧٠ -١٩٧٥ لەلایەن بەعسەوە و هەم بە هۆی گەشەی سەرمایەداریەوە لە عێراق و جیهاندا، توێژی ناوەنجی کۆمەڵ بەگوڕ وتینێکی بێ وێنە وحەماسێکی زۆر و ئەوپەڕی هێزەوە

هاتبووە مەیدان وببوو بە چالاکترین چینی کۆمەڵایەتیی ئەوکاتەی کوردستان.
سێیەم: ئەم توێژە کۆمەڵایەتیە چالاکە تینووی چەک و ڕوانگەیەکی فکریی بوو تا چوارچێوەی جووڵە سیاسیەکەی بۆ دیاری وئاراستە بکات. مارکسیزم بەهۆی نفوزی جیهانی و ناوچەیی ئەو کاتەیەوە و بەو خەسڵەتە تەعبەویەوە کە هەیبوو، باشترین وەڵام و حازرترین چەکی فکری بوو بۆ تمووحەکانی ئەو توێژە. هەر بۆیە و بەو مانایە مەسەلەی هاتنە مەیدان و جووڵەی چینی کرێکار و ئەو جۆرە شیکردنەوە هزریانە هیچ پایگایەکی واقیعیان نیە بۆ تێگەیشتن لە نفووزی فراوانی مارکسیزم لەو قۆناغەی کوردستاندا. ئەوانە شیکردنەوە نین و پشتیان بە واقیع نەبەستووە، بەڵکوو دروشمێکن کە لە سەرەتاو لە پێشەوە هەڵکراون و هەرچییەکی تر بە دوای ئەوەدا ئەووتریێ، هەوڵی نەزۆکن بۆ سەڵماندنی ئەو دروشمە. ئەو میتۆدە هیچ شت لە گەڵ زانست و میتۆدی لێکۆڵینەوەدا کۆی ناکاتەوە.
چوارەم: ئەڵبەتە نابێ ئەو ڕاستیەش لە بیربکەین کە خەباتی سەرتاسەریی خەڵک لە کوردستاندا لە دژی ستەمی بەعس وەکوو پیادەکەری سیاسەتی توندوتیژی ستەمی نەتەوەیی لە کوردستاندا، قاڵب و پایە و چوارچێوەی سەرەکیی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە و ناڕەزایەتیی ئەو کاتەی خەڵک بوو، هەر بۆیەش سەرجەم داخوازی وتوخمەکانی تری بزوتنەوەی ناڕەزایەتی لە چوارچێوەی ناوبراودا جێی خۆیان کردبۆوە. ئەو بزووتنەوە گشتیەی خەڵکی کوردستان چەترێک بوو بۆ نەش و نماکردنی بیروباوەڕی جیاواز کە دواتر تەنانەت تا ئەندازەی ناکۆکیی گەورە لە ناو پێکهاتەکانیدا، دەتەقێنەوە.

## پێشەکیەکانی وەرچەخانی هەشتاکان لە عێراقدا

ساڵانی هەشتاکانی سەدەی پێشوو لە عێراقدا، بەهەموو مانایەک، بە دەیەی کارەسات ئەشوبهێ.
لە١٧ ی تەمووزی ١٩٦٨ دا کە بەعس بە کودەتایەکی سەربازیی نەرم دەسەڵاتیان کەوتەدەست، ویستیان خۆیان دوور بگرن لە هەمان چارەنووسی ساڵی ١٩٦٣. ئەوان لە ١٨ی نۆڤەمبەری ١٩٦٣ دا، دوای ٩ مانگ لە کۆدەتا خوێناویەکەی ٨ی شوبات، لەلایەن عبدالسلام عارفی هاوپەیمانیانەوە، کە نوێنەرایەتیی باڵێکی تری ناسیونالیستیی عەرەبیی بەهێزتر وخاوەن پێگەی سەربازیی ئەکرد، لێدران و لە دەسەڵات دوورخرانەوە. بەعس وەکوو باڵی ڕادیکاڵی بزووتنەوەی نەتەوەپەرستی عەرەب پاشەکشەی باڵی ناسیونالیستی ناسریی لە دونیان عەرەبدا بەهەل زانی بۆ هاتنەوە سەر دەسەڵات. لە ئەنجامی شکستی میسر لە شەڕی بەناوبانگی حوزەیرانی ١٩٦٧ لە بەرانبەر ئیسرائیلدا، بەعسیەکان لە عێراق و سوریا کەوتنە هەڵگرتنی دروشمی نەتەوەیی ڕادیکال تا بتوانن ئاڵای نەتەوەپەرستی عەرەبی لە دەستی میسر و جەمال عبدالناصر دەربهێنن. جگە لەوەش لاوازیی دەسەڵات و فەزای کراوەی سیاسیی سەردەمی عبدالرحمان عارفی سەرۆکی ئەوسای عێراقیان بۆ ئەو مەبەستە قۆزتەوە. هاوکاتیش بەعسیەکان لە کودەتاکەی ١٧ی تەموزدا توانیان لەژێر دروشمی ڕادیکالی نیمچە سۆسیالیستیدا شەقامی عێراقیش لە خشتە بەرن بەوەی کە لە سایەی تێزەکانی وەکوو بەربەرەکانێ لەگەڵ ئیمپریالیزم و خۆماڵی کردنی نەوت و ڕێگەی ناسەرمایەداری بۆ بنیاتنانی سۆسیالیزمدا، سۆزی

خەڵکی عێراق ڕاکێشن یا هیچ نەبێ بێ دەنگیان بکەن و بیانخەنە حاڵەتی چاوەڕوانییەوە. ئەوانە و مۆرکردنی ڕێکەوتنی یانزەی ئازاری ١٩٧٠ لە گەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و خۆماڵی کردنی نەوت و ئیمزاکردنی هاوپەیمانی ستراتیجی لە گەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و دامەزراندنی بەرە لە گەڵ حیزبی شیوعیی عێراق، بناغەکانی دەسەڵاتی بەعسیان لە حەفتاکانی سەدەی پێشوودا، پتەوکرد.

ساڵی ١٩٧٩ صدام حسین پێشمەرجەکانی ئەو دەیەی بە نیمچە کودەتایەکی خوێناوی دەستپێکرد. لە میژووی نوێی عێراقدا ئەو کارەساتە بە (قەسابخانەی هۆڵی الخلد) ناسراوە. کورتەی داستانی ئەو ڕووداوە ئەگێڕمەوە چونکە لەوێوە شەپۆلی دووەمی دەسەڵاتی تۆتالیتاریانیی Totalitarian بەعس دەست پێ ئەکات و مێژووی خوێنڕێژی و سەرکوت ودڵڕەقی لەو وڵاتەدا پێ ئەنێتە قۆناغێکی جیاواز لەڕووی چۆنیەتیەوە (نوعي) کە تا ٢٠٠٣ درێژەی ئەبێت. هەر لەم قۆناغەدا، کوردستانی عێراق ئەبێ بە تاقیگەی نەشونماکردن و قەدوباڵا گرتنی حوکمی شمولیی بەعس و سیاسەتی قەڵاچۆکردن و سووتاندنی ڕەش و سپی پێکەوە، لە ئاستێکی سەرتاسەری و فراواندا، پیادە دەکرێت و سەدان هەزار قوربانیی گیانی لێ ئەکەوێتەوە.

دوای سەفەری (انور السادات) بۆ ئیسرائیل و مۆرکردنی ڕێکەوتنی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیلدا، پەیوەندیی هەردوو باڵەکەی بەعس لە سوریا و عێراق، دوای ١٥ ساڵ دوژمنایەتی و پیلانگێڕی لە یەکتر، پێی نایە قۆناغێکی کورتی ئەوتۆوە کە زیاتر لە ئاگربەست ئەچوو تا دۆستایەتی. وەکوو هەوڵێک بۆ پینەکردنی ڕیزی شەق وشڕی بزووتنەوەی ناسیونالیستی عەرەبی لە دوای لەت وپەت بوونی لە ئاکامی پاشەکشەی میسر و بەستنی پەیماننامەی کامپ دێڤید بۆ ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیلدا، پەیوەندیی عێراق و سوریا گەرمیەکی کتوپڕ و لە ناکاوی تێکەوت. پاش چەند گەڕ لە دانوستان و هاتوچۆی

مەکوکیی نێوان بەغدا و دیمەشق، هەردوو باڵی بەعسی عێراقی و سووری گەیشتنە ڕێکەوتنێک بۆ یەکگرتنی هەردوو وڵات. دیار بوو هەردوو وڵات مەرامی تایبەتی و هەروەها سەرۆکی هەردوو لاش ئەنگێزەی تایبەتیی خۆیان هەبوو سەبارەت بەم سیاسەت و هەنگاوە نوێیە. (احمد حسن البکر) ئەوکات، سەرباری هێزو پێگەی مەحکەمی (صدام حسین)، سەرۆکی ووڵات و کەسی یەکەمی حیزب و سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (مجلس قیادة الثورة) بوو. بەڵام (البکر) دەمێک بوو لەلایەن سەدامەوە باڵی کرابوو و خزێنرابووە گۆشەیەکی تەنگەوە و لای (حامد الجبوري)ی ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبەکەیان درکاندبووی کە (من دیلی دەستی سەدامم)، العراق من حرب الی حرب، صدام مر من هنا، غسان شربل، ص ٢٢.

یەکگرتنی عێراق و سووریا و بەوجۆرەی کە پێکهاتبوون کە (البکر) بکرێت بەسەرۆکی قەوارە تازە یەکگرتووەکە، دوایین شانسی ئەو بوو کە لەو (دیلی)یە قوتاری ببێت وهەر لە ڕێکەوتنەکەشدا لەسەر ئەوە بڕابوونەوە کە (حافظ الاسد)ی سەرۆکی باڵی بەعسی سوریا و سەرۆک کۆماری ئەو ولاتە، پۆستی جێگری سەرۆکی قەوارە تازەکەی بەرکەوێت.

ئەو ڕێکەوتنە ڕێک ڕیسەکەی سەدامی ئەکردەوە بە خوری و لە گەمەی پەیژە ومارەکەی دەسەڵاتدا، مارە هەرە درێژەکە قووتی ئەدا و لە پلەبەندیی دەسەڵاتدا چەندین فرسەخ ئەکەوتەوە دواوە.

نامەوێ لێرەدا بچمە ناو شیکاریەکی هەمەلایەنەی ئەو ڕووداوەوە، گەرچی لەڕووی بابەتیەوە ئەوە بوو بە شاهۆکاری ئەو ئاکامانەی کە دەیەی هەشتاکانی ئەو سەردەمەی نەخشاند بەو هەموو ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازییەوە کە بۆ خۆم پێموایە تا ئێستاش بەشێکی زۆری مێژووی هاوچەرخی ئەم ولاتە لە جوغزی کارلێکی جەمسەرە جیاوازەکانی ئەو سەردەمەدا، گیری خواردووە.

بەهەرحاڵ (صدام) وەکوو تێکدەری گەمەکە سەرجەم پلانەکانی سەرەوژێرکردەوە و لە ئەکتێکی سیاسیی هاوچەشنی ڕووداوەکانی کۆشکی کرەملینی ڕووسیای سەردەمی ستالین لە سیەکانی هەمان سەدە، کە هەموو ڕابەرانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی لەناوبرد، ئەمیش بەشی هەرە زۆری هاوڕێ وسەرکردە و کادرەکانی حیزبی بەعسی لە هۆڵی (الخلد)دا کۆکردەوە، بێ ئەوەی، جگە لە یەک دوو کەسایەتیی دەستوپێوەندی خۆی، بزانن چی پلانێک لە مێشکی ئەودا گەڵاڵەبووە وچ خولیایەکی خوێناویی تر مێشکی ئەوی خستۆتە گێنگڵ.
لەوێدا (صدام) بێ ئەوەی بەیەک وشەش زمانی بگەڕێ و باسی ڕێکەوتنەکەی عێراق و سووریا بکات، دیمەنی شانۆگەریەکەی بەئەندازەی ١٨٠ پلە گۆڕی و ڕایگەیاند کە (موئامەرەیەک) لە دژی حیزب و دەوڵەت لە دوایین ساتەکانی چنینیدا کەشف بووە و داوایکرد کەچەند کەس لە پاڵەوانەکانی بێنە سەر شانۆکە و وردەکارییەکانی ئەو پیلانە هەڵماڵن. هەر لەناو هۆڵەکەشدا لەناو چەپڵەڕێزانی سەدان کەسدا بڕیاری لەگۆڕنانی پیلانەکەی ڕاگەیاند و لەوێوە و بەبڕیارێکی سەرپێی و سەرزارەکی دەیان کەس لە ئەندامانی سەرکردایەتی و وەزیر و کادری باڵای حیزبەکەی ڕەوانەی کوشتارگاکان کرد کە بەناوبانگترینیان بریتی بوون لە (عبدالخالق السامرائي، محمد محجوب، عدنان الحمداني، محمد عايش، غانم عبدالجليل و. تاد*)[١]. چەند ڕۆژ دواتریش دوابەشەکانی شانۆگەریەکە ڕاگەیەندرا.
(احمد حسن البكر) لە زمانی ڕاگەیاندنەکانی "دەوڵەتی نوێ"وە بەنامەیەک ڕایگەیاند کە بەهۆی متمانەی تەواوی بە (صدام حسين) و

---

[١] ئەوانە کۆمەڵێک لە کەسایەتیی سەرکردەی بەعس بوون کە ڕێگر بوون لە کۆنترۆڵکردنی حیزب و دەسەڵات لە لایەن سەدام حسێنەوە. ئەوان لایەنگری ئەوە بوون کە (احمد حسن البكر) وەکوو کەسی یەکەمی سەرکردایەتی حیزب و حکوومەت بمێنێتەوە.

چونکە تەمەن وتوانا فیزیکیەکانی چیتر ڕێگەی پێ نادەن، ئەو بڕیاری خانەنشینیی داوە و داواشی لەهەموو " هاوڕێیانی " سەرکردایەتیی حیزب و دەوڵەت و گەلی عێراق ئەوەیە کە متمانەی تەواو ببەخشن بە ڕابەری مەزنی گەلەکەیان (صدام حسین)!!!!

شایانی باسە کە عبدالخالق السامرائي لە ساڵی ١٩٧٣ بیانوویەکی لە لایەن صدام حسێنەوە بۆ داتاشرا و بە تۆمەتی دەستێکەڵی لە کودەتاکەی ناظم گزاردا خرایە زیندانەوە و هیچ ئاگاداریەکی لە کێشمەکێشەکانی ئەمجارەی ناو بەعسیەکان نەبوو. بەڵام صدام ئەیزانی مانەوەی عبدالخالق بە زیندویێتی ئیلهام بەخشی هەر باڵێکی ناو بەعسیەکان ئەبێ کە خەیاڵی پیلانگێڕیان لە دژی ئەو لەسەردابێ، لە وەڵام بە داخوازیەکی علی حسن المجید دا، کە وتی تا عبدالخالق بمێنێ سەری پیلانگێڕی هەر زیندووە، لەناو هۆڵەکە وەکوو سەرۆکی عەسابەیەکی چەکدار دەستی بۆ سمێڵی برد ووتی: اخذها من هذا الشوارب، بەو مانایەی کە بەڵێنی پیاو بێت کە لەناوی ببەم!!!

لێرەوە پەردە هەڵدرایەوە لەسەر قۆناغێکی خوێناویی تری عێراق. ئەم جێگۆڕکێیە بوو بە سەرەتای قۆناغێکی تر لە هەوسارشکێنی دیکتاتۆریەتێکی تۆتالیتاری نەتەوەیی عەرەبی پان وپۆڕ کە سەرتاسەری عێراقی کرد بە تاقیگایەکی گەورە بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیناریۆیەی من ناوم ناوە (دەیەی کارەسات) کە هەموو کون وکەلەبەرێکی ژیانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئەمنی و کەلتووریی وڵاتی گرتەوە و ڕۆچوو بەناخی هەموو تاکێکی ئەم وڵاتەدا و لەونێوەشدا کوردستان، بەتایبەتی تر، بوو بە چەقی قورسایی ئەو تاقیکردنەوە خوێناویە.

من ئەوکات بەهۆی ئەندامێتی لە (ڕێکخراوی ڕەنجدەرانی کوردستان)دا زیندانی سیاسی بووم و دواتر و بە هۆی جێگرتنی (صدام حسین) لە پۆستی سەرۆککۆمار و سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش و ئەمینداریی گشتیی هەرێمی و نەتەوەیی و

سەرۆکی گشت هێزە چەکدارەکان و..... تاد، پاش نزیکەی سێ هەفتەیەک بەیەکجاری ئازاد کراین.
تا ئێستا لە ئەدەبی سیاسیی کوردیدا کە باسی قۆناغی هەشتاکانی سەدەی پێشووی عێراق و سەردەمی دەسەڵاتدارەتی حیزبی بەعس ئەکرێت زیاتر زمان و میتۆدی عاتیفی، کاردانەوە، قین و تۆڵە زاڵە و کەمتر شایەدییەکی وردی بابەتیی سەبارەت بەو قۆناغە، بەهەموو تایبەتمەندیەکانیەوە، بەرچاو دەکەوێت.
فاشیزم، ڕەفتار فاشی، نەتەوەپەرست، دیکتاتۆر، شۆفینیزم، عروبی، تکریتی، ڕەگەزپەرست و ... تد، هەندێک لەو تێرمانەن کە بۆ ناساندنی سروشتی سیاسی و فکری و کۆمەڵایەتیی ئەو دیاردە و سیستمە سیاسیە بەکارهاتوون کە قۆناغێکی زۆر تایبەتیی مێژووی ئەم وڵاتەی، بەکوردستانیشەوە، خستە ژێر کاریگەریی قووڵی خۆیەوە.
من پێموایە هەریەک لەو تێرم و نازناوانە، ئەتوانن لایەنێک لە کاراکتەرە سیاسی و فکریەکانی دەسەڵاتی سەردەمی بەعس نیشان بدەن، بەڵام هێشتا دەست ناخەنە سەر شوناسی وردی دیاردەی ناوبراو و تایبەتمەندیە کۆنکریتەکانی کەشف ناکەن. ئەوانە شیکردنەوەیەکی کۆنکریت (جامع) نادەن بەدەستەوە سەبارەت بە دیاردەی دەسەڵاتی بەعسی هەشتاکان کە هەڵگری کۆی ئۆرگانیک و لێکهەڵپێکراوی هەموو ئەو کاراکتەرانە بێت. لەبەر ئەوە لە ڕووی تێرمینۆلۆجیەوە بەکارهێنانی (تۆتالیتار یان تۆتالیتاریزم) بە ووردتر و دروستتر ئەزانم بۆ پێناسەکردنی بەعس. ئەم تێرمە هەم نیشاندەری جەوهەریترین کاراکتەری دەسەڵاتی ناوبراوە و هەم هەموو ئەو خەسڵەتانەی پێشووش لەژێر سێبەری تۆتالیتاریزمدا و بە پەیوەند بەوەوە مانای واقیعیی خۆیان پەیدا ئەکەن. دواتر لە سیاقی گێڕانەوەی شایەدیە سیاسیەکەمدا، لە جێی گونجاودا دێمەوە سەر ئەم بابەتە.

## لەزیندانی (ابو غریب)ەوە بەرەو ماڵەوە

بەڕاستی ژیان دەبێ وابێت!!

**(ناونیشانی کتێبی یادەوەریەکانی پابلۆ نیرۆدا)**

بەجۆرێک لە (ابو غریب) دەقمان بەژیانی ناو زیندانەوە گرتبوو بیرمان لای ئازادبوون و ماوەی زیندانی و شتی لەوچەشنە نەمابوو.

من لە هێرشە گەورەکەی بەهاری ساڵی ١٩٧٧ دا دەستگیر کرام. ئێمە ئەندامی (ڕێکخراوی ڕەنجدەرانی کوردستان) بووین. ڕەنجدەران باڵێکی جیاوەبووی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستان بوو.

من سزاکەم ١٢ ساڵ بوو و بەوەش باش بوو کە سەڵت بووم و نە هاوسەر و نە دەزگیران و کێشە و ئەرکێکم لەو ڕووانەوە هەبوو. ماڵی باوکیشم گوزەرانیان باش بوو و تەنها کێشەیان بوونی من لە زینداندا بوو. کە ساڵی ١٩٧٧ زیندانیکرام تەمەنم ٢٠ ساڵان بوو.

ئابی ١٩٧٩، چەند ڕۆژێک بوو دەنگۆی ئەوە هەبوو کە صدام حسین بەهۆی بوونی بەکەسی یەکەم لە عێراقدا لێبووردن بۆ زیندانیانی سیاسیی عێراق دەرئەکات. ئەو ڕۆژەی کە لە بڵندگۆی گشتیی زیندانەوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیەوە ئاگادار کراینەوە کە هەموو لە هۆڵی کۆبوونەوەکانی زیندانی سزا تایبەتەکان (قسم الاحکام الخاصة) کۆببینەوە بە مەبەستی ڕاگەیاندنی بڕیاری (مجلس قیادة الثورة) سەبارەت بە ئازادکردنمان، کۆمەڵێک هاوڕێ دانیشتبووین وسەرگەرمی قسە بووین کە بانگەوازەکە تەواو بوو و زانیمان ئازاد

ئەکـرێین، یەکێـک لەو هاوڕێیـانە وتـی: تـوو شـەرەف ئێسـتا وەختـی ئەوەیە!!!!

هەر ئەو ڕۆژە دەقی بڕیارەکە لە میدیاکانی ڕژێمەوە ڕاگەیەندرابوو و یەکسەر کەس و کاری منیش خۆیـان پێنەگیرابوو کەوتبوونە ڕێ بۆ بەر دەروازەی زینـــدانەکە تـــا لە گەڵ خۆیانـــدا بمـــانبەنەوە. بەڵام بەڕێوەبەرایەتیی زیندان دوو ڕۆژی تریش بەبیانووی (کتابنا وکتـابکم) لە گەڵ وەزارەت لە بەغدا ئێمەیان هێشتەوە و کەسوکاریشـم ئەو دوو ڕۆژە بەو ئومێـدەی ئێسـتا نـا تـۆزێکی تـر بەرئەدرێـین هەر لەنـاو سـەیارەکاندا مـابوونەوە. کە سـاڵی ١٩٧٧ گیـراین ماڵمـان لەگەڕەکـی (ئازادی)ی کەرکووک بوو، بەڵام پاش ئەوە بە مـاوەیەک، مـاڵی بـاوکم گوێزابوویانەوە بۆ گەڕەکی (ئیمام قاسم) و باش بوو ئەوان هـاتبوون بەدوامـدا ئەگینـا مـاڵی خۆمـانم پێنەئەزانـی. ئەو ڕۆژەی کە ئـازادکراین ژمێریارێک لە پێشدا بەجانتـایەکەوە خـۆی کرد بەژووردا کە پێئەچـوو لە بەغـداوە ناردبێتیـان. ئـێمە لەبەر کەسـوکار پەلەمـان بـوو بـڕۆین کەچی وتیـان بەندێک لە بڕیـارەکە ئەوەیە کە هەر زینـدانیەک بـڕی ٥٠ دینـــاری عێراقیـــی پـــێ بـــدرێت و کـــابرای ژمێریـــار کە ئەیزانـــی کەسـوکارمان لە دەرەوەن خێـرا لیسـتی ناوەکـانی خوێنـدەوە و لەگەڵ وەرگرتنی پارەکەدا ئیمزایەکیشی پێ ئەکردین.

بە هـۆی ئەو پـارە وەرگـرتنەوە ئازادبوونمـان کەوتە ئێـوارەی هەمـان ڕۆژ و لەبەردەم دەروازە گەورەکەی زینـدانی شـوومی ئەبـوو غرێـب بەکەسوکارمان شادبووینەوە و بەناو بەغدادا بەلای سـاحەی تحریـردا بەرەو کەرکووک کەوتینە ڕێ. درەنگانێکی شـەو گەیشـتینە نـاو مـاڵ و هەمـوو ئەوانەی کە نەهـاتبوون هێشـتا نەنووسـتبوون وچـاوەڕوانی دیتنی منیان ئەکرد.

ئەو شـەوە بەزەحـمەت و ئەویـش سـەروبەندی بەیـانیەکەی خەوتـم. دوای مـاوەی ٢ سـاڵ و ٣ مانـگ زینـدان، یەکەمجـار بـوو بە ئـازادی و دوور لە زرمەی بەیانیـانی دەرگـا کـردنەوە بە نەڕەی وەردیانەکـانی

ئەبوغرێبەوە بۆ سەرژمێری بەیانیان، خەو بچێتە چاوم. هەمووی ٣-٤ سەعاتێک نەبوو خەوتبووم لە دەنگی دایکم و منداڵەکانی کاکم بەئاگاهاتم و خواخوام بوو یەکێک خەبەری ببێتەوە و منیش لەگەڵیدا لە خەو هەستم. یەکێک لەو خووانەی ئێستاش دەقم پێوە گرتووە کەمخەویە. هەمیشە قسەی یەکێک لە پاڵەوانەکانی ڕۆمانی (شرق المتوسط)ی عبدالرحمن منیفم لە بیرە کە بەهاوڕێ هەمیشە خەواڵووە چلساڵیەکەی ئەڵێ تۆ تەمەنت تەنها ٢٠ ساڵە، چونکە نیوەیت بەخەو بردۆتەسەر! ڕاستی منیش هەمان فەلسەفەم لەسەر ژیان هەیە و پێموایە خەو بە ژیان ئەژمارناکرێت و تەنها ئەوکاتە ژیان مانای هەیە کە بێداریت!

بیر و خەیالم زۆر پەرت بوو و هەر چرکەیەک بەلایەکدا ئەیبردم. دەیان پرسیار پێکەوە ورووژمیان بۆ مێشکم ئەهێنا. چۆن ژیانی تازەی دوای زیندان دەستپێبکەمەوە؟ ئێستا ئەبی چی لەزیندان و قاوشەکەمان بگوزەرێت؟ ئەبێ هەستی ئەو دایک و باوکانە چۆن بێ کە ڕۆڵەکانیان ئیعدام کران و گەر وانەبوایە ئەوانیش ئێستا پێیان شاد ئەبوونەوە؟ چۆن تێ هەڵئەچینەوە بەکار و چالاکیی سیاسیمان؟ عێراق بەرەو کوێ ئەڕوا؟ چۆن ئەڵقەی سەرەکی ئەو گۆڕانە فکری و سیاسیە قووڵە بدۆزینەوە کە لە ئاکامی تاقیکردنەوەی زیندانەوە بەسەرماندا هات.

ڕاستیەکەی ماوەی زیندان بۆ ئێمە وەکوو دەورەیەکی چڕ وپڕی عەقائیدی و ئایدیۆلۆجی وابوو بە تایبەتی مشتومڕەکانی نێوان بەرەی چەپ و ڕاستی زیندانیە کوردەکان، کە ئەوکاتە بە تایبەتی سەرکردایەتی کۆمەڵەی مارکسی-لینینی هاوکات لەگەڵ ئێمە لەوێ بوون و هەر لەگەڵ ئێمەش ئازادکران. دووساڵ و چەند مانگی زیندان، بە بوونی ئەو ژینگەیەوە، بۆ من وەکوو قۆناغی پیاچوونەوەیەکی ورد بوو بە هەموو مەفاهیمەکانی فکر و سیاسەت و بەها ڕێکخراوەییەکانی لەمەوپێشم، بەتایبەتی لەو قۆناغەدا کە ئێمە

لەویٚ بووین، چونکە زۆرترین و چڕترین ململانێی فکری و سیاسی لە ناو بەرەی چەپی کوردستانی لە ئارادابوو. کێشەیەکی زیندان ئەوە بوو کە ئێمە هیچ سەرچاوە و کتێب و ماتریاڵێکمان لە بەردەستدا نەبوو کە کۆمەکمان بکا لەو وەرچەرخانە زۆرەی کە لە بوارەکانی هەم فکر و هەم هەڵوێست ولایەنگیریی سیاسیەوە پیایدا تێپەڕ ئەبووین. بۆیە زۆر هەڵپەی دوو شتم بوو.

**یەکەم:** چۆن لە پرۆسەیەکی خێرادا ئەو مەسەلە فکری و تیۆریانەی مارکسیزم کە بنەمای خۆساغکردنەوەی ئێمە بوو لە زینداندا هەزم و ئیستیعاب بکەم و بەوردی بەم دەرکەی ئێستاوە بچمەوە سەریان.

**دووەم:** ڕەوتی سیاسیی داهاتوومان سەر بەکوێوە ئەنیٚ و لە ڕووی ڕێکخراوەییەوە لە کوێدا دەگیرسێتەوە و چۆن بەرجەستە ئەبێتەوە و چۆن منیش تێهەڵچمەوە؟

لە بەینی هاتنی یەک لە دوای یەکی وەجبەی میوانی زۆردا، یەکەم فرسەتم بینی لە گەڵ هاوڕێیەکمدا، کە پێموابیٚ "توفیق خورشید" بوو، وەکوو چاوساغم چووینە دەرەوە بۆ شەقامی بەناوبانگی جمهوریی کەرکووک کە سەنتەرێکیش بوو بۆ گەڕان بەدوای کتێبخانە و کتێبدا. بڕی زۆری ئەو پەنجا دینارەی لە کاتی ئازادکردنماندا وەرمان گرت، دام بە کتێبی مارکسی لە کتێبخانەی ئاسۆی ئەوکات کە کاک جەبار خاوەنی بوو.

بۆ بەیانیەکەی جەژن بوو، منیش بەو کتێبانەوە خۆمکردەوە بەماڵدا. خێزانەکەمان، کە هەم ساڵی ١٩٦٣ دەستیان چزابوو بەمەسەلەی سیاسەتدا و باوکم لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووک دەرکرابوو، و هەمیش ساڵی ١٩٧٤ کە هەموو بەخێزانی ڕۆیشتینە دەرەوە و بە ئیفلاسی و ڕەجاڵی گەڕابووینەوە، تازە بەتازە خەریک بوو پاش زیندانی بوونی من و فشاری ئەمن خۆیان ئەگرتەوە بەو ئومیدەی سەرێکی بیٚ ئێش و بیٚ کێشە بنێنە سەرسەرین. ئەوان لایان وابوو کە ئیتر منیش تەمیٚ خواردوو بوومە و هەڵوێستە توونـد و

ئاگرینەکانی سەردەمی ناو زیندانی منیان بە کەفوکوڵێک ئەزانی و ئومێدی زۆریان لەسەر ئەوە هەڵچنیبوو کە ئیتر منیش بچمەوە سەر ڕەواڵی نۆرماڵی ژیان و خوێندن و خۆئامادەکردن بۆ زانکۆ. منیش نیازم وابوو بۆ ڕەچاوکردنی وەزعی ئەوان و بەدەرس وەرگرتن لە گرتنی جاری پێشوومان ئارام تر و بەحەوسەڵەتر هەڵسوڕێم، بەتایبەتی دایکم لەوماوەی زیندانیەمدا ئازاری زۆری چەشتبوو بە بۆنەی منەوە کە ئەمویست بالانسێکی وردی نێوان مەسئولیەتە سیاسیەکەی خۆم لەگەڵ ئیلتیزامێکی ئەخلاقی و خێزانیش بەرانبەر بەوان بەرقەرار بکەم. بەڵام دیاربوو کە دیکتاتۆریەت و داپڵۆسین و سەرکوت و چاودێری لەچاو جاراندا زۆر خراپتر ببو، بەتایبەتیش لە کەرکووکدا لە هەموو کوچە و شوێنێکدا دەزگاکانی بەعس دەیان چاویان بۆ چاودێری ڕواندبوو و ئێمەی تازە ئازادکراوی زیندانیش باشترین ماتریاڵی تاقیکردنەوەی ئەو سیخوڕی و چاودێریە بووین.

عادلی برام نزیکەی شەش ساڵ لە من گەورەتربوو. ئەو لە ساڵی ١٩٦٨ەوە کەوتە ناو دونیای سیاسەت و سەرەتا بۆ چەند مانگێک لەگەڵ جەلالیەکاندا چەکی هەڵگرت لای "عەلی عەسکەری" وپاشان بوو بە پێشمەرگە و لە ئاشبەتاڵەکەی ١٩٧٥ دا هاتەوە تەسلیم بووەوە. ئەو برایەم، وەکوو ڕەنگدانەوەیەک بەرانبەر تاقمی سیاسیی دەسەڵاتداری ناو پارتی و تاقیکردنەوەی شکستخواردووی ئەوان، بڕیاری دابوو کە جارێکی تر نەک هەر خۆی بەڵکوو ڕێگە نەدات ئەوەیش بەخوێی هەویر پێی بشێت، تووخنی سیاسەت بکەوێت و بە سازوئاوازی کوردایەتی هەڵپەڕێت. کاتی خۆی کە من بە تێهەڵچوونەوەم و پاشان گرتنم ڕیسەکەی ئەوم کردەوە بەخوری، زۆر سەرزەنشت و گلەیی کرد و ئێستا لە زیندان ئازادکراوم هەر بەدەور و خولمدا دێت تا جارێکی تر گڕ لە خەرمانی خەون و نیگەرانیەکان و ئاواتەکانی بەرنەدەم. ئەو سەرباری نەفرەتی زۆری لە بەعس، بەڵام زوخاوێکی زۆریشی چەشتبوو بەدەست پارتیەوە، بۆیە

ڕووی کردبووە ژیان و گوزەران و ماڵ و حاڵی خۆی. عادل لە لقی کۆمپانیای مانسمانی ئەڵمانی لە کەرکووک بە فۆرمان دامەزرابوو و گوزەرانی باش و جێگیر بوو و زۆریش خۆی لە مەسائیلی سیاسی و گێچەڵی ڕژیم ئەپاراست، بەڵام کوڕێکی زۆر بە هەڵوێستیش بوو لە ڕووی ڕژێمدا.

بەیانیی ڕۆژی جەژن ماڵەوە جمەی ئەهات لە برا و خۆشک و برازا و هەموو لە شەوق و زەوقی ئازادبوونی مندا سەرحاڵ بوون، منیش چووم هەموو کتێبەکانی دوێنێم هێنا و لە دەوەری سفرەکە لای خۆمەوە کەوتمە چاو پیاخشاندنیان. عادل پیاوێکی خوێندەوار و خاوەنی شارەزاییەکی باش بوو لە مەسەلەی فکر و مارکسیەتدا و جارێکیش لەسەر خوێندنەوە و تەرویجی مارکسیەت لە دەرەوە لە لایەن پارتیەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرابوو. ئەوکاتە ئەو ئەندامی لیژنەی ناوچەی هێزی ڕزگاریی پارتی بوو کە لە دەرەوە جوابی نارد کتێبی (اسس الفلسفة الماركسية)ی ئەڤاناسیفی بۆ بکڕم و بۆی ڕەوان بکەم کە لە بیرمە کتێبەکە لەلایەن "عزیز سباهی"ەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕدرابوو. گەر ناوی کتێبەکەی بەنووسراوی بۆ من نەناردایە ئەو کاتە واتە ١٩٧٢ نەم ئەتوانی ئەو کتێبە بدۆزمەوە، چونکە هێشتا دەرکم سەبارەت بە دونیای فکر و ڕۆشنبیری بەو ئەندازەیە پێ نەگەیشتبوو. دواتر بیستمانەوە کە عادل لەسەر ئەو کتێبەی بۆم ناردبوو لە لایەن پارتیەوە زیندانی کرابوو.

ئێوارەی پیش یەکەمین جەژنی دوای ئازادکردنمان یەکەمجار بوو پاش زیندان گوێم لە ڕادیۆی ئەلبانیا ئەگرت بەعەرەبی کە لە زیندانا ببوو بەسەرچاوەی تاقانەی ئاگاداریمان لە ئاڵوگۆڕە سیاسی و فکریەکانی دونیا. عادل لە ڕۆژی گوێ گرتنی من لە ڕادیۆکە پێوەی دیار بوو کە نارەحەتە بەوەی من وا بەشەوقەوە گوێبیستی باسەکانی ئەبووم و هەمیشە چاودێریی ئەکردم تا ئەو نیشانانەم تیا بدۆزێتەوە کە بەڵگە بن بۆ دوورکەوتنەوە لە سیاسەت و چالاکیی سیاسی. ئەو

ڕۆژەیان تەنیا پیشێکی خواردەوە و بێدەنگ بوو، بەلام ئەمجارەیان خۆی نەگرت و دووقۆڵی بوو بەباس و دەمەقاڵێیەکی توونـدمان بەجۆرێک کە جەژن لە هەموویان تێکچوو. عادل ئەیووت تۆ دوو ڕۆژە ئازادکراویت و یەک دونیا ئەرک و مەسئولیەتت لە ئەستۆیە و بۆ بیر لە داهاتووی خۆت ناکەیتەوە تا ئێمەش دوور ڕاگری لە بەلا؟

بەهەرحاڵێک بوو ئارامم کردەوە و بۆم ڕوونکردنەوە کە خوێندنەوەی کتێب بەمانای تێ هەڵچوونەوەی چالاکیی سیاسی نییە، بەلام ئەو زۆر لەوە شارەزاتر بوو کە دڵی بە بەڵێن و ڕوونکردنەوەکانی من ئاو بخواتەوە.

کەرکووک لە ڕووی ئەمنییەوە بۆ حکوومەتی بەعس بایەخێکی ستراتیجیی هەبوو. ئەمویست زۆر درەنگ بکەومەوە بەر ڕاداری چاودێریی دەزگای ئەمن بە تایبەتیش بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کەرامە هەموو ٥٠٠ مەتر لە ماڵمانەوە دوور بوو. بەرنامەم دانا کە ساڵێک بۆ تەواوکردنی خوێندنی شەشەمی ئامادەیی تەرخان بکەم و سەرنج لەسەر خۆم لابدەم و پاشان لە زانکۆیەک وەربگیرێم تا هیچ نەبێ لە کەرکووک دووربکەومەوە.

ساڵی خوێندنی ٧٩ – ٨٠ مان لەگەڵ هاوڕێیانی زیندان، "ئیسماعیل جەباری" و "خالید حەمە عەزیز"دا لە ئامادەیی ئیمام قاسم دەستپێکرد. بارودۆخی کۆتایی حەفتاکان لە چاو ٥ ساڵی لەوەوپێشدا گۆڕانی زۆری بەسەرداهاتبوو. ڕووکردنی توێژی گەنج و خوێندەوار بەرەو بەشداری لە کایەی سیاسی و ڕووکردن بەرەو مارکسیەت، سەرباری پەرەسەندنی ئاستی داپڵۆسین و سەرکوت، زیادی کردبوو و جیاوازتر بوو لە چاو قۆناغی دوای ئاشبەتاڵ کە ئێمە تیایدا چالاکیی سیاسیمان ئەنجامئەدا. ئیمەش بەهۆی زیندانەوە ببوین بە سیمبول و چەندە لای ڕژێم چارەگران بووین هێندە لەناو خەڵکدا خۆشەویست ببوین و بەتایبەتی کەسانی دژ بە ڕژێم و ئەوانەی هەوای سیاسەت و بە تایبەتی چەپڕەوی لە کەلەیدابوون، چاوەڕوانیەکی زۆریان لە ئێمە

هەبوو. هێشتاش بەهیج چەشنێک جیایی ئێمە و کۆمەڵەی مارکسی – لینینی و یەکێتی نەببو بە باس و مەسەلەی ناو هیچ توێژێکی کۆمەڵگا، مەگەر تاکوتەرایەکی سیاسیی زۆر تایبەت و کادری کۆمەڵە بەوەیان بزانیایە. بەڵام کۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەکێتی نفوزی بالایان هەبوو لەناو خەڵکدا وبە پێچەوانەی ئارەزووی ئێمەوە، هێشتا زۆری مابوو کە خەڵک ماهیەت و چییەتی ئەوان بناسێت.

زۆری پێ نەچوو دائیرەی ئەمن گەڕیان لێم ئالان و ڕۆژێکی کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٩ لە کاتێکدا دڵم بەوە خۆشبوو کە پێ ئەچێ ڕزگار بووبم لە گێچەڵیان لە دەرگای ماڵەوەیان دا. مفەوەزێکی ئەمنی عەرەب بوو بەناوی (موفق) کە لە گەڵ کچێکی کوردی گەڕەکەکەدا زەواجی کردبوو ودواتر لە ڕاپەڕیندا موفق لە لایەن خەڵکەوە کوژرا. پاش سڵاوێک وتی: ئەتوانی تا دائیرە بێیت لەگەڵمدا؟ منیش وتم: خۆم ئەگۆڕم و دێم، ئیتر بە سەیارەکەی خۆی بردمی بۆ لقی ئەمنی کەرامە و لەوێ حەواڵەی دەستی ئەفسەرێکی ئاسایشی کردم بەناوی (عبدالرزاق) کە بەڕێوەبەری ئەم لقەی ئەمن بوو. ئەویش بە دەنگێکی بەرز ڕووی کردە پرسگەکە و هاواری کرد: هەر کەس پرسیاری منی کرد بڵێن زۆر سەرقاڵە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گرنگی هەیە و خەریکی ئەوەیە. بەتاقیکردنەوەی لەوەوپێشم زانیم کەئەوە شەڕی سایکۆلۆجیە بۆ ئەوەی بمشڵەژێنێت. پاشان لەگەڵ خۆیدا بردمیە ژوورێکەوە و دەرگای داخست و دەستی کرد بە قسە. سەرەتا پرسیاری ئەوەی کرد چی ئەکەیت؟ وتم: سەرقاڵی خوێندنم لە فلان قوتابخانە و بەرنامەم ئەوەیە دواتر بچمە زانکۆ و بەوجۆرە. بەدوای ئەوەدا یەکسەر لە چەکمەجەکەی بەردەستی وێنەیەکی دەرهێنا و نیشانی دام وتی: ئەمە ئەناسی؟

وتم: بەڵێ.

یەکسەر هەڵچوو و وتی: یانی پەیوەندیت لەگەڵیدا هەیە؟

وەڵامـم دایەوە: پەیوەنـدیی چـی؟ ئەو پیـاوە لە زینـدانی ئەبـو غرێـب بووە و منیش لەوێ زیندانی بوومە.

ناوی چیە؟

علی بچکۆل.

مـن ئەمزانـی کە ئەو لەوە بە ئاگـایە کە ئـێمە هەردووکمـان لە ئەبـوو غرێــب زینــدان بــووینە و بە یەک بڕیــاریش ئــازاد کــراوین، بــۆیە هاشاکردنم بە باش نەزانی.

بەهەرحـاڵ وێنەکە هـی "عـەلی بچکـۆل" بـوو کە لێپرسـراوی هەرێمـی دووی یەکێتیی بـوو و هەر بەڕاسـتیش سـەرباری ئەوەی دووراودوور ئەمناسـی، بەڵام هـاوڕێم نەبوو، گەرچـی ئەمزانـی لە کـادرە کۆنەکـانی کۆمەڵەیە و لە زیندانیش ئەو لە قاوشێکی تر بوو.

وێنەکە لە ژێر دارێکدا گیرابوو و عەلی بچکۆل جامـانەیەکی پـانوپۆڕی لەسەر و چەک و تاقمی پێوەبوو.

پاشان ڕووی تێکردم وتی: ناتوانی جوابی بۆ بنێریت بێتەوە و خۆی تەسلیم بکاتەوە؟

منیش وتم: یەکەم هاوڕێم نیە و تەنانەت هاوتەمەنیشم نیە، دووەمـیش مـن هەر نـازانم چ کـارەیە و لە کـوێیە وجگە لەوەش لەو ڕۆژەوەی لە زینــدان ئــازادکراوم دوورم لە جەوی سیاســـەت و بڕیارمـــداوە کە توخنی ئەو شتانە نەکەومەوە.

ئەو بایدایەوە وتی: وانەزانی ئـێمە ئاگامـان لـێ نیە چـی ئەکەیت، بۆیە یەک جووڵە بەسە بۆ ئەوەی دەسـتمان پێت بگـات، و منـیش قسـەکانی پێشووم دووبارەکردەوە و ئیتر ئیزنی دام بڕۆم.

هاوڕێکانم ئاگادارکردەوە لە گێچەڵی ئەمن تـا ئەوانیش ئەو مەسـەلەیە ڕەچاو بکەن و بەدوای ئەوەدا تـوانیم بـۆ مـاوەیەکی بـاش بـێ کێشـەی ئەمنـی بیگـوزەرێنم، بەتـایبەتی کـۆمەڵێ هـاوڕێم مـابوون کە ئەنـدامی کـۆمەڵە بـوون هەمـوویـان پـاش تەواوکردنـی زانکـۆ بە نیـازی چـوونە دەرەوە بـوون. جگە لەوەش چـالاکیە سیاسـیەکانم لە کەرکـووک زۆر

کۆنترۆڵ کردبوو، گەرچی ئەو مەسەلانە یەکلایەنە و بەتەنیا بەمن نە ئەکرا، چونکە لایەنی تری کێشـەکە هـاوڕێ و دەوروبەرە سیاسـیەکەم بـوون کە مەرج نـیە بەوجـۆرەی مـن ڕەچـاوی دیسـپلینە ئەمنیەکـان بکەن.

ئێوارەیەک پێش تاریکان لە ناوشـارەوە گەڕامەوە بۆ مـاڵەوە و خۆم کـرد بەژووردا زۆر سـەرم سـووڕما، "شـێرکۆ حەمیـد"ی هـاوڕێم کە مـاوەیەکی زۆر بـوو ببـوو بە پێشـمەرگە، دوو قۆڵی لە حەوشـە لەگەڵ دایکمدا دانیشـتبوون. پـاش چـاک و چۆنیەکی نۆرمـاڵ لەبەردەم دایکم لەگەڵ شـێرکۆدا چـووینە ژووری دانیشـتنەکەمان و پرسـیم ئەوە چـی ئەکەی و چی هێناتی بۆ ناوشـار؟ دواتـر پێم وت تەنهـا بۆ ئاگاداریت مــن لە ژێــر چــاودێریی دەزگــای ئەمــن دام. ئەمزانــی (خــونچە)ی ژنەدراوسـێمان کـاری سـیخوڕیی بـۆ ئەمـن ئەکـرد و یەکێکـیش لە کارەکانی چاودێریی من بوو. هەر کە بیبینیایە هاوڕێیەکم دێت بۆ لام، خۆی ئەکرد بەماڵدا و دەستی ئەکرد بە پرسـیار و مجامەلە. ئەو ژنە دواتـر لە ڕاپەڕیندا بەهـۆی دەستێکەڵی لەگەڵ ئەمندا کوژرا. بەڵام بۆ بەختـی ئـێمە ئەو ڕۆژە دیـار نەبـوو و پـێ ئەچـوو بەهـاتنی شـێرکۆی نەزانیبێت. بەهەرحاڵ شێرکۆ تێی گەیاندم کە بۆ کوشتنی "قالە فەرەج" هــاتۆتە نــاو شــارەوە. لە ســیاقی قسەکانیشــیدا وتیشــی لە دەرەوە خۆشـیان بە ئێـوە نایـات و لە چەنـد بۆنـەدا نـاوی تۆیـان هێنـاوە کە کەسێکی نەیاری بەسیاسەت و ڕێبازی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتیمانی و بەعێراقچیەکـان ناوزەدتـان ئەکەن. پاشـان هەواڵـی مـاڵی بـاوکی "ابو شــهابی" ئەنــدامی ســەرکردایەتیی کــۆمەڵەی لــێ پرســیم و وتــی ڕایسـپاردووم کە سـەرێکیان لـێ بـدەم. ڕاسـتیەکەی سـەرباری ئەوەی کە ماڵی "مام نەجمی باوکی ابو شهاب" هەر ١٠٠ مەترێک لەولامـانەوە بــوو، بەڵام پــێم نەووت وهاشــام کــرد کە بیــزانم. پــاش هەنــدێ قسەوباسی سیاسیی تر و کەزانیم چەکی پێیە پێم گوت: من وەکوو

هاوڕێیەک ئامۆژگارییەکی دۆستانەت ئەکەم کە بگەڕێیتەوە و دەست بۆ ئەو کارە مەبە بەتایبەتی لەبەر چەند هۆیەک.
پێم گووت: شێرکۆ گیان ئێرە کەرکووکە و زۆر جیاوازە لە شارەکانی تر، هەروەها تۆ شارەزاییەکی ئەوتۆت نیە لە بواری ئیغتیالاتی ناو شار و کەسێکی وەکوو قالە فەرەجیش یەکەم تەقە نەیکوژی و دەرباز نەبیت ئەوە ئەو کوشتووتی. جگە لەوەش تۆ تا گەیشتووی بە ئێرە حەتمەن چەند ماڵ و شوێنی ترت کردووە و ئەوەش خۆی ڕیسکە و کەس نازانێ باشن یا خراپن و پاشان پرسیم: شێرکۆ بەڕاستی پێم بڵێ کەس پێی زانیوی کە هاتوویت بۆ لای من؟ تەئکیدی کردەوە کە کەس بەهاتنمی نەزانیوە بۆ لای تۆ، بەڵام هەر سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی کارەکەی و وتی: لەناو کۆمەڵێکی زۆردا من بە ئارەزووی خۆم ئامادەیی گرتنەئەستۆی ئەم کارەم دەربڕیوە و ئێستا لام جوان نیە بەدەستی بەتاڵ بڕۆمەوە. گەرچی زۆر رەخنەم لەو عەقلیەتە سەرەڕۆیی و لەڕوودامانە گرت و پێشم وت: ئەوەی تۆی ناردووە زۆر نامەسئولانە ئەم کارەی کردووە بەتایبەتی تۆ کادرێکی خوێندەوار و بەتوانای لە ڕووی سیاسی و فکریەوە و بۆ کاری شیاوی تر گونجاوی.
زانیم قسە بێسوودە بابەتەکەم گوڕی و هاتینە سەر مناقەشەی ڕا و بەرنامەی من و بەنیازی چیم و بەوجۆرە تا دوای نانخواردنی شێوان بەڕێمکرد.
ڕۆژی دواتر لە دەوامی مەکتەب "بورهان سەعید" کە ئەویش کۆمەڵە و هاوڕێی پۆلم بوو یەکسەر هاتە لام و پرسی: خەبەری شێرکۆ چیە و هیچ ئاگاداری نیت؟ منیش وتم: لەوەتی ڕۆیشتۆتە دەرەوە ئاگاداری نیم و دامە باری نائاگاداری و ویستم نەچێتەوە بەلای بابەتەکەدا. بورهان وازی نەهێنا وپاشان وتی: شێرکۆ هاتۆتە ناو شار و پێموابوو هەر سەرێک لە تۆ ئەدات و منیش زۆر بێبایەخانە وتم بڕوا

ناکەم شێرکۆ بیتە شارەوە و بڕاندمەوە و بە بیانوویەکەوە بورهانم جێهێشت.

چەند ڕۆژی نەبرد کۆتایی مانگی ئایاری ١٩٨٠ بوو، پۆلی شەشەکان ئازاد کران کە نەیەنەوە بۆ قوتابخانە و خەریکی خۆئامادەکردن بن بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆریا.

ڕاستی لە کاتێکی ناخۆشدا ئەم بەزمەی هاتنەوەی شێرکۆم بۆ هاتە پێش. بە بیانووی خوێندنەوە ئەو ماوەیە خۆم دابڕی، بەڵام زۆر بە وردیش چاودێریی هەواڵی شێرکۆم دەکرد تا ڕۆژێکیان لە باخچەی قەڵا خەریکی خوێندن بووم "باهیری مەلا ڕەحیم" کە دوورە خزم و ئەویش پێموابێ قوتابیی شەش بوو هاتە لام وتی: ئاگاداری شێرکۆ حەمید گیراوە؟! گەرچی پێشبینیی ئەو هەواڵەم ئەکرد، بەڵام بۆ چرکەیەک تاسام، چونکە شێرکۆ هاوڕێیەکی زۆر بەوەفا و قەدیمی و ڕاستگۆ و تایبەت بوو کە لە (ابو غریب) پێی لێ نەئەبڕیم. لە زینداندا وامان ڕێکخستبوو ئەو ڕۆژانەی کەس و کارم نایەن بۆ مواجەهە ئەو هەفتەیە ئەو، کە لە پەیمانگای تەندروستی لە بەغدا قوتابی بوو، ئەهاتە سەردانم و کاتەکەمان هەمووی بە گفتوگۆ بەسەرئەبرد. جگە لە غەمی گەورەم بۆ ئەو کۆتاییە تراجیدیەی شێرکۆ ترسی ئەوەشم لێ نیشت کە منیش تێوەبگلێم، بۆیە ئیحسانی برام ئاگادارکردەوە کە مەسەلەیەکی وا ڕوویداوە و پێم وت من ئەڕۆم بۆ دهۆک بۆ لای باوکم، کە لە ١٩٧٥ بەدواوە لە کۆمپانیای نەوت دەرکرابوو ولەبری ئەوە گوێزرابۆوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی کارەبای دهۆک. ئەوەی باش بوو دەوامی قوتابخانە نەمابوو. ئیحسان وتی: تۆ بڕۆ و گەر شتێک ڕوویدا من دێم ئاگادارت ئەکەم و پاش نزیکەی ٢ هەفتە گەڕامەوە و دوای ماوەیەکی تر بیستم شێرکۆ لە زیندانی موسڵ چاوەڕوانی جێبەجێکردنی "سزا"ی لە سێدارەدانە.

ئیحسانی برام لە من بچووک تر بوو، کوڕێکی نەترس وجەربەزە و چاوکراوە بوو. پێموت: کە شێرکۆی هاوڕێم لە ژووری لە

سێدارەدان دایە لە مووسڵ و ئەمەوێ دوایین جار سەردانی بکەم. وتی: من بەسەیارەکەی خۆمان لەگەڵتدا دێم و ڕۆژی مواجهە ڕۆیشتین و بەپرسیار شوێنەکەمان دۆزیەوە. بینیمان لە بەردەم دەرگای سەرەکی زیندانەکەدا ژوورێکی بچووکی وەکوو سەیتەرەی لێیە و ئەبێ هەویەکەت دابنێیت پاشان ئەتکەنە ژوورەوە. بەئیحسانم وت: گەر هەویە دابنێم سبەی ئەمنی کەرکووک پێم ئەزانن و تووشی گێچەڵی گەورەم ئەکەن، بۆیە گەر نەمتوانی تۆ بڕۆ و بیدۆزەرەوە و مەسەلەکەی بۆ بگێڕەوە. لەو کاتەدا چووینە ڕیزەکەوە شڵەژاوی و قەرەباڵغیەک دروست بوو بە یارمەتیی ئیحسان فرسەتم بینی لە بەینی ژن وپیاوێکدا بێ ئەوەی هەویەکەم نیشان بدەم خۆم پیاکرد وئیحسانیش هەویەکەی پیشاندا و ڕێگەیاندا. کە چووینە ژوورەوە وەکوو حەوشێکی گەورە وابوو کە زیندانیەکان هەریەکە لە دەوری کەسوکاریان بەغەمباری و هەندێکیش بەگریانەوە کۆببونەوە. شێرکۆ ڕەنگی تەواو پەڕی بوو. دیاربوو بە تەنها کەسوکاری هاتبوون بۆ دیدەنی و باوکی بەهاتنی ئێمە خۆشحاڵ نەبوو و بواری قسەمانی نەئەدا و شێرکۆش تەنها ئەوەندەی وت: لە یەکێک لەو ماڵانەی کە گوایە چاوساغی بوون لە هاتنەکەیدا بۆ ناو شار، داویانەتە گرت.

هەر ئەو ڕۆژە من و ئیحسان پێکەوە گەڕاینەوە بۆ کەرکووک و کەس بە ڕۆیشتنەکەمانی نەزانی. دواتر لێم مەعلووم بوو کە شێرکۆی هاوڕێم لە سێدارە دراوە.

هەرچی چۆنێک بوو و بە هەر غەمێکەوە بێت ئەو کۆستەشم تێپەڕاند و بە دوای ئەودا یەکسەر تاقیکردنەوەکان دەستیان پێکرد. من لە بەشی ئەدەبی بووم و نمرەکانم باش بوون، بۆیە دامنابوو لە زانکۆی بەغدا بۆ ئادابی ئینگلیزی یا کۆلێجی ئابووری خۆم ناونووس بکەم. هێشتا فۆرمم پڕنەکردبۆوە سەردانێکی سلێمانیم کرد و چاوم بە زیندەیاد "جەبار مستەفا"ی کۆنە هاوڕێی زیندان و ئیلهامبەخشی فکری و سیاسیی ئەوکاتەی من و زۆرێک لە هاوڕێکانم کەوت کە

دواتـر بـۆ چەنـدین سـاڵ بـوو بە لێپرسـراوم لە ڕێکخـراوی (یەکێتیـی تێکۆشانی کارگەران). لەگەڵ جەبـاردا، جگە لە زۆر بـابەتی سیاسـی و فکری، ئاگادارم کرد کە بەنیـازم لە فۆرمی پێشکەشکردن بـۆ زانکۆدا تەنهـا کـۆلێجی ئـابووری و ئـادابی ئینگلیزیـی بەغـدا بنووسـم وچـونکە نمرەکـانم باشـن بـێ هـیچ گرفتێـک وەرئەگیـرێم. جەبـار خۆشـی تـازە کــۆلێجی ئــابووریی زانکــۆی موستەنســریەی تەواو کردبــوو. ئەو پیشــنیاری کــرد کە بچــمە کــۆلیجی یاســا و لە ڕووی ڕێکخراوەیــی وسیاسـیەوە بـۆ ئێمە وا باشـترە. پـاش چەنـد هێنـان و بردنێـک هـاتمە سـەر ڕاکەی ئـەو. پاشـان ئەو وتـی: چەنـد کەسیشـت پـێ ئەناسـێنم کە یەکێکیــان (قــادر حــەمەجان) بــوو کە ڕۆژی دواتــر یەکمــان بینــی و ئەوکـاتە ئەو لە سـێی قـانوون بـوو. هەر جەبـاریش ڕای سـپاردم کە (عـەلی سـمایل) کە ئەویـش لە بەشـی سیاسـەی هەمـان کۆلێژ قوتـابی بوو بناسـم و ئەوانـی وەکوو کەسـانی مارکسـی پێم ناسـاند. هەر لەو سـەفەرەی سـلێمانیدا تەعـاروفم کـرد لەگەڵ "نەجـاتی مهنـدس"دا، کە چەند ساڵ دواتر و تا گیان لەدەسـتدانی بـووین بەنزیکتـرین هـاوڕێ و هاوسەنگەر.

## ساڵانی زانکۆ و بەغدا

لە چەنـد ڕوویەکەوە زانکـۆ بـۆ مــن فرســەتێکی زۆر بــاش بــوو. گرنگترینیـان ئەوە بـوو لەبەرچـاوی ئەمنـی کەرکـووک ونبـووم. جگە لەوە، ئەو سەردەمە لە عێراقدا، کۆلێجی یاسا تەنها لە زانکۆی بەغدا هەبوو، بۆیە ئەوێ شوێنێک بوو کە قوتابیی لە هەموو شارەکانەوە بۆ ئەهـات. تایبەتمەنـدییەکی سـاڵانی هەشـتاکانی عێـراقیش ئەوە بـوو کە زانکۆکان مەڵبەندێکی چڕی چالاکیی سیاسی وفکری بوون. هەڵگرانی بیروباوەڕی جیا ولایەنگرانی هێزی سیاسیی جۆراوجۆر لە زانکۆدا هەبــوون. لە نەتەوەی جیــاواز وشــاری جیــاواز و تەنــانەت لە زۆر وولاتی ترەوە قوتابی ئەهاتنە بەغدا بۆ خوێندن، بۆ نموونە ئوردونی، فەڵەستینی، میسری، سودانی، ئەریتری و مۆریتانی و تەنانەت چینیش بـۆ فێربـوونی زمـانی عەرەبـی دەهـاتنە کۆلێجەکـانی زانکـۆی بەغـدا. قوتابیی کۆلێجەکانیش سـەردان و هـاتوچۆ و دۆسـتایەتی لە نێوانیانـدا هەبوو.

وەکـوو لە دواییـدا بـۆم دەرکەوت دیـار بـوو کە ئەمنی کـۆلێجی یاسـا ئاگـادارنەکرابوونەوە لەوەی کە مـن پێشـتر زینـدانی سیاسـی بـوومە و ئەوەش زیاتر دەستی کردمەوە بۆ جموجۆڵ.

هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە ئەتووت وەکوو نوێنەری هێزێکی سیاسـی بە ئەرکێکـی ڕێکخراوەیـی بـۆ زانکـۆ نێـردراوم. ئەو سـەردەمە جموجـۆڵی سیاسـی و فکـری لە زانکـۆی بەغـدا زۆر بەهێزبـوو. لە کـۆلێجی یاسـا کەسـانی شـیوعی، کۆمەڵە، تـاکوتەرایەکی نزیـک لە پـارتی و لایەنگـری پاســۆک هەبــوون و دوای مــاوەیەک ئەو لایەنگــریە سیاســیانەم بــۆ

دەرکەوت. بـۆ خـۆمیش کەوتـمە جموجـۆڵێکی سـەرەتایی و ناسـین وتەعـاروفی نـاو پـۆل و کـۆلێج. لە بەشـی (سیاسـة) عـەلی سـمایلم دۆزیەوە کە پێشـتر جەبـار بـۆی وەسـف کردبـووم و بیسـتبووم کە خزمـی کـوڕێکی کـۆمەڵە بـوو کە هاوبەنـدیمان بـوو لە (ابـو غریـب) بەناوی "فەقێ عوسمان جەرجیس" کە دواتر لە پێشمەرگایەتی یەکێتیدا بـوو بە قوربـانی. هەر لە ڕێـی کەسـێکی تـری کـۆمەڵەوە لە گرووپـی زیندان لە هەولێر لە هاوینی سـاڵی پێش دەسـتپێکردنی دەوامـی زانکۆ لە بەغـدا کە نـاوی شـێخ قـادر بـوو تەعریفـی ئەیـاد نـامیقی بـۆکردم و وتـی: ئەویـش لە هەمـان کـۆلێج وەرگیـراوە خـراپ نـیە بیناسـیت. جگە لەوەش لە چوارچێـوەی پەیوەنـدیەکانی خـۆم لە کوردسـتاندا نـاوی "مەمەنـدی بـایز ئاغا"یـان بـۆ هەڵـدابووم کە بیناسـم و پەیوەنـدیی سیاسیی لەگەڵدا دابمەزرێنم، عەلی و مەمەند لە سـاڵی دووەم بـوون و زۆر یارمەتیان دام و چاوساغیەکی باشیان بۆم ئەکرد. لە مـاوەیەکی کەمدا توانیمان دۆستایەتیەکی نزیکی ئەوتۆ دابمەزرێنین لە نێوان من و مەمەنـد و عـەلی و ئەیـاددا کە زۆر خێـرا زەمینەیەکـی پـتەوی هـاوفکری و بۆچـوونی سیاسـیی هـاوبەش بنیـات بنێـین. دواتـر پەیوەندیەکە لەوەش ترازا و ئێمە بووین بە یەکێک لە گرووپە چالاک و خـاوەن بۆچوون و هەڵوێسـتە دیارەکـانی نـاو چەپەکـانی ئەو چەند سـاڵەی ژیـانی زانکۆمـان. پـایە و بـابەتی سـەرەکیی نزیکایەتیەکەمـان ڕوانگەی ڕادیکاڵی ئێمە بوو بۆ مارکسیەت و ئەو تێز و بنەما سیاسـیە شۆڕشـگێڕانەیە بـوو کە بووبـوو بـە شـوناس و خەسـڵەتی جیاکەرەوەمـان. کـۆڵەکەیەکی تـری پەیوەنـدیەکانمان بریتـی بـوو لە تەرویجـدان بە بیـری مارکسـی و هانـدانی دەوروبەرەکەشـمان بـۆ ڕووکـردن بەرەوە خوێنـدنەوەی کلاسـیکی مارکسـیەت بەتـایبەتی و فراوانکردنـی فکـری سیاسـی بەگشـتی و پێکهێنـانی ئەڵقەیەکـی تـری فراوانتر لە دەوری ئەو ئەڵقە سەرەکیەی خۆمان. بازنەی کاریگەریمان تا ئەهـات فراوانتـر ئەبوو. چەندین قوتـابی دەورەکـانی ئەوکـات پرس

وڕایان بە ئێمە ئەکرد کە چی بخوێننەوە و کامە سەرچاوە و نووسەر باش و بەکەڵکە. کۆڕی گفتوگۆی فکری و سیاسیمان بردبووە ناو بەشە ناوخۆییەکانی قوتابیان. پەیوەندیی دۆستانەمان لە کۆلێجەکانی ئیدارە و ئابووری، ئاداب، هەندەسە، وعلوم وتەکنۆلۆجی وئەکادیمیای هونەر و چەندین پەیمانگا و جێی تردا پەیدا کرد و پەرەمان پێدا. لەگەڵ شیوعیەکاندا سەرباری هاوڕێتی و گفتوگۆ، زۆرجاریش بەریەککەوتن لە هەڵوێستی سیاسی و خوێندنەوەی جیاوازمان بۆ ئەهاتەپێش. لە گەڵ لایەنگرانی کۆمەڵەدا بە گشتی پەیوەندیمان دۆستانە بوو و ئەو سەردەمە هێشتا کۆمەڵە هێزێکی شۆڕشگێر و چالاک بوو.
"کامیل عمر امین" کە ئێستا بە حاکم کامیل ئەناسرێ کەسێکی چالاک و بەهەڵوێستی مارکسی و دۆستی نزیکمان بوو. "ئازاد حەمەسەعید" کە قوتابیی بەشی (سیاسة) بوو دۆستی نزیک و هاوڕێم بوو ولەناو شیوعیەکاندا بۆ خۆم نزیکترین پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبوو. شیوعیەکان چ ئەوانەی کۆلێجی یاسا یا ئەوانەی کۆلێجەکانی تر، ئێمەیان بە گرووپێکی ڕادیکاڵ و توندڕەو ومونافسی مارکسی خۆیان ناوزەد ئەکرد و بە گشتیش ناومان وا ڕۆیشتبوو. ئێمە لەوسەردەمەدا هەڵگری ڕادیکاڵترین تەفسیر و ڕەوتی مارکسی بووین و ئەو ناوە لەخۆوە پێمانەوە نەچەسپابوو و بڕێکی باش لە ڕاستیی تیابوو. بەکورتیەکەی هێندەی سەرقاڵی خوێندنەوە و باسی کێشە و جەدەلە فکری و سیاسیەکانی ئەو سەردەمە و پەیداکردنی نفووزی سیاسی بووین دەیەکی ئەوە وزە و تواناما‌ن بۆ خوێندنی بابەتەکانی کۆلێج تەرخان نەدەکرد. کتێب کڕین و گەڕان بە دوای سەرچاوەی سیاسی و فکریدا ببوو بەخولیایەکی وا کە کەم کتێبخانەی بەغدا هەبوو نەک هەر نەیزانین، بەڵکوو هەندێکیان ببون بە ناسیاومان و ئەیانزانی بۆ چی ئەگەڕێین و زۆر جار سەرباری ئەوەی کە خوێنەری ئەوجۆرە باسانە ببونە جێی چاودێری، بەڵام خاوەنی کتێبخانەکان خۆیان ئەو

جـۆره سـەرچاوەیان بـۆ هەڵئەگـرتین یـا ئەیانـدۆزیەوه و بەگشـتیش متمانەیـان زیـاتر بـوو بە قوتـابیی کـورد کە لە ڕووی ئەمنـیەوه مەترسیان نیە.

"عبدالوهاب سابیر" هاوڕێیەکی تری سـەردەمی خوێندنم بوو کە دوو ساڵ لە پێش منەوه قوتابیی کۆلێجی یاسا و ڕامیاری بوو. ئەو خەڵکی سـلێمانی و مارکسیسـتێکی ئەرسـەدۆکس بـوو و پێمـوابێ کەسـی یەکەمـی گرووپـی (خەبـاتی سـوور) بـوو. ئەم گـرووپە زۆر بچـووک و کەمتر ناسرابوون و ئەوانەی مێژووی بزووتنەوەی مارکسـی و چەپـی کوردسـتانییان گێـڕاوەتەوه کەمتـر باسـیان کـردووه. هەر لە سـاڵی یەکەمەوه و بە دەسپێشـکەریی ئەو، پەیوەنـدیەکی هاوڕێیـانەی نـزیکم لەگەڵیدا هەبوو. چەند جارێک بۆ گفتوگۆ سەردانی بەشە ناوخۆیەکەی ئەوم کرد و شەوان لای ئەمامەوه، لە یەکێک لەو شـەوانەدا سـەبارەت بە نـامیلکەیەک گفتوگۆمـان کـرد کە پێشـتر بـۆ خوێنـدنەوه لـێم وەرگرتبـوو. نـامیلکەکە باسـێکی گـرووپەکەی ئەوان بـوو کە پێئەچـوو هەر خۆشـی نووسـیبێتی سـەبارەت بە بـارودۆخی بـزووتنەوەی کۆمۆنیسـتی و ئینحرافـاتی حیزبـی شـیوعی و پێویسـتی بنیاتنـانی ڕێکخراوێکـی چەپـی شۆڕشـگێڕ. یەک دوو جـاریش لە سـلێمانی سەردانیم کرد و ماڵیان لە مامۆستایان بوو. عبدالوهاب کوڕێکی ئـارام و خـاوەنی ڕۆشـنبیرییەکی زۆر بـوو لە بـواری مارکسـیزمدا. ئەو هـاوڕێیە سـاڵی ١٩٨٢ خوێندنی تەواو کرد و ڕۆیشـتە سـەرکردایەتیی یەکێتی و لەوێ مایەوه تـا لە هـاتوچۆی نێوان ئێران و گەڕانەوەی بۆ شـارەکانی کوردسـتانی عێـراق لە سـاڵی ١٩٨٥دا لە بـارودۆخێکی نادیاردا لەلایەن ئەمنەوه گیرا و لەسێدارە درا.

سـاڵی یەکەم لە بەشـی نـاوخۆیی (صـدر القنـاة) بـووین لەگەڵ عـەلی سـمایل و ئەیـاد نـامیق و "جەمـال غەمبـار" و کـۆمەڵێکی زۆری تـر لە هاوپۆلەکانمـدا. مـن لە ژوورێکـدا بـووم لەگەڵ هەریەکە لە "محەمـەد مستەفا" و "ابراهیم سپینداری" کە خەڵکی دەوری ئامێدی بوو. لەنێو

کۆمەڵێک قوتابیدا ببوم بەمەرجەعێک بۆ مەشوەرەت لەسەر کتێب و جۆر و نووسەرەکانیان. ئێوارانی دوای دەوام ئەڕۆیشتین بۆ سەعدوون و باب الشرقي والمتنبي بۆ کتێب کڕین و کە ئەگەڕاینەوە بەکۆڵێک کتێبەوە خۆمان ئەکردەوە بە داخلیەکەماندا. کار گەیشت بەوەی چەندین قوتابی لە دەرەوەی هاوڕێیانی گرووپەکەی خۆمان تەکلیفیان ئەکرد کە لە گەڵیاندا بڕۆم بۆ نیشاندان و تەوسیەکردنی ئەو کتێبانەی بەباشم ئەزانی تا ئەوان بیکڕن. ئەوە بۆ من باشترین فرسەت بوو بۆ ئاراستەکردنیان بەپێی عەقلیەتی سیاسی و فکریی خۆمان و زۆربەی کات بە خۆشحاڵیەوە ئەچووم بەدەنگیانەوە، چونکە ئەوە هەر ئەوەبوو کە من خۆم بەدوایدا ئەگەڕام و وا بە پێی خۆی هاتۆتە بەردەرگاکەم.

ئێوارانێک کوڕێکی هاوپۆلم کە خەڵکی هەولێر بوو بە ناوی "احمد حسن بابکر" ڕووی لێ نام کە لەگەڵیدا بڕۆم بۆ سەعدوون بۆ کڕینی کتێب. گەڕەکی سەعدوونی بەغداش هەم زۆر دووربوو لێمانەوە وهەم ئەو ڕۆژەش زۆر ماندووبووم و دیار بوو ئەویش هەر ئەیویست ئەو ڕۆژە بڕۆم لە گەڵیدا بەڵام من داوای لێبووردنم کرد، چونکە بەڕاستی زۆر ماندووبووم.

پێ ئەچوو ئەحمەد تازە فێری خوێندنەوەی کتێب بووبێ و تێگەیشتنێکی کاڵ وکرچی لەسەر مارکسیەت هەبوو، بەڵام زۆریش پێی سەرسام بوو وتا بڵێی کوڕێکی پاک و بێگەرد و مەعدەنێکی خاوێنی هەبوو. ئەو هەندێ ئێوارانیش بەشدارەی کۆڕەکانی ژوورەکەی ئێمەی دەکرد و گوێی لە گفتوگۆکانمان ئەگرت. بەهەرحاڵ ئەحمەد ڕۆیشت و بۆ شەو بەکۆمەڵێک کتێبەوە خۆی کرد بەژوورەکەی ئێمەدا تا نیشانی منی بدات. هەر کە کتێبەکانم بینی سەرم سووڕما!! ووتم: ئەحمەد ئەمانە چین کڕیوتن؟ وەڵامی ئەوە بوو کە ئەویش ئەیەوێ شارەزایی پەیدا بکات و پرۆسەی خۆرۆشنبیرکردن دەست پێ بکات. منیش ووتم: زۆر باشە... بەڵام

کوڕی خوا ئەمانە کەی بابەتی ئەوەن؟!!؟ کتێبێکیان ناوی (خطف الطائرات) واتە ڕفاندنی فڕۆکە بوو!! یەکێکی تریان (رحلة الی مجاهل افریقیا) واتە گەشتێک بۆ شوێنە نادیارەکانی ئەفریقیا، وباش بوو کتێبەکەی جۆرج پۆلیتزەریشی کڕیبوو سەبارەت بە فەلسەفەی مارکسی. ئەو وا تێگەیشتبوو هەرچی تووندڕەوەی و کارشکێنی و ئیشی نایاسایی وەکوو ڕفاندن وتێکوپێکدان و کاری لەو چەشنە هەیە ئەچنە خانەی مارکسیزمەوە! لە دڵی خۆمدا وتم: جا وەرە ئەمە بهێنە سەر ڕوانگە و فکرێکی سەلیم و تەفسیرێکی دروست و پایەدار لە سەر مارکسیەت و تیۆری و فکری سیاسی.
هەر لەو سەروبەندەدا ولە هەمان بەشی ناوخۆیی کوڕێکی خەڵکی قەڵادزەمان لەگەڵدا بوو بەناوی بابەکر کە لەگەڵ جەمال غەمباردا لەیەک ژووردا بوون. دیار بوو بابەکر زۆر سەروکاری لەگەڵ خوێندنەوە دا نەبوو، بەڵام حەزی بە تێکەڵی ئێمە بوو. شەوێکیان لە ژوورەکەی ئێمە گفتوگۆ دامەزرا و من چەند جار وشەی (پرۆلیتاریا)م لە سیاقی قسەکانمدا وتەوە و بابەکریش تەنها سەرنجی لەسەر ئەو وشەیە بوو و لەسەریەک ئەیپرسی: پرۆلیتاریا یانی چی؟ منیش لە گەرمەی قسەکردندا بووم و لاشم سەیر بوو کە قوتابییەکی یاسا ئەوە نەزانێت و نەشمئەویست گفتوگۆکە بۆ وەڵامدانەوە و شەرحی ئەوە ببڕم یەکسەر بۆ گاڵتە وتم: پرۆلیتاریا یانی ناتری حەمام!! تومەز بابەکر ئەو وەڵامەی بەجدی وەرگرتووە شەوێکیان میوانی کوڕێکی خاڵی ئەبێت لە مەعهەدی تەکنۆلۆجی لە بەغدا و ئەوانیش وەکوو ئێمە مناقەشەیان گەرم ئەبێ ولە قسەکانیاندا باسی پرۆلیتاریا دێتە پێشەوە. بابەکریش ئەیەوێ بەشداریی گفتوگۆکە بکا و کوڕی خاڵەکەشی ئەزانێ بابەکر ئاشنای ئەم باس وخواسانە نیە ئەڵێ: وازبێنە بابەکر هەر گوێ بگرە، و ئەویش تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: بۆ پێتوایە من نەزانم؟ ئەویش ئەڵێ: بڵێم چی، و بابەکر ئەڵێ: کوڕی باش بۆ نازانم پرۆلیتاریا یانی چی و باسی چی ئەکەن؟ ئەویش ئەڵێ

دەی پرۆلیتاریـا یـانی چـی و کە بـابەکر ئەڵـێ پرۆلیتاریـا یـانی نـاتر کــورەکە ئەداتە قاقــای پێکەنینێکــی زۆرو ئیتــر بـــابەتەکەش تەواو ئەگۆڕێت.

مـن ڕاپـۆرتی کـارو چالاکیەکـانی خـۆم بە زارەکـی ئەگەیانـد بە جەبـار مستەفا کە لێپرسراوم بوو چی لە کاتی چوونم بۆ سلێمانی و چی لە کاتی هاتنی ئەو بۆ بەغدا.

سـاڵی ١٩٨٠ یەکەمـین سـاڵی خوێنـدنم لە زانکـۆ تەواو کـرد. ئەو مـاوە سـەرەتاییەم لە بەغـدا لەڕووی سیاسـیەوە پـڕ دەسـکەوت بـوو وبـۆ خۆشم قۆناغێکی تری تێ هەڵچوونەوەیەکی چڕ و پڕ و ڕێکخـراو بـوو بە چالاکیی سیاسی. ئێستا تیمێکی چـالاک و بەتوانـای ڕێکخراومـان لە کۆلێجی یاسا هەیە. تۆڕێک پەیوەنـدیی سیاسـیی تـری فراوانیشـم هەیە چ لە ناو قوتابیانی هەمان کۆلێج یا لە کۆلێجەکانی تری زانکـۆی بەغدا و پەیمانگاکـان. ڕاسـتیەکەی یەکێـک لەو پرسـانەی ببـوو بە خولیـام دۆزینەوە و ڕێکخستنی کەسانی مارکسـی دیکە بـوو لە نـاو قوتابیـانی غەیری کورددا، چونکە ئێمە بە ناو ڕێکخراوێکی سەرتاسەریی عێراقـی بووین، بەڵام بڕواناکەم هـیچ ئەنـدامێکی جگە لە کـورد لە ڕیزەکانمانـدا هەبووبێت.

هەر سـێ یـا چـوار هەفـتە جارێـک ئەگەڕامەوە بـۆ کەرکـووک و لە یەکێک لەو جارانەدا ماڵەوە ئاگاداریـان کـردمەوە کە دیسـانەوە مـوفقی مفەوەز ئەمن هاتووە بەدواتا و پێمان وتوە ئەو لە بەغدا ئەخوێنێت و بە مــاڵەوەی ڕاگەیانـدبوو هەر کە هــاتەوە بینێـرن بـۆ ئەمنـی کەرامە. منیش هەر ئەو ڕۆژە سۆراغێکی هاوڕێ و هەواڵی شارم کـرد و دڵنیـا بــووم کە شــتێکی ئەوتــۆ بە پەیوەنــد بە مــنەوە ڕووی نەداوە، ڕۆژی دواتر ڕۆیشتم بۆ ئەمنی کەرامە کە لە بەرانبەر قەڵای کەرکووک بـوو لای فــولکەکەی بەردەم ســینمای خەییــام بەدیــوی ئیمــام قاســمدا. پرسـیاری مـوفقم کـرد و ئەویـش هـات و دیسـانەوە بـردمیەوە بـۆ لای عبــدالرزاق و ئەویــش بــردمیە ژوورێــکەوە و دەســتی کــردەوە بە

پرسیاره تەقلیدیەکانی چی ئەکەیت و خەریکی چیت و منیش وەڵامم دانەوە. پاشان لەسەر مێزەکە کاغەزێکی دایەدەستم و وتی: ئەوەی لەو کاغەزەدا نووسراوە بە دەستوخەتی خۆت و بە ڕەوانی لە سەر ئەو کاغەزەی تر بینووسەرەوە. هەستمکرد کە بەڕاستی ئەیانەوێت هەم بۆیان دەربکەوێت کە ئایا ئەو کاغەزەی دەستیانکەوتووە و خاوەنەکەی ناناسن هی منە یان نا و جگە لەوەش ئەوەی زیاتر تووشی دڵەڕاوکێی کردم ئەوە بوو کە دواتر ئەوە بەسەر مندا ساغبکەنەوە، چونکە نووسراوە ئەسڵیەکەش بە دەست نووسرابوو. ووتم باشە و دەستمکرد بە نووسینەوەی بێ ئەوەی بەهیچ جۆرێک خەتی خۆم بگوڕم، چونکە لە پێشەوە لەوە دڵنیابووم کە ئەو کاغەزە هی من نیە.

به ناوەڕۆکی نامەکەدا کە پێ ئەچوو لە ئەسڵدا دوو لاپەڕە بووبێت و ئەوان تەنها لاپەڕەی یەکەمیان نیشانی من دابێ، چونکە بابەتەکە نووسراوەیەک بوو زیاتر لە ئەدەبیات و بەیاننامەی کۆمەڵە ئەچوو کە بەدەسخەت ئەم نوسخەیەی لەسەر گیرابێتەوە. پێش ئەوەی لاپەڕەکە تەواو کەم وتی: باشە بەسە، منیش پێش ئەوەی بیدەمەوە دەستی وتم: ئەتوانم لە سەری  بنووسم کە ئەمە بە حوزووری تۆ و لەم دائیرەیە نووسراوە؟ وتی: بینووسە و بەرواری ئەمڕۆشی لەسەر بدە و لەخواریشەوە ئیمزای بکە. ئەوە هەندێ لە دڵەڕاوکێکەمی کەمکردەوە و جگە لەوەش هەستم کرد ئەوە خاڵێکی پۆزەتیڤە کە دەزگای ئەمن گومانی ئەوەیان لەسەرم هەبێ کە لایەنگری کۆمەڵە بم، چونکە ئەوە هەم دەری ئەخست کە ئەوان بیروباوەڕ و هەڵوێستی سیاسیی منی پاش زیندان نازانن و هەمیش ئەوان لە شوێنێک و بە شوناسێکی سیاسی و ڕێکخراوەییەوە بۆ من ئەگەڕێن کە من نەک پەیوەندیی ڕێکخراوەیی بەڵکوو هیچ سۆزێکی سیاسیشم بەرانبەری نیە. ئەڵبەتە سالانێک دواتر بەوەم زانی کە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هێندە ناوی کەسانی نەیاری سیاسیی خۆیان لەناو کادر و

پێشمەرگەدا لە دەرەوە بەئەنقەست بەدناو ئەکرد و وێنەیەکی خراپ و ناحەزیان لەسەری ئەگێڕایەوە کە دواتر لە کاتی تەسلیم بوونەوەدا پێشمەرگە و لایەنگری ئەوان گەر بانگ کران بۆ لێکۆڵینەوە لە لایەن دەزگـــای ئەمـــنەوە و لە وەلامـــی ئەوەدا کە چـــی ئەزانێـــت و چ مەعلوومـاتێکی هەیە نـاوی ئەو جـۆرە کەسـانە بـدەن بە ئەمـن کە ناویانی وەکوو نەیاری یەکێتی بەرگوێ کەوتووە. بەڕاستیش خۆم چەنـد سـاڵ دوای ئەوە ئاگـاداری حـاڵەتێکی وابـووم کە کـادیرێکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە کەرکووک کە قوتابی زانکۆی تەکنۆلۆجی بەغدا بوو ببوو بە ڕەخنەگری سەرسەختی ڕێبازی یەکێتی بوو بەو داوەوە و تەنها بە وریایی خۆی لە لێکۆڵینەوەی ئەمندا ڕزگاری بوو.

ناوەڕۆکی بەیاننامەکەش کە بە کوردی نووسرابوو شتێکی تەحریزی بـــوو لە دژی پەرەســـەندنی داپلۆســـین و دیکتـــاتۆریەتی ڕژێـــم و تەرکیزیشی کردبووە سەر تەعریب و تەبعیس لە کەرکووک و بەوەدا گومـانم بـۆ ئەوە چـوو کە هـی ڕێکخـراوی نـاو شـاری کەرکـووکی کۆمەڵە بێت، چونکە لە شوێنێکیشدا ووشەی (کەرکووک)م تیا بەدی کـرد. بەهەرحـاڵ پاشـان عبدالرزاق بەهەڕەشـەوە وتـی: ئێمـە ئەوانە ڕەوانەی (الادلة الجنائية) دەکەین بۆ فەحسی ورد تا بزانین تۆ دەستت لەگەڵ ئەم گـرووپە هەیە یـان نـا و ئیتـر ئیزنـی دام بـڕۆم. دواتـر کە هەواڵەکەم بـۆ چەنـد هـاوڕێیەکی نزیکـی خـۆم گێـڕایەوە و بـۆ گـاڵتە ئەمووت من لەناو ئەمندا بەیانی کۆمەڵە ئەخوێنمەوە!

دەوروبەری مانگی حوزەیران کە دەوامی زانکۆ تەواو بوو گەڕامەوە بۆ کەرکووک. هێشتا ساڵێک تێ نەپەڕیبوو بە سەر کودەتاکەی صدام بەسەر (احمد حسن البكر)دا. ڕەوتی دیکتاتۆریەت و سەرکوتی توونـد هەمـوو عێراقـی داگرتبـۆوە. زیـاتر لە سـاڵێک بـوو کە بەرەی نێـوان بەعـس و حیزبـی شـیوعیی عێـراق هەڵوەشـابۆوە و صـدام و ڕژێـم پەیوەســـتبوونی حیزبـــی شـــیوعییان بە بـــزووتنەوەی چەکـــداریی کوردستانەوە کردبوو بە بیانوویەکی باش کە شەپۆلی ڕاونـان وگـرتن

و کوشـتن لە هەمـوو عێراقـدا ببـاتە ئاسـتێکی کەم وێـنە. گەر جـاران بەهۆی بوونی حیزبی شیوعیەوە و لە پەنای ئەودا دەریچەیەکی تەنگ بـۆ نەفەسـێکی ئـازادانە یـا جۆرێک لە جموجـۆڵ لە ژێـر بیـانووی ئەو هاوپەیمـــــانیەدا بـــــوونی بووبێـــــت، ئەوا ئێســـــتا بە پـــــێچەوانەوە هەڵوەشـــــاندنەوەی ئەو هاوپەیمـــــانیە لە ١٩٧٩ بەدواوە بـــــووە بە بیانوویەک بۆ گرتنەبەری سیاسـەتی کوشـت وبڕی هەمەلایەنە و ئیتر تەنـانەت خوێنـدنەوەی کتێبێکـی مارکسـی یـا گرتنـی لە ماڵانـدا ببـوو بە بەڵگە و بیـانوویەک بـۆ ڕاپێچکردنـی ئەو کەسـە بـۆ کـونە تاریکەکـانی گــرتن و ئەشــکەنجە. ســـەرانی بەعـــس لە دوای ڕووخـــانی ڕژێـــم ئەگێـڕنەوە کە بەفەرمـانی خـودی سـەددام حسـین لە نێـوان سـاڵانی ١٩٧٧-١٩٧٨ و هەڵوەشـانەوەی بەرە لەگەڵ شـیوعیەکان و لێـدان لە حیزبــی شــیوعیدا، ڕێنمــایی بە دەزگاکــانی ئەمــن دراوە کە ڕێــگە بە سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی بدەن کە بەسەلامەتی عێراق جێ بهێڵن تـا دواتـر توونـدترین تـۆڵە لە ئەنـدامان و کادرەکانیـان بکـرێتەوە و ئەوەبوو گەورەترین قەسابخانەیان لە دژی شیوعیەکان ئەنجامدا.

ئەو فەزای گرتن و ڕاونانەی کە هەموو کونج و کەلەبەرێکی عێراقی گرتبۆوە بۆ بزووتنەوەی تازەکاری چەپی ئێمە دژواریی تایبەتی خۆی هەبوو. ئیتـر تـا دەهـات نـاکۆکی نێوان خەڵـک بە هەمـوو بیروبـاوەڕ و ڕەوتە سیاســیەکانی نــاویەوە لە لایەک ولەولاشــەوە ڕژێــم کە ئیتــر کورتکرابۆوە بۆ دەیان دەزگای سـەرکوت و کوشـتار، پەرەی ئەسـەند. کوردسـتان لە سـایەی بەعسـدا لە جـاران خراپتـری لێهـات و بـوو بە ئۆردووگــایەکی ســـەربازی و ئەمنـــی گەورە. ئەو جـۆرە بـارودۆخە سیاسیە کە زیاتر لە وڵاتانێکدا دێنەپێش کە حیزبە تۆتالیتارەکان تیایـدا لەسەرکارن، ئەو سەردەمە لە عێراقدا زۆر بەزەقی ئەبینـرا. سـەرباری جیـاوازی کـات و شـوێن، عێراقـی ئەودەمە زۆر لە وڵاتـانی ئەوروپـای ڕۆژهەڵاتی سۆسیالیستی سەردەمی دەسەڵاتدارێتی سـتالینیزم ئەچـوو کە چۆن ئەژدیهای تۆتالیتاریەت و حیزبی (قائد) خۆی بۆ سـووتاندنی

سـەراپای وڵات ئامـادە ئەکـرد وهـاواری ئەکـوژم ئەبـڕم ببـوو بە سـەدایەک کە بـۆ هەمـوو کەسـێک دیـاربوو کە وەیشـوومەیەکی نـوێ بەڕێـوەیە کە زۆر جیـاوازە لەو سیسـتمە کلاسـیکیەی سـەرکوت و داپڵۆسـین کە پێشـتر تـاقیکراوەتەوە. فەزای سـەرەتای هەشـتاکانی عێراق لە سایەی دەسەڵاتداریتی (صدام)دا لەو چەشنە بوو. هەموو چاوەڕوانی موغامەرەیەکی گەورەبـووین. هەمـوو ئەمـانزانی کە ئەم دێو و جانەوەرە نوێیە، لەو چوارچێوەیەی تا ئێستایدا جێی نابێتەوە و تەنها کوشتار و خوێنڕێژیی ناوخۆی عێراق، هەوەسی دڕندەیی و تینوێتیی ئەو تێر ناکات و بەزمێکی تر بەڕێوەیە.

هەر شـیکردنەوەیەک سـەبارەت بە تایبەتمەنـدیەکانی دەسـەڵاتداریتی سیاسـی عێـراق لە هەشـتاکاندا، لەسـەر یەک پـێ ئەوەسـتێت گەر، کاراکتەری صدام حسین وەکوو لایەنێکی سەرەکیی شیکردنەوەکەی نەهێنێتە ناو باسەکەوە. جێ پەنجەی صدام وجۆری کەسایەتیی ئەو لە هەمـوو بڕیـار و وەرچەرخـانە چـارەنووس سـازەکانی عێراقـی هەشتاکاندا زۆر بەزەقی دیارە.

صلاح عمر العلي دۆستی نزیکی صدام و هاوڕێی سەردەمی لاویی ئەو و ئەنـدامی ڕابەریـی بەعـس بـوو. ئەو دواتـر لەدەسـتی صـدام دەربـازی ئەبـێ و بـۆ بەریتانیـا ڕائەکـات. لە گفتوگـۆیەکی دا لەگەڵ (غسـان شـربل)ی ڕۆژنامەنووسـی نـاوداری لوبنـانی ئەڵـێ: (صـدام لە زینداندا کتێبەکانی لینین و ستالینی ئەخوێندەوە. ستالینی زۆر خۆش ئەویسـت. صـدام بـڕوای بە شـتێک نەبـوو نـاوی دۆسـتایەتی یـا هاوپەیمـانی بێت. ئەو تینـووی دەسـەڵات بـوو. لە پێنـاوی دەسـەڵاتی خۆیدا ئەوەی لا گرنگ نەبوو چەند خوێن دەڕێژێت. گاڵتەی بە شتی وەکـوو میـانڕەوی و نێـوانگیری دەهـات. ئەو بـڕوای بە یەک شـت هەبوو: یا قەسر یا گۆڕ 'القصر او القبر')! العراق من حرب الی حرب، صدام مر من هنا. غسان شربل. ص ١٤٨ - ١٤٩

له وەڵامی ئەوەدا کە ئایا صدام متمانەی بە میشێل عەفلەقیش نە ئەکرد؟ صلاح عمر العلي ئەڵێ:( صدام شەریکێکی نەدەویست جا هەر ناوێکی هەبێت. ئەو خاوەنی خوویەکی تاکڕەوانەی کوشندەی بێ وێنە بوو. من پێموایە تەنانەت هیتلەریش پرس و ڕای بە هاوڕێکانی ئەکرد لە سەرکردایەتیەکەیدا، بەڵام صدام ئەوەشی نەدەکرد). هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ١٦٥

بەڵام دیارە ئەو جێگە و ڕێگەیەی صدام لەهەشتاکاندا، ئەگەڕێتەوە بۆ پرۆسەی ١١ ساڵی نێوان ١٩٦٨ – ١٩٧٩. ئەو بەرهەمی ئاڵوگۆڕەکانی عێراق و حیزبی بەعسی ئەو ١١ ساڵە بوو. کاراکتەرە تاکەکەسیەکانی صدام وەکوو کەسایەتیەک لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخەدا مانای واقیعی خۆیان پەیدا ئەکەن و جێی گونجاوی خۆیان دەدۆزنەوە. جگە لەوەش کاراکتەرە تاکەکەسەکان و حیزبەکانی سەردەمی ئەو ڕۆڵیان بوو لە هاتنە پێشەوەی ئەو و کردنی بەو بتەی کە بینیمان.

حیزبی شیوعی عێراق، کە دواتر بوون بە قوربانی خووە خوێنخۆریەکەی، لە گەرمەی سەرگەرم بوونیان لە هاوپەیمانی لەگەڵ بەعسدا، وەکوو پیاهەڵدان، ناوی صدام حسینیان نابوو (کاسترۆی عێراق) وبە نیازی دامەزراندنی سۆسیالیزم بوون دەست لەناو دەستی ئەو. پارتی بۆ چاری مەسەلەی کورد گرەویان لەسەر ئەو بوو. لەناوخۆی حیزبی بەعسیشدا، میشێل عەفلەق کە بەرزترین ئایکۆنی سەرتاسەریی ئەو حیزبە بوو ئەیووت: صدام دیاریی ئاسمانە بۆ سەر ئەرز!

(نزار الخزرجي) سوپاسالاری عێراقیش، بۆ غسان شربل ئەگێڕێتەوە: (صدام لە شەڕدا چاوی لە ستالین دەکرد. ئەو بۆ ئەو مەبەستە نێردەی حیزبیی یا کۆمیساری سیاسیی لەگەڵ تیپەکانی سوپادا دائەنا وئەیکردن بە چاودێر بە سەر سەرکردەکانی سوپاوە. صدام وەکوو ستالین هەمیشە مەترسیی ئەمنی بەسەر سەریەوە بوو).غسان شربل، ص ٢٠٤

صدام بڕوای بە حیزبی پێشڕەو و مۆدێلی بینای حیزبی لینینی هەبوو بە کاراکتەرێکی نەتەوەییەوە. ئەو وەکوو حیزبەکانی وڵاتانی بلۆکی سۆڤیەتی، حیزبی دەور دابوو بە پەرژینی کۆمەڵێک ڕێکخراوی جەماوەریی وەکوو لاوان و ئافرەتان و قوتابیان.
بەرز ڕاگرتنی کاریزمای کەسایەتیی ڕابەر و کردنی بە سیمبولی هەموو وڵات و نەتەوەش دیارییەکی هاوردەی تری دەسەڵاتی هەشتاکانی بەعس بوو.
هیچیەک لە لایەنە چەپ و مارکسیەکانی ئەو سەردەمانەی هەشتاکان، کە ئێستا هەندێکیان باسی پێشڕەویە تیۆریەکانیان ئەکەن، سەرنجێکی سەرپێیشیان نەئەدا سەبارەت بە تایبەتمەندیە سیاسی و ئابووری و ئایدیۆلۆجی و کۆمەڵایەتیەکانی نیزامی فەرمانڕەوا لە عێراقدا. ئەوان تەنها نووسابوون بە گشتی ترین کاراکتەری وەکوو سەرمایەداری بوونی عێراق و ئایدیۆلۆجی ناسیۆنالیستی حیزبی دەسەڵاتدارەوە. ئەو دوو خەسڵەتە جگە لەوەی زۆر گشتی بوون، تەنها تایبەتمەندی عێراق و سیستمەکەی نەبوون.
نوخبەی دەسەڵاتداری (ئیلیتی – Governing Elite) عێراقی هەشتاکانی سەدەی پێشوو ومەنزوومەی حیزبی وماڵباتی، بایەخێکی تایبەتیی ئەدا بەوەی کە حیزب بکاتە ئامرازێکی چاودێری و ئەمنیی قەبە. (بۆ ئەو مەبەستەش ساڵی ١٩٨١ ژمارەی ئەندامانی حیزبیان گەیاند بە ملیۆن و نیوێک نەفەر). فالح عبدالجبار. دولة الحزب الواحد. ص ٩
لە هەشتاکاندا ئاڵوگۆڕێک دەهێنرێت بەسەر ڕۆڵی حیزبی بەعس و جێگەی ئەو حیزبە لەسەرجەم مەنزوومەی دەسەڵاتداریتی سیاسیدا. حیزبی ناوبراو بە جۆرێک دەشێلرێتەوە کە ببێت بە چەکێکی کارای دەستی صدام بۆ خزمەتکردن بە بەرهەمهێنانەوەی پێگەی ئەو وەکوو کاریزمای نەک یەکەم، بەڵکوو تاقانەی وڵات.

سەرباری ئەو ئاڵوگۆڕانەی بە سەر جێگە و وەزیفەی حیزبدا هاتبوو، بەڵام حیزبی بەعس، لە مەنزوومەی دەسەڵاتی هەشتاکاندا، هێشتا ئامرازێکی کاریگەر بوو بۆ دابینکردنی پرۆسەی کۆنترۆڵی وڵات و کۆمەڵگا.

لەم قۆناغەدا سەنتەرە بەهێزەکان و فراکسیۆنەکان وکەسایەتیە کاریزمیەکانی ناو حیزب یەک لە دوای یەک، بۆ خزمەتکردن بەو ئامانجەی پێشوو، پاکتاوکران. بۆ نموونە باڵی جەنەڕاڵە دیارەکان و سامەڕاییەکان یا پاشەکشەیان پێکرا یا بە بیانووی جیاواز سیمبول و کاریزماکانیان پاکتاوی فیزیکی کران. صدام زۆر باش ئەیزانی کە فرە جەمسەری و بوونی سەنتەری جیاوازی هێز ودەسەڵات، جا با سەرەتا زۆر لاوازیش بێت، یا بوونی کاریزمای تری بواری سیاسی و سەربازی، ڕێگرن لەبەردەم خەونەکانیدا و تاقیکردنەوەی دەیان کێشمەکێشی نێوان باڵەکانی بەعس لە شەستەکان و حەفتاکاندا، لە زاکیرەیدا مابوون. صدام لەو بوارەدا ئەیووت: ( ناکرێ جارێکی تر ڕێ بدەین بە چوار ئەفسەر و سێ تانکەوە دەسەڵات بڕوخێت.)
Memories of State, Eric Davis. P 285

(جگە لەوەش صدام و گرووپەکەی دەوروبەری پێیان وابوو کە دیموکراسی و هەڵبژاردن بەرهەم و بیانووی ئیمپریالیزم و زایۆنیزمن. جگە لەوەش بڕوایان وابوو کە شیوعیەت و لیبراڵیزمی سەرمایەداری ڕێگەیەکی گونجاو نین بۆ عێراق، چونکە دژایەتییان هەیە لەگەڵ مێژوو و کەلەپووری ئەم ولاتە وپێداگریان لەسەر (ڕێگەی سێیەم) دەکرد، کە لە ئەدەبیاتی خۆیاندا ناویان نابوو (دیموکراسیی میللی–الديمقراطية الشعبية) کە زامنی پووچەڵکردنەوەی پیلانەکانی دوژمنانە لە سەر عێراق و تەبایە لە گەڵ مێژوو و کەلتووری گەلی عێراقدا) Memories of State, Eric Davis. P 286

مۆدیلی دەسەڵاتداریێتی بەعس لە سەردەمی صدام لەهەشتاکاندا، زیاتر لە مۆدێلی دەسەڵاتداریێتی سیستەمە سۆسیالیست –

تۆتالیتاریەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی وەکوو ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و بولگاریا و هەنگاریا وکۆریای باکوور ئەچوو. بەراوردکاری ڕووکەشی بەعسی سەردەمی (صدام) بە فاشیەت، کە زۆربەی نەیارەکانی ڕژێم بەکاریان دەبرد، زیاتر دەچووە خانەی تەشهیری سیاسی و ڕسواکردنی میدیاییەوە تا ئەوەی بەشێک بێت لە میتۆدێک بۆ شیکردنەوەی سروشت و خەسڵەتی چینایەتی و سیاسی و ئایدیۆلۆجیی ئەو دەسەڵاتە.

من پێموایە بۆ شیکردنەوەی خەسڵەتی دەوڵەتی عێراقی ئەو قۆناغە ئەبێ پەنا ببەینە بەر کۆمەڵێک پێکهاتەی ئۆرگانیک وکاراکتەری سەرەکی و جەوهەریی سیستمی دەسەڵاتدار. بۆ ئەو مەبەستە پێویستمان بە شیکردنەوەیەکی وردە سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵایەتی نوخبەی دەسەڵاتدار، شێوازی شەرعیەتدان و تەسویقی سیاسیی دەسەڵاتەکە، ئایدیۆلۆجیا یاخود ئەو مۆدێلە ئابووریەی دەسەڵات پەیڕەویی لێ دەکات. بەراوردکردنی سیستمی دەسەڵاتی هەشتاکانی عێراق لەگەڵ ئەوروپای سۆسیالیستی سەردەمی ستالینیزم زۆر لێکچوونی نێوانیانمان نیشان ئەدات، بەڵام بە تایبەتمەندییکی عێراقیەوە و بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەو سیستمە سۆسیال – تۆتالیتارە لە عێراقدا پێویستی بە چ فۆرمێکە.

مۆدێلی سیستمی سیاسیی ئۆردووگای ئەورووپای ڕۆژهەڵات لەسەر چەند کۆڵەکەیەک دامەزرابوو کە هاوتاکانیان لە عێراقدا بە ڕوونی ئەبینرا:

**یەکەم:** دەسەڵاتی حیزبی تاقانە.

**دووەم:** کۆنترۆڵی هەموو کایە سەرەکی و ستراتیجیەکانی ئابووری و بەرهەمهێنان لەلایەن دەوڵەتەوە.

**سێیەم:** دەسەڵاتیکی ڕەهای چڕ وپڕ و ناوەندێتی توندوتۆڵ.

**چــوارەم:** دەمــج و تیکەڵکردنــی هەرســێ دەســەڵاتی یاســادانان و جێبەجێکـردن و دادوەری بە پـێچەوانەی جیاکردنەوەیـان لە سیسـتمی دیموکراتی و پەرلەمانیدا.

**چوارەم:** کاریزمـای سـەرۆکی حیـزب و وڵات و چڕکـردنەوەی هەمـوو دەسەڵاتەکان لە دەستیدا.

**پێنجەم:** دەوڵەت خاوەنی ئایدیۆلۆجیایەکە کە جێی مشتومڕ و ڕەخنە نیە و وەکوو ئایکۆنێکی هولامیی پیرۆز تەماشا ئەکرێت.

**شەشـــەم:** شـــەرعیەتی دەســـەڵات لە ســـندووقەکانی دەنگـــدانەوە سـەردەرناهێنێت، بەڵکـوو ئایـدیۆلۆجیای حیـزب سـەرچاوەی تاقـانەی شەرعیەتە.

**حەوتەم:** ســـەرکوت و داپڵۆســـین و یاســـاغکردنی سیاســـەتکردن لە دەرەوەی دیوارەکـانی حیزبی دەسـەڵاتدار. ئـازادی بیـروڕا و دەربـڕین وفرەیی و سیستمی چەند حیزبی بوونی نییە. هەمـوو مـافە سیاسـی و یاســـاییەکان بە تەنیـــا لە ســـەر حیزبـــی دەســـەڵاتدار و کـــادر و سەرکردەکانی حیزب تاپۆ ئەکرێن.

بەعـس هەڵگـری نـاوەڕۆکی هەمـوو ئەو خەسـڵەتانە بـوو و بە پێـی بەرنـامە و بەهـۆی گونجاوبوونیـانەوە زۆر هۆشـیارانە پەیـڕەوی لەو مۆدێلەی دەسەلات ئەکرد و بۆ ئەو مەبەسـتەش هەمـوو شـێوازەکانی تەنســـیق و هاوکـــاریی لەگەڵ وڵاتـــانی نـــاوبراودا ئەکـــرد. تەنهـــا جیـاوازییەکی بەعـس (بەعێراقـی کردنـی) ئەو کـاراکتەرە سـەرەکیانەی ئەو مـــۆدێلە و تەوزیفکردنیـــان بـــوو لە خزمەتـــی دووبـــارە بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی تۆتالیتاری لە عێراقدا.

بنیاتنـانی دەوڵەتـی تۆتالیتـاریی صـدامی لە عێراقـدا، وەکـوو لازم و مەلزووم، پێداویستی تایبەتی خۆشی هەبوو.

گەرچـــی پرۆســـەی هەڵلووشـــین وهەزمکردنـــی دەوڵەت وەکـــوو بونیادیترین دامەزراوەی کۆمەڵایەتی سـەردەم لە لایەن حیزبـەوە هەر لە ١٩٦٨ بەدواوە لە لایەن حزبی بەعسیشەوە دەستی پێکردبوو، بەڵام

له ١٩٨٠ بەدواوە ئەو پرۆسەیە ڕەهەند و شێوازێکی تری بەخۆوەگرت. لە نیوەی یەکەمی هەشتاکانەوە صدام بوو بە ڕەمزی هەڵلووشینی دەوڵەت وەکوو ماشینێکی ئۆرگانیک لە لایەن حکوومەت و حکوومەت لە لایەن دەسەڵات و دەسەڵات لە لایەن حیزب و حیزب لە لایەن نوخبەی خێزانی و سەرکردەوە. بەومانایە لە هەشتاکاندا دەسەڵاتی بەعس لە ڕێگەی صدامەوە پرۆسەی تەکامول بوونی تۆتالیتاریزمی دەسەڵاتداریێتی سیاسیی وڵاتی تەواو کرد و گەیاندی بە سەرئەنجامی کۆتایی. جێدەستی صدام بەم پرۆسەیەوە تەواو دیار بوو بەتایبەتی لە ڕووی توندی و خێرایی و توندڕەوبوونی پرۆسەکەوە.

پرۆسەی بەرجەستەکردنەوەی تۆتالیتاریزمی تاکەکەسیی دەسەڵات لە عێراقدا خۆی لە خۆیدا هەڵگری مەیلێکی قووڵ و هەڵپەیەکی زۆر بوو بۆ تەسفیەکردنی هەموو ناوەندەکانی تری دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی. بۆ نموونە لە هەشتاکاندا ئەبینین کە پاشماوەی نوخبەی پرۆفیشینالی سەربازی و ڕمووز و جەنەڕاڵەکانی تەسفیەی فیزیکیی تەواو ئەکرێن و هەمان چارەنووسیش بوو بە نسیبی کەسایەتیە حیزبیە خاوەن نفووزەکانی لە چەشنی (عبدالخالق السامرائي ومنیف الرزاز و شبلي العیسمي) و لە جێی ئەوان حیزب ئاوێتە ئەکریت بە نوخبەیەکی بێدەسەڵات و خاڵی لە کەسایەتی و خەسلەتی کاریزمی کە خاوەنی کەمترین تمووحی سیاسین و تەنانەت ئەوانیش دەور ئەدرێن بە حەلقەیەکی تری خزم و کەسوکاری وەکوو (علي حسن المجید و برزان و سبعاوي و وطبان و قصي وحسین کامل و صدام کامل)[1] و .. تاد و بەو جۆرە هەموو پاشماوەکانی ناوەندەکانی دەسەڵات و هێز لەناو حیزب ودەوڵەتدا تەسفیە کران.

---

[1] ئەوانە کەسایەتی دەسەڵاتداری نوخبەی دەوری صدام و زۆربەشیان خزم و کەسی خۆی بوون کە دوای بوونی بە کەسی یەکەم لە حیزب و دەوڵەتدا پۆستی بەرزی پێدان و زۆربەشیان نیمچە خوێندەوار بوون.

لێـره بەدواوه بەڕۆژی ڕوونـاک دیـار بـوو کە جەسـتەی صـدام و تەماحە سیاسی و شەخسیەکانی و ئەو مۆدێلەی کە لە مێشکی ئەودا سەبارەت بە کێشە میحوەریەکانی ناوخۆ و ناوچەکە فۆرمۆڵە بووە، لەو چوارچێوە تەسکەی تـا ئێسـتایدا جێیـان نـابێتەوە و ئەبـێ ئەو نـاکۆکیە بەلایەکدا بخرێت. ئاشکراشـە لە ڕووی تیـۆری و پێشـینەی مێـژووییەوە ئەکـرێ ئەو جـۆره نـاکۆکی و قەیـرانە سیاسـیە وەکـوو بـاڵۆنێکی پڕ لە پاڵەپەسـتۆ تەنفیسـێکی بـدرێ، گەرچـی بە ڕواڵەتـیش بێت، تـا لە تەقینەوەی حەتمی ڕزگاربکرێت. بەعس لە حەفتاکاندا ئەم بەدیلەی گرتەبەر لە ڕێی ڕێکەوتن لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان و مـۆرکردنی بەیـانی ١١ ی ئـازار و پاشـان مـۆرکردنی (بەرەی نیشـتیمانی پێشـکەوتنخواز – الجبهـة الوطنيـة التقدميـة) لەگەڵ حیزبـی شـیوعی عیـراق و لە ئاسـتی دەرەکیشـدا بەسـتنی (هاوپەیمـانیی دۆستایەتی و هاوکاری – معاهدة الصداقة و التعاون) لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا. بەڵام خوێندنەوەی صدام بۆ قۆناغی هەشتاکان جیاواز بوو لەو خوێندنەوەیەی حەفتاکانی بەعس.

چەنـدین فـاکتەر ڕۆڵـی خۆیـان گێڕا لە سـەرهەڵدان و لەدایـک بـوونی مۆدێلی تازەی حوکمڕانی شمولی لە عێراقدا، لەوانە:

١/ کـاراکتەری شەخسـی صـدام لەپـاڵ جێگیـر بـوونی پایەکـانی ڕژێمەکەی.

٢/ دامەزرانـدنی سـوپایەکی زەبەلاح و پـڕچەک و دەیـان دەزگـای سـەرکوتی شـارەزا بە یـارمەتیی کەی جـی بیـی KGB سـۆڤیەت و ستازیی ئەڵمانیای شەرقی و کوبا.

٣/ بـوونی سـەرچاوەیەکی دارایـی زەبەلاح کە بەهـۆی خۆمـاڵیکردنی نەوت و چوونەسـەری نرخـی نەوت بە ڕادەیەکـی زۆر بەرز لە پـاش شـەڕی ئۆکتـۆبەری نێـوان وڵاتـانی عەرەبـی و ئیسـرائیل و وەسـتانی نـاردنە دەرەوەی نەوت بـۆ بازاڕەکـانی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا لە لایەن سەرجەم وولاتانی عەرەبەوە.

٤/ بەهێزبوونی تەوژمی قەومپەرستی عەرەبی دوای دۆڕانی شەڕی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ی عەرەب و فەلەستینیەکان لە بەرانبەر ئیسرائیل و هاتنەسەرخەتی عێراقی ژێر دەسەڵاتی صدام وەکوو باڵی ڕادیکاڵی ناسیۆنالیزمی عەرەب و هەڵلوشینی گیانی نارەزایەتی بەرانبەر باڵی (سازشکاری) هەمان بزووتنەوە.

هەموو ئەوانە ڕێگەیان لە بەردەم پرۆسەی شکڵگرتنی تۆتالیتاریزمی هەشتاکان لە عێراقدا خۆش ئەکرد و صدام بوو بە ئەندازیاری بێ ڕەقیبی ئەو پرۆسەیە. ئیتر بەڕۆژی ڕووناک دیاربوو کە عێراق بارگاوی بووە بە قۆناغێکی تری دیکتاتۆریەتی نەتەوەپەرستی عەرەبی سەرتاسەری کە ڕابەرایەتیەکەی بە بالای صدام بڕاوە و بەپێی مەرامەکانی ئەو دیزاین کراوە.

ئاشکرایە کە لە ڕووی تیۆریەوە ئەگەری ئەوەش هەیە پێش بە تەقینەوەی ئەو جۆرە ناکۆکی و قەیرانانە بگیرێت، لە ڕێی بەرینکردنەوەی مافە دیموکراتیەکان و ئاڵوگۆڕ لە شێوازی دەسەڵات لە ڕێی ئیسلاحاتی سیاسی و بەرینکردنەوەی ڕووبەری ئازادی دەربڕین و بواردان بە چالاکی هێزی سیاسی تری ئۆپۆزیسیۆن یا تەنانەت لابردن و دوورخستنەوەی بیچم و کەسایەتی و ئۆرگانە بەدناو و قێزەونەکانی سیستمەکە و دامرکاندنەوەی ترس و نارەزایەتی خەڵک لە داهاتووی نادیاری وادا. بەڵام ئەم ڕێگەیەیان کەمترین شانس و زەمینە و بواری لە عێراقی سەرەتای هەشتاکاندا هەبوو و نەک هەر ئەوە بگرە صدام و تاقمە ڕادیکاڵەکەی دەوروبەری زۆر بە هوشیاریەوە ڕەوتی ڕووداوەکانیان بە ئاراستەی تەنها یەک ئەلتەرناتیڤدا پاڵ پێوەئەنا: توندڕەوی و قفڵکردنی دەروازەکانی وڵات و فەزای سیاسی بەڕووی هەر ئاڵوگۆڕێکی پۆزەتیڤدا و خۆشکردنی فەزا و پێویستیەکانی ڕەشترین جۆری دیکتاتۆریەت و شمولیەت (تۆتالیتاریەت) کە ڕۆژ بە ڕۆژ سەروسیماکانی زیاتر و زیاتر لە ئەرزی واقیعدا بەرجەستە

ئەبوونەوە و ئیتر سەرەتاکانی دەیەی کارەسات لە پلانەوە ئەبوون بەواقیع و مامانی ئەم مۆدێلە نوێیەی دەسەڵاتدارێتیش کەسێک نەبوو جگە لە (صدام حسین).

لێرەدا بە پیویستی ئەزانم وەکوو شایەدیی زیندوو لەسەر ئەو قۆناغە سەرنجی خوێنەر بۆ دوو پێشهات بدەم:

**یەکەم:** ڕاپەڕینی ئیسلامیی ئێران کە بە ڕووخانی تەلاری دیکتاتۆریەتی شاهانە و دامەزراندنی جمهوریی ئیسلامی و نیزامی ولایەتی فەقیهی ئێرانی بە ڕابەریی سیاسی و ڕووحی خومەینی کۆتایی هات.

زۆر جار کە باس لە دامەزراندنی جمهوریی ئیسلامیی ئێران و نیزامی ولایەتی فەقیە لەو ولاتەدا ئەکرێت ئەو ڕاستیە پشتگوێ ئەخریت کە بڕیاردان سەبارەت بەو شکڵە لە نیزامی سیاسی لە ساڵی ١٩٨٠ دا لە ڕێگەی ڕیفراندۆمێکەوە بوو کە ٩٨٪ ی بەشداربووان تیایدا، جگە لە زۆر ناوچەی کوردستان کە ئەو ڕیفراندۆمەی لە بنەوە ڕەتکردەوە، دەنگیان بە بەڵێ دا بە بەرپاکردنی ئەو سیستمە سیاسیە لە ولاتەکەیاندا. زۆربەی هێزە چەپەکان و لایەنگرانی پاشایەتی و ناسیۆنالیستە ئێرانیەکان یەکلایەنە دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری ئیسلامیی ئێران ئەگێڕنەوە بۆ بەلاڕێدابردنی ڕاپەڕین و جڵەوگرتنی لەلایەن خومەینی و داروودەستەکەی ئەوەوە بێ ئەوەی هێمایەکی لاوەکیش بکەن بۆ ئەو خۆشباوەڕیەی خەڵک کە بە دەنگی بەڵێ لەو ڕیفراندۆمەدا بەشدارییەکی فراوانیان کرد. لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو کە ئەو ڕێژە زۆرەی خەڵک لە ئێراندا دەنگی بەڵێیان دا بە ڕیفراندۆمێک کە کارتی دەنگدانەکە تەنها یەک پرسیاری لەخۆ گرتبوو کە بریتی بوو لەوەی: ئایا بەبەڵێ یا نەخیر دەنگ ئەدەی بە دامەزراندنی جمهوریی ئیسلامیی ئێران! ئەو ڕیفراندۆمە بەو ڕۆڵەوە و بەو شێوە ئاشکرا دژە دیموکراتیەیەوە نەک نەبوو بە جێگەی

نارەزایەتی گشتی، بەڵکوو ڕێژەیەکی بەربڵاوی خەڵک هەم بەشدار بوون وهەم بە بەڵێ پێشوازیان لێ کرد و دەنگیان دا.

**دووەم:** هاتنەوە سەر شانۆی بزووتنەوەی شیعەگەریی سیاسی لە عێراقدا کە پەیڕەویی لە مۆدێلی شیعەی ویلایەتی فەقیهی خومەینی ئەکرد و ئیلهامی راستەوخۆی لە هاوتا ئێرانیەکەیەوە وەرئەگرت.

بزووتنەوەی نارەزایەتی و خۆپیشاندانی جەماوەریی شارە شیعیەکان بە دەستێوەردانی حیزبی دەعوە لە ساڵی ١٩٧٧ بەدواوە دەستی پێکرد. لە نیسانی ١٩٨٠ دا لە زانکۆی (المستنصرية) ئەندامانی حیزبی دەعوە هەوڵی تیرۆرکردنی تاریق عەزیزی وەزیری ڕاگەیاندنی ئەوکاتی عێراقیان دا و ٥ ڕۆژ دوای ئەوە پەلاماری چەکدارانەی ئەو کاروانەیان دا کە خەریکی ناشتنی تەرمی کوژراوەکانی ڕۆژی پەلامارەکەی بەر زانکۆی (المستنصرية) بوون.

صدام دەسپێشخەری کرد و بەمەبەستی چاوترسێنکردنی بزووتنەوەی ئیسلامیی شیعی لە نیسانی ١٩٨٠ دا هەستا بە لە سێدارەدانی محمد باقر الصدر و بنت الهداي خوشکی. الصدر گەورەترین ڕابەری ڕووحی و سیاسیی ناو ڕیزی ئیسلامی سیاسیی شیعی بوو لە عێراقدا.

بەهێزبوونی ئامادەیی سیاسی ئیسلامی سیاسی شیعی لە عێراقدا ئەگەڕێتەوە بۆ پێش دامەزراندنی کۆماری ئیسلامیی ئێران، بەڵام تا ئەو قۆناغە ئەو بزووتنەوەیە لە عێراقدا لە خۆی ڕانەدەدی کە ڕووخانی ڕژێم بکات بە دروشمی ڕۆژ بۆ خۆی.

بەڕای من ئەوە نیشاندەری کورت بینیی سیاسیە کە زۆر کەس ئەڵێن توندبوونەوەی ناکۆکیی ڕژێمی عێراق و ڕەوتی ئیسلامی شیعی تەنها بە هۆی دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە بوو ئەو کاتەی کە هێزە سیاسیە شیعەکانی عێراق هاوسۆزیی خۆیان بۆ دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی دەربڕی. لەڕاستیدا دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی لە ئێراندا تەکانێکی دا بە بزووتنەوەی ئیسلامیی شیعیی عێراقی، بەڵام

ئەم بزووتنەوەیە هەر لە ساڵی ١٩٥٨ بەدواوە وەکوو پەرچەکردارێک بەرانــبەر هەنگــاوە پێشــکەوتنخواز و ڕادیکــاڵ و ئــازادیخوازەکەی کۆمــاری ١٤ی تەمــووزدا ســەری هەڵــدا و بەهێــز بــوو و سیاســەتە عیلمانیەکانی ساڵانی حەفتاکانی بەعس، دیسانەوە هێنایەوە سەرخەت وەکوو هێزێکی نەیار بەو سیاسەتانە.

حیزبی دەعوە سەرەتا ڕێک وەکوو پەرچەکردارێک هاتە سەر شانۆی سیاسی بەرانبەر بە یاسای پێشکەوتووی باری کەسێتی ساڵی ١٩٥٩ و سیاسەتی چەپڕەوانەی عبدالکریم قاسم و یاسای چاککردنی زەوەی وزار و بەهێزبوونی شیوعیەت لە عێراق و ئەو ژینگە سیکیولارەی کە دوای ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە عێراقدا هاتەئاراوە. ئەو حیزبە هەرگیز هاشای لەو ڕاستیە نەکردووە وهەر بۆیەش لەدوای کۆدەتای ١٩٦٣ی هێزە قەومیە عەرەبیەکان و ڕووخانی حکوومەتی عبدالکریم قاسم، محســن الحکیمــی مەرجەعــی بــاڵای شــیعەکان لە نەجەفەوە فتــوا بەناوبــانگەکەی دا و خــوێنی هەمــوو شــیوعیەکان و ئەنــدامانی حیزبەکەیــانی حەڵاڵ کــرد و بەعــس بە ســوودوەرگرتن لەو فتــوایە نزیکەی ١٥ هەزار شیوعیان قەتڵوعام کرد.

بەو مانایە ئیسلامی سیاسی شیعی بەهەموو باڵەکانیەوە لە عێراقدا لەسەرەتاوە خاوەنی پرۆژەی دامەزراندنی حکوومەتی ئیسلامی بوون لە عێراقــدا و بــارودۆخی دوای دامەزرانــدنی کۆمــاری ئیســلامیان لە ئێراندا وەکوو هەلێکی گونجاو تەماشا دەکرد بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجە ستراتیجیەیان.

ئەو دوو پێشــهاتە بــوون بە تــوخمی ســەرباری پێکهێــنەری دەیەی کارەسات ئامێزی هەشتاکان لە عێراقدا.

ئەم دوو فــاکتەرە لە زۆر ڕووەوە کاریگەرییــان بەســەر بــارودۆخی سیاســی عێراقــدا جێهێشــت، بە جۆرێــک کە بــوون بە ســەرەکیترین هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران.

تا ئەو جێیەی کە بۆ ڕێکخراوی ئێمە، (یەکێتی تێکۆشانی کارگەران) ئەگەڕێتەوە، ئەو ئاڵوگۆڕە ڕیشەییانە جێگە و بایەخێکی ئەوتۆیان لە پلان و بیرکردنەوە و نەهجی سیاسی و میتۆدی فکریماندا نەبوو. هیچیان ڕاینەچڵەکاندین و هێشتا هەر سەرگەرمی باسی کلاسیکی تیۆریی مارکسی وشانازیکردن بە گەڕانەوە بۆ مارکسیزمی ئەرسەدۆکس و کێشەکانی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی جیهان و ماویزم و سۆسیال ئەمپریالیزم و تیۆریە ئەبستراکت و سیحراویەکەی خەباتی چینایەتی بووین. ئەوانە هێچیان یارمەتیان نەئەداین لەوەی ئەو ڕاستیە دەرک پێ بکەین کە ئەو دیاردە و هێما فکری و تیۆریانە لە ئەرزی واقیعدا چی لە ئێمە ئەخوازن لە بەرانبەر ئەو وەرچەرخان و ئاڵوگۆڕە غەیرە کلاسیکیەی کە وا خەریکە تەڕ و وشک پێکەوە هەڵئەلووشێ و وەرچەرخانێکی نوێ، بە تایبەتمەندیەکی تایبەتیی سەردەم و شوێنی عێراقیەوە ئەخوڵقێنێ و هەموو عێراق بە کرێکار و جوتیار و ووردە بورجوازی و سەرمایەدار و دارا و نەدارەوە، بەرەو دۆزەخێک ئەبات کە لە ناو کتێب و دەقەکاندا نموونەیان نیە. بیری ئەوەمان نەبوو ئەوە ئێمەین، لە ڕووی ئوسوولییەوە، بەپێی ئیدیعا و پێناسەی خۆمان، چاوەڕوانی ئەومان لەسەرە کە ببین بە پەیامبەری ناسین و ناساندن و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دێوە زەبەلاحە!

چەپی مارکسی خاوەنی شیکردنەوە و روئیایەکی (vision) تیۆری ئەوتۆ نەبوو کە یارمەتیدەری بن بۆ داڕشتنی بەرنامەیەکی ڕۆشن کە ئەو بارودۆخەی وڵات بە هەموو پێشهاتە تازەکانیشیەوە لەخۆ بگرێت، بەڵکوو ئەدەبیاتی زۆر کەمی ئەم سەردەمە جگە لە سەرزەنشتی سیاسی و تەحریزی بێ ناوەڕۆک و دروشمی ڕادیکالی ناواقیعیی هیچی تری تیا نەبوو.

دیارە کە ئەڵێم ئەوە لە فکری ئێمەدا غایب بوو، وەنەبێ لای هیچ هێزێکی تریش ئەو وەرچەرخانە سیاسی و کۆمەڵایەتیەی وڵات مایەی

وەستان و تێڕامانێکی نوێ بێت، بەڵکوو هەموو هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی تری وڵات، شیوعیەکان، هێزە سیاسیە شیعیەکان، یەکێتی و بگرە چەپ و ڕاست سەرگەرمی ڕوئیا کلاسیکیەکانی خۆیان بوون و بڕوایان وابوو کە ئەوەی لە سەر شانۆی سیاسیی وڵات ڕووئەدات شتێک نیە جگە لە ئەڵقەیەکی تری ململانێی نێوان بەرەی ڕژیم و نەیارەکانی و هیچی تر.
بەڕێکەوت من مانگی سەبتەمبەری ١٩٨٠ لە دهۆک بووم. ئێوارەی ٩/١٧ لەگەڵ هاوڕێیەکمدا کە میوانی ئەو بووم ڕوومان کردە یەکێک لەو نادیە زۆرانەی شار و شەوگاری بەسەرداهات وئێمە لە گەرمەی قسە و باسدا بووین کە (ڕشدي عبدالصاحب)ی بێژەری بەناوبانگی عێراق لە تەلەفزیۆنەوە چەند جار بەرنامە نۆرماڵەکانی ئەبڕی و بەدەنگە نێر و جەهووریەکەی ئاگاداریی ئەوەی رائەگەیاند کە تۆزێکی تر سەرۆکی موهیبی ڕوکن و فەرماندەی هێزە چەکدارەکان و چی وچی، صدام حسین وتارێکی مێژوویيتان پێشکەش دەکات. لەناکاو بەرنامەی تەلەفزیۆن ڕاوەستا و صدام لە هۆڵی ئەنجوومەنی نیشتیمانیەوە (المجلس الوطني) وتارێکی ئاگرینی خوێندەوە کە ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە پێداگری لەسەر ئەوەی.. کە ئەوەی ئێران لە دوو هەفتەی ڕابوردوودا لە دژی عێراق کردوویەتی دەسدرێژی و تاوانە ودرێژەی دوژمنایەتی و ناحەزیی دێرینەی فارسەکانە لە دژی نەتەوەی عەرەب و هەر لەوێ لەناو چەپڵە ڕێزانی داروەدەستەکەی خۆی بڕیاری شەڕێکی دا کە لە ڕاستیدا بوو بە بەستەری سەرهەڵدان و شەرعیەتدان و پاساو بۆ لە دایکبوونی ئەو دەسەڵاتە شمولییەی کە ساڵێک زیاتر بوو خەریکی تەداررووکی پێویستیە نەفسی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی بوو.

صدام حسین له وتارەکەیدا یەکلایەنە (ڕێکەوتنی جەزائیر)[1]ی ساڵی ١٩٧٥ ی هەڵوەشاندەوە.
ڕاستە صدام حسین خەونی ئەوە دابووی لە کەلەی کە دوای شای ئێران ئەو ببێت بە پاسەوانی کەنداو و ئەوەش یەکێک لە فاکتەرەکانی هەڵگیرسانی شەڕ بوو لە دژی ئێران، بەڵام ئێرانیش لای خۆیەوە بوو بە جێ ئومێد و پشت و پەنا وبەرەی پشتەوەی هێزە شیعیە عێراقیەکان و هاندەری ڕاستەوخۆیان لە دژی صدام و ڕژێمەکەی. هەر لەو چوارچێوەیەشدا هەوڵی تیرۆری صدام لەلایەن حیزبی (الدعوة) بە پاڵپشتی ڕاستەوخۆی ئێران، لە ساڵی ١٩٨٢ لە (الدجیل) هێندەی تر ناکۆکیەکانی نێوان هێزە سیاسیە شیعەکان و بەعسی گەیاند بە بەرزترین ئاستی دوژمنایەتی.
ساڵی خوێندنی ٨٠-٨١ چەخماخەی شەڕی هەشت ساڵەی عێراق لە گەڵ ئێراندا دەستی پێکرد. صدام حسین ویستی ئەم شەڕە بکات بە بیانوویەک بۆ میلیتاریزەکردنی هەموو کونج و کەلەبەرێکی وڵات و چڕکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆی و تاقمێکی نزیک لە کەس و کار وعەشیرەت و تکریتیەکان. دەیانی وەکوو (علي حسن المجید و عدي و قصي و عبد حمود وحسین کامل و صدام کامل و جمال مصطفی)ی لە دەوری خۆی ئالان و ئەو توێژە بوون بە سیما و سیمبولی دەسەڵات و ڕژێم لە هەشتاکاندا. دەوڵەت بوو بە ماشینێکی گەورەی چاودێری و ژماردنی هەناسەی هاووڵاتی و ئیعدام وسەرکوت و کوشت و بڕ.
ئەم وەرچەرخانە سیاسیەی عێراق لە سیاسەتی دەرەوەش ڕەنگی دایەوە و لە جیاتی پشت بەستنی تەنها بە ڕووسیا، عێراق بایدایەوە

[1]ئەو ڕێکەوتنە لە وڵاتی جەزائیر لەنێوان صدام حسین ومحمد ڕەزا پەهلەویی شای ئێراندا بەسترا کە بەپێی ئەوە شا بەڵێنی دا کە پشتگیریی بزووتنەوەی بارزانی نەکات و عێراقیش دەست لە داواکاریەکانی سەبارەت بە سنوور هەڵگرێت لەگەڵ ئێراندا بەتایبەتی لە (شط العرب).

بەلای ئەمریکا و فەڕەنسا و بەریتانیادا وچەندین وەفدی ئەمریکی ڕێی بەغدایان گرتەبەر کە یەکێکیان بە سەرۆکایەتیی (دۆنالد ڕامسفیلد)ی وەزیری بەرگریی دواتری کاتی هێرشی ئەمریکیی ساڵی ٢٠٠٣ بوو بۆ سەر عێراق. زماندرێژیی ڕژێم لە دژی ئیسرائیل ئارامتر بووەوە. پەیوەندیی حکوومەت عێراقی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی کەنداودا گەرموگوڕیەکی کەموێنەی تێکەوتەوە.

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ڕەنگدانەوەی ئەم وەرچەرخانە سیاسیانە بوون لە ناوخۆی وولاتدا. هێرش و پەلاماردان لەدژی هێزە شیعیە سیاسیەکان بوو بە سیاسەتی سەرەکیی دەوڵەت و ڕەشبگیر و سەرکوت خوارووی عێراق و بەغدای کردە مەیدانی سەرەکیی خۆی. جموجۆڵی سیاسیی دژ بەڕژێم بە ئاشکرا لە ناو شیعەکاندا، لەناوەندی زانکۆکاندا هەستی پێئەکرا. دامەزراندنی جمهوری ئیسلامی لە ئێران گیانێکی تری کردبۆوە بە بەر هێزە سیاسیەکانی وەکوو حیزبی (الدعوة) و حەوزە دینیەکاندا. مانەوەی چەندین ساڵی خومەینی لە نەجەف کاریگەریی خۆی هەبوو و سەرباری سەرکوتی خوێناویی ساڵانی ١٩٧٧ - ١٩٨٨ و لە خوێندا هەڵکێشانی شارەکانی نەجەف و کەربەلا پاش خۆپیشاندانە گەورەکانی ئەو ماوەیە کە بە ڕووداوی (خان النص) بەناوبانگە، بزووتنەوەی سیاسی لەناویاندا تا ئەهات بەهێز ئەبوو. ڕژێم چەند ساڵێک بوو لەڕێی سەرکوت و ئیعدامی هەزاران کەس لە شیوعیەکان پێی وابوو زەمینەی بۆ ڕەخساوە بۆ جیگیربوون بە بێ لەمپەرێکی ناوخۆیی، کەچی ئێستا بەرەیەکی فراوانتری نارەزایەتی و جموجۆڵی سیاسیی لە ناو شیعەکان لە بەرامبەریدا قووت بۆتەوە. کێشەکە ئەوەبوو گەر حیزبی شیوعی هێزێک بوو لەسەر بنەمای فکرو ئایدیۆلۆجیایەکی عیلمانی دامەزرابوو، ئەمرۆ دەسەلاتە تازەکەی صدام ڕووبەڕووی دوژمنێک بۆتەوە کە جگە لەوەی کە لەسەر بنەمای ئاینی و مەزهەبی دامەزراوە، خاوەنی پایگایەکی کۆمەلایەتی بەهێزە و ئیلهام وەرئەگرێ

له مێژووی خوێناوی سەرکوتی دەیان ساڵی شیعەکان و پرۆژەی ئیسلامی سیاسی شیعی بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی تری ئیسلامی له عێراقدا. ئەمان وەکوو هێزێکی توندڕەوی ئیسلامی، جگە له ڕووخانی ڕژیم بەهیچی دیکە ڕازی نابن و لەوە نایەنە خوارێ و سازش ناکەن. لەپاڵ ئەوەشدا له ١٩٧٩ بەدواوە و بەبێ لێکدانەوەیەکی عەقڵانیی وورد، هەوای سەرکەوتن چووبووە مێشکی هێزە سیاسیە شیعیەکان و تەنانەت جەماوەری فراوانی شیعەی عێراقیش وخۆیان بە شایستەی دەسەڵاتدارێتی ئەزانی دوای ئەوەی بینیان کە چۆن خومەینی توانی لە جەرگەی ڕاپەڕینێکی میللیەوە حکوومەتی ویلایەتی فەقیە دابمەزرێنێ و سەڵتەنەتی شای ئێران لەناو ببات.

بۆ ئێمەی چەپ، گەرچی دروشمی سەرەکیمان لە بەرانبەر دەسەڵاتدارێتیی ئەوکاتی بەعسدا بریتی بوو لە ڕووخانی ڕژیم، بەڵام جگە لە دروشم نە خاوەنی بچووکترین پێگەی جەماوەری بووین و نە خاوەنی ڕوئیایەکی ڕۆشن بۆ چۆنیەتی و ڕەوت و پێویستیەکان و قۆناغەکانی هاتنەدیی ئەو دروشمە. جگە لەوەش چەپ و ڕێکخراوی ئێمە ئەو دروشمەی زیاتر بۆ پێناساندنی بەشێک لە ئامانجەکانی هەڵگرتبوو و لەوە زیاتر نە شیکردنەوەیەک، نە لێکدانەوە و بەرنامەیەک، نە پلاتفۆرمێک لە ئارادا بوو کە دیدگا و جیاوازیی سیاسی و ڕوانگەی تایبەتی ڕێکخراوەکەمان بخاتەڕوو. بەوجۆرە وەکوو خاسیەتێکی دەرگیربوونی بە پەتای ئایدیۆلۆجی، ڕێکخراوی (یەکێتیی تێکۆشانی کارگەران) هەر لەو سەرەتایەی هەڵسووڕانیەوە، لە دەسپێکی قۆناغێکی سیاسیی جیاواز لە عێراقدا، ژیانی پەراوێزنشینی سیاسیی کرد بە خەسڵەتێکی سەرەکیی کە تا کۆتایی ژیانی تیا جێگیر و قەتیس مایەوە.

کوردستانیش بێ بەری نەبوو لەو پێشهات و ئاڵوگۆڕانەی کە عێراقی گرتبۆوە. لەلایەکەوە نارەزایەتی جەماوەری لە پەرەسەندندا بوو،

بەتــایبەتی لە ڕیــزی خوێنــدکاران و لاوانــدا. زانکــۆی ســلێمانی لەو سەردمەدا ببوو بەسەنتەرێکی گەورەی جموجۆڵی سیاسی. خەڵک و بە تایبەتی دەرچووی زانکۆکان بە شەپۆل ڕوویان ئەکردە چالاکیی سیاسی و ڕێکخراوەیی یا ڕوویان ئەکردە خەباتی شاخ و ئەبوون بە پێشمەرگە. جموجۆڵی سیاسی و ڕێکخستن لەناو شارەکاندا جمەی ئەهــات و کــۆمەڵەی ڕەنجــدەران ســەرباری پەلامــاری یەک لە دوای یەکی دەزگاکانی ئەمن بۆ سەر ڕێکخراوەکانی و ئیعدامکردنی سەدان کەســیان، ببــوو بە ڕێکخراوێکــی زۆر بەهێــز و بەنفــووز. ســەرباری وەرگەڕانــی ئەم ڕێکخــراوە بەلای ڕاسـت لە ئاسـتی سـەرەوەیدا، بەڵام هێشتا نفووزی چەپ و مارکسیزم لەناو ئەندامان وکادیرەکانیدا بەهێز بــوو. جــگە لەوەش وەرچەرخــان و ڕووتێکردنێکــی بەهێــز بــۆ بیروبۆچوونی چەپ و مارکسیزم لە کوردستاندا بەهێزەوە شەپۆلی ئەدا. بەکورتی جموجۆل و جۆش و خرۆش و دینامیزمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بزاوتێکی نارەزایەتیی بەهیز و فراوان سەرتاسەری کوردســتانی گرتبــۆوە. پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان لاوازتــرین و بێهێزترین ڕەوتی ناو خەڵک و هێزە سیاسیەکان و کەمترین پایگای لە ناو خەڵکدا هەبوو. بارودۆخەکە بە جۆرێک بوو مەیلی چەپڕەوی و مارکسیەت بە تایبەتی لە ناو توێژی خوێندکار و لاوانی کوردستاندا بە ڕادەیەک گەشەی کردبوو کە، پارتیش سەرباری ئەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە نوێنەرایەتی عەقلی تەقلیدی و کۆنەپارێزترین بەشی کۆن و بەســەرچووی کۆمەلگــای کوردســتانی ئەکــرد، بە ناچــاری و بــۆ خۆگونجانــدن لەگەڵ ئەو مەددە چەپ و ئــازادیخوازانەیەدا، لێــرە و لەوێ و لە ئەدەبیــات ونووســیندا ئەیانویســت ماســکێکی چەپ بــدەن بەسەر سیمای سیاسی کۆن و دواکەوتووی خۆیاندا.

بەکورتیەکەی نیوەی یەکەمی هەشتاکان سەرباری سەردەرهینان و دواتریش هەیمەنەی ئەو تۆتالیتاریزمەی باسمکرد، بە قۆناغی زێڕینی جموجــۆڵی سیاســی لە کوردســتانی عێراقــدا ئەژمــار دەکــرێ. بەڵام

لەسایەی نەبوونی هێزێکی ئازادیخواز و شۆڕشگێڕدا کە نەبووبێت بە ئەسیری باوەڕی ئایدیۆلۆجی وهەڵگری تێڕوانینێکی واقیع بینانەی سیاسـی و خوێنـدنەوەیەکی ورد بێـت بـۆ تایبەتمەنـدیەکانی سـەردەمەکەی، یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان تـوانیی خەبـاتی جەمـاوەریی ئەو قۆنـاغە لەکوردسـتاندا بکـا بە قوربـانیی سیاسـەتە چەوتەکـانی و ئەو بـزووتنەوە جەمـاوەیە گەورە و بەهیـزەی نـاو شارەکان بخاتە پاشکۆ وخزمەتی بزووتنەوە چەکداریە شاخاویەکەی خۆی کە ئەیتوانی بەتەواوی و بە پێچەوانەی بزووتنەوەی ناڕەزایەتی ناو شارەکان، کۆنترۆڵی بکات و سەرئەنجامیش کۆتایی ئەو دەیەیە بەکارەسـاتی ئەنفـال و قەلاچـۆکردن و سـووتماکی وڵات لە لایەن بەعسەوە بە تراجیدی تەواو کات.

## هاوکێشەی خەباتی شاخ و شار!!

لەهیچ قۆناغێکی تا ئەوکاتەی بزووتنەوەی چەکداریی کوردستاندا، خەباتی مەدەنی و جەماوەریی ناوشارەکان بەو ئەندازەیە نەبووژاوەتەوە ولە هیچ قۆناغێکیشدا ئەو بزوووتنەوە چەکداریە هێندە لەسەرحسابی خەباتی جەماوەریی ناوشار خۆی بەهێزنەکردبوو وئەو بزووتنەوەیەی خەڵکی بەرەو ناکامی نەبردبوو.

ئێستا کە من وەکوو شایەدحاڵێک چاو بەو سەردەمەدا ئەخشێنمەوە بۆم دەرئەکەوێ کە چۆن خەباتی شاخ، توانیی بەو کاراکتەر وعەقڵیەت و ڕابەرایەتیە سیاسیەوە کە بە تایبەتی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان نوێنەرایەتیی ئەکرد، بزووتنەوەی مەدەنی و نارەزایەتیی شارەکان بەوهەموو پۆتانسیلە بەهێزەیەوە کە هەیبوو، لەبارو لە خشتە بەرێت و بیکات بە هێزی زەخیرەی هێزە چەکدار و حیزبیەکەی خۆی لە شاخ ولە دواییدا بە هەردوولا، واتە بە مەنگەنەی سەرکوتی خوێناویی ڕژێم و سیاسەتی دیماگۆجیی چەکداریی ئۆپۆزیسیۆنی کوردستانی، شارەکان خاڵی بکەنەوە لەو هێزە گەورەیە. ئەو ئاکامەش تەنها ڕژێم سوودمەندی یەکەم بوو لێی و زەمینەی خستە سەر گازەرای پشت بۆ ئەنفال و جینۆسایدی قۆناغی ١٩٨٨ بەدواوە.

هەرچی ڕەوتی مارکسی کوردستان و ڕێکخراوی ئێمەش بوو، نەک هەر چاوی نووقابوو لە بەرانبەر ڕەهەندەکانی ئەم گەمە مەترسیدارەدا، بەڵکوو سەرەتای هەشتاکان بەچاوی سۆزەوە ئەیڕوانیە بزووتنەوەی چەکداریی کوردستان و ڕابەرانی ئەم بزووتنەوەیە و دەمیان ئاوی ئەکرد بۆ ئەو ڕۆژەی ئەوانیش ببن بە

باڵی ڕادیکاڵ و نوێنەری بەرەی چەپ لەناو بزووتنەوەی ناوبراودا. هەر لەو قۆناغەدا بەشێکی زۆر لە ڕابەران و کادری (کارگەران) و کەسایەتیی چەپی تر پەیوەست بوون بە ڕیزی پێشمەرگایەتیی یەکێتی نیشتیمانیەوە بەو بیانووەی کە هێزێکی بەرەییە و هەمە فکری تیایدا جێی ئەبێتەوە و جەلال تالەبانی خاوەنی عەقلیەتێکی دیموکراتیکە و ... تاد.

دیارە قسەکەی من بەومانایە نیە کە بە موتڵەق نەئەبوو دەست بۆ چەک و خەباتی چەکداری ببرایە لە بەرانبەر هەوسارشکێنیی بێ وێنەی فاشیزمی دەسەڵاتداردا، بەڵکوو باسەکەم لەسەر ئەوەیە کە چۆن لە پرۆسەیەکی شێنەیی و گوماناویدا، جا بە پلان و نەخشە بوو بێت یا وەکوو هۆ و ئاکامێکی مەنتیقی، بزووتنەوەی چەکداری ڕۆڵی بینی لە متبوون و خۆشکردنی زەمینەی خامۆشکردنەوەی خەباتی مەدەنی و جەماوەریی شارەکاندا کە بەتایبەتی لە نیوەی یەکەمی هەشتاکاندا زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گرتبۆوە.

کوردستانی عێراق لە هەشتاکاندا زۆر گۆڕابوو لەچاو شەستەکانی هەمان سەدەدا و سیمای شارنشینی بووبوو بە خەسڵەتی دیاری. هەشتاکان جگە لە زۆربوونی دانیشتوان، ئاڵوگۆڕی ڕیشەیی لە پێکهاتەی کۆمەڵگادا بەدی هاتبوو. چینی ناوەندی و توێژی خوێندەوار و لاوان و خوێندکاری زانکۆ جگە لەوەی قورساییەکی کۆمەڵایەتی بەهێزیان پەیداکردبوو، ببوون بە بڕبڕەپشتی جموجۆڵی سیاسی و کارلێکی فکری و جەزبی دەیان ڕەوت و بیروباوەڕی تیۆری ببوون لە بوارەکانی سیاسەت و فکر و ئەدەب و هونەردا. جۆش وخرۆشێکی کەم وێنەی شۆڕشگێڕانە و داینامیزمێکی بەهێز لە دەروونی ئەو توێژانەدا قوڵپی ئەدا. ئەو جموجۆڵ و فەزا فکری و سیاسیە، فەزا وهێزی خێڵەکی وتەقلیدیی وەکوو پارتی و چەمکگەلێکی وەکوو جەلالی و مەلایی و شیوعیەتە کلاسیکیەکەی حیزبی شیوعیی، تێپەڕاندبوو. ئەم هێزە کۆمەڵایەتیە پڕ لە جۆش وخرۆشە پێویستی بە

رونیـایەکی سیاسـی و فکریـی نـوێ هەبـوو کە نـاکۆک بـێ لە گەڵ دونیـای تەقلیـدیی سیاسـەتکردنی کـوردی. بـزووتنەوە جیهانیەکـان کاریگەرییان هەبوو بەسەر ئاوات و بیر و هەڵوێستی سەدان هەزار کەسـی ڕیـزی ئەم بـزووتنەوەیە. ڕاپەڕینـی گەلانـی ئێـران و (سـەرکەوتنی)، تـاقیکردنەوەیەکی زینـدوو بـوون کە بە بەرچـاوی ئەم ڕیـزە فـراوانەوە ڕوویـان ئەدا. ڕووتێکردنـی سـەدان هەزار گەنجـی کوردسـتان بـۆ مارکسـیەت تەنهـا بەو مانـایە بـوو کە ئەوان بـۆ ڕادیکالترین و گونجاوترین فۆرم و نوسخەی سیاسەتکردن ئەگەڕان کە وەڵامـی ئـاوات و ئومێـدەکانی ئەوان بـداتەوە کە لەلایەن بزووتنەوەیەکـی تەقلیـدیی کـوردایەتیەوە هەرزانفرۆشـکرابوو و تـاقیکردنەوەی ئاشـبەتالەکەی پـارتی لە ویژدانـی سیاسـیاندا هێشـتا زینـدوو بـوو. لەولاشـەوە ئەو ئومێدبەسـتنە بە مارکسـیزم و ڕادیکـالیزمی چەپ بەڕێگەیەکـی کـاریگەر دائەنـرا بـۆ تەیـارکردنی جەماوەری خەڵکی شارەکان بۆ شەڕی دەستەویەخە لە گەڵ بەعسدا، بەمەبەستی ڕووخانی لە هەر وەرچەرخانێکی سیاسیی گونجاودا.

بەڵام ئەبـێ ئەوەش لەیـاد نەکەیـن ئەم ڕووتێکـردن و پێشـوازیە لە مارکسـیزم، تەنیـا لە ڕەهەنـدە سیاسـیەکەیدا بەرجەسـتە ببـۆوە. مارکسـیزم تەنهـا وەکـوو چەکێکـی سیاسـی دەبینـرا، ئەویـش بە شێوەیەکی ڕووکەش، لەبەرانبەر تاقیکردنەوەی تا ئەوکات ڕاسترەوی پارتی و میتۆدی ڕیفۆرمیستیی سۆسیالیزمەکەی حیزبی شیوعیدا و خاڵی دەکرایەوە لە هەموو ڕەهەندە سۆسیۆلۆجی و مەعریفیەکەی.

ئەم وەرچەرخـانە ڕووە و چەپ و مارکسـیەت لە ئاسـتی بەرینـی کۆمەڵـدا، جیـاوازبوو لە مەشـغەڵە وگێنگڵ و گـرێ فکریەکـانی ئـێمەی چەپ و دیاردەیەکی ڕەسەنتری کۆمەڵایەتی بوو گەر لە بواری تیۆری و فکریشـدا لاوازیی هەبـووبێ. بزووتنەوەیەکی وا گەر کەرەستەکانی تـری بـۆ دابینبکـرایە، ئەیتـوانی دواتـر لەپرۆسـەی گەشـە و کـارلێکی داینـامیکی خۆیـدا ئەو لاوازیە سـانەویانەی فکـر و تیـوری پڕبکـاتەوە،

بەڵام ڕەوتە مارکسیەکەی ئێمە نەیئەتوانی و فیعلەن نەشیتوانی ئەو لاوازیە کۆمەڵایەتیە پڕ بکاتەوە. زۆر کەس و لایەن بە نادروستی و بەمیتۆدێکی میکانیکی و ڕستەی پان وپۆڕ ئەو کیشەیەیان بە پەیوەندیی نۆرماڵی نێوان تیۆری وپراتیک لێک ئەدایەوە و سەرەنجامیش نەیانتوانی بگەن بە نهێنیی ئەو پەیوەندیە و بگرە ئاڵۆزتریشیان کرد.

ئەم بزووتنەوە ناڕەزایەتیەی شارەکانی کوردستان، لە ناوەڕاستی هەشتاکان بەدواوە، لە بەر زۆر هۆ، بوو بە هێزی ئیحتیاتی یەکێتی نیشتیمانی. ئەوەش جگە لەوەی کە بەمانای دەرکێشانی فتیلی تەقینەوەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی ڕووخاندنی ڕژێم بوو، بۆ خۆشی باشترین دیاری بوو کە بدرێ بە ڕژێمی عێراقی و لە ڕێی خاڵی کردنەوەی شارەکان لەو هێزە شۆڕشگێڕە وتەخت کردنی ڕێگە بۆ داسەپاندنی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق لە کوردستاندا.

## عێراق له سایەی شەڕ لەگەڵ ئێراندا

هەرچی عێراقە ئەوە تایبەتمەندیەکی سەرەتاکانی هەشتاکان جیاواز بوو لە کوردستان کە شەپۆلێک لە هەڵچوونی چەپی و ئازادیخوازانە و شۆڕشگێر و خۆپیشاندانی جەماوەریی ببوون بەخەسلەتی دیاری ئەو قۆناغە. لە باقی عێراقدا ئەم قۆناغە بە سەرەتایەکی بەهێزی وەرچەرخان بەرەو ڕاستڕەوی و بەهێزبوون و تەشەنەکردنی نفووز و بیروباوەڕی ئیسلامی و بەتایبەتیش پەرەسەندنی نفووزی هێزە ئیسلامیە شیعی و سوونیەکان ئەژمار ئەکرێ. ئەو جیاوازیەی فەزای سیاسیی کوردستان لەگەڵ خوارووی عێراقدا زیانی زۆری بۆ بزووتنەوەی دژە ڕژێمی خەڵکی عێراق هەبوو. کوردستانی بێ بەشکرد لە هاوتا و هاوسەنگەرێکی چوونیەکی عێراقی و هێز و بزووتنەوەیەکی ئازادیخواز. بیانوویەکیشی دایە دەست هێزە نەتەوەییە کوردیەکان بۆ وەرچەرخانی زیاتر بەلای ڕاست و پەیڕەوی لە سیاسەتی شۆڤێنیستی. باقی عێراقیشی کرد بە گۆڕەپانی هەڵسووڕانێکی کوێرانە وتووندڕەو و ملهوڕانەی هێزە سیاسیە ئیسلامیەکان. بەوجۆرەش و لە سایەی شەڕ لەگەڵ ئێراندا ڕژیم توانی بە سەرکوت و دیکتاتۆریەت وهەروەها بە سوودوەرگرتن لە وابەستەیی هێزە ئیسلامیە شیعیەکان بۆ ئێران، هەموو جموجۆڵێکی ناڕازی لە وڵاتدا خامۆش بکا و لە چاڵی بنێت و جەماوەی عێراقیش بخاتە بەردەم تەنها دوو بژاردەوە: یا بوون بە بەشێک لە سوپا و ماشێنی زەبەلاحی کوشتار و شەڕی ڕژێم لەگەل ئێراندا یا بوون بە خۆراکی ئیعدام و سەرکوت و زیندانەکان.

پلانی بەعس ئەوەبوو کە بە بیانووی هەڵگیرسانی شەڕ لەگەل ئێراندا، لە ناوخۆی عێراقدا، چەند ئامانج بپێکێت:

**یەکەم:** لەڕێی میلیتاریزەکردنی سەرجەم کایەکانی ژیان بە بیانووی شەڕەوە، کونج و کەلەبەرێک بۆ سیاسەتکردن چ بۆ هێزە سیاسیە نەیارەکانی ناوخۆ و چ بۆ تاکی عێراقی نەهێڵێتەوە، وکایەی سیاسەت بە مەفهوومێکی تەواو تۆتالیتاری، لەلایەن دەوڵەتەوە زەوت بکات.

**دووەوم:** دەیان موالیدی ڕاپێچی بەرەکانی شەڕ و سەربازی کرد و ئەوەشی لە فەرمانگە و زانکۆ و شوێنە مەدەنیەکاندا بوایە بەزۆر ئەیکردن بە (الجیش الشعبي) و لەپەنای ئەوانەشدا دەیان دەزگای تری وەکوو (الحرس الخاص) و (الحرس الجمهوري) و موخابەرات و دەزگای تری چاودێری و سەرکوتی دامەزراند و کۆنەکانیشی زۆر زەبەلاحتر کردن.

**سێیەم:** دامو دەزگا و ڕێکخراوە مەدەنیەکانی تریشی بەتەواوی میلیتاریزەکرد وەکوو قوتابیان و لاوان و ژنان و نووسەران و هونەرمەندان ... تاد، و هەموویانی ڕاستەوخۆ کۆنترۆڵکرد و ڕایکێشانە ناو کایەی سیاسەت بۆ خزمەتکردن بە پلانە جەهەنەمیەکەی خۆی.

**چوارەم:** لە کوردستاندا جگە لە سەپاندنی کەش وهەوای شەڕ و کوشتار و سێدارە، سەدان هەزار چەکداری بەناوی (افواج الدفاع الوطني) و (المفارز الخاصة) دامەزراند، کە لە ژێر سەرپەرشتیی ڕاستەوخۆی دەزگاکانی ئیستیخبارات و ئەمندا لە دژی بزووتنەوەی چەکداری کوردستان و خەڵکی ناوشارەکان بۆ سەرکوت بەکارئەهێنران.

**پێنجەم:** لەڕێی کڕین و ڕاپێچکردنی نوخبەی ڕۆشنبیری سەرجەم بوارەکانی ئەدەب و هونەر و ئەکادیمیەوە، بەعس زۆر فراوانتر لە چاو حەفتاکاندا، بواری ڕۆشنبیری و فکریی بەتەواوی کۆنترۆڵکرد و خستیە خزمەتکردن بە کامڵبوونی ئایدیۆلۆجیەکی تەواو فاشیستی موتوربەکرابوو بە ناوەڕۆکێکی عروبیی ڕاسیستی وشۆڤێنی و تایفیەوە. ئەدەبی جەنگ و قادسیە وگۆرانیی جەنگیی ئەو سەردەمە

نموودێکی زەقی ئەم ئایدیۆلۆجیە نوێیەی حوکمی شمولیی هەشتاکانی ژێـر هەیـمەنەی (صـدام) بـوون کە بـۆ یەکەمینجـار ئەم ئـاڵوگۆڕە فەرهەنگیە بەشێوەیەکی بەربڵاو کوردستانیشی گرتەوە و فشـاری بۆ ئەدەب و ڕۆشنبیریی شۆڕشگێڕ و بەرگری هێنابوو.

**شەشـەم:** تۆتالیتـاریزم بەبـێ داگیرکردنـی کـایەی عەقـڵ نـاتەواو ئەمێنێتەوە بۆیە هەموو ئەوانە پێویستی بەدەزگایەکی میدیایی پان و پـۆڕ و چـالاک بـوو کە بتـوانێ تـا نـاخی ئینسـانی عێراقـی ڕۆبچـێ. (صـدام) دوای بـودجەی شــەڕ زۆرتـرین بەشــی داریـی وڵاتــی بـۆ بوارەکانی ئەدەب و هونەر و ڕۆشنبیری و میدیایی تەرخـان ئەکرد و هەر بەڕاستیش لەپاڵ دەزگای سـەرکوتدا ئەم دەزگایـانەی خەرەفاندن و مێشـک شـتنەوە ببـون بە کۆڵەکەیەکی مـانەوە و بەرهەمهێنـانەوەی دەسەڵاتی صدام و ئایدیۆلۆجیی بەعسی هەشتاکان.

بەڵام گەورەتـرین هەڵەی کوشـندەی (صـدام) وەهمەکـانی خـۆی بـوو. ئەو پێیوابـوو کە شـەڕ لە گەڵ ئێرانـدا بە پاشەکشـەیەکی سـەربازی و سازشـێکی گەورەی ئەو وڵاتە دوایـی دێـت و مەرامەکـانی صـدام، بـۆ هەیمەنەکردن بەسـەر نـاوچەی کەنداو و پڕکردنەوەی بۆشـایی دوای شـای ئێـران، لە ڕێـی هەڵوەشـاندنەوەی پەیمـانی جەزائیـر، بەئاسـانی بەدی دێن.

صـلاح عمـر العلـي کە یەکێکە لە سـەرکردە هەرە کۆنەکـانی بەعـس و هـاوڕێی صـدام تـا ١٩٨٢ ئەگێـڕێتەوە کە لە دانیشـتنێکی دوو قۆڵیـدا (هەوڵــی داوە پــێش هەڵگیرســانی شـــەڕ قەنــاعەت بە صـــدام بکــات پەیوەندیەکی نۆرمـاڵ لەگەڵ کۆمـاری ئیسـلامیی ئێرانـدا دابمەزرێنێت). پاشـان صـلاح ئەڵـێ صـدام وەڵامـی دایەوە (صـەڵاح گـوێ بگـرە. ئەم فرسەتەی بۆمان هەڵکەوتووە ڕەنگە ١٠٠ ساڵی تر ڕێنەکەوێتەوە. مـن ملی ئێرانیەکان ئەشکێنم). پاشـان صدام ڕوو ئەکاتەوە ئەو سـەرکردە بەعسـی و هـاوڕێیەی و ئەڵـێ (نـامەوێ جـارێکی تـر گـوێم لەم جـۆرە قســانە بێــت ســەبارەت بە چــارەی ئاشــتیانە و یەکلاکــردنەوەی

کێشـەکانمان لەگەڵ ئێرانـدا. ئەبینـی چـۆن ملـی ئێرانیەکـان ئەشـکێنم و دوا بستی موحەممەرەش ئەگێڕمەوە). غسان شربل، العراق من حرب الی حرب، صدام مر من هنا. ص ١٦.

سـەیر ئەوەیە ئەو قسـانەی صـدام لە پەراوێزی بەشـداریی لە لـوتکەی وڵاتـانی بـێلایەن کـراوە لە سـەبتەمبەری ١٩٧٩ لە هاڤانـای پـایتەختی کووبـا پـاش ئەوەی چـاوی ئەکەوێـت بە ئیبـراهیم یەزدیـی وەزیـری دەرەوەی ئەوکـاتی ئێـران. صـلاح عمـر العلـی کە کۆبـوونەوەکەی ڕێکخستووە ئەو کاتە نوێنەری عێراق ئەبێت لە نەتەوە یەکگرتووەکـان وئامادەی کۆبوونەوەکەیان بووە و بە کۆبوونەوەیەکی سـەرکەوتوو و ئەرێنی باسی ئەکات.

ئەوەش بەڵگەیەکی ترە کە صدام بژاردەی شـەڕی لەگەڵ ئێرانـدا یەک سـاڵ پێشـتر هەڵبـژاردووە وەکـوو ئامرازێـک بـۆ پێناسـەکردنەوەی سـەرجەم بـارودۆخی سیاسـیی عێـراق و بەرقەرار کردنـی دەسـەڵاتی تۆتالیتـاری وەکـوو سـەرەکیترین ئامـانج تـا ئەو جێـیەی بە قـازانجی مەرامەکانی ئەو لە ناوخۆی عێراقدا ئەگەڕێتەوە.

بۆ ئەوە باڵانسی نێوان شـایەدیی سیاسـی و یادەوەریەکـان لاسـەنگ نەبێ بـا تـۆزێ بگەڕێینەوە یادەوەریەکـانی ئەو ڕۆژگـارە و ئەڵقەکـانی باسەکە پێکەوە گرێ بدەمەوە.

کە پێمان نایە سـاڵی خوێندنی ٨٠-٨١ و گەڕامەوە بۆ خوێندن، بەغدا بەتەواوی بۆنی باروتی لێ ئەهات. فەزای شـەڕ و لافیتە و دروشـم و وێنە وپەیـکەری صـدام ئیحـای ئـاڵوگۆڕ و بەسـەرچوونی قۆناغێک و دەسپێکردنی یەکێکی نوێیـان ئەچرپاند بەگوێدا. سـەرانی ڕژێم بەپێی ئەو سـتراتیجەی لای خۆیـان دایانڕشـتبوو، پێیـان وابـوو کە شـەڕ بەم زوانە بە سـەرکەوتنی عێـراق دوایـی دێـت، بۆیە سـەرباری سـەپاندنی کەشـوهەوایەکی عەسـکەری، بەڵام ئەیانویسـت وا نیشـان بـدەن کە گەشـە و بەرنـامە ئابووریەکـانی وڵات پەکیـان ناکەوێـت و پـرۆژەی ئاوەدانکردنەوە و جوانسازیی شارهەر بەردەوام بوو.

## موسا عومرانی خەڵکی زوبێر چۆن بوو بە پاسۆک!!

ساڵی خوێندنی ٨٠-٨١ هەر لە سەرەتاوە بە گێچەڵی ئەوە دەستی پێکرد کە بۆ نابم بەبەعسی. من هەر یەکەم ساڵ بۆم دەرکەوت کە لەکۆی ١٢٠ قوتابیی پۆلەکەمان ١١٨ لەو قوتابیانە بەعسی بوون و بەشداریی کۆبوونەوەیان ئەکرد. تەنها من و کوڕێکی شیعەی نەجەفی مابووینەوە کە ئەویش کۆتایی ساڵ ڕاپێچی زیندان کرا و ئیتر (عبدالحسین)م نەدیتەوە و تەنها خۆم مامەوە. عەدنان ناوێک کە کوڕێکی عەرەبی کەرکووکی بوو یەک دوو جار بەبیانووی ئەوەی خەڵکی یەک شارین ئەهاتە لامەوە و تا جارێکیان وتی: وەکوو بزانم تۆ ئەندامی حیزب نیت و ئایا بۆ نابیت بە ئەندام؟ منیش لە بەرامبەر ئەو داوا لەناکاوەدا هەر وەڵامە سواوەکەی جارانم شک ئەبرد و وتم: زۆر خۆشیم بە سیاسەت و تووخن کەوتنی ناکەم و ئەویش درێژەی پێ نەدا تا چەند مانگی تر جارێکی تر پێش دەسپێکی موحازەرە عەدنان دیسانەوە تەکلیفێکی تری کردەوە و منیش بابەتەکەم کردە سوعبەت و گاڵتە و ناڕاستەوخۆ خۆم دزیەوە و ئیتر کەس بڕای ببڕ تەکلیفی وای لێ نەکردمەوە.

پەیوەندی ڕێکخراوەییم لەگەڵ کارگەراندا هەر لەڕێی جبار مستەفاوە بوو وهاوینی ئەو ساڵە لە سلێمانی چاوم پێکەوت. لە بیرمە جەبار مانگی ١١ی ئەوساڵە ئەو هات بۆ بەغدا و چەند ڕۆژ مایەوە و دیاربوو دۆست و ئاشنای تریشی لە زانکۆکانی تر بەسەرئەکردەوە. ئەمجارە جگە لە باسی چالاکی و ڕێکخستن و کارەکانی من لە بەغدا دوو کەسی تازەی پێ ناساندم.

یەکەمیان (موسی عمران) بوو کە بەسەرهاتێکی دوور و درێژی هەیە. موسا قوتابی بەشی زمانی ڕووسی بوو لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدا کە ئەو سەردەمە لە (باب المعظم) بوو. پێموابێ ئەوکاتە لە ساڵی سێیەم بوو و خوشکێکیشی هەر لە ئاداب ئەیخوێند. ئەو عەرەب و خەڵکی قەزای (الزبیر) شاری بەسرە بوو و ئەو زەمانەی ماڵی جەبار بەهۆی ئیشی باوکیەوە گوێزابوویانەوە بۆ زوبێر لەوێ ببوون بە هاوڕێ. جەبار وەکوو ئوسوڵی کاری ڕێکخراوەیی ئەوکاتە هەندی سەرنجی لام باسکرد سەبارەت بە موسا کە لە پەیوەندیماندا لەبەرچاویان بگرم. هەروەها وتیشی کە موسا کەسێکی مارکسیی چالاک و بزێوە و تابلێی ئەهلی قسەی خۆش و دۆستایەتیی زۆر خۆشە.

دووەمیان کوڕێکی تر بوو کە خەڵکی (الثورة) بوو و ئەویش هەر گەنجێکی هاوتەمەنی خۆم بوو کە بە ناوی (عادل) پێمی ناساند، بەڵام زانیم کە ئەوە تەنیا ناوێکی خوازراوە. ئەمیان پیشەی کرێکاری بوو و زۆر چالاک و شارەزای بەغدا بوو. جارێکیان لە شەقامی ڕەشید پێکەوە بەدەم پیاسەوە قسەمان ئەکرد گەیشتینە بەردەم بینایەی (مدیریة الاحوال المدنیة العامة) کە سەربەوەزارەتی ناوخۆ بوو لە خوار بینایەی (حافظ القاضي)یەوە وتی: هاوڕێ ئەمە بە ڕواڵەت دائیرەیەکی مەدەنیە بەڵام ژێر زەمینەکەی زیندانی نهێنییە. عادل گەرچی کرێکار بوو، بەڵام خاوەنی ئاستێکی ڕۆشنبیریی بەرز بوو کە زۆر جا ئەکەوتینە گفتوگۆ ئیتر لەبواری سیاسەتەوە سەری ئەکێشا بۆ ئەدەب و ڕۆمان بەتایبەتی و دیاربوو هوشیاریەکی زۆر باشی هەیە و لە ڕووی پاشخانی سیاسیەوە، پێشتر سەر بە قیادە مەرکەزی بوو، بەڵام ئێستا تەواو لەڕووی بیر و هەڵوێستی سیاسیەوە ڕێک وەکوو ئێمە بوو.

ئەو پەیوەندیانە بۆ من هەم نوێ بوون و هەم بایەخی زۆریان هەبوو، چونکە پەیوەندیی سیاسیی زەمانی ئەبووغرێبی لێدەرچێت کە

دۆســـتایەتیی نـــزیکم لەگەڵ گرووپێکـــی زۆری هـــاوڕێی مارکســـیی عەرەبمـان هەبـوو، بـاقیەکەی هەمـوو چـالاکی وپەیوەنـدیەکانم لەگەل کەسانی کورددا بوو.

موسا هێندە بزێو و بەجۆش بوو کە ببو بە مـایەی ترس و دڵەڕاوکێ بـۆم. بەهـۆی سـەردانەکانی بـۆ بەشـی نـاوخۆیی بـۆلام هەنـدێ لە هاوڕێکانی تریشم ئەیانناسی. ئەم کەسایەتیەکی مارکسیی تەقلیدی و کلاسیک بوو، بەڵام تایبەتمەندی ئەوە بوو کە زۆر دۆست و لایەنگری کـورد و مەسـەلەی کـورد بـوو بەجۆرێـک کە تووشـی تێڕوانینێکـی پۆپۆلیسـتیی ببـوو سـەبارەت بە کـورد. پەیوەنـدیەکی فراوانـی هەبـوو لەنـاو قوتـابیە کوردەکـانی سـەرجەم کۆلێجەکـانی زانکـۆی بەغـدا و بەتایبەتی کۆلیجی ئاداب. لەگەڵ قوتـابیە کوردەکاندا سـەفەری هەمـوو شارەکانی کوردستانی ئەکرد و ببوو بە کەسـایەتیەکی خۆشەویستی ناوەندی قوتابیانی کوردی بەغدا. تەقەیەک لە کوردستاندا بکرایە بۆ سـبەی موسـا هەمـوو دونیـای تـێ ئەگەیانـد. نـاوی سـەرتیپ و کەســایەتیەکانی هێــزی چەکــداری کــۆمەڵەی هەمــوو ئەزانـــی و بڵاوکـراوەی ئەوانیشـی دەس ئەکەوت. زۆر موعجیـب بـوو بەخەبـاتی چەکـداری و پێشـمەرگایەتی وچەک و چـۆڵ و لێـدانی چەکـدارانە لە حکوومەت. پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ بەرەی میلیی ڕزگـاریی فەلەستین (الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين)ی جەماعەتی جۆرج حەبەشـدا هەبـوو و چووبـــووە خێوەتگـــا و خـــولی سیاســـی و ســـەربازیی ئەوانەوە. کـوردییەکی باشـیش فێـر ببـوو. ئەو سروشـتە بزێـو و جەنجـاڵیەی کێشـــەیەک بـــوو کە بەمـــن کـــۆنترۆڵ نە ئەکـــرا. هەوڵـــی زۆرمـــدا کە ســـەرنجی بـــۆ کۆمەڵێـــک کـــار و بـــابەت و مەیـــدانی تـــری بایەخـــدارتر ڕاکێشـم بـێ فایـدە بـوو. ترسـی ئەوەم بـوو وەکـوو بۆمبێک ڕۆژێـک بگیـرێ و خـراپ بتەقێتەوە بەو هەمـوو پەیوەنـدی و ناسـیاوی و ئەم شار و ئەو شارکردنانەیدا. لێی دڵنیا بووم کە تا بڵێی کەسێکی پاکە و کێشەی لەو بارەوە نیە بەڵام تیپێکی زۆر تایبەت بوو. ئاخر و ئۆخری

ساڵی خوێندن و ماوەیەکی کەم پێش کۆتایی ساڵ بیستم موسا گیراوە و لە ئەمنی عامە زیندانە. ماوەیەک خۆم ونکرد و هەر لەو سەروبەندەشدا بوو کە هاوڕێم "مارف عومەر گوڵ"یش گیرا و پەیوەندیی سیاسی و باس و خواس و نزیکایەتیم لەگەڵ ئەویشدا خۆش بوو. وا ڕێکەوت بەبێ ئەوەی مەوعیدمان هەبێ لەوکاتەدا جەباریش هات بۆ بەغدا و منیش بەووردی باسی کەسایەتیی موسا و گرتنەکەیم بۆ کرد. لە گەڕانەوەیدا جەبارم ڕاسپارد کە لەڕێی برادەرێکی ترەوە لە کەرکووک ماڵی مارف بدۆزێتەوە نەوەک ئاگاداری گرتنەکەی نەبن.

زۆری پێ نەچوو چەند ڕۆژ بەر لە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ کاک مارف ئازاد کرا و منیش هەواڵی موسام لێپرسی بەڵام ئەو هیچی لەوبارەوە نەئەزانی و پیشتریش نەیئەناسی. هەر گوێقولاغ بووم بۆ هەواڵی موسا و مەترسی ئەوەی گرتنەکەی تەشەنە بکات و بێتەسەر منیش بۆیە کە ئەڕۆیشتم بۆ ئیمتیحانەکان کردبووم بە شیعاری ئەو چەند ڕۆژە کە بایی دەرچوون بنووسم و لەوە زیاتر نەمێنمەوە لەو دەوروبەرە لە ترسی گرتن. لە زانکۆکانیشدا وا باو بوو کە سەروبەندی تاقیکردنەوەکان ئەمن زیاتر کەڵکیان وەرئەگرت بۆ گرتن، چونکە هەموو کەس ناچارە کە دەوام بکات و ئامادە بێت. عبدالحسێنی شیعەی هاوپۆلیشم هەر لەوسەروبەندی ئیمتیحاناتەدا گیرا و نەهاتەوە. باش بوو کوڕێکی تری قوتابیی ئادابی بەغدا کە ئەویش کورد بوو ئازاد کرا و لای دۆستێکی خۆم گووتبووی: موسا هێشتا لە ئەمنی عامەیە بەڵام تەحقیقی تەواو بووە و زۆر خۆڕاگرە و مەعنەویاتی باشە و باسی کەسی نەکردووە.

پێش نیوەی ساڵی خوێندنی ٨١-٨٢ لەبەر زۆریی کتێب و بڵاوکردنەوە لامان، لەگەڵ مەمەند بایز و عەلی سمایلدا بڕیارماندا چیتر لە بەشە ناوخۆییەکان نەمێنینەوە. لەڕێی برادەرێکەوە ژوورێکمان لە ماڵێکدا دەستکەوت لە نزیک (ساحة الخلاني) کە تا

کۆتـایی ئەو سـاڵە لەوێ مـاینەوە و گەرچـی لە کـۆلێجی یاسـاوە لە وەزیـریەوە دوور بـوو، بەڵام لە بەر ئاسایشـی ژیانمـان ئەوێ باشـتر بوو.
پاش ماوەیەک کە من لە هاوینی ١٩٨٢ فەرمانی گرتنم بۆ دەرچوو و کۆلێجی یاسام جیهێشت زانیم کە موسا حوکمی هەمیشـەیی دراوە و لە زینـدانی ئەبـووغرێبە. ئیتـر کە مـن دواتـر ئیختیفـام کـرد ڕۆژێکـی بەهــاری ســاڵی ١٩٨٥ لە گەڵ جەبــار مســتەفادا بــۆ مــاڵی ئەوان دەگەڕاینەوە، لووتمان تەقی بە لووتی موسادا. دیار بوو بە ناوونیشان مـاڵی جەبـاری دۆزیبۆوە. دوای بـاس و خواسـی چەنـد سـاڵی زینـدان وتـی: کە بەرلێبوردنێـک کەوتـووە و ئێسـتاش ڕایکـردووە و ئەیەوێ ڕەوانەی دەرەوەی بکەیــن وبەرنــامەی ئەوەیە کە لەڕێــی حیزبــی شـیوعیەوە بـڕوات بـۆ یەمەنـی خـواروو. مـن و جەبـار پێشـنیاری ئەوەمان بۆ کرد کە بینێرین بۆ پێشمەرگایەتیی کۆمەڵەی ئێران، بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ڕاکەی خۆی. چەند ڕۆژ دواتر لەڕێی "شـەهید نەجاتی موهەندیس"ەوە ڕەوانەی گونـدی سـوێراوای قەرەداغمـان کـرد و لەوێوە خزمەکانی نەجات گەیاندبوویانە لای حیزبی شیوعی. دواتر بیستمانەوە لەبەر خۆشەویستیی خۆی و بەو کاراکتەرە کۆمەڵایەتیە زینـدووەوە کە هەیەتـی ببـوو بە کەسـێکی خۆشەویسـتی دێهاتەکـانی نـاوچەی قەرەداغ. ئیتـر هەواڵـی موسـا نەمـا و لە کـاتی ئەنفـالەکە هەر دڵمـان لای بـوو بەڵام دڵێکمـان بەوە خـۆش ئەکـرد کە بـۆ یەمەن یـا دەرەوەی عێراق ڕۆیشتبێت. لە دوای ڕاپەڕین ساڵی ١٩٩٢ سەردانێکی هـاوڕێ کـاوە مەحمـوودی حیزبـی شـیوعیم کـرد لە هەولێر و هەواڵـی موسـام لەو پرسـی. ئەو ووتـی: موسـا پێشـمەرگەیەکی خۆشەویسـتی حیزبی شیوعی بوو، بەڵام پێش ئەنفـال بـوو بە پاسـۆک و لە شـەڕێکدا وەکـوو پێشـمەرگەی پاسـۆک شـەهید کـرا! ئەو هەواڵە جگە لەوەی بـۆ مـن ناسـۆرێکی دڵـتەزێن بـوو، بەڵام زۆریـش سـەیر و یەکێکـی تـر لە بەزمەکانی موسا بوو. بۆم دەرکەوت کە موسا ئەوەندە سەرسـەختانە

لایەنگــر و بەرگــریکەر بــوو لە مەســەلەی کــورد ولە دژی ســتەمی نەتەوەیــی بــوو لە کوردســتاندا، پێــی وابــوو پەیوەســت بــوون بە پاسۆکەوە بەرزترین ئاستی دڵسۆزی و وەفایە بۆ خەڵکی کوردستان!!

## گێچەڵی سەرلەنوێی ئەمنی کەرکووک!!

ماوەیەک بوو وەزعی خێزانیمان بەرەو جۆرێک لە ئارامی و باشی ئەڕۆیشت ودوای تەواوبوونی ساڵی خوێندن گەڕامەوە بۆ کەرکووک. هاوینان زۆر لە کەرکووک نەئەمامەوە وزووو زوو سەردانی سلێمانی و هەولێر و دهۆکم ئەکرد. ماوەیەکی باشیش بوو لەلایەن ئەمنەوە کێشەم بۆ نەهاتبووە پێش ومالەوەش دڵیان بەوە خۆشبوو کە لەوبارەوە بێ کێشەن. خۆشم هەستم بە جۆرێک لە دڵنیایی دەروونی ئەکرد و پێموابوو ئەوە دەستیشم ئەکاتەوە بۆ هەڵسووڕانی زیاتر گەرچی بەهۆی دەوامی بەغداوە زۆربەی پەیوەندیەکانم کەوتبوونە دەرەوەی کەرکووک.

هاوینی ١٩٨٢ تازە لە سلێمانی گەڕابوومەوە هەواڵیان بۆ ماڵەوە هێنابوو کە باوکم لە دهۆک تووشی کێشەی دڵ بووە وئێستا لە نەخۆشخانە لەژێر عیلاجدایە. لەگەڵ عادلی برام و کاک مستەفای خزمماندا عەسرێکی درەنگ بە سەیارەکەی عادل بەڕێکەوتین بەرەو دهۆک، بەڵام بەهۆی شەڕ و داخستنی سەیتەرەی کەرکووک – هەولێر گێڕامانیانەوە. ئێمە ڕێگەی دوبس – ئاڵتوون کۆپریمان گرتە بەر و ئێوارەکەی گەیشتینە خەستەخانەی گشتیی دهۆک وپاش مانەوە لای باوکم و دڵنیابوون لەوەزعی تەندروستیی ئەو شەو چووینە ماڵی کاک ئەسکەندەری ناسیاومان و بۆ ڕۆژی دواتر گەڕاینەوە و چونکە ماڵی عادلی کاکم گوێزابوویەوە هەر لەسەر کۆڵانەکە منی داگرت و ڕۆیشت. لە ماڵەوە دایکم پاش پرسیاری هەواڵی باوکم وتی: ئەمڕۆ زیاتر لە ٥ جار ئەمن هاتوونە بەدواتا و

وتوویانه زوو بێت بۆ ئەمنی کەرامە. هەر کەس و کاریش وتیان دوێنێ کە ئێوە لە دهۆک بوون لە سەرووی ماڵی خۆمانەوە تەقەکراوە لە چایخانەی ئەشرەف و دەسرێژ لە ئەمنی کەرامەش کراوە. من زۆر لە خۆم دڵنیا بووم کە ئەو جۆرە کارانە دوورە لە دەوروبەرە سیاسیەکەی من و دۆست و هاوڕێی منەوە، بەڵام بە پەلەش سەری برادەرێکی خۆمم دا تا زیاتر لە وەزعەکە دڵنیا بم و ئەویش هەر هەمان هەواڵی لابوو. چەند خولەک دوای ئەوەی کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە لە دەرگایان دا وتیان ئەوە موەفەق و چەند ئەمنێکن و داوای تۆ ئەکەن. دیسانەوە بردمیانەوە بۆ جێی جاران و بۆ لای عبدالرەزاقی بەڕێوەبەری ئەمنی کەرامە. ئەو سوورهەڵگەڕابوو و نەڕاندی ئەم بەزمە چیە؟

– بەزمی چی و من ویستم پرسیار لە تۆ بکەم کە بۆچی ناردووتانە بەدوامدا؟

– ئەو تەخریبەی دوێنێ چی بوو و بۆ خۆت شاردۆتەوە؟

– خۆم لەچي شاردۆتەوە؟ من باوکم لە خەستەخانەی دهۆک کەوتووە و چووم بۆ سەردانی ئەو و ئەتوانیت پەیوەندی بە خەستەخانەکەوە بکەیت تا ڕاستیت بۆ دەرکەوێت.

من لەم بگرە و بەردەیەدا بووم لە گەڵ عبدالرەزاق و بێ منەت قسەم ئەکرد، چونکە خۆم زۆر بەدوور ئەزانی لەوجۆرە کار و چالاکیانە بەڵام چووزانم، کە سەلمانی برام (پۆلا) یەکێک لە ئەنجامدەرانی ئەو هێرشە بووە بۆ سەر چاخانەکە و ئەمنی کەرامە ومنیش وا بە پێی خۆم و بەو هەموو گومانەوە کە ئەمن لەسەر من هەیانە، هاتوومەتە بەردەستیان. بەڵام بۆ شانسی من ئەوە باش بوو کە هێشتا بکەرەکانی کردەوەکەیان کەشف نەکردبوو.

دوای بگرە و بەردەیەکی زۆر و سەلماندنی ئەوەی کە من هەر لەم شارەش نەبوومە و دوورم لە ئەجوائی لەو جۆرە هەڵیدایەوە و وتی:

بەشەرەفم گەرچی ئاگادار نیت، بەڵام گەر بتەوێ هاوکاریمان بکەیت ئەتوانین بکەری ئەو هێرشە تەخریبیە دەسگیر بکەین.
وەڵامم دایەوە: من ئەڵێم هێشتا نازانم تۆ باسی چی ئەکەیت و سەدان کیلۆمەتریش لەم شارەوە دووربووم، منێک کە هیچ دەسەڵاتێکم نەبێ هاوکاریی چیتان بکەم؟
دیاربوو کە هێشتا هیچ سەرەداوێکیان لە بارەی کردەوەکەوە دەس نەکەوتووە و منیش ڕێگەم درا بگەڕێمەوەماڵەوە و پێموابوو ئەستۆپاکیی خۆمم سەلماندووە جا با هەر بێنەوە بەشوێنمدا. ئەوەی بیرم لێ نەکردبۆوە ئەوە بوو سەلمانی برا بچووکم کە بەتەمەن لەخوار ئیحسانی لەمن بچووکتریشەوە بوو، کاری وا بکات.
گەڕامەوە ماڵەوە ئیحسانیش لەماڵەوە لەگەڵ دایکما چاوەڕێم بوون و بە پێکەنین و گاڵتەوە مەسەلەکەم بۆباسکردن و لە وەڵامی هەواڵ پرسینی سەلمانی برامدا وتیان بە قسەی خۆی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا چوون بۆ گەشتی هاوینەهەوارەکانی لای هەولێر. لەم قسە و باسانەدا بووین لە دەرگا درایەوە ئینجا داوای ئیحسانیان کرد و بردیان. ئەو هەم گومانی لە خۆی نەبوو و هەم بەهۆی پیشەی دوکانەکەیەوە کە کارگەیەکی ئاسنگەری بوو لە بەرچاوی ئەمنەکان بوو وکەمتر جێی گومانیان بوو. لەوکاتەدا بەهمەنی شاگردی دوکانیش بۆ سەردانی ئیحسان هاتبوو و مەسەلەکەمان بۆ باسکرد. ئەو وتی نەوەک تووشی بەزمێکی بکەن مفەوەزێکی ئەمنی عەرەب هەیە بەناوی ڕەبیع کە زۆر جا دێتە لامان دائەنیشێ با بچین ئاگاداری بکەینەوە لە بردنی ئیحسان و پێکەوە ماڵەکەیمان لە گەڕەکی حورِیە دۆزیەوە و کابرا لای سەیر بوو کە ئێمە سەردانی ماڵی ئەو بکەین، بەڵام دیار بوو بەهمەنی لە دووکان بینیبوو وئەو منی وەکوو برای ئیحسان پێ ناساند وتێمان گەیاند کە بۆچی هاتووین. ئەویش زۆر بەرێزەوە بەدەممانەوە هات و وتی: ئەو گەڕەکانەی لای ئێوە مەڵبەندی زۆر کێشەن و چەند جار بە ئیحسانم وتووە بۆ ناگوێزنەوە

و بچن له‌ تسعین یا ڕێی به‌غدا خانوویه‌ک بکڕن. منیش کردمه‌ گاڵته‌ وتم: وای لێ ئه‌که‌ین. ئه‌و وتی: من ئێستا ئه‌یدۆزمه‌وه‌ و بڕوا ناکه‌م له‌ گومان زیاتر هیچی له‌سه‌ر بێت. ئێمه‌ گه‌ڕاینه‌وه‌ و زۆری پێ نه‌چوو ئیحسانیش خۆی کرده‌وه‌ به‌ماڵدا و هه‌مان سین و جیمی منیان له‌گه‌ڵ ئه‌ویشدا کردبوو و ڕه‌بیع شه‌فاعه‌تی بۆ کردبوو. هێشتا نه‌ ئێمه‌ ڕاستیی مه‌سه‌له‌که‌ ئه‌زانین و نه‌ ئه‌منیش، به‌ڵام گه‌ڕه‌ک و شار شڵه‌ژاوه‌ و قه‌ت کرده‌وه‌ی وا له‌ که‌رکووکدا ڕووی نه‌دابوو. من ڕۆیشتمه‌ ده‌ره‌وه‌ و پاش قه‌ده‌رێک گه‌ڕامه‌وه‌ وتومه‌ز هه‌موو شت لای ماڵه‌وه‌ ده‌رکه‌وتووه‌. که‌سێک که‌ پێ ئه‌چوو که‌ ئه‌ویش له‌ ڕێکخستن بووبێت تازه‌ به‌تازه‌ هاتبوو به‌ مله‌تاتکێ هه‌واڵی ئه‌وه‌ی به‌ دایکم دابوو که‌ سه‌لمان یه‌کێک له‌ به‌شداربووانی ئه‌و هه‌ڵڵا و گۆڵمه‌زه‌ بووه‌. باش بوو کاکم عادلیش هات و ته‌گبیرێکی خێرا و پلانێکی به‌ په‌له‌مان دانا. به‌ کاکم وت تۆ مناڵت ورده‌ و جیابوویته‌ته‌وه‌ ده‌ست له‌ خۆت مه‌ده‌ به‌ڵام له‌ به‌ر ئاستی گه‌وره‌یی ومه‌ترسیداریی کاره‌که‌دا وتی: نا و ئه‌بێ هه‌مووومان ڕاکه‌ین. بڕیارماندا که‌ ئه‌وان هه‌موویان بڕۆن بۆ چه‌مچه‌مال بۆ ماڵی خاڵێکم و منیش به‌په‌له‌ و پێش ئه‌وه‌ی کار له‌ کار بترازێ خێرا بڕۆم بۆ دهۆک و باوکم له‌گه‌ڵ خۆمدا ببه‌م بۆ چه‌مچه‌ماڵ، به‌ڵام به‌که‌رکووکدا نه‌یه‌مه‌وه‌. له‌ چه‌مچه‌ماڵ یه‌کمانگرته‌وه‌ و تومه‌ز هه‌ر که‌ ئه‌منی که‌رکووک ئه‌و شه‌وه‌ سه‌ره‌داوی یه‌که‌میان له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌که‌ ده‌سکه‌وتووه‌ داویانه‌ته‌ سه‌رماڵماندا بۆ گرتنی هه‌موومان. له‌ چه‌مچه‌ماڵیش، که‌ هه‌ر به‌و جلانه‌ی به‌رمانه‌وه‌ ڕامان کردبوو، بڕیارماندا به‌ په‌له‌ ئێره‌ش جێبهێڵین و خۆمان بگه‌یه‌نینه‌ ناوچه‌ی ده‌ره‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاتی حکوومه‌ت.

**کورتەی ئەو ڕووداوەی کە سەلمانی برام تیایدا بەشدار بوو و بوو بە هۆی تێوەگلان و ڕاکردنی خێزانەکەمان، بەپێی گێڕانەوەی خۆی، بەم جۆرە بوو:**

لەدوای تەفروتوناکردنی (کۆمیتەی ئاگر)ی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە کەرکووک و دەسگیرکردنی زۆربەیان لە ساڵی ١٩٨١، چەند شانە و ڕێکخستنی کۆمەڵە ئاشکرا نابن و لە بەهاری ١٩٨٢ دا ئەکەونەوە ڕێکخستنی خۆیان. سەلمانی برام لە یەکێک لەو شانانەی کۆمەڵەدا کار ئەکات. دیارە ئەمان بە عەقڵی خۆیان دەیانەوێ هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە گەورەیە بدەن کە بە تەسفیەکردنی کۆمیتەی ئاگر هاتبووە ئاراوە و بە تایبەتیش چالاکیی چەکدار و پێشمەرگانە بۆ ئەو مەبەستە بەکار بهێنن. ڕیکخستنەکانیشیان بەو عەقلیەتەوە کە هەیانبووە، پێداگریی زۆر لەسەر ئەنجامدانی چالاکیی لەو جۆرە ئەکەنەوە و پێیان وایە بەوە ئەو بۆشاییە پڕئەکەنەوە. سەلمانی براشم هەم لەبەرئەوەی وەکوو خێزان لە کۆنەوە کەوتبووینە ناو کار و چالاکیی سیاسی و هەمیش لەژێر کاریگەریی ئەو هەموو ستەم و جەورەی کە دەرهەق بە خەڵک ئەکرێ لەلایەن ڕژێمەوە، لەبەر کەم ئەزموونیی خۆی، ئامادەی هەموو کارێک ئەبێت. پاش ماوەیەک بڕیاری ئەنجامدانی چالاکیەکی پێشمەرگانە دەدرێت و ئەرکی ڕزگارکردنی ئەنجامدەرانی چالاکیەکە و دەربازکردنیان بە ئۆتۆمبێلی تایبەتیی ماڵی خۆمان بەر سەلمان ئەکەوێت.

لە ١٧ ی تەمووزدا زنجیرە پەلامار و چالاکیەکی هاوکات لە کەرکووک ئەنجام ئەدەن و سەلمان ئاشکرا دەبێ و لە ڕێی لەیلانەوە خۆی دەگەیەنێتە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی یەکێتی بێ ئەوەی هیچ کەسێکی ماڵی ئێمە ئاگادار بین. ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە سوود لەوە وەردەگرن کە سەلمان بەو عەقڵیەتەی ئەوکاتەیەوە ئامادەی ئەنجامدانی هەر کارێک دەبێت کە پێی بسپێرن ولەو جۆرە ژینگە سیاسی و نەفسیەدا ڕەفزکردنی ئەرکێکی لەوچەشنە بە جۆرێک لە

خیانەت ئەزانێت. کەم ئەزموونی و دڵسۆزیی ئەو ڕۆڵی گەورەیان بوو لە بەشداریی ئەو لەو چالاکیەدا.
ڕاستیەکەی ئەمە بۆ من زۆر کارەساتێکی لەناکاو و سەخت بوو. هەموو سێ ساڵ بوو لەزیندان ئازادببووم دیسانەوە و ئەمجارە بە ماڵێکی هەشت نەفەریەوە ئەم پێشهاتە ڕوویدا. بەڵام لە هەمووی سەخت تر ئەوە بوو کە من دانووم لە گەڵ یەکێتیدا نەئەکولا و بەهۆی ڕەخنەی ئێمە لە سیاسەت و هەڵوێست و کردەوەکانی ئەوان زۆر لام سەخت بوو ئێستا بڕۆمە شوێنێک کە ئەوان بەو عەقڵە ژەنگ گرتوو و دژی دیموکراتیەوە حاکمی موتڵەقی بن لە کاتێکدا ئەوان لە سەر سادەترین ناڕەزایەتی و ڕەخنە و جیایی سیاسی و فکری زووخاو ئەکەن بە قوڕگی هەموو کەسێکدا. پیش ئەم ڕووداوە هەموو هەوڵێکم ئەدا و ئامادە بووم ئەو هەموو بگرە و بەردەیەی دەزگای ئەمن و ڕاپێچی هەرجارە قەبووڵ بکەم تا ناچار نەبم لە دەستی گورگێک هەڵبێم و بچمە بەردەستی یەکێکی تر کە هەمان زووخاو بکەن بەگەروومدا، بەڵام ئەمجار بە ناوی شۆڕش و خەبات و کوردایەتیەوە ببمە نێچیری بگرە و بەردەی ئەمان وباجی هەڵوێست و بیروباوەڕم قورستر بدەم. دەمزانی خۆشاردنەوە لە دەستی دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێم زۆر ئاسانترە لە خۆدەربازکردن لە دەست یەکێتییەک کە هەم ڕابووردوویەکی هاوبەشمان هەبووە وهەم ئەوانیش پاشخانێکیان هەیە لە بواری کار و هەڵسووڕانی نهێنی و خۆشاردنەوەدا کە ئێستا بۆ سەرکوتی نەیارانی خۆیان بەکاری دەهێنن. بەڵام تازە ڕیش بووە بە تووشەوە ئەبێ شانەی بۆ هەڵگرم و واقیعبینانە بیرێک لە حاڵی هەم خۆم و هەم ئەم ئۆردووی ماڵ ومنداڵە بکەمەوە.
ڕۆژی دواتر بەپەلە چەمچەماڵمان جێهێشت و ڕوومانکردە گوندی خاڵدان لە ناوچەی هەمەوەند. خاڵدان دێی باوانمان بوو و دایکم و باوکم لەوێ لەدایکبوونە و ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەی

یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان بوو. دێیەکە هەمووی خزمی خۆمانن و جارێ بڕیاری یەکجاریمان بۆ نادرێت و زۆر شپرزین. کێشەیەکمان ئەوە بوو کە سەرباری ئەوەی ئەو ماوەیە بەهۆی دووکانی ئاسنگەریەکەی براکانمەوە گوزەرانمان زۆر باش بوو، بەڵام کە هاتینە دەرەوە هیچ پارەی نەختینەمان لە بەردەستدا نەبوو و زۆریش بەشپرزەیی ڕامان کرد و ڕزگارکردنی گیانی خۆمان لە دەستی ئەمن لە هەموو شتێک لەپێشتر بوو. بە هەرحاڵ خۆمان گەیاندە خاڵدان، بەڵام لە بارێکی دەروونی زۆر شپرزە و نالەباردابین. سەلمانی براشم هیچ هەواڵێکی نیە وگەرچی ئەمانزانی خۆی دەربازکردووە، بەڵام چۆن و ئێستا لە کوێیە و کەی دێت بۆ لامان، هیچی لێ نازانین و تا بڵێی بەداخین لێی و تیر و شیری لێ ئەسووین کە بوو بەهۆی ئەم ڕەجاڵی و دەربەدەری و ڕیسکە گەورەیە بۆمان بەتایبەتی کە باش ئەیزانی من لەژێر چ فشار و چاودێرییەکی دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێمدام و چۆن بۆ بچووکترین بیانوو ئەگەڕێن لێم. کەس و کار هیچ شتێک نازانن سەبارەت بە هەڵوێستی من بەرامبەر بە یەکێتی وپێیان وابوو کە بەهۆی چالاکیی پیشوو و زیندانی بوونم و بەردەوامیم لە کاری سیاسی دوای زیندان ئێستا بەهۆی منەوە لای یەکێتی ئەبین بە جێی ڕێز وحورمەتێکی تایبەتی و بە گوڵ پێشوازیمان لێ ئەکەن. جا بێنە بەرچاوت کە من خۆم هاتنە دەرەوەی ناچاریم بە شکست و سەرچاوەی گرفت و کێشەی لەبن نەهاتوو بزانم و ڕووبەڕووی ئایندەیەکی زۆر نادیار بووبمەوە و لەولاشەوە کەس وکار ئەو چاوەڕوانیانەیان لێم هەبێ! بەڕاستی کەوتبوومەوە ناو دوو بەرداشی گەورەوە کە ئەیهاڕیم. من پێشتر و دوای ئازادبوونمان لە زیندان هەم بەوهۆیەوە کە هێشتا ڕەخنە و جیاوازی و کێشەی ئێمە و یەکێتی وەکوو ڕەوتێکی بچووکی سیاسی لە سەرەتاییدا بوو و نەبووبوو بە کێشەیەک کە لە ئاستی گشتی کۆمەڵدا پرسیاری لەسەر بکرێت و هەمیش بۆ نهێنی کاریی زیاتر، جگە لە ڕەخنەی گشتی و قسە لە سەر

ماهیەتی سیاسیی یەکێتی و پێکهاتەی سەرکردایەتیان، شتێکی ئەوتۆی ترم لای کەس و کارم لەوبارەوە نەدرکاندبوو.
هەموو خێزانەکەمان بەجلی سادەوە خۆمان گەیاندبووە دەرەوە ومن پانتۆڵ و کراسێکم لەبەربوو و لەوێ لە ماڵی خاڵم شەرواڵێکیان داپێم. بۆ ڕۆژی دواتر پێشمەرگەکانی کەرتی سێی هەمەوەند، کە "شەهید حەمە ڕەش" فەرماندەیان بوو، بۆ جەولە هاتنە ناوچەکە و کە بەسەرهاتەکەی ئێمەیان پێزانی حەمەڕەش خۆی هاتە لامان و دەستمان کرد بە گفتوگۆ و پێشنیاری ئەوەی بۆ من کرد کە بڕۆم بۆ سەرکردایەتی بەو حسابەی کە من چالاکوانی سیاسی و زیندانی پێشوو بوومە. منیش لە خەیاڵی سەرەتایی خۆمدا دامنابوو هەرچی دوورتربم لە ناوەندەکانی سەرکردایەتیی ئەوان سەرئێشەم کەمترئەبێت. یەک دوو ڕۆژ دواتر لە چەمچەماڵەوە هەواڵمان بۆ هات کە ئەمنی کەرکووک کۆمەڵێکی زۆر خزم و کەسوکاری ئێمەیان گرتووە. هەریەک لە "وەزیرە"ی خوشکم و "نوری قەساب"ی هاوسەری و "عزالدین"ی برای نوری لە کەرکووک و "کامل"ی کوڕی خاڵم ساڵح ومام سەعیدی ئامۆزای باوکم لە چەمچەماڵ لە ئەمنی کەرکووک زیندانی کراون. من هەستم کرد کە مەسەلەکە هەم گەورەیە وهەم ئەمانەیان وەکوو بارمتە گرتووە تا بیانکەن بە بابەتی سەودای گێڕانەوەی ئێمە. هەر ئەو ڕۆژە کاک "کەریم ئاغا" کە سەرۆک عەشیرەتی هەمەوەند بوو بە کەسێکدا هەواڵی بۆ ناردین کە ئەمن بەشوێنمانەوەن. بۆ شەوەکەی لەگەڵ عادلی برامدا دووقۆڵی دانیشتین و وتم من پێم باش نیە کە لێرە بمێنینەوە. ئەو سەرەتا وتی: جا لێرە بەولاوە بۆ کوێ بڕۆین خۆ ئێرە ناوچەیەکی ئازادە و ئەی نەتبینی دوێنێ کەرتێک پێشمەرگە بە کەماڵی ئیسراحەت تیا مانەوە. ئەو درێژەی پێدا و وتی: جگە لەوە ئێمە ئەم خاوخێزانە گەورەیە بە گیرفانی خاڵیەوە بۆ کوێ بەرین؟ من وتم: ئەوانەی تۆ باسی ئەکەی هەمووی ڕاستن، بەڵام بە حاسەی ئەمنیی خۆم واهەست ئەکەم ئێرە

شوێنێکی ئەمین نیە بۆ ئێمە. پێشمەرگە چەکدار و پادارە و ئەتوانێت چاری خۆی بکا و ئێمە جیاین. ئەتوانین بۆ ماوەیەک بڕۆین بۆ بەری قەرەداغ تا ئەم بەزمە ئەنیشێتەوە و هەواڵێکی تەواوی ئەو گیراوانەشمان بۆ دەرئەکەوێ. درێژەم بە قسەکانم دا وتم: ئەڵێن لە دێی گوڕباز لە بەری قەرەداغ ماڵی خزمێکی لێیە ئەڕۆین ماوەیەک لەوێ ئەمێنینەوە و ئەوێ شوێنێکی قایم تر و دوورەدەستترە. ئێمە مەسئوولین لەژیانی ئەم خێزانە و دیارە سەلمان خۆیمان لێ تێناگەیەنێت و نایات بەدەورماندا و ناکرێ چاوەڕوانی ئەو بکەین. ئاخرین قسەم ئەوەبوو وتم: ئێستا ئەولەویەتی ئێمە دەربازکردنی گیانی خۆمانە لە مەترسیەک گەرچی لەسەدا دەش بێت و دواتر تەگبیری وردتر ئەکەین سەبارەت بە دواڕۆژ و چارەنووسمان وکاتی ئەوە دێت و گەر لێرە بڕۆین زیانێک ناکەین. بەهەرحاڵ دوای هەندێ بگرە و بەردەو بە نابەدڵی ئەویش قەناعەتی کرد و ئینجا لەگەڵ دایک و باوکم قسەمان کرد و باوکم گوێی لە قسەی ئێمە ئەگرت، بۆیە وتی: ئێوە هەر بڕیارێک بدەن من ڕازیم. بەڵام کێشەی گەورەمان دایکم بوو. ئەو ئەیووت من کە یەکجار لەماڵ و حاڵی خۆم هەڵکەنرام نامەوێت هەررۆژەی لە دێیەک و شوێنێک بم هەرچیم بەسەردێت با لەناو کەس وکار و خزمەکانم بەسەرم بێت. بەنیوە زۆرێک دایکمان قایل کرد بەو بەڵێنەی کە ڕۆیشتنمان کاتیە و دواتر دێینەوە بۆ ئێرە و ئیحسانیش کە تاسابوو نارەزایەتیەکی ئەوتۆی دەرنەبڕی. بڕیارماندا بۆ سبەی لەبەر گەرما بەیانی زوو بەڕێکەوین و تەنها دوو کوڕی کردەی ئاوایی کە خۆمان هەڵمان بژارد لەگەڵماندا بێن و دوو وڵاغی بەرزە ئامادە بکەن بۆ دایکم و لاولاوی براژنم کە دوو کچی هەبوو بەناوەکانی "میدیا" و "ئاوێستا". لەکاتی دیاریکراودا بەڕێکەوتین و ڕێگەکە بەو قەرەباڵغیەی ئێمەوە ٧-٨ سەعاتی ئەویست و دەوروبەری نیوەڕۆ کە نزیک بووبووینەوە لە دەربەندی باسەڕە تا لەوێوە هەڵگەڕێینەوە بەرەو دێلێژە زۆر بەکزی گوێمان لە دەنگی

هەندێ کۆپتەر بوو، بەڵام زۆر دوور بوون و بەچاویش بینیمان کە بەئاسمانی ناوچەکەدا ئەگەڕان. دواتر لەبەر هاژەی ناودەربەندەکە دەنگەکان نەمان و ئێمەش گوێمان پێ نەدا و بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن و هەزاران غایەڵە و خەیاڵ مێشکمیان داگیرکردبوو سەبارەت بە چارەنووسی خۆم و ئەم هەموو خێزانە. پاش وچانێکی کەم لە دێلێژە لە ماڵی شێخ سەلام دەمە و ئێوارە گەیشتینە دێی گوڕباز و ماڵی "کوێخا مەحموودی گوڕباز" بەخۆی وپوورە حەلاوی هاوسەری و خێزانیەوە پێشوازیەکی گەرمیان لێمان کرد و داستانی بەسەرهاتی تاڵی ئێمەیان لە خۆمانەوە بیست. بۆ ڕۆژی دواتر خدری خاڵۆزام و فازیلی حاجی ڕەحیم کە ئێمەیان گەیاندە گوڕباز گەڕانەوە بۆ خاڵدان. ئێمە هێشتا بڕیاری تەواومان نەداوە لە کوێ جێگیر بین و ڕوو بکەینە کوێ، چونکە هێشتا چاوەڕوانی دەرکەوتنی چارەنووسی کەس و کارە گیراوەکانمانین و جگە لەوەش لامان سەیر بوو کە سەلمان، کە سەبەبکاری ئەم ئاوارەیی و دەربەدەریەمان بوو، خۆیمان تێ ناگەیەنێت.

هەموو دوو ڕۆژی پێ نەچوو ئەو دوو کوڕە خزمەی کە ئێمەیان لە خاڵدانەوە گەیاندە گوڕباز بە پەلە و شڵەژاوی خۆیان کرد بەماڵدا. تومەز ئەڵقەکانی گۆڵمەزەکەی ئێمە بەردەوامە. بەپێی قسەی ئەوان هەر ئەو ڕۆژی کە ئێمە خاڵدانمان جێهێشتووە بەدوای ٤ – ٥ کاتژمێردا، شەش کۆپتەر لە دێکەدا نیشتوونەتەوە کە مودیری ئەمنی کەرامە و کۆمەڵێکی زۆر ئەمنی تر و مەفرەزەیەک جاشی قالە فەرەج و هەندێک قوات خاصەیان لەگەڵدا بووە. دیاربوو کە هەواڵی وردی ئێمەیان پێبووە و یەکسەر چوونەتە ماڵی خاڵم کە خانەخوێی ئەو چەند ڕۆژەی ئێمەبوون. خاڵم دەمێک بوو نەمابوو و خدری تەنها کوڕیشی ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئێمەدا هاتبوو بۆ گوڕباز و تەنها دەوڵەتی خاڵۆژنم و کچەکانی و هاوسەرەکەی خدر لە ماڵ ئەبن. جگە لە تۆقاندنی دانیشتوانی دێکە کە لە ژیانیاندا سەربازێکی حکوومەتیشیان

لەناو دێکەیاندا نەبینیبوو، کەوتبوونە پرسیار و ئیهانەکردنی ماڵی خالّم وهەڕەشەکردن وهەواڵی ئێمەیان لێ پرسیبوون. سەرەتا خالۆژنم هاشای کردبوو کە ئێمە لەوێ بووبێتین، بەلاّم ئەمنەکان بڕوایان نەکردبوو وهەموو کون وکەلەبەری مالەکە گەڕابوون تا لە کادانێکدا پانتۆڵەکەی منیان دۆزیبۆوە کە یەکەم ڕۆژی ڕاکردنمان لەبەرم بوو و پێش دابەزینی کۆپتەرەکان خالۆژنم لە ناوکادا شاردبوویەوە. کاتی خۆشی کە پانتۆڵ یا جل دەبرا بۆ ئوتووی دەرەوە بە قەڵەم و لەدیوی ناوەوە ناوی خاوەنەکەیان لەسەر ئەنووسی و بەوەدا بۆیان دەرکەوتبوو کە ئێمە لەوێ بووینە. خالۆژنم وتبووی ئەوان خزمی ئێمەن و بەمیوانی ڕوویان تێمان کردووە و بەرەو سەرکردایەتی یەکێتی ڕۆیشتوون. پاش لێدان و شکاندنی دەستێکی وتبوویان چیان لەپاش بەجێماوە و ئەویش هیچی وای شک نەئەبرد و هەر ووتبووی هیچ. پاشان کە بێئومێد ئەبن لە دەسگیرکردنی ئێمە کێوماڵێکی ئەو ناوچەیەیان ئەکەن و تا شاخەکانی پشتی دێی ماڵۆڵە، کە بازیان و دیوی گەرمیان لەیەک جیا ئەکاتەوە، ڕۆیشتبوون و ئێمەش لەوکاتەدا نزیکەی ٦ -٧ کیلۆمەترێک بەدەستی ڕاستی ئەواندا لە دەربەندی باسەرەوە پەڕیبووینەوە.

ئەو هەواڵە بۆ ئێمە هێندەی تر جێی نیگەرانی بوو و لە بری بیستنی هەواڵی بەربوونی کەس و کارە گیراوەکانمان بۆمان دەرکەوت، کە لەم شاخ و داخەیش هێشتا ژیانمان لە مەترسیدایە. ئێستا دایک و باوکم و هەموو خێزان ئەڵێن تۆ چۆن بیرت بەلای ئەوەدا چوو کە لە خالّدان نەمێنین. ئەو بیرۆکەیەی من کە سەرچاوەکەی ئەگەڕایەوە بۆ تاقیکردنەوەی سیاسی و کاری نهێنیی چەندین ساڵە و ناسینی سروشتی دڕندانەی دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێم، خێزانێکی ٨ کەسی لە مەرگ یا چارەنووسێکی نادیار گێڕایەوە.

دەنگوباسی کۆپتەر و ڕاونانی ئێمە ببوو بە باسی هەموو مەجلیس و دیوەخان و سەرکانیی دێهاتی گەرمیان و قەرەداغ.

کەس و کــارم لایــان ســەیر بــوو کە ســەرباری دەنگــدانەوەی ڕاکردنەکەمان بەهەموو ناوچەکاندا، بەڵام هیچ لێپرسراو یا کەسێکی یەکێتــی خۆیمــان تــێ ناگەیەنێــت. مێــوڵی کە بارەگــای تیپــی ٥٧ی سەگرمەی لێبوو بیست خولەک لە سەرووی گوڕبازەوە بوو.
کـابرایەکی جاشــی چەمچەمــاڵی بــە نــاوی جەلال چەمچەمــاڵی کە لە تەلەفزیـۆنێش گـۆرانیەکی بـۆ قادسـیە وتبـوو بەنـاوی (ئەی عێـراقم). جەلال ڕایکردبـوو بـۆ پێشـمەرگایەتی، بەڵام ئەو ڕێـز و حـورمەتێکی زۆری لـــێ ئەگیـــرا لەو دێهاتـــانە و لەلای پێشـــمەرگە و لەگەڵ پێشمەرگەکانی تیپی ٥٧ی سەگرمەدا جەولەی ئەکرد. مـاڵی ئێمە لایـان سەیر بوو ئەو ڕێزە زۆرە لە جاشێکی وەکوو ئەو ئەگیرێ و ئەمانیش بەو هەمـــوو قوربـــانیەوە کەس مەرحەبایەکیشـــیان ناکـــات. ئەوان شارەزای یەکێتی نەبوون کە ئەوەندە لات لێ ئەکاتەوە تا ئیشی پێت بێ و کە ئیشی تەواو بوو فەرامۆشت دەکات. جەلال چەمچەمـاڵی زۆر نەمایەوە و بەچەکێکەوە خۆی تەسلیم کردەوە بە ڕژێم.
ڕۆژێکیـان کـاک بەکـری کـادری یەکێتـی کە پێشـیان ئەووت "بەکـری زراعە" لە مــاڵی کوێخــا مەحمــوود هــات بۆلامــان. لە زمــانی ئەوەوە بیستم کە زۆربەی کادرەکانی نـاوچەکە ڕۆیشـتوون بۆ سـەرکردایەتی بــۆ بەشــداری لە کۆنفرەنســی دووی کــۆمەڵەی کە پێمــوابێ هێشــتا پاشکۆی مارکسی – لینینیەکەی لەخۆی نەکردبۆوە. نەم ئەزانـی کێـی دۆســت یــا ناسـیاوی خــۆم لەم نــاوچەیە پێشـمەرگەیە، بەڵام بیسـتم دوکتـۆر سـاجیدی هـاوڕێی سـەردەمی زینـدان لەقازانقـایەیە، بەڵام نە ئەو بە هاتنی منی زانیبوو و نەمنیش سەردانیی ئەوم کرد.
"نەجـاتی موهەنـدیس"ی هـاوڕێم کە لەســەردەمی زینـدانەوە بەهــۆی هاتنی بۆ سـەردانی هاوڕێکانیەوە ئاشـنایەتیمان پەیداکردبوو و چەند جاریش لە بەغدا و کەرکووک سـەردانیی ئەکـردم بیسـتبووی کە ئێمە ڕامـانکردووە و بـۆ قەرەداغ ڕۆیشـتووین، هەرچـی خـزم و ئاشـنایان هەبـوو لەو دێیـانەی قەرەداغ، ئاگـاداری کردبـوون کە مـاڵی دۆسـتێکم

بەو نـاو ونیشـانانەوە ڕایـان کـردووە و چیتـان پێکـرا بۆیـان بـکەن. نەجات کەسایەتیەکی تایبەت و دۆست و هـاوڕێی ئیختیفا و هـاوبیر و هاوهەڵوێستی یەک بەرە بووین لە هەمـوو هەڵچوون و داچوونەکـانی ژیانی سیاسی و ڕێکخراوەییماندا وتا ئەو ڕۆژەی گیانی سپارد و بوو بەقوربـانی دەسـتی جەلادەکـانی ئەمـن لە کەرکـووک، وەکـوو بـرا وابووین وهەر بۆیەش لە زۆر جێی ئەم یادەوەریەدا نـاو ویـادی دێتە پێشـەوە.

ڕۆژێکی تر هەردوو هاوڕێم شوانەی کادری کەرتی چواری جەبـاری و "حەمە هەڵـۆی موهەنـدیس" کە دواتـر شـەهید بـوو هـاتن بـۆ لامـان. شـوانە گەرچـی کـادرێکی سەرسـەختی مـولتەزیمی کـۆمەڵە بـوو لە کەرکـووک بەڵام زۆر هـاوڕێ بـووین و هەر لە ڕێـگەی ئەویشـەوە حـەمەم ناسـی کە ئەوکـات لەگەڵ کـۆمەڵێکی زۆرتـری ئەنـدامانی کۆمەڵەدا کە جەلال جەوهەر و دوکتۆر شوانیشیان لەگەڵدا بوو، ساڵی ٨١ و پـاش تەواوکردنـی زانکـۆ و پـێش چوونەدەرەوەیـان، گەشـتێکی ناوچەکـانی ئامێـدی و بادینانمـان کردبـوو. حـەمە هەڵـۆ کە کـوڕێکی قسـەخۆش و هەمیشـە دەم بە پێکەنـین بـوو هەر لە دوورەوە و پـێش ئەوەی بـاوەش بە یەکدا بکەیـن وتـی: دەک بەخێر نەیەیتە دەرەوە!!! و دواتـر و پـێش ئەوەی داسـتانی هـاتنەدەرەوەی ناچـاریی خـۆمی بـۆ بگێڕمەوە، پێی وتـم کە ئیشـێکی باشـت نەکـرد کە ڕووتکردە دەرەوە، چونکە ئێمە خۆمـان تەواو بێزار بووینە و دەسـتی کـرد بە هەڵڕشـتنی زوخاوێکی زۆر لەدەست سەرکردایەتی و ڕێباز و ممارسـاتی یەکێتـی. دیـار بـوو شـوانیش ئەو حەماسـەی جـارانی نـاو شـاری نەمـاوە و ئەویـش هەمـان شـعوری هەبـوو. بەهەرحـاڵ دەردی هـاتنە دەرەوەی خۆمم بۆیان باسکرد و ئەوان، کە پێشتر بە وردی شارەزای بیروڕای من وهەڵوێستەکانم بوون لە بەرانبەر یەکێتی، هەندێ سەرنجیان پێدام و بۆم دەرکەوت کە کاردانەوەی یەکێتی لە بەرانبەر نەیـارانی سیاسـی وەکوو ئێمەدا زۆر خراپترە لەوەش کە خۆم بیرم لێ ئەکردەوە.

لەو ماوەیەدا لە گوڕباز مامۆستا "جەلالی حەمە ڕەشید"ی کانی شەیتان، کە هەم خزم و هەمیش هاوڕێیەکی نزیکی کاکم بوو، هات بۆ سەردانمان. ئەو کە مامۆستا بوو لە گوندی تەڕەمار وتی: ئەمە وەزع نیە و ئێوە ناتوانن هەروا لێرە دانیشن وەرن ئەتانبەم بۆ تەڕەمار و من لەوێ بینای قوتابخانەکەم بەدەستەوەیە و کە دەوامیش کرایەوە خۆم جێگەتان بۆ تەرتیب ئەکەم. سەرباری ئەوەی کە ماڵی کوێخا مەحموود هەموو ماڵیان خستبووە بەردەستمان، بەلام ڕازی بووین بە پێشنیارەکەی مامۆستا جەلال. ڕۆژی دواتر بەرەو تەڕەمار بەڕێکەوتین و بە سەیارەکەی مامۆستا هەر بە ڕۆژ لای موجەممەعی ئەڵڵایی پەڕینەوە بەرەو بەری ئەودیوی شاخەکە بۆ تەڕەمار. لەبەر ئەوەی مامۆستا جەلال ماڵی لە تەکیە بوو و دەوامیش نەکرابۆوە ئێمەی لە مەکتەبەکە دامەزراند و چەند پیاوی دێیەکەی پێ ناساندین و خۆی گەڕایەوە، بەڵام هەر بۆ بەیانی هەرچی پێویستیی ماڵ بێت بۆمانی هێنا.

کاکم زۆر زیاتر لە هەمووومان بەگلەیی بوو لە سەلمانی برام. ئەو ئەیووت سەیرە خۆشیمان تێ ناگەیەنێت! ڕۆژێک عادل لە گوڕباز دووقۆڵی وتی: تەواو ئێمە ئەمە چارەنووسمانە و من بەحوکمی ئەوەی پێشتر پێشمەرگە بووم ئەزانم چی ڕەزالەتێکمان تووش ئەبێ و چ ڕۆژێکی ڕەش تێ کەوتووین. با تەگبیرێک بکەین. منیش بۆم دەرکەوت کە فرسەتە و با ئەو چاوەڕوانیەیان لە من واقیعی بێت بە کورتی سەرگوزەشتەی جیاوازیی بیروڕای خۆم لەگەڵ یەکێتی و جیاوازیەکانی زیندان و چۆنیەتیی سیاسەتکردن و مامەڵەی یەکێتی وتوندڕەویی وکەم حەوسەڵەیی ئەوان لەبەرانبەر جیاوازی و ئازادیی بیروڕا و ئەوانەم بۆ باسکرد و وتم: زۆر زەحمەتە بۆ من بتوانم لە دەرەوە بمێنمەوە. ئەو وا تێگەیشت کە من ئەمەوێ بڕۆم بۆ ئەورووپا، بەڵام وتم: نا من نیازی شتی وام نیە. ئەو وتی: من ماوەیەکی زۆر و تا ڕاکردنیشمان فۆرمەن بووم لە کۆمپانیای مانسمانی ئەڵمانی و

ئەڵمانیەکەم زۆر باشە و خۆتیش ئەزانی ئینگلیزیشم خراپ نیە. با من بڕۆم بۆ ئێران و لەوێوە بۆ ئەڵمانیا و دواتر ئێوەش دەرئەکەم. من وتم: ڕازیم بەڵام گەر لاولاوی هاوسەرت و منداڵەکان لەگەڵ خۆتدا ببەیت و ئەو ڕازی نەبوو، منیش وتم: ئێمە بەم وەزعەوە چۆن ئەرکی ئەم هەموو ماڵ ومنداڵە بگرینە ئەستۆ و کەس نازانێ تۆ چەند ساڵت پی ئەچێ تا لانی کەم ئەوان ببەیت. ئیتر ئەو و منیش بابەتەکەمان گۆڕی.

ڕۆژگار بەرەو پایزی ١٩٨٢ ئەڕوا و ئێمە زۆر بێزارین و بەدیار ئایندەیەکی نادیارەوە لە دێی تەڕەمارین، نیوەڕۆیەکی گەرم بوو کە لاڵ و پاڵ لێی کەوتبووین دوو زەلام خۆیان کرد بەماڵدا و ئەها ئەوە سەلمانە (پۆلا). هەر کە بینیانمان عادلی برام بۆی هەڵسا و پەلاماری دا. ئەو شێخ سوارە (جودت)ی لە گەڵ خۆیدا هێنابوو، چونکە چاوەڕوانیی ئەوەی ئەکرد کە کاردانەوەی ئێمە توونـد ئەبێ لە بەرانبەری بەتایبەتی کە ئەو ماوە دوورودرێژە خۆی تێمان نە ئەگەیاند. لە بیرمە کاکم بە سەلمان (پۆلا)ی ووت: کاتێ عەدنان گیرا تەنها خۆی مەسئولیەتی کارەکەی خۆی گرتە ئەستۆ، بەڵام تۆ ئێمەت ڕووبەڕووی مەرگ و ئەم هەموو چەرمەسەریە کردەوە. هەرچۆنێک بوو ئارامیمان کردەوە و من سوارەم پێشتر ئەناسی و ئەو وتی: با لە جیاتیی ئەوە تەگبیرێکی حاڵی ئێوە بکەین و تازە ئەوانە هیچ داد نادات. دواتر زانیم کە سوارە خۆشی کەسێکی چەپ و مارکسیە و نزیکە لە بەرەی ڕزگاریی زەحمەتکێشان (بەرزە)وە و دۆستی نزیکی هاوڕێ "نەجمی فەقێ عبدوڵڵایە". پۆلا کە ئەیزانی ئێمە لە چی بارێکی دەروونی خراپدابین، ماڵێکی بۆمان ئامادە کردبوو لە قەمچووغە و پێکەوە چووین بۆ ئەوێ و ماڵی باوکم تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٥ و شەهیدبوونی عادلی براگەورەم هەر لەوێ مانەوە.

پۆلا لە شار هیچ ئاگاداریەکی نەبوو لە بیروباوەڕی دوای زیندانکردنی من و پێی وابوو کە من کۆمەڵەم. من لە شار شتێکی

ئەوتۆم لای ئەو باس نەئەکرد، چونکە ئەو گەنجێک بوو تازە چاوی ئەکــرایەوە و هــیچ نیشــانەیەکی ئەوەشــم تیــا بەدی نەکردبــوو کە سەروسوختی لەگەڵ دونیای سیاسەت یا فکر و ڕێکخستندا هەبێ.

## یەکێتی و کارگەران: دوو ئەنتی تێز

ماڵ و حاڵمان لە قەمچووغە جێگیر بوون. جۆرێک دڵنیاییم پەیداکرد کە ئیتر ئەمە، لانی کەم بۆ ماوەیەکیش بێت، شوێنی گوزەرانی ئێمەیە. قەمچووغە چەند لایەنی باشی هەبوو. لە جادەوە دوور نەبوو وبە١٠-١٥ خولەک لە جادەی سەرەکیی سلێمانی – دووکانەوە بە پیادەڕەوی ئەگەیشتی پێی. سەیارەش هەموو ڕۆژ ئەهات بۆ ئاواییەکە. کارەبای ٢٤ سەعاتیی هەبو و چەند دووکانێکیشی تیابوو بۆ پێویستیەکانی ماڵ. ئەم دێیە گەرچی زۆر لە جادەی سەرەکی و شارۆچکەی دووکانەوە نزیک بوو و لە سەرەوە بەشاخی سارا دەوردرابوو و ڕەبیەیەکی سەربازیش نزیکی دێیەکە بوو، بەڵام بەهۆی قایمیی شوێنەکەیەوە ببوو بە مەڵبەندێکی حەوانەوەی پێشمەرگە و دەیان کەسی ڕاکردووی سەربازیی شارەکانیش بەتایبەتی کەرکووک ڕوویان تێکردبوو و تیایدا نیشتەجێ ببوون. بەوهۆیەشەوە کە قەمچووغە ڕێگەی پێکەوە گرێدانی سەرگەڵوو و ناوچەی قەڵاسێوکەبوو، کە هەردووکیان مەڵبەندی عەسکەری و ئیداریی هێزەکانی یەکێتی بوون، ببوو بە سەرە ڕێ و ماڵی ئێمەش ببوو بە کاروانسەرای هەرچی پێشمەرگەی تیپی بیست و یەکی کەرکووک و بیست و پێنجی خاڵخاڵان هەیە.

قۆناغی سەرەتای جێگیربوونمان خۆم سەرقاڵ کرد بەخوێندنەوەوە. جگە لەوەش نامیلکەیەکی ستالین بەناوی (اسس اللينينية)م وەرگێڕا بۆ کوردی. "سادق عەزیزی" ئەندامی دواتری کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق لەو دێیە بوو و ئەوکاتە ئەو کادری

کارگەران بوو، بەڵام ئێمە هیچمان بە هەویەی ڕێکخراوەیی یەکترمان نەئەزانی. جگە لەو چەند کەسی تری چەپ ومارکسی کەرکووکی لەوێ بوون لەوانە "هێمن" و "سەلیم جاسم" و "سۆران (سەباح حسن)"ی برای "حەمە سانیە"ی خزمی ابو شهاب. لە کادرە پێشمەرگەکانی کۆمەڵەش شەهید "بێستوون عەسکەری" و "شوانەی تەنسیق (علی حسین)" کە لە سەردەمی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانەوە لە ساڵی ٧٤ەوە ئەمناسی، لە هاتوچۆیاندا سەردانی ماڵیان ئەکرد و جاروبار گفتوگۆمان ئەکرد. ئەو سەردەمە ڕەخنەی سەرەکی ئێمە لە کۆمەڵە لە چەند بواردا کورتکرابوونەوە.

**یەکەم:** بڕوایان بە ڕووخانی ڕژێم نیە و ئامادەن گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن و چەندین جاریش لە ساڵی ١٩٧٨ەوە هەوڵی مفاوەزاتیان داوە و ئێمە لایەنگری ڕووخانی ڕژێم بووین و ئەوە دروشمێکی نەگۆڕمان بوو.

**دوو:** کۆمەڵە هێزێکە کە نەهجێکی سیاسیی کوردستانی هەیە و ئێمە وەکوو هێزێکی مارکسی پێداگریمان لەسەر ئەوە ئەکرد کە چینی کرێکار و خەڵکی عێراق خاوەنی یەک بەرژەوەندیی هاوبەشن، هەر بۆیە ڕێکخستنی سیاسی چەپ و مارکسی ئەبێ ڕێکخراوێکی عێراق و سەرتاسەریی چینایەتی بێت و لەوەوە ئەوان وەکوو تەوس و تانە بە ئێمەیان ئەووت (عێراقچیەکان).

ئێمە ئەو نەهج و ڕێبازە سیاسیەی ئەوانمان بە ڕاسترەوی و نەتەوەیی ناو ئەبرد و ئەوانیش ئێمەیان بە بان چەپ ناوزەد ئەکرد.

**سێ:** ئێمە پێمان وابوو کە کۆمەڵە لە پرۆسەیەکی چەند ساڵەدا تا ئاستی دەسبەرداربوون پاشەکشێی لە مارکسیزم کردووە و لەژێر کاریگەریی جەلال تاڵەبانی بووە بە هێزێکی بێ کاریگەری ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و هاوکار و هاوبەرەی هێزی ئاغا و دەرەبەگ و هێزە تەقلیدی و محافزەکانی کۆمەڵگای کوردستان و تا هاتووە سەربەخۆیی خۆی لەدەستداوە.

**چــوار:** ئەو ئــاڵوگۆڕانە وایــان لە کــۆمەڵە کــردووە کە زیــاتر ڕووو وەرگێڕێــت لە خەبــاتی جەمــاوەریی نــاو شــارەکان و هەڵســووڕانی پێشمەرگایەتی و خەباتی چەکداری بووە بە شوناسی ئەم هێزە.
جــگە لەو ســەرنجانە، بەلای ئــیمەوە کــردەوە و پراتیکــی یەکێتــی لە دەرەوە بە کۆمەڵەشەوە لەبەرانبەر خەڵک و هەڵسوکەوتی لە بەرانبەر بیــــروڕای جیــــاواز و چــــالاکیی کەســــایەتی چەپ و مارکســــی و برەوســــەندنی بەهــای عەســکەرتاریەت و قورســایی چەک و هێــزی چەکــدار لە نــاو ڕیزەکانیانــدا و بــایەخ نەدان بە بەهــا فکــری و سیاسیەکان لەناو ڕیزەکانیان و پەروەردەنەکردنی کادر و ئەندام و پێشــمەرگە بە هوشــیاریی سیاســیی پێویســت و.....تــاد، نیشــانەی وەرگەڕانی کۆمەڵە بوون وەکوو هێزێکی چەپی نیمچە مارکسی بەرەو فکرو سیاسەتێکی ڕاست و بورجوازیانە و دژە دیموکراتی.
کارگەران بەدروستی پێداگریی لەسەر ئەوە ئەکرد کە یەکێتی پەیگیر نیە لەســەر چارەســەری مەســەلەی نەتەوەیی لە کوردســتاندا وبگــرە بەپێــی سروشــتی چینــایەتیی خــۆی هێزێکــی سازشــکارە. لە ڕاســتیدا یەکێتــی و هێــزە نەتەوەییە کوردیەکــان ئەیانەویست بــبن بەشــەریکی دەســەلاتی سیاســی لە عێراقــدا و ئەوان ئامــادەبوون تەنــانەت لەگەڵ ڕژێمێکــی وەکــوو بەعسیشــدا لەوبــارەوە بــگەن بە ڕێکەوتــن بەنــاوی حوکمی زاتیەوە.
بەلام ســــەبارەت بە پێکهــــاتەی سیاســــی ئەم هێــــزە، کــــارگەران، بە شــایەدیی "بەختیــار مســتەفا"ی ئەنــدامی ناوەنــدی، لەو ســەردەمەدا بە شــێوەیەکی نادروســت پێــی وابــوو کە (یەکێتــی هێزێکــی دیمــوکرات وپێشکەوتنخوازە).
ئەو ســالانە کــۆمەڵێکی زۆر لە ئەنــدامانی ڕێکخــراوی کــارگەران لە دەرەوە بــوون کە بەشــێکیان لە هەرێمــی جوتیــاران یــا لە بارەگاکــانی سەرکردایەتیی یەکێتی لە نێوزەنگ ببون بە پێشمەرگە و زۆری تریش

هەبوون لە دێهاتەکاندا دانیشتبوون. من ئەوەی بیرم لێ نەکردبێتەوە بوون بە پێشمەرگە بوو.

تێزی فکریی باوی ناو ڕێکخراوی ئێمە مارکسیزم- لینینیزم – ماویزم بوو. لەڕووی سیاسی و بەرنامەییەوە بڕوامان بە (دیموکراسیی نوێ) هەبوو کە یەکێک بوو لە بنەما سیاسیە جیاکەرەوەکانی ماویزم. قۆناغی خەباتی ئێستا، بەپێی دەرکی ئەوکاتەمان، قۆناغی شۆڕشی دیموکراتیە وەکوو ئەڵقەی سەرەکی بۆ هەنگاونان بەرەو شۆڕشی سۆسیالیستی. کرێکاران، بەپێی ئەو مەفهوومە، هێزی سەرەکی و ڕابەری شۆڕشی دیموکراتین وئەوەش جیای ئەکاتەوە لە شۆڕشە دیموکراتیە کلاسیکیەکانی پێشوو کە بورجوازی ڕابەرایەتیی ئەکرد هەر بۆیەش لە فکری ماویزمدا پێی ئەووترا (دیموکراسیی نوێ). جوتیاران هاوپەیمانی سەرەکیی کرێکارانن لەم شۆڕشەدا و وردە بورجوازیش یەکێکە لە هێزە پێکهێنەرەکانی (تا ئەو کاتە توێژبەندیی چینایەتیمان بەو جۆرە ئەکرد و لەقۆناغەکانی دواتردا لەژێر کاریگەریی کۆمەڵەی ئێراندا تێرمی زەحمەتکێشان هاتە ناو فکری سیاسیمانەوە). ڕووخاندنی ڕژێم بەبێ خەباتی چەکدار و جەنگی گەلی درێژخایەن و سەرکردایەتیی چینی کرێکاری ڕێکخراو لە حیزبی چینایەتیی سەربەخۆی خۆیدا، مەیسەر نابێت. ئێمە لامان وابوو کە کوردستان لە ڕووی مێژووییەوە لکێندراوە بە عێراقەوە (الحاق) و گەلی کورد مافی دیاریکردنی چارەنووسی هەیە. بەڵام سەرباری ئەو دروشمە گشتیە، ئێمە لەڕووی هەڵوێستی کرداری وسیاسیمانەوە لەو بارەوە، هیچ فۆرمۆلە و شێوازێکی دیاریکراومان دەسنیشان نەکردبوو سەبارەت بە چارەی مەسەلەی کورد. جگە لەوەش ڕێکخراوی (کارگەران) بڕوای وابوو کە ئەبێ شۆڕش لەڕووی سیاسیەوە خەسڵەتێکی عێراقیی هەبێ.

ئەوەندەشی بگەڕێتەوە بە بارودۆخی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی جیهان، لێکدانەوە فکریەکانی وڵاتی چینی سەردەمی ماوتسی تۆنگ

سەبارەت بە مارکسیەت، سەرچاوە و ئیلهامی بیری ئێمە بوون. سۆڤیەت لە ڕوانگەی ئەوکاتەی ئێمەوە وولاتێکی سۆسیال – ئیمپریالی و حیزبی کۆمۆنیستی ئەو وڵاتە و وڵاتانی ئۆردووگای سۆسیالیستی و سەرجەم ئەحزابی شیوعی هاوبیر یاخود لادەر لە مارکسیزم – لینینیزم بوون. حیزبی شیوعی عێراق بە حیزبێکی تەحریفی و خائین بە کرێکاران ناوزەد ئەکرا.

هێندەی بۆ (یەکێتیی تێکۆشانی کارگەران) بگەڕێتەوە، گەرچی ئەوانەی سەرەوە چوارچێوەی میتۆدی فکری و سیاسیی ئەویان پێک ئەهێنا، بەڵام تا ئەو کاتە نە خاوەنی بڵاوکراوەی دەرەکی یا ناوخۆیی بوو و نە بەرنامە یا پلاتفۆرمێکی سیاسیی پەسەندکراوی هەبوو نە هیچ مەرجەعێکی سیاسی و فکریی خاوەن ئیعتیبار و بە نفوز لە ڕابەریەتیەکەیدا هەبوو کە خاوەنی نووسراوە یا بەرهەمێکی فکری یا تیۆری یا سیاسی بێت.

جگە لەوانەش ڕێکخراوی (کارگەران) بەدرێژایی تەمەنی خۆی نە کۆنفرانس و نە کۆنگرەی بەست. ئەندامانی ناوەندیی ڕێکخراو و سەرجەم ئۆرگانەکانی بە شێوەی ئارەزوومەندانە و لەڕێی ڕێکەوتن و گونجانی سیاسی و بە دڵی ڕابەریی ئەو ڕێکخراوە لە نێوان ئەندامانی ناوەندیدا دادەنران و ئەوە تەنها پێوەری ڕێکخراوەیی بوو. بەو مانایە ناوەندیەتیی تووند و بڕیاردان بەتەنها لە چوارچێوەی ئەو ئۆرگانە ڕابەریەدا و بێ دەسەلاتیی ئۆرگانەکانی خوار ناوەندیەوە، ڕاستیەکی ژیانی ئەم ڕێکخراوە بوو. کارگەران خاوەنی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆ وهیچ بەڵگەنامەیەکی تری ڕێکخراوەیی نەبوو و تا ئەو شوێنەی منیش ئاگادار بم یا بیستبێتم هەرگیز بیریشی بەلای ئەو مەسەلانە و بایەخیاندا نەچووە. هیچ بەڵگەنامەیەک لەئارادا نەبوو کە میکانیزمەکان و شێوازەکانی هەرەمی ڕێکخراوەیی و دیسپلینەکان دیاری بکات. کۆمەڵێک هاوڕێ لە پرۆسەی پەیوەندیەکی چەند ساڵەی هاوبیری و هاوڕێیەتیی سیاسیدا لە سەرەوە ببوون بە نەواتی ڕابەری

و ئەوەی کـۆی کردبـوونەوە تێگەیشـتنێکی پـر تەم و مـژی فکریـی شەفەهی بوو سـەبارەت بە مارکسـیزم. جگە لەوەش و تـا ڕادەیەکیش ڕابوردووی سیاسی و ڕێکخراوەیی هاوبەشیان لە ڕیزەکانی کۆمەڵەی مارکسـی–لینینـی و ڕەخـنە و وازهینانەکانیـان لەو ڕێکخـراوە، پـایەی یەکگرتنیان بوو .

ئەو هاوڕێیـانەی ڕابەریـی ئەو سـەردەمەی کـارگەران ئێسـتا لە یاداشـتەکانیاندا، ئەویـش نەک لە چوارچێـوەی چاوپیـاگێڕانی ڕەخنەگرانەی تایبەتیدا، بەڵکوو وەکوو یادەوەری، ئەگێڕنەوە کە چۆن لە ڕێگەی گەڕانەوەیـان لە سـەردانی کۆمەڵەی ئێران هەر بەدەم ڕێوە زۆر مەسـەلەی بنەڕەتیـی وەکـوو پێویسـتی هەڵبژاردنـی نـاو بـۆ ڕێکخـراوەکە یـان پەسـەند کـردووە. بـۆ نمـوونە هـاوڕێ "بەختیـار مستەفا" کە ئەوکاتە بە وتەی خۆ ئەندامی (ئەڵقەی ناوەندی) کارگەران بووە ئەگێڕیتەوە کە لە سـەردانێکیاندا بۆ لای کۆمەلەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشـانی ئێـران (دکتـۆر جەعـفەر ووتـی: بۆچوونەکانتـان لە باسـەکانی پەیکـارەوە نـزیکە. پێشـی سـەیربوو کە گرووپەکەمـان تـا ئێستا ناوی نیە. پێشنیازی کرد تا زووە ناوێک بۆ خۆمـان هەڵبژێرین. لەکـاتی گەڕانەوەمانـدا بیرمـان لە نـاوێکی شـیاو کـردەوە بـۆ ڕێکخراوەکەمـان، چەنـد ناوێکمـان پێشـنیار کـرد. لەدواییـدا لەسـەر پێشـنیارەکەی عوسـمانی حـاجی مـارف ڕێکەوتـین. ڕێکخراوەکەمـان لەناوەڕاستی ئۆکتۆبەری ١٩٨١ دا ناونا یەکێتی تێکۆشـانی کـارگەران). لەنێـو دنیـای سیاسـەتەوە. ئەڵـقەی ١٧. فەیسـبووک Baktiar Mustafa Arif

هەموو ئەو ئاڵوگۆڕە فکری و سیاسیانەی کە لە کارگەراندا ڕوویـان ئەدا، بۆ نمـوونە تێپەڕانـدنی مـاویزم و گەڕانەوە بەرەو ئەرسەدۆکسـی مارکسـی، لەوە دەرنەئەچـوو کە مـایەی گـۆڕانی قەنـاعەتی تاکەکـانی ئەڵـقەیەک ڕۆشـنبیری مارکسـی بێـت کە سـەریان نـاوە بە دونیـای دەروونیـی خۆیانـدا. ئەو ئـاڵوگۆڕانە لە ڕاسـتیدا، بەشـێک نەبـوون لە

هەوڵی هێزێکی سیاسیی دەرگیر لە خەبات و تێکۆشانی ئەو قۆناغەدا، کە پێ بەپێی گەشـەی چالاکیەکـانی، پەی بردبێت بە لاوازیـی دەزگـا فکـریەکەی پێشـووی یـا نەزۆکیـی ئەو بنەمـا تیـۆری و فکریـانە یـا بە تاقیکردنەوەی عەمەلی ناکاراییی ئەو سیستمە فکریەی بۆ دەرکەوتبێ لە یەکێـک لە مەیـدانەکانی خەبـاتی سیاسـیی جۆراوجـۆری ئەو سـەردەمەدا کە بریتـی بـوون لە: مەسـەلەی کـورد و دابـڕان لە شـێوازەکانی تـا ئێسـتای ڕابەرایەتـی کردنـی لەلایەن هێـزە کوردیەکانەوە، ناکامیی خەباتی سیاسیی ڕەوتی ڕیفۆرمیستیی حیزبی شـیوعیی عێراقـی، خەبـات لە دژی دیکتـاتۆریەت و سـەرکوت و لە پێنـاوی ئـازادی و مافەکـانی خەڵکـدا، تێکۆشـان لەبـواری ئەو داخوازیانەی کە پەیوەندن بەژیان و گوزەرانی ڕۆژانەوە و .. تاد، یا لە چوارچێـوەی بزووتنەوەیەکـی سەرتاسـەریدا کە هەمـوو ئەوانە پێکەوە گرێ بدا.

ڕەتکردنەوەی پۆپۆلیزمیش کە زۆرجار لە سیاقی گێڕانەوەی مێژووی هەڵسـووڕانی ڕێکخـراوی کارگەرانـدا ئامـاژەی پێ ئەکریت بەهەمـان شێوە فووی پیائەکرێ. ئەم (ڕەتکردنەوانە!!) هیچیان لە چوارچێویەکی کۆمەلایەتی وماددی و لە مەتنی تاقیکردنەوەیان لە قۆناغێکی مێژووی دیـاریکراو لە ئەرزی واقیعـدا ڕوویـان نەداوە. ئەوانە هەموویـان لە زهنی کۆمەڵێک ڕۆشبنیردا لانکەیان کردووە و قۆناغ بە قۆناغ گێنگڵی دواتر و خوێندنەوە و شارەزایی لە تاقیکردنەوەیەکی نوێ وایکردووە بەردەوام بەوی پێشـوودا بچـنەوە. کۆمیـدیترین ناونـانیش بـۆ ئەم دیاردەیە ئەوەیە وەکوو پێویستیی خەباتی چینایەتی و ڕەنگدانەوەی حوزووری پرۆلیتاریا لە ئاستی کۆمەڵ و گەشەی تمووحاتی سیاسیی ئەو چینە یـا ڕەوتـی کـۆمەلایەتیی" گرایشـاتێک " لەنـاو ئەو چینە یـا پێشـڕەویی تەیفـی کۆمۆنیسـتی نـاو چینـی کرێکـار لێـک بـدرێتەوە لە کاتێکدا نە چینی کرێکار و نە کۆمەڵگە و نە هیچ کەس، جگە لەو ئەڵقە

تەسـکەی گرووپـی نـاوبراو، ئەم پێشـڕەویە (دۆنکیشـۆت) یەیـان نەبیستووە و ئاگایان لێی نەبووە!
لەوەش سـەیرتر ئەوەیە کە هەمـوو ئەو وەرچەرخـانە فکریـانە هەر لە زەینـدا ڕوویانـداوە ومـۆرکێکی شـەفەهی و سـەرزارەکیان هەیە و نە نووسراون، نە تۆمارێک نە بەڵگەنامەیەکی نووسراو لەبەردەستدایە بۆ نیشـاندانی چەند وچووونی ئەو ئاڵوگۆڕانە وگشـتیان لە چوارچێوەی نەهجێکی ئیرتیجالی و عەفەویدا ئەنجامـدراون و هیچیـان درێژەیـان لە جیهـانی دەرەوەی مێشـکی ئەو دەسـتە ڕۆشـنبیرەدا نـیە. ئەو هەمـوو وەرچەرخـان و " پێشـڕەوی "یە فکـری و تیۆریـانەش لاپەڕەیەکـی نووسراویان بەرهەم نەهێناوە تا دواتر کەسانی لایەنگر یا نەیار پیایدا بچنەوە و وەکوو بەڵگەنامەیەک بۆی بگەڕێنەوە.
عێراقیبـوونیش کە شـوناس و کـاراکتەرێکی بنەڕەتیـی ڕێکخـراوی کـارگەران بـوو لە بەرانـبەر شوناسـی کوردسـتانیدا، لە هەمـان چوارچێوەدا هاتۆتە ئاراوە. عێراقیبوونی کارگەران پشتی نەبەستبوو بە لێکدانەوەیەکی کونکریـت سـەبارەت بە کۆمەڵگـای عێـراق و جـێگە وڕێگەی چینی کرێکار وئاستی خەبات و توانای عەمەلیی ئەو چینە بۆ بەرجەسـتەکردنەوەی لانـی کەمـی ئەو چاوەڕوانیـانەی کە ئەم ڕێکخـراوە سـەبارەت بەو چیـنە باسـی ئەکـرد. ئـێمە لەسـەر بنـاغەی ئەوەی خۆمان چیمان پێ باشـە و کـام حـاڵەت لە ڕووی هزرییـەوە لـە پێشترو پێویسـتترە سـەیری ئەم مەسەلەیەشمان ئەکرد. بەڵگەی ئـێمە بـۆ عێراقیبـوونی ڕێکخـراوی سیاسـی مارکسـی پشـتی نەبەسـتبوو بەفاکت و واقیعێکـی مـاددی بینـراو لە دەرەوەی مێشـک وبیـری ئـێمە، بەڵکوو پێی داکووتابوو لەناو تاقیکردنەوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهـانی و ڕسـتەیەک لێـرە و یەکێکـی تـری دابـڕاو لەوێـی لینـین یـا مارکس سەبارەت بە ئێرلەندا یا ڕووسیای سۆڤیەتی.
بەدیاریکراوتریش ئەم پێداگریە لەسەر خەسڵەتی عێراقیبوونی حیزبی سیاسی و جموجۆڵی شۆڕشگێڕانە و سـەرجەم سیاسـەتکردن لەلایەن

ڕەوتــی مارکســی کوردســتانی ئەو ســەردەمەوە، کــاردانەوەیەکی ڕووکەشــی بــوو لەبەرانــبەر هێــزە سیاســیە چەکدارەکانی گۆڕەپــانی سیاسی کوردستان نەک وەکوو سەڵماندنی باشتر بوون و پێویست بــوونی لە قۆنــاغێکی دیــاریکراودا کە ڕەنــگ بــێ ئەو پێویســتیە لە قۆنـاغێکی سیاسـیی تـری عێراقـدا ئـاڵوگۆڕی بەسـەردا بێـت و بەو جـۆرەی جـاران نەمێنێتەوە. بەپـێچەوانەوە ئەم عێراقیبـوونە خـۆی لە خۆیدا چاوی لـێ دەکرا تـا ئەوئاسـتەی کرابوو بەخەسـڵەتێکی زاتـی و شوناسێکی فکری و ئایدیۆلۆجی مارکسیەکانی کوردستان.

مـاوەی چەنـد مانگێـک لە قەمچـووغە مـامەوە تـا مـاڵی بـاوکم جێگیـر بوون. ئێستا هەرسێ براکەم عادل و ئیحسان و سـەلمان پێشـمەرگەی یەکێتین لە تیپی ٢١ ی کەرکووک. دەوروبەری پایز گەڕامەوە بۆ نـاو شـارەکان. سـەرەتا ڕۆیشـتم بـۆ قەڵادزێ و مـاوەیەک لای مەمەنـدی هــاوڕێم مــامەوە. ســەردانێکی مــاڵی هــاوڕێ "ســەرداری حمەمــین شــاڵقیت"م کــرد کە خــۆی ڕۆیشــتبووە دەرەوە وکــادرێکی دیــاری کارگەران بوو. سەردار لەگەڵماندا لە (ابو غریب) زیندان بـوو. ئێمە لە یەک ژووردا بـووین لە بەشـی (الاحکـام الخاصـة). ئەو لە بەرەی ئـێمە بـوو وکوڕیـک بـوو کە گەرچـی ئامـادەیی کشـتوکاڵی خوێنـدبوو بەڵام ڕۆشـنبیریەکی فراوانـی هەبـوو. دوای ئەوەی سـاڵی ١٩٧٩ لە زینـدان ئـازادکراین سـەردانێکی کـردم لە کەرکـووک و پـێکەوە جەولەیەکـی هەولێریشــــمان کــــرد. ئەو زوو ئەڕواتە دەرەوە و لەو کــــادرانەی کـارگەران بـوو کە دواتـر لە نزیـک بارەگاکـانی کـۆمەڵەی ئێـران لەوێ دانیشــتبوو و فێــری زمــانی فارســیش ببــوو و زۆر کەوتبــووە ژێرکـاریگەریی خەتـی سیاسـی و فکریـی مارکسـیزمی شـۆڕشـگێڕی ئێرانەوە. ساڵی ١٩٨٣ بە ئیختیفا گەڕایەوە بۆ سلێمانی و دواتر لەڕێی ئێرانەوە ڕۆیشت بۆ پاکستان تا لەوێوە ڕووبکاتە ئەورووپا و لە کـاتی مانەوەی لە کەمپەکانی پەناهیندەی لە پاکستان لە بـارودۆخێکی ئـاڵۆز و نادیاردا تیرۆر کرا.

ئەو شـــەوەی ئیســـرائیل پەلامـــاری بەیرووتـــی دا، لە ڕادیـــۆی مۆنتیکارلۆوە لەگەڵ براکانی سەرداردا گوێمان لەو هەواڵە بوو.
پاش ماوەیەک ولەبەر ئەوەی جێیەکی وام نەبوو کە لە شارەکاندا بە ئیختیفـا بمێـنمەوە گەڕامەوە بـۆ قەمچـووغە. دیـار بـوو یەکێتـی کەوتبوونە پرسـیار و تاقیب لەسـەر ئەوەی چۆن و بۆ ئەڕوات بۆ شـارەکان. جارێکیـان بە سـودفە لەنـاو قەمچـووغە چـاوم بە عەلـی بچکۆل کەوت کە ئەوکاتە لێپرسراوی مەڵبەندی دوو بوو لەسەرگەڵوو و بێ مناسەبە و هۆ پرسیاری کرد: ها ئەتانەوێ ئینقلابمان لێ بکەن؟ ئیتر زانیم کە ئەوە سەرەتای گیروگاز و بڕوبیانووەکانیانە، بەڵام زۆر گـوێم پێـنەدا. جـارێکی تـریش لە مەڵبەنـدی دوو ناردیـان بەدوامـدا و کاتێ چووم دیسانەوە عەلی بچکۆل دەستی کردەوە بە پرسیار کە لە قەمچـووغە پەیوەنـدیت لەگەڵ کـێ هەیە و ئاگـادارین کە کۆبـوونەوە ئەکەیت و چی وچی وپاشان وتی: کاکە ئێوە کە خەبات بۆ پرۆلیتاریا ئەکەن بۆ ناڕۆن بۆ شارەکان وخۆ پرۆلیتاریا لەم شاخ وکێوانە نیە؟ منیش ووتم من ئازادم کێ ئەبینم و چی ئەکەم وچۆن بیر ئەکەمەوە وگەر لە ناوچەکـانی ژێردەسـەڵاتی یەکێتیدا مارکسیەت قەدەغەکراوە ئەوە بە ڕەسمی ڕای بگەیەنن تا خەڵکیش ئاگادار بێت کە چی ئەکا و چی ناکات.
دیـار بـوو ڕاپـۆرت نووسـین لەسـەر هەمـوو جموجـۆڵێکی خەڵکـی ڕەخنەگـر و نـاڕازی بەوان و جیـاواز لێیـان لە ڕووی فکـری و سیاسیەوە، بووە بە نەهجێکی جێگیری ئەوان و سیستمێکی پۆلیسی لەبەرانـبەر جیـاوازیی فکـردا پیـادە دەکەن. بۆشـم دەرکەوت کە ئەوان هەر لەناو دێکەوە خەڵکانێکیان ڕاسپاردووە بەو کارە دزێو و بێتامانە ئەگینا چۆن ئەیان زانی من لەناو دێی قەمچووغە چی ئەکەم. دواتر زانیم کە کابرایەک بە ناوی "فایەقی شێخ حامید" کە بە ماموستا فایەق ناسرابوو و خەڵکی دێکە بوو ئەرکی چاودێریی منی گرتبووە ئەستۆ و لەڕووی خۆمیشدا زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە خۆی دەرئەخست.

یەکێکی تر لەو مەسەلانەی کە ببوو بە بابەتی چاودێریکردنم لە لایەن یەکێتیەوە هاتن و سەردانی زۆری هاوڕێکانم بوون لە شارەکانەوە بۆ لام. هاوڕێیانێکی وەکوو مەمەند لە قەڵادزێوە عەلی سمایل و ئەیادی حاجی نامیق لە هەولێرەوە ومیقداد وهاوڕێی گیانبەختکردووم نەجات لە سلێمانیەوە سەردانیان ئەکردم. ئەوانیش هەموویان ئەندامی ڕێکخراوی کارگەران یا چەپ بوون. لەڕاستیدا دەرەوەش و بەتایبەتی ئەو دەوروبەرەی من جێیەکی گونجاوی ئەوتۆ نەبوو بۆ چالاکیی سیاسی، بەڵام من بەردەوام بووم لە دەربڕین و بڵاوکردنەوەی بیروڕای ساسی و فکریی خۆم و بەحوکمی ئەوەش کە هێزی دەسەڵاتدار لەو دەوروبەرە بریتی بوو لە یەکێتیی نیشتیمانی زیاتر ڕووی ڕەخنەکانم سیاسەتی ئەوانی ئەگرتەوە. هاتوچۆی پێشمەرگە بۆ ماڵمان چی بەهۆی براکانمەوە و چی بەهۆی ئەوەی وەکوو ماڵە پێشمەرگەیەک کە ڕوویان کردۆتە دەرەوە، زۆر بوو، و منیش زۆر جار باسم لەگەڵیاندا دائەمەزراند و دواتریش یەکێک لەو تۆمەتانەی کە زۆرتر دوایان خستبووم قسەیەکی سواو و پووچ بوو کە گوایە من پێشمەرگە سارد ئەکەمەوە. ئەوان پێیان باشبوو کە ڕیزی پێشمەرگە بە پەرژینێکی قایم جیابکەنەوە لە هەر کەسێک کە بیروڕایەکی جیاوازی هەبێ وهەموو ڕەخنەگرتن و باسکردنێک لە سیاسەت و کردارەکانی خۆیان بە ڤایرۆسێک ئەزانی. پێشمەرگە لە ڕوانگەی ئەوانەوە تەنها هەقی ئەوەی هەیە کە قسە و هەڵوێستی ئەوان ببیستێت ئەگینا چاوی ئەکرێتەوە و ڕاستی زۆری بۆ دەرئەکەوێ و ئەبێتە خاوەنی هۆشیاریی سیاسی و فکری و بەوجۆرە ئەوان ناتوانن وەکوو گاڕان لێیانخوڕن. هەر بەڕاستیش تێکەڵی لەگەڵ ڕیزەکانی پێشمەرگەدا بۆ هەموو کەسێکی دەرئەخست کە چۆن ئاگاهانە و بە بەرنامەوە ئەوان سەرکوێر کراون و لە ئاستێکی زۆر نزمی هۆشیاریی سیاسیدا هێڵراونەتەوە. ئەوە خۆی سووکایەتیەکی بێ تام بوو بە پێشمەرگە کە بە ئێمەیان ئەووت ئێوە دڵساردیان

ئەکەنەوە و نیشـــانەی ئەوپەڕی بـــێ بڕوایـــی بەوان و بەنـــزم تەماشاکردنیان بوو لەلایەک، و هەروەها ترسی ئەوان بوو لەوەی کە هۆشیاری وڕۆشنبیریی سیاسی و فکری لە ڕیزەکانیاندا بڵاونەبێتەوە نەوەکوو دەسەڵات و نفووزی ئەوان بکەوێتە لەقی.
ئەم جەوەی سەرکوتی ڕای جیاواز و بوارنەدان بەهیچ جۆرە ڕەخنە و سـەرنجێک و تەماشـاکردنی هەمـوو هەڵگرێکی بیـروڕای جیاواز بە دوژمن و تەنگەبەرکردنی تەواوی ڕادەربڕین تا ئەهات لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی یەکێتیدا بەهێزتر ئەبوو تا وای لێهات ئیتر کادر و ڕابەر سیاسـی و پێشـمەرگەی خۆشـیان مـافی دەربڕینـی ڕای جیـاواز و ڕەخنەیـان نەمـابوو و بگـرە سـەرکوت و بەدنـاو ئەکـران و سـەدان حـاڵەتی لەوجـۆرە لەنـاو ڕیـزی هێزەکـانی خۆیانـدا بەدی ئەکـرا. لە سـاڵانی دواتریشـدا و هەم بەهـۆی ڕووتێکردنـی شـاڵاوێکی زۆری خەڵک بۆ دێهاتەکان وەکوو نارەزایەتیەک بۆ بەشداری لە سەربازی و سـەرهەڵدانی بـاس و گفتوگـۆی سیاسـی و خوێنـدنەوە لەناویانـدا، دەزگاکـانی یەکێتـی ئەوەنـدەی تـر هەراسـان ببـوون. جـگە لەوەش پاشەکشەی یەکێتی لە سیاسەتی ساڵانی یەکەمی درووستبوونیان کە جێ ئومێدی خەڵکی کوردستان بـوون کە وەکـوو بەدیلێکی نـوێ و شۆڕشـگێڕ لەچـاو بـزووتنەوە چەکدارەکەی مەلا مسـتەفادا تەماشـای ئەکـردن و ڕووو وەرگێـڕان لەوانە ئیتـر وای کردبـوو کە جیـاوازیەک لەنێوان ئەمان و پارتی یا بزووتنەوی چەکداری ١٩٧٤ لە گەڵ ئەوەی ئەمان پێی ئەڵێن (شۆڕشی نوێ)، نەمێنێت. جیاوازی یەکیتی و پارتی لەو کـاتەدا لە هـیچ بـوارێکی بەرنامەییـدا نەبـوو. ئەوان بـاڵی چەپ و پـارتی بـاڵی ڕاسـتی یەک بـزووتنەوەی سیاسـی بـوون بە سـتراتیج و تەکتیک و دروشم و شێوەی خەباتی هاوبەشەوە.
بەوجـۆرە یەکێتـی لە ناوەڕاسـتی هەشـتاکاندا تـا ئەهـات ئەبـوو بە هێزێکـی میلیتاریسـتیی بێ پەیوەنـد بە ئـاوات و ئامانجەکـانی خەڵـک. بزووتنەوەیەکـی چەکـداری وسیاسـیی دابـڕاو لە زۆرینـەی خەڵـک کە

تەنها پاساوی مانەوەیان بوونی ڕژێمێکی هارو سەرکوتگەر و دڕندەی وەکوو بەعس بوو. زنجیرە شەڕەکانی یەکێتی لەگەڵ پارتی و لەگەڵ حسک و لەگەڵ شیوعی و لەگەڵ پاسۆکیش کە جگە لەوەی ئەبوو بە هۆی کوژرانی سەدان چەکدار لەهەموو لایەنەکان، بۆ خەڵکی نیشان ئەدا کە یەکێتی کەمترین حەوسەڵەی هەیە بۆ بواردان بەهێزی سیاسیی جیاواز و فرەیی لە کاری سیاسی و پێشمەرگایەتی و ئەم شەڕانە کە لەناو دێهات و ناوچەکانی ژیانی خەڵکدا ڕوویان ئەدا، تا ئەهات زیاتر پەردەی هەڵدەماڵی لەسەر خەسڵەتی دژە دیموکراتی و دژایەتی لەگەڵ سادەترین پرەنسیپەکانی دیموکراتیی کە لە بەرنامەی سیاسیی یەکێتیدا ڕازینرابوونەوە. ئەبێ بۆ مێژووش ئەوە بووترێ کە لە ئاستی سەرکردایەتیدا نەوشیروان مستەفا وباڵە توندڕەوەکەی ئەو، سیمبول و سەرەڕمی پلاندانان و جێبەجێکردنی ئەم ڕەوتە میلیتاریستی و ڕادیکاڵ و پەلاماردەرە بوو.

**گەڕانەوە بۆ شارو دەستپێکردنی ژیانی ئیختیفا لە هەولێر:**

سالی ١٩٨٣ و پێموابێ بە دیاریکراویش هاوینی ئەو ساڵە بوو کە ڕێکخراوی کارگەران بڕیاریدا کە ئەندامانی خۆی لە دەرەوە بانگەواز بکات بۆ گەڕانەوە بۆ ناو شارەکان. ئەو بڕیارە چەند هۆکاری هەبوو:

**یەک:** ئەو وەرچەرخانە لە ماهیەت و سیاسەت و پراتیکی یەکێتیدا کە پێشتر باسم کردبوو ئەو تێزانەی بە کردەوە لەناو کارگەراندا پێچابۆوە کە پێشتر پێیان وابوو (یەکێتی هێزێکی دیموکرات و پێشکەوتنخوازە). ئیتر یەکێتی بە بەرنامە و هۆشیارانە هەموو بوارەکانی داخست بۆ بوون و مانەوەی کەسانی چالاک و هەڵسووڕاوی خاوەن بیروڕای جیاواز، نەک لە ڕیزی هێزە چەکدارەکان و دامودەزگاکانی خۆی، بگرە لەهەموو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیشی.

**دوو:** کارگەران تا ئەهات زیاتر ڕادیکال ئەبووەوە وئەکەوتە ژێر کاریگەریی تێزە فکری و سیاسیەکانی ڕەوتێکی ناو چەپی ئێران کە بریتی بوو لە مارکسیزمی شۆڕشگێڕ کە لە دوایین قۆناغەکانی بەهێزبوون وهەیمەنە بوو لە ناو کۆمەڵەی ئێراندا.

**سێ:** هێزی ڕێکخراوەیی کارگەران لە شارەکاندا لەناو تویژی خوێندەوار و چەپ و مارکسیدا برەوی سەندبوو، کاگەران پێویستی بەو کادرانەی دەرەوە بوو بۆ گرتنە ئەستۆی لێپرسراوێتی بواری ڕێکخراوەیی.

من جاروبار هاتوچۆی سلێمانیم ئەکرد و پەیوەندیم بە ڕێکخراوەوە گەرم بوو. لە دوایین سەردانمدا جەبار مستەفا کە تا ئەو کاتە ڕایەڵی پەیوەندیم بوو بە کارگەرانەوە ناساندمی بە "عوسمانی حاجی مارف" وەکوو ئەڵقەی پەیوەندیی ڕێکخراوەییم.

عوسمان هات بۆ قەمچووغە و پێی ڕاگەیاندم کە بڕۆمەوە بۆ ناو شار. ماوەیەک بەدوای ئەودا خۆم گەیاندە سلێمانی و دوای بینینی جەبار مستەفا، سەردانی عوسمانم کرد و ئەو پێی ڕاگەیاندم کە شوێنی چالاکی ڕێکخراوەیی من لە هەولێرە. هەر لەڕێی جەبارەوە زانیم کە هاوڕێ نەجاتیش فەرمانی گرتنی لە لایەن ئەمنەوە بۆ دەرچووە و ڕۆیشتووە بۆ ناوچەی قەرەداغ. بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ عوسماندا بۆ هەولێر بەڕێکەوتین. ئەو سەیارەیەکی هێنا و بەرەو هەلێر سلێمانیمان جێهێشت. لەسەر داوای من ڕێی کۆیە و کانی وەتمانمان گرتە بەر و هێشتاش هەر هەویەی زانکۆی بەغدا بەکار ئەهێنم. کات پایزێکی گەرم و دەوری پاشنیوەڕۆ بوو کە لای یەکێ لە چێشتخانەکانی دەوری کانی وەتمان لامان دا بۆ نانخواردن. تا ئەو لە سەیارەکە دابەزی من ڕوومکردە حەوزی دەست شۆرینەکە وئینجا ڕێکەوتم بۆ سەکۆکانی دانیشتنی چێشتخانەکە کە زۆر قەرەباڵغ نەبوو. یەکسەر ڕووم تەقی بە کابرایەکی ئەمنی کورددا. ئەوە "مەنسووری خورشید خەتاب"ە کە بە ئەسڵ کەرکووکیە ولە دوای گەڕانەوەی لە پێشمەرگایەتی لە ئاشبەتاڵەکەوە لە سلێمانی جێگیر ببوو. ئەو لەگەڵ ئافرەتێکی خزمی ئێمەدا هاوسەرگیریی کردبوو. هەر لە دائیرەکەی، کە پێموابێ ئاوی سلێمانی بوو، ببوو بە پیاوی ئەمن. هاوڕێییەکی بەناوی فەرهادەوە کە لەوێ کاری لەگەڵدا ئەکات لە ژێرەوە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا کار ئەکات و بەوەدا بە مەنسوور ئەخەڵەتێت کە کەرکووکیە و تا ئاشبەتاڵەکە پێشمەرگە بووە، هەموو نهێنی خۆی لائەدرکێنێت. مەنسووریش هەرچی دەست ئەکەوێت و ئەیبیستێ یەکسەر ئەیگەیەنێت بە ئەمن. فەرهاد ئاگاداری ئەکاتەوە کە کوڕێکی پێشمەرگە هاتۆتە ناو شارەوە وبە نیازی ژنهێنانە و شوێن و کات و هەموو شتێک لای مەنسوور ئەدرکێنێ و ئەویش خێرا ئەیگەیەنێت بە ئەمن و دواتر ئەو کارەساتە خوێناویەی لێ کەوتەوە کە بە کوشتارەکەی گەڕەکی حاجی ئاوا بەناوبانگە و هێزێکی زۆر کە

مـلازم موحسـین ڕێبەریـان بـوو پەلامـاری مـاڵی "مـام کـاکی" ئەدەن و چەندین کەس ئەکوژرێن. بەهەرحاڵ مەنسوور منی ئەناسی و ئەیزانی کە بە خێـزانەوە لە دەرەوەیـن و وردەکـاریی ڕاکردنەکەمـانی ئەزانـی. ئەو وایزانــی منـیش وەکـوو براکـانم پێشـمەرگەم. کە منـی بینـی لە سـەیارەکە دابەزیـم و یەکسـەر بەرەولای ئەو چووم زۆر ترسـا و لەو کـاتەدا جامێـک ماسـتاوی لە دەمـی گێـڕایەوە و دەسـتی بـرد بـۆ عەلاگەیەک کە لە تەنیشـتیەوە داینـابوو. مـن هەسـتم کـرد کە ئەو وایزانیبوو بە پلانەوە تاقیبی ئەو ئەکەم. ئەویش لەو ڕووداوەی حاجی ئاوا بەدواوە و پاش کەشف بوونی لای یەکێتی و خەڵک زۆر ئەترسا و هەمیشـە چەکی پێبوو. دەی وەرە ئینجا لەم قوڕاوە ڕزگـارت بێت. منـیش گەڕامەوە بـۆ دواوە بـۆلای عوسـمانی هـاوڕێم کە لەو کـاتەدا دەموچاوی ئەشت و دیار بوو ئەویش وەکوو من بیری لای خـواردن و چێشـتخانەکە بـوو و پـێم وت: بگەڕێـوە بـۆ نـاو سـەیارەکە و بەچـاوێکیش چـاودێریی مەنسـوورم ئەکـرد. بە عوسـمانم وت خێـرا لێخوڕە و بە ئاراستەی دوو ڕیانەکەی پردی هیزۆپ ڕێمـان گرتە بەر و بە خێرایـی و کـورتی مەسـەلەکەم تێیگەیانـد. تەگبیرمـان کـرد کە لە پەنای چێشتخانەی داهاتوو بوەستین تا بزانین سـەیارەکەی مەنسـوور بەملایەدا دێت یا نا، چونکە سەیارەیەکی ژمارە کەرکووکم لەوێ بینی و گەر بەمـلایەدا نەهـات ئـێمە بەردەوام ئەبـین بەرەو کـۆیە. عوسـمان وتـی گەر زانیمـان لە سـەیتەرەکە بۆ ئـێمە وەسـتاون پێی پیا ئەنـێم و ئەوە تەنیـا ڕێـگەیە لەم ناوەڕاسـتەدا. چـووینەوە نـاو سـەیارەکە و لە سـەیتەرەکە هەر لە دوورەوە تەماشـایەکیان کـردین و سـەربازێک بەدەست ئاماژەی کرد کە بڕۆین.

دەمەو ئێـوارە گەیشـتینە هەولێـر و لەڕێـگە عوسـمان وتـی: ئـێمە کۆمیتەیەکین لە هەولێر و تۆ لەمەودوا ئەندامی تیایدا، بەڵام وتـی: مـن جێیەکی کاتیـت بـۆ پەیـدا ئەکەم لای برادەرێکـی خـۆم تـا خـۆت جێگە بۆخۆت پەیدا دەکەی. منیش سـەرباری ئەوەی زۆر بـۆم سـەخت بـوو

بە ئیختیفا و ڕاونراوێکی دەستی ئەمن و بە گیرفانی بەتاڵەوە ولەم شارەدا چۆن تەگبیری ئەم هەموو کێشەیە بکەم. گەیاندمی بەشووقەیەک لە نزیک جادەی شەستیەکە و ناساندمی بە هاوڕێیەکی خۆی بەناوی تواناوە کە دیار بوو خەڵکی سلێمانیە و لە تەمەنی خۆمدا بوو. دیار بوو شوقەکە ماڵی ئەویش نیە و دواتر کاک ئازادی خاوەن ماڵ هاتەوە و ئەویش خەڵکی سلێمانی و لە سەنتەری ڕۆشنبیریی زانکۆی سەلاحەدین فەرمانبەر بوو، بەڵام هەردووکیان سەڵت بوون. ئەو چەند ڕۆژەی مامەوە لەگەڵ کاک توانادا جاروبار قسەمان لە مەسائیلی گشتی ئەکرد و جارێک چووینە دەرەوە. من کارم بەوە نەبوو کە توانا و ئازاد لە ڕووی سیاسیەوە چ کارەن و ئەمزانی هاوڕێی عوسمانن. من دوو هاوڕێی خۆم لە هەولێر هەبوو کە لە کاتی دەوامی زانکۆی بەغداوە لە ڕێگەی منەوە پەیوەندییان لەگەڵ کارگەراندا هەبوو کە عەلی سمایل و ئەیاد نامیق بوون. ئەوانم دۆزیەوە و پێکەوە سەردانێکی قەڵادزەمان کرد بۆ لای مەمەند کە ئەویش ئەندامێکی تری هەمان گرووپی هاوڕێی کارگەرانمان بوو لە بەغدا.

لە میانەی باسی سیاسی و ڕێکخراوەیی و دوایین پێشهات و بەرنامەی من پێم ڕاگەیاندن کە ئەمەویٰ لە هەولێر نیشتەجیٰ بم، بەڵام کێشەکەم نەبوونی ماڵ و جێیە. عەلی کە جگە لەوەی ماڵیان لە لادێ بوو، بەڵام بنەیەکیان لە گەڕەکی بەلاشاوای هەولێر هەبوو وتی ئەتوانی بێیت لەویٰ نیشتەجیٰ بیت. ئەوە بۆ من چەتری نەجاتێکی باش و لە کاتی خۆیدا بوو. سیٰ قۆڵی گەڕاینەوە بۆ هەولێر و من وعەلی ڕوومان کردە ماڵەکەی هەولێریان. ئەوان خانووەکە هی خۆیان بوو و تەنها شیروانی برای لەگەڵ دایە حەنیفی نەنکیاندا، کە هەموو پێمان ئەووت داپیرە، لەویٰ ئەژیان. وارێکەوت حاجی سمایلی باوکی عەلیش لەویٰ بوو. من جارێکی تر لە (میرەکان)، ئەو گوندەی تیا ئەژیان، سەردانێکیانم کردبوو. حاجی سمایل تا بڵێی پیاوێکی

نەجیب و دۆستی هاوڕێکانی عەلی بوو. ئەو وایزانی تەنها بۆ سەردان هاتووم بۆ هەولێر و من دەسپێشکەریم کرد وتم: لە زانکۆی بەغداوە گوێزراومەتەوە زانکۆی سەلاحەدین بۆ هەولێر و نزیک بوومەتەوە لێتان بەڵام کێشەکەم ئەوەیە بۆ ژوورێک ئەگەڕێم بۆ نیشتەجێبوون. ئەویش یەکسەرە وتی جا ئەوە خانوو و تۆش وەکوو شیروان و عەلیت و بۆ خۆت لێرە دانیشە. ئەو ئامادەییەی حاجی سمایلی باوکی عەلی کێشەی ماڵ و حاڵی بۆ من چارەسەر کرد و نزیکەی ساڵێک بەئەرکیکی زۆری خۆم و ڕێکخراوەوە وەکوو کوڕی خۆیان حەوانمیانەوە گەرچی دواتر بۆیان دەرکەوت کە خوێندنی زانکۆ لە هەولێر تەنها سیناریۆیەکە و هیچی تر، بەڵام تا دوایین ڕۆژی مانەوەشم لە ماڵەکەیاندا هەر وەکوو ڕۆژی یەکەم ڕێز و خۆشەویستیان بۆ من نەگۆڕا. ئەوان خۆشیان کوڕێکیان پێشمەرگەی سۆسیالیست بوو بەناوی "مامۆستا عبدالله" و تا کۆتایی هەشتاکان لە دەرەوە بوو.

کە زانیم ئەمە جێی خۆحەشاردانمە کەوتمە بیری چەندوچوونی قۆناغی تازەی ژیانی ئیختیفام. لە بیرمە هەر لە ڕێی ئەو هاوڕێیانەی دەوروبەرمەوە کتێبێکی نووسەرێکی ڕووسیم دەسکەوت کە یادگاریەکانی سەردەمی ئیختیفای خۆی بوو وەکوو کادرێکی حیزبی بەلشەفی لە سەردەمی خەباتیی ژێرزەمینیی ژێر دەسەڵاتی قەیسەریدا. دواتر کاتێک بیرم لە ڕووداوەکانی ناو کتێبەکە ئەکردەوە وبەراووردم ئەکرد لەگەڵ باری سەخت و مەرگی خۆمەڵاسدراوی هەر ڕۆژەی ئێمەومانانی ئیختیفای سەردەمی بەعس، خۆزگەم بەو نووسەر و چالاکوانە بەلشەفیەی ئەهاتەوە کە لە چاو ئێمەدا چەند خۆشبەخت بووە. عەلی چوارەمین ساڵی بوو لە بەشی سیاسەی کۆلێجی (القانون و السیاسة)ی زانکۆی بەغدا و ئەیادیش کە هاوڕێیەکی تری گرووپەکەمان و هاوپۆلم بوو، ئەبوایە بۆ دەوام بڕۆنەوە بۆ بەغدا.

شەوانی تەنیایی پایزی خانووەکەی بەلاشاوا بۆ من ڕۆژگارێک بوو پڕ لە بیرکردنەوە و وردبوونەوە. لە لایەک بیرم لە چارەنووسی کەس وکار وبەتایبەتی دایکم ئەکردەوە. لە ولاوە خەیاڵ ئەمی برد بۆ داهاتووی ژیانی خۆم و ئەم کاروانی ئیختیفایە کە چەند ئەخایەنێ و چارەنووسم چی بەرزی و نزمی و کام ئاڵوگۆڕ و چەند مەترسی و ریسک ئەبن بە هاوڕێی سەفەری هات ونەهاتی ئەمجارەم. لە لایەکەوە مەعلووم بوو کە چارەنووسی شەخسیم بەتەواوی بووە بە پاشکۆی دواڕۆژی سیاسیی ئەم وولاتە کە هیچ کلاوڕۆژنەیەک دیار نەبوو بۆ کۆتایی قۆناغی ستەم و سەرکوت و شەڕ و ماڵوێرانی و کوشت و کوشتارێک کە تازە بەتازە ڕژێم بە بیانووی شەڕ لەگەڵ ئێران و شەڕ لە دژی هێزە چەکدارەکانی کوردستان، نێڵەی ئاگرەکەی خۆشتر ئەکرد. پێویستم بەوە بوو کە پلانێکی وورد دابڕێژم و توێشووی ئەم سەفەرە سەختە بەناو ئەم تۆنێلی بێکۆتاییەدا هەڵگرم. وردەکاریی ئیختیفا شارەزا نیم. ئیمکاناتی دە دینارم نیە. خێزانێکی پەرت و تەفروتوونا کراو کە هاوکاتیش یەکێتی، سەرباری ئەوەی ببووین بە گەورەترین قوربانی بۆ خزمەتی سیاسەتی ئەوان، ئەوەیان پێڕەوا نەدەبینیم کە لە ناوچەکانی ژێردەسەلاتیدا، لانی کەم وەکوو ناوچەی ژێردەسەلاتی ڕژێمی بەعس بمێنمەوە. لەولاشەوە سێ برام پێشمەرگەی ڕیزی پێشەوەی هەمان هێزی سیاسین. چەند ڕۆژی یەکەمم تەرخان کرد بۆ بیرکردنەوە لەو واقیعە تازەیەی کە هاتۆتە پێشم کە هیچ چارێکی ترم نیە جگە لە خۆئامادەکردن بۆ قەبووڵکردن و دەسپێکردنی. جگە لە وردەکاریی نهێنی کاری و تێگەیشتن و هەزم کردنی تەکنیک وشێوازەکانی خۆدەربازکردن لە دام ودەزگا ئەمنیەکانی ڕژێم کە وەکو زیندانیی سیاسی پێشوو دیسانەوە ئەمری قەبزێکی وا بەشوێنمەوەیە کە گرتن و تیاچوون یەکە، لەولاشەوە ئەبوایە ئاگاداری ئەوە بم نەکەومە بەر ڕاداری چاودێریی ڕێکخستنەکانی یەکێتیش لەناو شاردا.

کۆمەڵێــک ئەنــدام و کــادری کــۆمەڵەی هەولێــریم ئەناســی کە لە سـەردەمی زینـدانەوە هـاوڕێم بـوون. بە لەبەرچـاوگرتنی هەمـوو ئەو فاکتەرانە کەوتمە خۆئامادەکردنی دەروونی وکۆمەڵایەتی و ئەمنی بۆ قۆناغێک کە نازانم یەک ساڵ یاخود دەساڵ ئەخایەنێت.
لەولاشــەوە بیــرم لای قۆنــاغی تــازەی هەڵســووڕانی سیاســی و ڕێکخراوەیــی ئەکــردەوە. کۆمەڵێــک پەیوەنــدیی ڕێکخراوەیــی لە دەوروبەرم دروسـت ببـوون کە ئەبـوایە بە تەگبیـر لەگەڵ ڕێکخـراو تاووتوێیان بکەم و بەپێی وەزعی تازەی ئیختیفای من ڕێ وشـوێنیان بۆ دابنێین. جگە لەوەش چاوەڕوانی ئەوە بـووم کە لەمەودوا ڕێکخـراو چ ئەرکێکم پێ ئەسپێرێت و پلانی کارکردنمان لە هەولێر چۆنە.
سەرباری ئەو هەموو پێشهات و نادیاریەی کە ڕووبەڕووم ببوونەوە لە ڕووی ورە و مەعنەویەوە زۆر پتەو و ساغ بووم. ئیتر بە تەبیعەت تێکۆشانی ڕێکخراوەیی وسیاسی و کاری پێشـەیی سیاسی، ئەبێ بە ناونیشانی قۆناغێک لە ژیانم کە نـازانم چەند ئەخـایەنێ، بەڵام ئەزانم تەنهــا مەرگ ئەتــوانێ ئەو پرۆســەیە بوەســتێنێ. پێشــبینیی هەر لەحزەیەکی گرتن و مەرگیش، سـەرباری تـاڵیەکەی، لە مێشـکمدا ببوو بە ئەگەرێک کە دواخستنی ببوو بە جەوهەری پلانی نهێنیکاریی ژیـانی ئێستام.
سەیر ئەوەبوو ڕێکخراوەکەمان بۆ یەکجاریش نەباسێک، نەڕێنوێنیەک، نە پرسـیار وسـۆراغێک لەسـەر ژیـانی ئیختیفـای مـن وچـیم ئەوێ و چۆن ئەژیمی لە گەڵمدا باس نەئەکرد و هەر ئەتووت فەرمـانبەرێکم و لە شــوێنێکەوە گــوێزراومەتەوە بــۆ شــوێنێکی تــر و هیچــی تــر. ڕاستیەکەی منیش ئەوەنـدە خەمخۆری ڕێکخـراوەکە بـووم وپەرۆشـی ئەوە بـووم کە هـیچ ئەرکێـک نەخەمە ئەسـتۆی و ڕێسـایەکی ئاسـنینی وام بۆخــۆم دیــاریکردبوو کە ڕێکخــراوەکەم لا ببــوو بە بــوونێکی هولامی و سیحریی زۆر پیرۆز، کە هەرچی بکات ئەو لەسـەر هەقە و حەتمەن ئەوان لەمن باشتر ئەزانن!!

## نەجات

(لەم ژیانەدا مردن سەخت نییە

سەختی لەوەدایە ژیان دروست بکەینەوە)

**"مایکۆفسکی"**

لە (ابوغربب) نەجات زووزوو سەردانی کۆمەڵێک هاوڕێی خۆی ئەکرد وەکوو جەبار مستەفا و د. ساجید و تەهای حەمەڕەش. لەوکاتەوە ئاشنایەتیەکی سەرپێی لە نێوانماندا دروست ببوو. دوای زیندانیش هاوینی ساڵی ١٩٨٠ لە سلێمانی جارێکی تر لە ڕێی سەردانی جەبارەوە بینیمەوە. نەجات کەسایەتیەکی نەسرەوت، چالاک، زۆر بزێو، پڕ لە جووڵە وئینێرجی وزیرەک بوو. ئەو لە نیوەی یەکەمی حەفتاکانەوە سەرەتا لە ڕێگەی چالاکی لەناو یەکێتی قوتابیانەوە سەروکاری لەگەڵ دونیای سیاسەتدا پەیدا کردبوو. دواتر وەکوو زۆربەی هاوڕێکانی ئەو سەردەمەی ڕووی کردبووە مارکسیەت و تێکەڵ بە کۆمەڵە ببوو.ماڵی نەجات لە سەرشەقام بوو و زۆربەی هاوڕێکانی وەکوو خۆی سەرقاڵی دراسەی مارکسیەت و چالاکی سیاسی ئەبن. ئەو مەوالیدی ١٩٥٧ بوو. دیار بوو دواتر ئەکەوێتە ئەو بەرەیەی کە دەسبەرداری کۆمەڵە ئەبن و هەوڵ ئەدەن بۆ چوارچێوەیەکی ڕادیکاڵتر لەو تا درێژە بەتێکۆشانی سیاسی بدەن. بەوجۆرە نەجاتیش (لە پاڵتۆکەی گۆگۆلەوە هاتبووە دەر واتە لە کۆمەڵەوە تێکۆشانی سیاسیی دەست پێکردبوو)، تا دواتر وەکوو زۆربەمان، لە ڕێگەی جەبارەوە بە کارگەرانەوە پەیوەست دەبێت. لە

زانکۆی سلێمانی ئەیخوێند و کۆلێجی ئەندازە بەشی مەدەنی تەواو ئەکات. ماڵی حەمە دەروێشی باوکی نەجات خێزانێکی هەژار و پیاوێکی کرێکار بوو. هاوینی ساڵی ١٩٨١ لەگەڵ قادری حمە جاندا سەردانێکی کەرکووکیان کرد و شەوێک لای من مانەوە. تا بڵێیت کەسێکی خۆشەویست و زوو تیکەڵ بە کەس وکارم ببوو وئەوانیش زۆریان خۆش ئەویست. نەجات کاراکتەرێکی تایبەتی هەبوو وبیرێکی تیژ ورد و حەزێکی زۆری بە تێکەڵی هەبوو هەر بۆیە کەم شار و شارۆچکە هەبوو ئەم پەیوەندیەکی زۆری تیا نەبێت.
من دەمێک بوو هەستم کردبوو کە نەجاتیش پەیوەندیی ڕێکخراوەیی لەگەل (یەکێتی تێکۆشانی کارگەران) دا هەیە، بەڵام تا ساڵی ١٩٨٣ لەیەک ئاشکرا نەبووبووین. بیستبووم کە ئەویش وەکوو من بووە بە نێچیری ئەمن و ماوەیەک ئەچێتە قەرەداغ بەڵام هەر زوو لەگەڵ یەکێتیدا ئەبێ بەدەمەقاڵە و کێشەی وئەوانیش نایەڵن لەوێ بحەوێتەوە. ڕاستیەکەی نەجاتیش لە هەر کۆڕوکۆمەڵێکدا، جا تەعزیە بوایە یا شایی و لە هەر بۆنەیەکدا بۆی بڕەخسایە، و جاری وابوو بەتووندڕەوی و بێگوێدانە شوێنەکەش، ئەکەوتە شەرحی سیاسەت و هەڵسوکەوتی یەکێتی و بێ پەیوەندیی ئەوان بە ئامانج و بەرژەوەندیی خەڵکەوە. تۆمەز کە ناچار ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و لە بەر ئەوەی کە زۆر ناسراو بوو لەوێ هاوڕێیانی ڕێکخراومان وایان پێ باشبوو بوو کە ئەویش بێتە هەولێر وەکوو ئەندامی کۆمیتەی کارگەران و پێشیان وتبوو کە بێت بۆ لای من تا پێکەوە لە خانووەکەی بەلاشاوا پێکەوە بژین. ئەوە بوو بەسەرەتای پەیوەندی وهاوڕێیەتییەکی زۆر تایبەت و نزیکی نێوانمان لە ڕووی سیاسی و فکری و کۆمەڵایەتیەوە کە تا دەستگیری و گیان لەدەستدانی ئەو لە ئایاری ١٩٨٦دا، مەگەر بۆ چەند ڕۆژ، ئەگینا شەو و ڕۆژ پێکەوە بووین.

پێموایە ڕۆژێکی بەهاری ١٩٨٣ بوو لە ناکاو و بێ ئەوەی من لەوەوپێش ئاگادار بم، نەجات خۆی کرد بەماڵدا. تەنها وتی بیستوومە بە ئیختیفا لێرە ئەژیت و منیش وەزعم لە سلێمانی تێکچووە و پێمباشبوو سەرێکت لێ بدەم و لە نزیکەوە ئاگاداری وەزعت بم. دوای ٢-٣ ڕۆژ مانەوەی نەجات هاوڕێ "عوسمانی حاجی مارف" کە ڕێکخەری من بوو هات و ئیتر ئاگادار کرام کە ئێمە هەرسێکمان لەگەڵ دوو هاوڕێی تر ئەندامی کۆمیتەی هەولێری ڕێکخراوین. بەوجۆرە جگە لە من کۆمیتەکە پێکهاتبوو لە عوسمان و نەجات و "نوری کەریم" و "سامی" کە تەنها ئەم هاوڕێیەمان خەڵکی هەولیر بوو و ئەویش ئەندازیار و هاوڕێی زەمانی خوێندنی نوری و نەجات بوو لە زانکۆ. تا ئەوکاتە پەیوەندیی من بە ڕێکخستنەوە دوو قۆڵی بوو، ساڵانی سەرەتا لە ڕێگەی جەبار مستەفا و پاشان ئەو ناساندمی بە عوسمان. ئێستا عوسمان لێپرسراوی کۆمیتەکەیە و بۆ من ئەمە یەکەمین کۆبوونەوەی بەکۆمەڵە لە ڕێکخراودا و سەرەتای قۆناغێکی چڕوپڕە لە کارو وەهەڵسووڕانی ڕێکخراوەیی بەشێوەی ئیختیفا. هەموو هاوڕێیان بەگەرم و گوڕیەوە بەشداریی کۆبوونەوەکە بووین و پاش تەواو بوونی تەنها من و نەجاتماینەوە و من باسی ئەم ماڵە و گەڕەکەکە و دەوروبەری و بارودۆخی هەولێرم بە گشتی بۆ نەجات کرد.

نەجات چی لە ڕووی ئاستی هۆشیاریی فکری و سیاسیەوە و چی لە ڕووی تاقیکردنەوەوە لە من کامڵتر بوو. جگە لەوەش ئەو لە بواری ڕێکخستن و وردەکاریەکانی توانایەکی زۆر باشی هەبوو. تەنها گرفتێک کە هەیبوو و زۆر جار ئەبوو بە مایەی کێشە لە نێوانماندا کەم بایەخدان و بەکەم سەیرکردنی توانای دەزگا سەرکوتگەریەکانی ڕژێم بوو و حەماسێکی زۆر گەرم و بزێویەکی بێ ئەندازەی ئەو بوو.

من خۆم لە هەولێر تۆڕێک پەیوەندیی ڕێکخراوەییم هەبوو چ لە ناو هەولێــر چ  لە زانکــۆی ســەلاحەدین. جــگە لەوەش تــۆڕێکی تــری پەیوەنـدیم لەگەڵ زۆر کـادری کـۆنی کـۆمەڵە هەبـوو کە تـا ئەو کـاتە لەنــاو شــاردا مــابوونەوە. هەمــوو هەوڵــم ئەوەبــوو کە هەم ئەو پەیوەنــدیانەم لەڕێــگەی مالەکەمــانەوە نەبێــت و هەم پەیوەنـــدیە ڕێکخراوەییەکانی خوار خۆمەوە نەبەمە ناو کۆمیتەکە و تەنها هـاوڕێ عوسـمانی لـێ ئاگـادار بێـت. هەمـوو ئەوەش وەکـوو پرەنسـیپێکی ڕیکخراوەیـی و دیسـپلینێکی ئەمنـی بەتـایبەتی کە مـن خـۆم وەزعـی ئەمنیم شەق و شڕ بوو. جگە لەوەش ئەمزانی کە نەجاتیش لە هەولێر پەیوەندیی تـایبەتی ڕیکخراوەیی، سیاسی و شەخسیی خۆی هەیە و زۆر خـــۆم لەوەش دوورئەگـــرت و ئەوپەڕی هەوڵـــم ئەدا کە ئەو پەیوەندنیانە تێکەڵ بەیەک نەبن بە تایبەتیش ئێمە کەسمان خەڵکی ئەم شـارە نـین و هـیچ سەرپۆشـێکی کۆمەلایەتیمـان نیـیە بـۆ داپۆشـینی چالاکیەکانمان و هەردووکیشمان سەڵت بووین.

کێشـەیەکی گەورەتـر ئەوە بـوو کە بەلاشـاوا گەڕەکێکـی زۆر شـەعبی هەولێر بوو. ئەوە مایەی کۆمەڵێک سەرئێشە و مەترسی بوو بۆ ئێمە. ژیان لەو گەڕەکە شەعبیانەدا کە هەموو کەس ئەزانێ هەر کەسـە چـی ئەخوا و چی ئەکا و چەند کەس لەو ماڵەدا ئەژین و چەند لەوی تر، بۆ ئێمە ئاسان نەبوو، بەڵام هیچ چارەیەکی تریشمان نەبوو. هەمیشـە ڕیـــزی ژنــانی دراوســـێ و دەوروبەر بەردەرگاکانیـــان ئەتەنـــی و مەجلیســـیان دائەبەســـت و چـــاودێریی ڕێبواریـــان ئەکـــرد و هاتوچۆکەریان ئەژمارد. ئێمە بە زاراوەی قسەکردنماندا دیار بوو کە خەڵکی ئێرە نین. خەڵکی گەڕەکەکە زۆربەیان پێشتر لادێ نشین بوون کە لەو سالانەدا ڕوویان کردبووە شـار. بۆ ئەوەی نەکەوینە بەرچـاو وببـــین بەمـــایەی ســـین و جیمـــی خەڵـــک، جـــگە لەوانەی کە بـــۆ کۆبوونەوەی کۆمیتەکە ئەهاتن، ڕێگەمان نە ئەدا بە هـاوڕێ و دۆسـتی خۆمان بۆ هـاتوچۆی ئەوێ، خۆمـانیش لە چوونەدەرەوە و هـاتنەوەدا

ئەبوایە زۆر ئاگادار بین. من بۆ خۆم نیزامێکی توند و تۆڵی ئەمنی و دیسپلینیم پەیڕەو ئەکرد و چونکە پێش نەجات لەوێ بووم، ئەویشم ئاگادار کردبۆوە کە وا بکات. بۆ نموونە کاتێک بڕۆیشتمایەتە دەرەوە لە پێشدا لە درزێکی دەرگاکەوە چاوێکم بەدەوروبەردا ئەگێڕا. لە کۆڵانێکەوە بڕۆیشتمایە بەهەمان کۆڵاندا نەئەگەڕامەوە. بەرەبەرە خۆمان لەگەڵ ژیانی خانوو و گەڕەکەکە ڕاهێنا و پاشان کەوتینە سەر ڕەوتی سروشتی خۆمان و تێوەچوونی بەرنامەی چالاکیی سیاسیمان.

## کارگەران: خولانەوە لەناو بازنەیی خۆدا!!

ئەو سەردەمە لە ناوخۆی کارگەراندا جموجۆڵێکی فکری و سیاسی لە ئارادابوو کە لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی یەک لەدوای یەکی باسەکانی کۆمەڵەی ئێران و ئەو گۆڕانکاریە فکریانەی کە بەسەرهەڵدانی باسەکانی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و نووسراوەکانی یەکێتیی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست (اتحاد مبارزان کمونیست) ناسرابوون، ڕیزەکانی ڕێکخراوی ئێمەشی کردبوو بە مەیدانی تێکۆشانێکی فراوان. کێشەیەکی ئەو باسانە بۆ ئێمە ئەوەبوو کە لە درێژەی گەشەی سروشتیی بزووتنەوە وڕێکخراوی ئێمەدا نەهاتبوون. وەکوو پێویستیەکی ڕاستەوخۆی گەشەی سیاسیی ناو کۆمەڵگەش نەهاتبوونە پێش. جگە لەوەش بەرهەمی جەدەلێکی لەوەوپێشی ناوخۆیی ڕێکخراو یا بزووتنەوەی چەپ نەبوو لە ناوخۆی عێراقدا. ڕاستە ئەو باسانە و ئەو دیاردە و کێشانەی کە ماتریالی شیکردنەوە و ڕەخنەکردنیان بوون خەسڵەتێکی گشتیی سیاسی و فکریی زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەمی هاوچەشنی عیراق بوون، بەڵام لە ئێراندا و بۆ خاوەنە ئەسڵیەکانی، لە جەرگەی ڕاپەڕینێکی جەماوەری و ئاڵوگۆڕێکی مێژوویی لەو وڵاتەدا هاتبوونە ئاراوە. بە پێچەوانەی عێراقەوە، هەموو تێز و بابەتەکانی ئەو ڕەوتە فکری و سیاسیە لە ناو کۆمەڵگەی ئێرانی و ڕێکخراوە چەپەکانی ئەوکاتەدا ئەبینران وببوون بە مایەی مشتومڕێکی سیاسی و فکری و ڕێکخراوەیی فراوان کە بەقەولی کوردی کلکی کەریان تیادا ئەپچڕا.

له عێراقـدا، بە پـێچەوانەوە، ئـێمە لە قۆنـاغی پاشەکشــەیەکی فراوانــی بــزووتنەوەی چەپ و سۆســیالیزم و مارکسیســتیدا بــووین. وڵات کەوتبـووە دەسـتی دەسـەڵاتێکی خوێنخـۆر و عەسـابەیەکی فاشـی. نە بزووتنەوەیەکـی جەمـاوەری نە نـووزەیەکی چەپ یـا کۆمۆنیسـتی لە خـوارووی عێراقدا نەئەبیسـترا. ئەوەی لە بـواری جموجۆڵی سیاسـیی وڵاتیشدا هەبوو یا جووڵەیەکی چەند ساڵ جاری نـاو سـوپا یا بـاڵێکی بەعسی سەر بە سووریا بوو یا جموجۆڵی هێزە ئیسـلامیە شـیعیەکان کە ئیلهامیان لە ڕێنوێنیەکانی ئێرانی ئیسلامی و خـومەینی وەرئەگرت. ئەوەی لە کوردستانیشـدا هەبـوو کـۆڕ و کـۆمەڵ و ئەڵـقە و گرووپـی لێرە ولەوێی پەرش وبڵاوی مارکسی بوون کە تازە بەتـازە مەفتوونی ئەلبانیـا و مـاویەت و سـێ جیهـانی و مەفـاهیمی فکـری و سیاسـیی لەوجــۆرە و نــوقمی دونیــای بــاس و جەدەل و خۆســاغکردنەوەی گشتیترین خەسڵەت و هەویەتی تیۆری و فکری بوون.
پێویسـتە پێداگری لەسـەر ئەو ڕاسـتیە بنەڕەتـیە بـکەم کە ئەوەی لای ئـێمە گرنگیـی نەبـوو و بایەخمـان پێـی نەدەدا جیـاوازی دانـان بـوو لە نێوان قۆناغی شۆڕشگێڕی و قۆنـاغی نـا شۆڕشـگێڕیدا. ئەو جیـاوازی دانـانە ئەلـف و بێـی سیاسـەتکردنە و کۆمەڵێکی فـراوان جیـاوازیی تـر بەدوای خۆیــدا بەکــێش ئەکــات. هەر لە شــێواز وئارایشــتدانەوەی ڕێکخـراوەییەوە تـا پەیوەنـدیی نێـوان سـتراتیج و تاکتیـک، داڕشـتنی دروشــم و پلاتفــۆرم، بەرنــامە و ســەرجەم ڕەهەنــدەکانی تــری هەڵسـووڕانی هێـزی سیاسـی، پەیـڕەوی لە یاسـا ئاسـنینەکەی ناسـین وجیاکـاریی نێـوان قۆنـاغی شۆڕشـگێڕانە و قۆنـاغی ناشۆڕشـگێڕانە دەکەن. بەو هەموو بایەخەشیەوە، ئەو مەسـەلەیە لە میتۆدی سیاسـیی کـارگەران و هێـزە چەپەکـانی تـری ئەوکـاتە و لە دەزگـای فکـری و سیاسیاندا، کەمترین جێگەی هەبوو. هۆکارەکەشـی لە ئێسـتادا بۆ مـن ڕۆشنە: ئەو جۆرە "ڕێکخراو"انە لەسەر بنەمای پێویسـتیەکانی خەبـاتی سیاسیی واقیعیی ناو کۆمەڵگا، بەو جۆرەی کە هەن، دروست نـابن و

نــاجوولێن بەڵكــوو لەســەر بنــاغەی ئایــدیۆلۆجیا و بــڕوای فكــری ئەنــدامەكانیان، لە گشــتیترین ئاســتدا، ســەردەرئەهێنن. كۆمەڵگــا، لەم دیدگایەدا، قەوارەیەكە یـا بـۆتەیەكە بـۆ سـەڵماندنی جەبریـی ڕاسـتیی ئایــدیۆلۆجیا نەك ئایــدیۆلۆجیا ئامرازێــك بێــت بــۆ ناســینی دیــوە تاریكەكانی كۆمەڵگا تا لە كوێدا ئەو ئایدیۆلۆجیایە دروست دەرنەچوو زۆر بەئاسانی توور هەڵبدرێت.

ئەو باسانەی كە پێیان ئەوترا (ماركسیزمی شۆڕشگێڕ) زیاتر هەوڵێك بوون بۆ گەڕانەوە بۆ ماركسـیزمی ئەرسـەدۆكس و كلاسـیك وەكوو چەكێكی تیۆری بۆ شیكردنەوەی كێشـەكانی شـۆڕش لەم سـەردەمە و بەتــایبەتیش لە جەرگەی شــۆڕش لە ئێرانــدا. لەو ســەردەمەدا چــوار خەت و ڕەوت لە ناو بزووتنەوەی چەپی ئێراندا بـاوبوون. لایەنگرانـی حیزبـی تـوودەی ئێـران و ئەوانەی كە لایەنگـری یەكێتیـی شـوورەویی ئەوكـاتە بـوون كە ئەمـانە بە خەتـی یەك ئەناسـران. پاشـان ڕەوتـی چریكــی كە ڕەوتێكــی بەهێــزی نــاوبزووتنەوەی چەپ بــوو و لە شەســــــتەكانەوە لە پرۆســــــەیەكی درێــــژدا لە ڕەوتــــــی یەكەم دووركەوتبـوونەوە. ئەمـانە بڕوایـان بە خەبـاتی رادیكـال و چەكدارانە هەبـوو بـۆ ڕووخـانی (ڕژێمـی ئەڵـقە لە گـوێی ئیمپریـالیزمی شـا) لە ئێرانـدا، ئەمـان خەتـی دوو بـوون. یەكێكـی تریشـیان كە بەخەتـی سـێ ناسرابوو لەو ڕێكخراوانە پێكهـاتبوو كە لە دژی هێزی یەكەم بـوون و ئەوانیان بە لادەر لە ماركسـیزم (ڕیڤیژینیسـت) لە قەڵەم ئەدا وبڕوایـان وابــوو كە ئەبــێ پشــت بە ماركســیزمی ڕەســەنی مــاركس و لینــین ببەسـترێ. خەتـی سـێ جگە لەوەش تێدەكۆشـان بـۆ بنیاتنـانی حیزبـی سـەربەخۆی كۆمۆنیسـت كە تەنهـا ماركسـیزم بكـا بە ئـاڵای خـۆی و بڕواشیان بە خەباتی چریكیی دابڕاو لەخەڵك نەبوو و پێیـان وابـوو كە خەباتی كرێكاران و جوتیاران یا زەحمەتكێشان لە دژی سەرمایەداری و دەسـەڵاتە سیاسـیەكەی لە ئێرانـدا لە ڕێـی ڕاپەڕینـی جەمـاوەری و چەكدارانەوە تەنها ڕێگەی دروسـتە. یەكێتیـی تێكوشـەرانی كۆمۆنیسـت

بەڕابەرایــەتی (مەنســوور حــیکمەت، حەمیــد تەقــوایی و ئیرەجــی ئـازەرین)[1]، کە گرووپێکی بچووکی سـەر بەم خەتە بـوون، بنیـاتنەری ڕەوتــی مارکســیزمی شۆڕشــگێڕ بــوون. بەڵام ئەم ڕەوتە چەنــدین ڕێکخـراوی بەهێـز و بەنفـووزتری وەکـوو پەیکـار و ڕەزمەنـدگانی تیـا بــوو و لەنــاو ئەم خەتــی سێیەشــدا دەیــان جیـاوازی و ململانــێ لە ئارادابوو. خەتی چواریش بە لایەنگرانی تروتسکیزم و ئەو گرووپانە ئەووترا کە پێداگریان لەسـەر ئەوە ئەکرد کە شۆڕشـی سۆسیالیسـتی ئەرکـی دەسـبەجێی بـزووتنەوەی کۆمۆنیسـتیە لە ئێرانـدا، لە کاتێکـدا هەرسـێ خەتەکەی تـر پێداگریان لەسـەر ئەوەبـوو کە ئێسـتا قۆنـاغی شۆڕشــی دیمـوکراتیە بەهەنـدێ پاشــگر و پێشـگری تـرەوە، وەکـوو هەنگـاوی پێویسـت بەرەو شۆڕشــی سۆسیالیسـتی. ئەوەم تەنهـا بـۆ تێگەیشتنی زیاتر سـەبارەت بە خەسڵەتی بزووتنەوەی کۆمۆنیسـتی و چەپی ئەوکاتەی ئێران نووسی نەک وەکوو بابەتێک بۆ شـیکردنەوە، چــونکە ئێســتا ئــاڵوگۆڕێکی زۆر بەســەر ئەو جــۆرە ڕیزبەنــدیانەی ئەوکـاتەدا هـاتووە و مێژووی چـل سـاڵی ڕابـووردووش حـوکمی داوە بەسەر ڕاستی یا ئەفسانەبوون و یا لەهەوادابـوونی بەشـێکی زۆر لەو جۆرە تێز و مەفاهیمانەدا.

تا ئەوکـاتە، ڕێکخـراوی کـارگەران سـەبات و پایەداریی فکریی نەبوو. بەشێکی بڕوای بە بیروباوەڕی ماو تسی تۆنگ و تەنـانەت تێزی سـێ جیهانیش بوو وەکوو مارکسیزمی سەردەم و هەندێکیشیان بەتـایبەتی گرووپی زینـدان کە منیش یەکێکیـان بـووم بڕوامـان بە تێزە فکـری و

[1] مەنســوور حــیکمەت، حەمیــد تەقــوایی و ئیرەجــی ئــازەرین پــێکەوە لەســەروبەندی ڕاپەڕینــی ئێرانــدا گرووپێکــی بچــووکی مارکســی بەنــاوی (ســەهەند) دائەمەزرێــنن. دواتــر نــاوی گــرووپەکە ئەگــۆڕن بە (یەکێتیــی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست – اتحاد مبارزان کمونیست). ئەمان بیروڕا فکری و سیاسیەکانی خۆیـان ناونـا مارکسـیزمی شۆڕشـگێڕ. دواتـر لەگەڵ (کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێراندا حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان دامەزراند.

سیاسـیەکانی ئەلبانیـا و ئەنـوەر خـۆجە هەبـوو وەکـوو پـوختەی مارکسیزمی سەردەم و بەتایبەتی لە پەیوەند بە کێشـە و ململانێکانی نـاو بـزووتنەوەی کۆمۆنیسـتیی جیهـانی لەو سـەردەمەدا. بەڵام ئەو ڕێکخـراوە نە بەرنـامەیەکی سیاسـیی هەبـوو نە پلاتفۆرمێـک و نەخەتێکی سیاسی و تاکتیکی و دروشمێک.

ڕێکخراوی سیاسی، بەگشتی، و چەپی بەتایبەتی، بە دوو شێوە و لە درێژەی دوو پرۆسەدا سەرهەڵئەدات.

**یەکەمیـان:** وەکـوو پێویسـتی و چەکێکـی خەباتکـارانە لە جەرگە و لە درێژەی خەباتی عەمەلیی بزووتنەوەیەک یا هێزێکی کۆمەڵایەتی یا جەماوەریی دەرگیر لەخەباتێکی فیعلیدا کە لە شوێنێک و ئاستێک لە گەشەکردنیدا ڕێکخراوبوون ئەبێ بە پێویستیەک کە ئیتر چارەنووسی ئەو بـزووتنەوەیەی پێـوە گـرێ ئەدرێ. ئەم ڕێکخـراوە پێویسـتی بە شوناسێکی تیۆری و فکری هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەرکە سیاسی و عەمەلـی و ڕێکخراوەییەکـانی وهەروەهـا بـۆ نیشـاندانی ئەو بەدیلەی بۆی تێ ئەکۆشێت. ئەم مۆدێلە لە حیزب و ڕێکخراو، لەسەر بنەمای ئەو پێویسـتیەی پێشـوو، سروشـتێکی تـایبەت بەخـۆوە ئەگـرێ و مەشغەڵە و پێکهاتە و جەدەل و باس وئەنگیزەکانی، ڕەنگدانەوەی ئەو پیویستیەن کە ڕاستەوخۆ لە پیناویدا پیکهاتووە. تیۆری و ئایدیۆلۆجی لە دنیـابینیی کەسـان و ڕابەرانـی ئەم جـۆرە ڕیکخـراوانەدا ئەبـێ بە وەسیلە و ئامرازێک و کلیلێک بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەکان و دەرگـا داخراوەکـانی ئەو بزووتنەوەیە وتیشـک خسـتنە سـەر لایەنە نادیـار و تاریکەکـانی. تیـۆری و فکـر ئەبـن بە یارمەتیـدەر بـۆ دیـاریکردنی سیاسـەت، هەڵوێسـت، دروشـم و مـۆدێلی ڕێکخسـتن و...تـاد، بـۆ ئەو بزووتنەوە و ڕێکخراوە. ئیتر لەم ڕوانگەیەوە، تیۆری خۆی، نـابێ بە کێشەیەکی دابڕاو (مجرد) و سەربار و مایە و هۆکارێک بۆ ئینشیقاق و لێـک تـرازان و دابڕینـی هێـز و لاوازکردنـی ئەو بـزووتنەوەیە و زەوتکردنی هێز و توانای ڕابەرەکانی.

لەوەش گرنگتر، هەر جیاوازیەک لە بواری فکر و تیۆریدا بێتە پێش و ڕاست و ڕەوانیی تیۆری و فکریش، یا پێچەوانەکەی، جارێکی تر لە مەحەکی هەنگاوە سیاسی و عەملیەکانی هەمان بزووتنەوە و لە هەمان پرۆسەدا ئەسەلمێت.
**دووەم:** مۆدێلێکی تری ڕێکخراو ئەوانەن کە هەر لە سەرەتاوە لە ناو ژینگە و جیهانی ڕۆشنبیرانی چەپدا سەرهەڵئەدەن. ئەم گرووپ و مەحافیلانە دەرگیر نەبوون لە خەباتێکی سیاسی یا جەماوەری. لە مەیدانێکی کێشمەکێشەکانی ناو کۆمەڵگا و سەردەمەکەی خۆیاندا نەوەستاون. پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی و کارلێکی ناو هیچ چین و توێژێکی کۆمەڵدا نیە. کێشەی ئەمان مەشغووڵ بوون نییە بە ئاڵوگۆڕ و وەرچەرخانە زیندووەکانی ناو دونیای سیاسەت و ململانێ زۆر و زەبەندەکانی. ئەمان سەرگەرمی موجەڕەدترین ودابڕاوترین کێشەی تیۆری و فکریەکانن کە زۆربەیان هیچ نموونەیەکیان لە ئەرزی واقیعی وڵات و سەردەمەکەیاندا نیە. ئەنتەرناسیونالیزمی پرۆلیتاری، مێژوو وسروشتی شۆڕشەکانی وەکوو ١٨٤٨ی ئەورووپا و ئۆکتۆبەری ڕووسیا و کۆمۆنەی پاریس یا مەقوولاتی وەکوو چین و توێژ و جیاوازیە فکریەکانیان یا زێدە بایی و کەڵەکەبوونی سەرەتایی و ڕەوتی تێکڕای قازانج بەرەو دابەزین، کێشەی نێوان چین و سۆڤیەت، کێشەکانی ناو ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆمۆنیستی، وەرچەرخانی سەرمایەداری بەرەو قۆناغی ئیمپریالیزم، یا خەباتی مارکس و لینین لە دژی ڕەوتە فکریەکانی تری ناو بزووتنەوەی سۆسیالیستی ودەیان بابەتی تر، ئەبن بە سەرقاڵی و بابەتی سەرگەرمیی ئەمجۆرە لە ڕێکخراو و هەڵسووڕاوانی سیاسیی مارکسی .
ڕێکخراوی (یەکێتی تێکۆشانی کارگەران) نموونەیەکی کلاسیکی ئەو مۆدێلەی دووەم بوو.

کەســـــایەتیەکانی ڕابەریـــــی ئەم ڕێکخـــــراوە لە شـــــیکردنەوە و یادەوەریەکانی دواتریاندا پێداگری لەسەر ئەوە ئەکەن کە کارگەران تا قۆنـــاغی پەیـــداکردنی پەیوەنـــدی لەگەڵ کـــۆمەڵەی شۆڕشـــگێڕی زەحمەتکێشانی ئێران و کەوتنە ژێر ڕاداری کاریگەریی مارکسیزمی شۆڕشگێڕەوە (مەحفەلێکی پۆپۆلیستی ماویست – ئەلبانی) بووە. هەر خۆشیان (بۆ نموونە بڕواننە گێرانەوەکانی جەبار مستەفای لە کتێبی: (مێژوویەک لەیادەوەریدا – ئێدیتۆر سالار ڕەشید) باس لەوە ئەکەن کە خەریکی هەنگاونان بوون بۆ ڕێکخستنی خەباتی جەماوەری و چەند نموونە لە سلێمانی و پێنجوێن وقەڵادزێ باس ئەکات. هەر لەو قۆناغەشـدا و بـۆ بەهێزکردنـی ئەو هەنگـاوە سـەرەتاییانەی پێشـوو، کــارگەران جموجــۆڵێکی تــێ ئەکەوێ بــۆ شــیکردنەوەی خەبــاتی جەماوەری (هەندێک نووسراومان بە دەستنووس لە چوارچێوەیەکی تەسکدا لەسەر مانگرتنی ١٩٨٠ ی پێنجوێن، جەنگی عێراق ئێران و.. بڵاوکـردەوە). جەبـار. ل ٥٥. هەر لە هەمـان چوارچێـوەدا و وەکـوو هەنگاوێکی تری پۆزەتیڤ نووسراوەیەکی درێژ لە لایەن ڕێکخراوەوە دەرچـوو بەنـاوی (حركـة الاضـرابات و المظـاهرات فـي العـراق) کە هەمـوو پـێکەوە سـەرەتایەکی بـاش بـوون بـۆ بەشـداری سیاسـی و عەمەلی و فکری لە هەندێ کێشەی ناو عێراقدا.

ئەوەی دواتر پێمان ئەووت (لادانی پۆپۆلیستی) لە ڕاستیدا سـەرەتای قۆناغێکی پایەدار بوو لە ڕووتێکردنی ڕێکخراوی ئێمە بەرەو خەباتی جەماوەری وەکوو گرنگترین مەیدانی خەباتی سیاسیی ئەو سـەردەمە کە زۆر زوو نەک هەر دەســـبەرداری بـــووین، بەڵکـــوو کەوتیـــنە نەفرەتکردن و دەربڕینی پەشیمانی لێی. نەبوونی پایگای جەماوەری وتێوەنەچوون لە چالاکیی سیاسیدا لە مەیدانەکان و ژینگەی واقیعیی خەبـات و ژیـانی خەڵـکەوە، کێشـەیەکە بە هـیچ هێزێکـی مەعریفـی و تیـۆری چـارە ناکرێـت. بەڵام کەموکـوڕیی تیـۆری و مەعریفـی لای هێزێکی سیاسی، بەپێچەوانەوە، قابیلی چارەسەکردنە.

ڕاســتیەکەی ئەوەی پێمــان ئەوت مارکســیزمی شۆڕشــگێڕ بــوو بە چەتری نەجاتێک و ڕێکخراوی ڕزگارکرد لە پاشاگەردانی وبنبەستێکی فکــری کە تووشـــی بووبــوو و هیچـــی تــر. ئەم ڕووکـــردنە بەرەو مارکسیزمی شۆڕشگێڕ کە زۆر جار فووی پیا ئەکرێ و ئەکرێ بە سـیحرێک، سـەرەتایەک بـوو بـۆ ڕوو وەرگێڕانێکـی ڕیشــەیی نــاو بــزووتنەوەی چەپــی کوردســتانی عێــراق لەو هەنگــاوە ســەرەتاییە سیاسـی و عەمەلیـانەی کە خەریـک بـوو لە کـۆمەڵی ئەو سـەردەمەدا هەڵی ئەگرت بۆ بەشداری لە خەباتی جەماوەریدا بەقازانجی کشانەوە بۆ نـاو جیهـانە بە لەزەت و خۆشەویسـتەکەی بـاس و جەدەلـی لەبـن نەهاتووی دابڕاوی ئەوەی پێمـان ئەووت تیۆری یـا فکر. جگە لەوەش ئەوە ســەرەتای پەیوەنــدیەکی ناهاوتــا و پــڕ لەگــرێ و لە ڕاســتیدا پاشکۆیەتی بزووتنەوەی چەپی کوردستانی عێراق و ڕەوتی مارکسیی نوێ بوو بۆ لایەنێکی دیاریکراوی ناو چەپی ئێرانی کە سەرەتا بۆ ناســاندنی شوناســی فکــری و سیاســیی خــۆی نــاوی خــۆی نــا مارکســیزمی شۆڕشــگێڕ و لە نیــوەی دووەمـــی هەشتاکانیشـــەوە بەویشەوە نەوەستا و بوو بە (کۆمۆنیزمی کرێکاری).

خـاڵی بەهێـزی کـارگەران ئەوە بـوو کە چوارچێوەیەکی ڕێکخراوەیـی دروســـت کـــرد بـــۆ کۆبـــوونەوەی گرووپێـــک لە کەســـایەتیە مارکسیستەکانی ئەو قۆناغە لە کوردستانی عێراقدا. بەڵام ئەم گرووپە لە ڕاستیدا، و بە پێوەری سیاسـەتکردن لە ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکەیدا، نەیتوانی ببێت بە ڕێکخراوێکی سیاسی لە ئاستی کۆمەڵدا.

گرنگتـــرین ئەو هۆکـــارە خودیانـــەی کە کارگەرانیـــان کردبـــوو بە مەحفەلێکی نەزۆکی سیاسی بریتی بوون لە:

١/ بونیەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی لاوازی کارگەران.

٢/ دەرکێکی ڕووکەش (سطحي) سەبارەت بە ڕۆڵـی فکر و تیۆری و نەزعەی قووڵی ئایدیۆلۆجیگەری لەو بوارەی دواییدا.

٣/ نەبـــوونی ئیرادەیەکـــی شۆڕشـــگێڕانەی بەهێـــز لەنـــاو ئەڵـــقەی ڕابەرایەتیەکەیـدا واتە ئیـرادەیەک بـۆ گیرسـانەوە لە نـاو هاوکێشـە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان و تێکۆشانی بە بەرنامە بۆ گۆڕینیان.

٤/ کەمـی ولاوازیـی نفـووزی ڕێکخراوەیـی و شـێوازی مەحفەلیـی ڕێکخستنەکەی.

٥/ نەبـوونی یەکدەسـتی و یەکیەتیـی ئیـرادە لەنـاو ڕابەریەکەیـدا و مەشـغووڵ بـوون بە کێشـە و ململانێ لەسـەر بـابەتی پـەتی (مجـرد) فکری وتەنانەت شەخسیش کە دواتر لە جیابوونەوەکەی ساڵی ١٩٨٤ دا دەرکەوت.

٦/ ژیانی کاری نهێنی و.. تاد.

٧/ فەزای دیکتـــاتۆریەت و ســـەرکوت وداپڵۆســـین لە عێراقـــدا کە نموونەی لە جیهاندا کەم بوو.

دیـارە مـن زیـاتر قسـەم لە سـەر هۆکـارە خودییـەکان کـردووە لەم بوارەدا، ئەگینا ئەو بارودۆخە دیکتاتۆریەی کە باڵی کێشـابوو بە سـەر هەموو سووچێکی ژیـانی سیاسـی و کۆمەڵایەتیدا، فـاکتەرێکی بـابەتیی گەورە بوو کە تەجاوزکردنی کـارێکی سـادە و ئاسـان نەبوو، گەرچـی ئەوە دراوێکی (معطى) بابەتیە کە لەسەرەتاوە ئەم ڕێکخـراوە هۆشـیار بووە پێی و بوونی ئەوی بەفەرز وەرگرتووە.

لەولاشـــەوە، لەســـەرەتای هەشـــتاکاندا، کوردســـتانی عێـــراق لەو بەسـتەڵەکە سیاسـیەی بـاقی عێـراق جیـا ئەبـووەوە و نـاڕەزایەتیی جەماوەری شەپۆلی ئەدا و ئەهاتە سەر شانۆی سیاسیی کۆمەڵ.

لە کاتێکـدا زۆربەی فـاکتەر و پێویسـتیە کـۆمەڵایەتی و سیاسـیە بابەتیەکان (موضوعي) دەخەملان و ئامادە دەبوون بۆ گەشەسـەندنی بزووتنەوەی جەماوەری لە دژی سیاسەتە سـەرکوتگەریەکانی ڕژێمـی بەعـس. هەر لەو کاتەشـدا کـۆمەڵەی ڕەنجـدەران پایگـای لەنـاو بـزووتنەوەی شۆڕشـگێڕانەی جەمـاوەریی شـارەکاندا بەرەو لاوازی تەواو ئەچوو ودەستبەرداری دروشم و سیاسـەتە شۆڕشگێڕانەکانی

قۆناغی ١٩٧٦ – ١٩٨٠ ئەبوو. لەولاشەوە کێرڤی ئامادەیی خەڵک بەتایبەتی لە شارەکاندا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێم بە شێوازێکی شۆڕشگێڕانە بەرەوە سەرەوە ئەچوو. لەکاتێکدا کە ئەو بارودۆخە تەنها پێویستی بە هێز و ڕێکخراوێکی چەپی شۆڕشگێڕ هەبوو، بەڵام ڕێک هەر لەو کاتەدا، کارگەران، لەجیاتی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە وبەپێرەوە چوونی ئەو ئەرکە گەورەیە لە دڵی ئەو بارودۆخە گونجاوەدا، بە بیانووی دەسبەرداربوون لە پۆپۆلیزم و ڕووکردن و پێشوازی لە مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، ١٨٠ پلە با ئەداتەوە و ئەچێتەوە ناو قاڵبە تەسکە مەحفەلیەکەی خۆی و لە قووڵایی میحرابی تیۆری وفکردا جێخوش ئەکات، بێ ئەوەی لە هەموو مێژووی خۆشیدا یەک دەستکەوت لەبواری فکر و تیۆریدا بەدەست بهێنێت.

جگە لەوەش ئاڵوگۆڕ و گەشە لەبواری فکر و تیۆریدا، لە گشتی ترین ئاستدا، ئەوەیان لێ چاوڕوان ئەکرێت کە تەکانێکی بەهێزتر بدەن بە خەباتی سیاسی و پراتیکیی هێز و ڕێکخراوی سیاسی و بازووی ئەو بەهێزتر بکەن نەک لاوازتر، وەکوو لەم نموونەیەی ڕێکخراوەکەی ئێمەدا بینیمان.

ڕابەریی ئەم ڕێکخراوە ئەوەندە لە ڕووی عەمەلیەوە کەم ئیرادە، و لە ڕووی فکریەوە ناپایەدار بوو کە بە قسەی جەبار مستەفا لەیەک کۆبوونەوەدا لەگەڵ د. جەعفەر و هاوڕێ حەسەنێکدا کە ئەندامی ناوەندیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێرانن (سیستمی فکری وسیاسیی پۆپۆلیستیی کارگەرانیان هەڵوەشاندەوە و بەمارکسیزمی شۆڕشگێڕ ئاشنایان کردین) مێژوویەک لە یادەوەریدا، ل ٥٦.!!! بەڵگەی ئەو ئاڵوگۆڕەش ئەوەیە کە ئەڵێ (ئاشنایان کردین بەوەی کە ئیمپریالیزم هەر سەرمایەدارییە، بەڵام لە قۆناغێکی بالادا، مەسەلەی نیشتیمانیبوون و پێشکەوتنخوازیی بەشێک لە چینی بۆرژوازی ئەفسانەیەکی ڕووتە، عێراقیش وەکوو ئێران وڵاتێکی سەرمایەدارییە)! هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

ڕابەرانـی ڕێکخراوێکـی مارکسـی دوای چەنـد سـاڵ لە (دراسـەی مارکسـیەت: بە وتەی خۆیـان) تـا ئەوکـاتە نەیانزانیبێـت کە ئیمپریـالیزمیش قۆنـاغێکی سـەرمایەداریە، کە ئەوە ئەلـف و بـای مارکسیزم و ناوی سەر بەرگی کتێبێکی لینینە!!! زەحمەتە چاوەڕوانی شتی گەورەتریان لێ بکرێت.

لێـرەدا، و دیـارە لە ئێسـتادا کە بەو مێـژووەدا ئەچیـنەوە، زۆر پرسیارمان لا دروست ئەبێ و هەر بۆ نموونە:

**یەکەم:** بۆچی ئەم ئاڵوگۆرانە لە بری ئەوەی ئەم ڕێکخراوە چالاکتر بکاتەوە و دەسکراوەتری بکات لە خەباتی سیاسیدا و پاڵی پێوە بنێت بـۆ جەرگەی کێشـە سیاسـیە گەورەکـانی ئەو قۆنـاغەی کۆمەڵگـای عێراق، سەرباری بارودۆخێکی گونجاو لەناو کۆمەڵدا، بەپێچەوانەوە، لەو ڕووانەوە پاشەکشـەیان پـێ ئەکـا و ئەیانبـاتەوە نـاو قـۆزاخە میحفەلیەکەی خۆیان ودەست ئەکەنەوە بە (دراسەکردنی مارکسیەت)؟

**دووەم:** دەسـتکەوتی ئەو (دراسـەکردنی مارکسیەت)ـە چـی بـوو؟ کـام بەرهەمـی تیـۆریی گشـتی؟ چـی لە جیهـانبینی ئەم ڕێکخـراوە گـۆڕی؟ کردنەوەی گرێکوێرەی کام مەسەلەی پایەیی لە عێراقدا بەدوای خۆیدا هێنا؟ و...تاد.

بـۆ نمـوونە دامەزرانـدنی سیسـتەمی کۆمـاری و ڕووخـانی سیسـتمی پاشـایەتی، سـەرهەڵدانی بـزووتنەوەی ناسیونالیسـتی عەرەب و بەهێزبـوونی بەعـس، کودەتاکـانی ١٩٦٣ و ١٩٦٨، گەشـە و پاشـان پاشەکشـەی شـیوعیەت لە عێـراق، ڕیفـۆرمی کشـتوکاڵیی ١٩٥٨ و خۆماڵیکردنە ئابووریەکانی ١٩٦٤ و ١٩٧٢، ئـابووریی نەوت و ڕەیعی و جێگە ورێگای لە سەروسیمادان بە سیستمی سەرمایەداریی وولات، مەسـەلەی کـورد و ڕێگەچـارە جیاوازەکـانی، مەسـەلەی ژنـان، سـتەمکاری بەعـس و سـەرهەڵدانی تۆتالیتـاریزمی سـەددامیی دوای ١٩٧٩ و مـاهیەتی شـەڕی عێـراق - ئێـران و دەیـان بـابەتی تـر کە لەلایەن هێـزە سیاسـیەکانی تـرەوە نەک ببـوون بە بـابەتی لیکـۆڵینەوە

وشـیکردنەوەی زۆر و زەبەنـد بەڵکـوو لە بەرنـامە وخەتـی سیاسـی وتێکۆشـانی ئەواندا بەرجەسـتە ببوونەوە، لای ئەم ڕێکخـراوەی ئـێمە، بەو سیستەمە فکریە بەحساب ڕۆشنەوە، جێی کەمترین شیکردنەوە و بایەخدان بوون.

ئەو "قەڵەمبـازە" فکـری و تیـۆری و سیاسـیە، لە پۆپـۆلیزمەوە بەرەو مارکســیزمی شۆڕشــگێڕ، لە دەرەوەی زیهنــی ڕابەرانــی ئەم ڕەوتە نەبیَ، لە دونیـای واقیعـی پڕ لە کیشـە و مەسەلەسـازی ئەو قۆنـاغەدا، هیچ خێرێکیان نەدایەوە.

دواتر لەسەر ئەم قەڵەمبـاز و (فەتـح)ە نەزەریـانە ڕادێین و چەند بـارە بوونەوەیـان لە ڕێـگەی خوێـندنەوەی ئەم یـا ئەو نـامیلکەی هاوڕێیـانی ئێرانیەوە، ئەبێ بە کاریکاتێرێکی بی لەزەت و بێتام.

**سـێیەم:** وەکـوو پێشـتریش ووتـم گەر تیـۆری یارمەتیـدەر نەبێـت لە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەی خەبات لە مەیدانە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا، دەسگرۆیی نەکات لە بەهێزبوونی بازووی تێکۆشانی سیاسیدا، ئیتر چ بایەخێکی هەیە؟ ئاخر جێگەی تیۆری بۆ هێزی سیاسـی لەوەدا کورت ئەبێتەوە ئەگینا ئەبێ بە گەشتێکی زیهنی و کەڵەکەکردنێکی زانیـاری لەسەر تیۆریەکان و هیچی تر.

خەسڵەتێکی ڕەوتی مارکسیزم لە کوردستانی عێراق لە قۆنـاغی ١٩٧٥ بەدواوە، کە دواتــر ئەبــێ بە مارکســیزمی شۆڕشــگێڕ و پاشــان کۆمۆنیزمی کرێکاری، توونـدڕەو بوونیەتی لە پەیڕەویکردن و تەبەنـی کردنـی ئەو تێـزە فکـری و سیاسـیانەدا کە بـڕوای پێـدێنێت وکەچـی زووش دەسـبەردای ئەبێـت. ئـێمە لە ڕووی بڕوابـوون بەو تێـزانە، سەرسـەختربووین لەو ڕەوتەی کە ئەم چەمکانـەی داهێنـا و لەڕووی فکــریەوە ئەرکــی داڕشــتنیانی لە ئێرانــدا گــرتە ئەســتۆ. دیــارە توونـدڕەوبوون هاوکات بوو لەگەڵ تێڕوانینی تاکلایەنە و ڕووکەشیانە بۆ ئەو مەقوولات و ڕوانگە فکریـانە. هەر بۆیە بـزووتنەوەی مارکسـی و کۆمۆنیستیی کوردستانی عێراق لە مێژووی دوور و درێژی خۆیدا

خاوەنی هیچ دەسکەوتێکی فکریی خۆی نەبووە لە چوارچێوەی ئەو ڕەوتەدا و هیچ بەشدارییەکی نەبووە تیایدا و شتێکی نەخستۆتە سەر ئەو "پێشڕەو"یە تیۆریانە، بەڵکوو تەنها ئیشی ئەوەبووە کە پەیڕەویان لێ بکات.

ئاکامێکی تری ئەم تێڕوانینە ڕووکەشیە بۆ فکر و تیۆری ئەوەیە کە ئەم ڕەوتە ئەبێ بە نێچیرێکی ئاسان کە ڕەشەبای ئاڵوگۆڕە فکریەکان بە ئاسانی ئەیهێنێ و ئەیبات و هیچ سەربەخۆییەکی بۆ ناهێڵێتەوە. ئیتر تۆ نازانیت کە کام شەپۆلی تری ئالوگۆڕی فکری لە ئۆردووگاکانی کۆمەڵەی ئێرانەوە دێت و ئەم ڕێکخراوە بەکام لادا دەبات؟ ئەم دیاردەیە بە ڕوونی لەو قۆناغانەدا دەبینین کە پێی ئەووتریێ گۆڕان لەپۆپۆلیزمەوە بۆ مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، و لەویشەوە بۆ کۆمۆنیزمی کرێکاری. ئاکامەکەشی ئەوەیە کە بە ئاسانی و بەقەولی جەبار مستەفا (لە دیدارێکی دوو ڕۆژیدا سیستمی سیاسی و فکریان هەلوەشێتەوە) و هاوکاتیش دواتر ئەم ڕەوتە ئەکا بە لاشەیەکی بێ کاریگەر و لایەنێکی لاواز وجەمسەرێکی پاشکۆ بۆ ئەو باڵەی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی ئێران و سەربەخۆیی سیاسی و بگرە ڕێکخراوەییشی کەم ڕەنگ ئەکاتەوە.

لە ڕاستیدا ئەوەی کە هاوڕێیانی ئێمە پێوەی خەریک بوون سەرقاڵی تیۆری نەبوو بە مانا میتۆدیەکەی، بەڵکوو جوینەوەی کۆمەڵێک ڕیتۆریکی فکریی ڕەها و مجرد و دابڕاوبوون لە هەر بنەمایەکی واقیعی. ئەو مەقولە و وتەزا تیۆریانەی بابەتی سەرقاڵیەکانمان بوون، هیچیان لەسیاقی کار و هەڵسووڕان و پرۆژەیەکی سیاسیی فیعلیدا نەدەهاتنە پێشەوە کە ئێمە لە کۆمەڵگای عێراق و کوردستانی ئەوکاتەدا ڕووبەڕووی دەبووینەوە. هیچیان بەشێک نەبوون لە کێشەگەلێکی واقیعی و زیندوو، کە لە پرۆسەی گەشەکردنی بزووتنەوەیەکی لەسەر ئەرزدا دەرگیر، بۆمان هاتبنە پێشەوە و ئێمەش ناچاربین لە دونیای تیۆریدا بۆ وەلامەکانیان بگەڕێین و

دیسانەوە بیهێنینەوە و بەو کێشە واقیعیانە بەراوردیان بکەینەوە تا ڕاستی یا چەوتی ئەو چەمکە تیۆریانەمان بۆ بسەلمێت.
تیۆری و فکر، گەر لەوە دەرچوون کە ببن بە ڕێ نیشاندەرو چرای ڕێگەی تێکۆشانی سیاسی و کردەیی، بۆ مرۆڤی مارکسی ئەبن بە (عەقیدە) و مۆرکێکی میتافیزیکی و "نیمچە ئاینی" ئەگرنە خۆیان. دەبێت بە دۆگمایەکی ووشک. ئەوە ڕێک ئەو پەتایەیە کە مارکسیزم لە کوردستانی عێراقدا لەوکاتەوە تا ئێستا تووشی بووە.
لایەنێکی نێگەتیڤی تری ڕوانگەی مارکسیستەکانی کوردستانی عێراق بریتی بوو لە تێڕوانینی یەک لایەنە بۆ تیۆری.
من وەکوو کەسێک کە نزیکەی ٣٠ ساڵ لە ئاستە جۆراوجۆرەکانی ئەو بزووتنەوەیەدا کار و چالاکیم کردووە، زۆر بەدەگمەن بیستوومە یا بینیومە کە تاکە کەسێکیش ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ بەراوردکردن و دواتر تێگەیشتنی وردتر، لە نێوان مارکس و فیۆرباخ یا برۆدۆن، ئەنجلس و برنشتاین یا کاوتسکی یا دۆهرینغ ، لینین و بلیخانۆف یا هێلفەردینغ و...تاد، لە مشتومڕە تیۆریەکانی ئەو کەسایەتیانەدا لاپەڕەیەکی تەنانەت لەو نووسراوانەی فیۆرباخ و برۆدۆن، برنشتاین و کاوتسکی ودۆهرینغ و بلیخانۆف خوێندبێتەوە. ئەوە سەرباری ئەوەش کە کەسایەتی و تێڕوانینەکانی ئەوان بوون بە بابەتی ڕەخنەی مارکس و ئەنجلز و لینین و بگرە لەپرۆسەی ڕەخنەگرتن لە تێڕوانینە تیۆری و فکری و سیاسیەکانی ئەواندایە کە مارکسیزم تا بیستەکان گەشە و تەکامول ئەکات. جگە لەوەش ئەوە لە کاتێکدایە کە مێژوو و ڕۆژگار لە زۆر بابەتدا ڕاستیی بۆچوونەکانی ڕەخنە لێگیراوەکانی سەلماند و بۆ نموونە لە باسەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم لە نێوان ڕابەرانی مارکسیی ئەو سەردەمەدا پێشبینیەکانی برنشتاین دووربین تر و دروستتر هاتەدی کە پێی وابوو هێشتا سەرمایەداری خاوەنی دینامیزم و هێزێکی ئەوتۆیە کە بواری بۆ ئەڕەخسێنێت کە وا

بەئاسانی لەناو نەچێت و توانایەکی زاتیی خۆنوێکردنەوە و ئاڵوگۆڕ و خۆدەربازکردن لە قەیرانەکانی هەیە.
سەبارەت بە ڕوانگەی بلیخانۆفیش بۆ شۆڕش لە ڕووسیا هەمان ڕاستی دەرکەوت.
بەڵام ئەو سەردەمە ئێمە بە ڕادەیەک سەرگەرمی ئەو سەرکەوتن و ئاڵوگۆڕانە بووین کە پێمان وابوو کەشفی جیهانێکی تازەمان کردووە. ئەوەش بڵێم کە ئەم دەرد و پەتایە تایبەت نییە بە بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی لە کوردستانی عێراقدا بە ڵکوو دیاردەیەکی گشتیی ناو کۆمۆنیستەکانی ئێرانیش و زۆر وولاتی تریشە، بەڵام بەشە کوردستانیەکەی ئەم بزووتنەوەیە زۆرتر تووشی ئەم دەردە بووە.

من و نەجاتی هاوڕێم ئەو ماوەیەی سەرەتای ئیختیفامان لە هەولێر، بەپێی ئەو ئاڵوگۆڕانە، سەرلەنوێ هەرچی کلاسیکی مارکسیزم هەبوو پیاچووینەوە و بەقووڵی خوێندمانەوە. جاری وابوو لە شەووڕۆژێکدا ۱۰-۱۲ سەعات خەریکی خوێندنەوەی نووسراوەکانی مارکس و ئەنجلز و لینین بووین و لەبیرمە تەنانەت کتێبێکی ئەنجلزمان پەیداکردبوو بەناوی قەیرانی خانووبەرە (ازمة السکن) ئەویشمان چەند جار خوێندەوە. نەجات جاروبار هاتۆچۆی سلێمانیی ئەکرد و لەوێ پوختەی باس وئاڵوگۆڕەکانی لەگەڵ خۆیدا ئەهێنا و لە کۆتایی بەهاری ۱۹۸۳دا نامیلکەی (ئەفسانەی بورجوازیی میللی) هێنا کە نامیلکەیەکی مەنسوور حیکمەت بوو و خێرا پێش ئەو ووتم نۆرەی منە بۆ خوێندنەوەی. نامیلکەکە کرابوو بە کوردی و بەدەسخەت نووسرابوو.
ئەوە ماوەیە لە کوردستانی ئێران پرۆسەی نزیکبوونەوەی نێوان کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێران و یەکێتیی تێکۆشەرانی کۆمۆنیست لە دوایین قۆناغیدا بوو کە دواتر ئاکامەکەی بە پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دوایی هات. بۆ پێکهێنانی حیزبی

کۆمۆنیست کۆمیتەی بەرپاکردنی پێویستیەکانی دامەزراندنی حیزب پێکهاتبوو لە کۆمەڵێک ئەندامی سەرکردایەتیی هەردوولا. جاروبار کاسێت یا وتار و باسی ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە بەدەستی ئێمەش ئەگەیشت. یەکێکیان کۆمەڵێک کاسێتی کاک "عبداللە موهتەدی" بوون کە لە گوندێکدا قسەی بۆ خەڵکی ئاواییەکە ئەکرد. لە وەڵامی پرسیاری کەسێکدا سەبارەت بەوەی کە ئایا ئێوە بڕواتان بە ئیسلام هەیە کاک عبدالله ئەیووت: ئەی خۆ گاور نین چۆن بڕوامان پێی نیە و تا ماوەیەکی باش ئەوەبووبوو بە مایەی قسەی خۆش وسوعبەتی نێوان من و نەجات!

نزیکەی هەر ٣ هەفتە جارێک لێپرسراوی کۆمیتەکەمان "عوسمانی حاجی مارف" ئەهات و کۆبوونەوەی کۆمیتەکە ئەکرا. من ناوی خۆم گۆڕیبوو بۆ ئەحمەد و نەجاتیش بۆ محمد. ئەو ماوەیە باسەکانمان زیاتر سەبارەت بە مەسائیلی فکر و گوێبیست بوون لە دوایین هەنگاوەکانی پیکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و بارودۆخی گشتیی کوردستان و هەڵوێستەکانی یەکێتیی نیشتیمانی و لەوجۆرە بابەتانە بوو. هەر کەسەشمان بە جیا و تەنیا لای عوسمان باسی چالاکیەکان و هەواڵی پەیوەندیە ڕێکخراوەییەکانی لای خۆی ئەکرد.

من لای خۆمەوە پەیوەندیی ڕێکخراوەییم لەگەڵ عەلی و ئەیاد و مەمەند هەبوو. لەو ماوانەدا کە عەلی و ئەیاد لە بەغداوە بۆ سەردان ئەهاتنەوە قسە و باس وکۆبوونەوەی جیاجیام لەگەڵ هەریەکەیاندا ئەکرد و دەنگوباس و هەڵوێست و ئاڵوگۆڕەکانی ڕێکخراوم لەگەڵیاندا باس ئەکرد و هەر لە ڕێگەی ئەوانیشەوە زیاتر ئاگاداری چالاکیەکانی ئەوان و هەواڵ و ئاڵوگۆڕەکانی دەرەوە و دەوروبەریان لێرە و لە زانکۆ ئەبووم، چونکە لە چەند مانگی یەکەمی ئیختیفادا وا تێگەیشتبووم کە بەهیچ جۆرێک تێکەڵ بە دونیای دەرەوەی ماڵەکەی خۆم نەبم. من پێشتریش لە کەرکووک پەیوەندیی سیاسیم لەگەڵ کۆمەڵێک کەس و ئەندامی لەوەوپێشی کۆمەڵەدا هەبوو، بەڵام لە بەر

ئەوەی تا ماوەیەکی زۆر بەهۆی مەترسیی ئەمنیەوە هاتوچۆی ئەوێم نەئەکرد، زووتر جەبار مستەفام لەو پەیوەندیانە ئاگادار کردبۆوە تا لەلای ترەوە کاریان لەسەر بکەن. دوای ماوەیەک لە جێگیربوونەوەی یەکجاریم لە هەولێر هەوڵمدا کە لەناو ناوەندی زانکۆی سەلاحەدیندا، کە لە ڕووی سیاسیەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو، بە لەبەرچاوگرتنی تەواوی بارودۆخی ئەمنی، پەیوەندی دروست بکەم.
"ئیسماعیل جەباری" و "خالید حەمەعەزیز" کە هاوڕێی سەردەمی زیندان و گرووپی ئەو کاتەی خۆمان بوون و لە شەشی ئامادەییش لە کەرکووک پێکەوە بووین لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین ئەیانخوێند. ئەوە کەناڵێکی باش بوو بۆ من و وەکوو ئیحتیاتیش شوێنەکەی خۆم بە ئیسماعیل وت تا ببێت بە ڕایەڵێکی پەیوەندیم بە دونیای دەرەوە و ئاگاداركردنەوەم لە هەر ئاڵوگۆڕێک و بەئاگابوونیش لە جموجۆڵ و چالاکیی چەپ لە کەرکووک کە لەو سەردەمەدا بزووتنەوەی چەپ ببوو بەخاوەنی پایگایەکی بەهێز لەوێ. ماڵەکەی من زۆر نزیک بوو لە کولێجی ئادابەوە و ئیسماعیل جاروبار سەردانی ئەکردم. منیش جاروبار شەوانە سەردانی بەشی ناوخۆییەکەی ئەوانم ئەکرد تا خالیدیش ببینم. ئەم دوو هاوڕێیەش سەر بەکارگەران بوون وبەداخی زۆرەوە هاوڕێ خالید لە دوای سەرکووتی ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ لەڕێگەی نێوان کەرکووک و چەمچەماڵدا لە بارودۆخێکی نادیاردا کوژرا.
مەمەند کە لە قەلادزێ دەژیا کادرێکی چالاکی ڕێکخراو بوو و لە ناوچەی پشدەر کەسێکی خاوەن ئیعتیبار و خۆشەویست بوو. ئەو گەرچی خۆی لەخێزانێکی ئاغای گەورەی ناوچەکە بوو و کوڕەزای بابەکر ئاغای گەورەی پشدەر بوو، بەڵام دەمێک بوو بوبوو بە کەسێکی مارکسیی چالاک و ڕۆشنبیر. ئەو هەر لە سەردەمی زانکۆوە پەیوەندیی بە کارگەرانەوە هەبوو و یەکێک بوو لە هاوڕێ چالاکەکانی گرووپی ئێمە لە زانکۆی بەغدا. ئەو جاروبار لە قەمچووغە و هەولێر

سەردانی ئەکردم. مەمەند تۆڕێک پەیوەندیی فراوانی هەبوو لە پشدەر و ناوچەکە و توانایەکی فکری و سیاسیی باشی هەبوو بەتایبەتی لە شیکردنەوەی فکری مارکسیدا وردەکار بوو بۆ کەسانێک کە تازەکاری ئەو بوارەن. عەلیش یەکێکی تر بوو لە کادر وکەسایەتیە هۆشیار ولەسەرخەت و کامڵەکان کە جگە لەوەی لە ڕووی فکریەوە تواناییەکی باشی هەبوو، خاوەنی پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتیی فراوان بوو چ لە ناوەندی زەحمەتکێش و چ لە ناو کۆڕوکۆمەڵی خوێندەوار و لە دەوروبەرە کۆمەڵایەتیەکەی خۆشی کەسێکی خاوەن کەسایەتیی بەهێز و خۆشەویست بوو. ئەمیش لای خۆیەوە پەیوەندیەکی فراوانی هەبوو. ئەم دوو هاوڕێیە زۆر بە دیسپلین و هۆشیاریەوە هەڵئەسووڕان و لە ماوەی دوور ودرێژی پەیوەندیی سیاسی و ڕێکخراوەییماندا کەمترین کێشەی ئەمنییان نەخوڵقاند. هەر لەو ساڵەدا ولە ڕێی عەلیەوە وەستا جەلالم ناسی کە کوڕیکی کرێکاری کاشی بوو و تازە سەروکاری لەگەڵ چەپدا پەیدا ئەکرد. جیاوازیەکی وەستا جەلال لەگەڵ ئێمەدا ئەوەبوو کە ئەو لە ژینگەیەکی فکری و کۆمەڵایەتیی جیاوازەوە هاتبوو. ئەو کوڕێکی کرێکار بوو کە تا ئەو کاتەی کە ئەکەوێتە ژێرکاریگەریی عەلی، کەمتر سەروکاری لەگەڵ دونیای فکر و تیۆری و ناکۆکیەکان و مەشغەڵەکانی ئەو ژینگەیەدا هەبوو. عەلی بەزمانە سادە وڕەوانەکەی خۆی کاریگەریی فکریی لەسەر وەستا دانابوو و ئەوکاتەی من ناسیم ئیتر لای ئەم لەوە سادەتر نەبووکە خۆی بە مارکسیست پێناسە بکات. هەرچی ئەیاد بوو و بەوهۆیەوە کە کوڕی خێزانێکی دەوڵەمەندی هەولێری بوو کە کەس وکاری لە ماڵەوە بە تورکمانی قسەیان ئەکرد، پێشتر نزیکایەتی لەگەڵ کۆمەڵەدا هەبوو و لە سەردەمی کۆلێجی یاساوە ببوو بە یەکێک لە ئەڵقەکەی کارگەران لای ئێمە، بەڵام پەیوەندیی ڕێکخراوەیی ڕاستەوخۆی لەڕێگای منەوە بوو.

هاوینی ١٩٨٣ عەلی و ئەیاد بۆ وەرزی پشووی خوێندن هاتنەوە بۆ هەولێر. ئەوە بۆ من بوو بە دەروازەی تیکەڵی و هاتوچۆ و دەرەوە بینینێک کە تا ئەو کاتە لەخۆم قەدەغە کردبوو. زۆر جار سەردانی ماڵی ئەیادم ئەکرد و لای ئەو ئەمامەوە. ئیتر چاوم لە هەولێردا کرابۆوە و تۆزێک لەو حاڵەتی نیمچە زیندانیەی کونجی ماڵ هاتمەدەر کە زۆر وەڕسی کردبووم.

لەبەرئەوەی پێشتر ژیان و دونیای ئیختیفام نەدیبوو، سەرەتا پێموابوو کە دەبێ دەرگای ماڵ لەخۆت داخەیت و تەنها ڕایەڵێک کە بیهێڵیتەوە بریتیە لە پەیوەندیی ڕێکخستن و ئەو هاوڕێیانەی کە لەو پەیوەندیەدا چاوت پێیان ئەکەوێ. بەرەبەرە لەو قاوغە هاتمە دەر. تا ئەوکاتە، کاتێک نەجات ئەڕۆیشت بۆ سەفەر جاری واهەبوو بۆ مانگێک مەگەر لەبەرخۆمەوە قسەم بکردایە ئەگینا کەسێک نەبوو کە تەنانەت بیدوێنم.

بەتەواوی مانا ژیانێکی چریکیمان هەبوو. نە گوێگرتن لە مۆسیقا و گۆرانیەک، نە بینینی فیلم و سەردانێکی سینما، نە خواردنەوە و نادی و گەشتێک و بۆ منیش نە ئاگاداری کەسوکار و چارەنووسی ئەوانم. وام هەست ئەکرد کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی بەتەواوی دابڕاوم و بووم بە ژمارەیەک لە تۆماری ئەندامەتیی ڕێکخراوێکی نهێنییدا. خولیا و حەز، ئارەزوو و عەشق، تام و چێژی هەموو شتەکانی ژیان، خۆشی و غەم، هەموویان لە حاڵەتی سایکۆلۆجی سروشتی خۆیان جەڕابوون وترازابوون و پێوەری هەموو شت لای من ببوو بەوەی چۆن بیروباوەڕ و ڕێکخراوەکەم وهاوڕێکانم وڕێبازە سیاسیەکەم هەمیشە بەروە پێش و سەرکەوتن ئەڕوات. بەتەواوی لەناو قۆزاغەی جیهانی ئیختیفا و ڕێکخراودا قەتیس ببووم. ژیانی کۆمەڵایەتی و شەخسی و عاتیفی کەسی موختەفی لە سایەی ڕژێم و سیستمە دڕندەکانی وەکوو بەعسدا، و بۆ کەسێک کە هێزە سیاسیە بەناو " شۆڕشگێڕەکەی " شاخیش بەخوێنی سەری تینوو بێت، کورت

ئەبوەوە بە خواردن و خەوتن و خوێندنەوە و کۆبوونەوە و مناقەشە و چاوەڕوانیی ئەوەی کە کەی دەسگیر ئەکرێیت!!
لە ڕووی سیاسیشەوە، ژیانی خۆڤەشاردن و ئیختیفای سیاسی خۆی جیهانێکی تایبەتە. هەموو شتەکان کورت ئەبنەوە لە نێوان دووجەمسەری تۆ و دوژمندا.
ئێمە تەنها ڕادیۆ و تەسجیلێکی کۆنی ماڵی عەلیمان لابوو کە بۆ گوێبیستی هەواڵ بەکارمان ئەهێنا. نەجات جووڵە و سەفەری لە من زیاتر بوو. ئەو دڵتەڕ تریش بوو لە من. دەزگیرانێکی هەبوو کە لە دەرەوەی هەولێر مامۆستا بوو. دیاربوو ماوەیەک بوو نەیبینیبوو و بیری ئەکرد. شەوێکیان قەلەق بوو و قەڵەم و کاغەزێکی بەدەستەوە بوو تومەز ئەیەوێت نامەیەکی غەرامی بۆ مامۆستا بنێرێت. منیش لە تەنیشتیەوە وەکوو پیشەی هەمیشەییمان سەرقاڵی دەرس و دەور بووم. ڕووی وەرگێڕا بۆ لای من وتی: ئەتوانی یارمەتیەکم بدەیت؟
- خێر بۆ نا.
- یارمەتیم بدە نامەیەکی غەرامی بۆ یار بنووسم.
- منیش دامە پرمەی پێکەنین وتم: خواهەڵناگرێ یەکێکی باشت دۆزیوەتەوە. کوڕی خوا من جیهازی عاتیفەم هەر دەرهاتووە.
ئەو شەوە هەرچەندی کرد و کۆشا نامەیەکی چەند دێریی بۆ نەنووسرا و وازی هێنا.

ڕۆژێکی زستانی ١٩٨٣ دوای کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەکەمان نەجات وتی: من بۆ ماوەیەک ئەڕۆمەوە بۆ سلێمانی و منیش بێ ئەوەی لای ئەو باسی بکەم بەدوای ئەودا ڕێی قەمچوغەم گرتە بەر. مەبەستی سەرەکیم ئەوە بوو کە بڕۆم لای ماڵەوە سیناریۆیەک بهۆنمەوە کە بە نیازی ئەوەم بڕۆم بۆ دەرەوە و بەوجۆرە هەم جۆرە دڵنەواییەکی ڕواڵەتی بدەم بەوان و بەتایبەتی بە دایکم و هەم یەکێتیش دەماودەم ببیستن کە من لە ناوشار ئیختیفا نیم و ڕێی دەرەوەم گرتۆتە بەر. بیستبوومەوە کە کەس و کار زۆر نیگەرانی منن و پێیان وابوو بەو هەموو ڕابووردوەوە لای دەزگاکانی ئەمنی ڕژێم هەر تووش ئەبم و تیا ئەچم. خۆم گەیاندە ماڵ و ئەوان هەم سەریان لە ئیشی من سوورمابوو و هەم زۆر گەشانەوە بە هاتنەوەکەم و پێیان وابوو هاتوومەتەوە لەوێ جێگیر بم و بە هەرجۆرێک بووە خۆم لە کێشە لەگەڵ یەکێتی لادەم و ئەوانیش و منیش بحەسێنەوە. دوای چەند ڕۆژێک پێم وتن کە هاتوومەتەوە تا ماڵئاواییتان لێبکەم و بڕۆم بۆ ئێران و لەوێوە بڕۆمە دەرەوە. باش بوو عادلی برام لە ماڵەوە بوو، بەڵام دوو براکەی ترم لە پێشمەرگایەتی بوون. زۆریان پێ خۆش بوو کە گەیشتووم بەو قەناعەتەی کە بڕۆم بۆ دەرەوە و برا گەورەکەم ٥٠٠ دیناری دەرهێنا وتی: گەرچی کەمە بەڵام بیبە چونکە ئەزانم سەفەر بۆ دەرەوە پارەی زۆری ئەوێت. من وتم: هاوڕێیەکم یارمەتیم ئەدات وهەوڵێکی زۆرم دا کە وەری نەگرم و زۆر لام سەخت بوو ببم بە ئەرک لەسەر ئەو بەڵام ئەو وازی نەهێنا وتی: کە کۆمەڵێک قەرزی لای خەڵک هەبووە و بۆیان ڕەوانە کردووە. منیش دوای چەند ڕۆژ وتم: ئەبێ من بڕۆم و پلانەکەم وایە کە لە قەڵادزێوە لەگەڵ ڕەفیقێکی خۆمدا ئەڕۆم و بۆیە ئەبێ ڕێی دووکان بگرمە بەر و لە ڕێی ئەیادەوە جاروبار هەواڵی خۆمتان لە ئێرانەوە بۆ ئەنێرم تا لەوێ دەرئەچم.

بەهەستێکی برینداری پڕ لە گلەییەوە لە خۆم، ئەوانم جێهێشت لە بارودۆخێکدا کە کەوتبوومە نێوان دووبەرداشی گەورەوە و ئەبوایە بالانسێک ڕاگرم لە نێوان درێژەدان بە ئەرک و لێپرسراوەتیە سیاسیەکەم و ئەرکم لەبەرانبەر کەس و کاردا. گێڕانەوەی ساتەوەختی وا و دەیان و بگرە سەدانی هاوچەشنی لە ٩ ساڵ ژیانی ئیختیفا، بابەتێکی بەچێژی ڕۆمانن و ئەوکات ببوو بە بەسەرهاتی واقیعیی من. ئەبوایە ئەو هەموو ئینفیعالات و هەست و سۆز و ترس و دڵەڕاوکێ و حەز و ناخۆشی و دەیان هەستی سایکۆلۆجیی تر بەدەستی خۆم بچەپێنم. لە ڕاستیشدا ڕێگەیەکی ترم شک نەدەبرد گەر بمویستایە ئەو ڕێگە سەختە بەرنەدەم، ڕێگەیەک کە هەموو شتێکی تر لە ئاستیدا بچووک دەبوەوە.

لە جیاتی قەلادزێ و ئێران هەر لە دووکانەوە سواری سەیارەی خەتی هەولێر بووم و خۆم گەیاندەوە ماڵی تەنیا و چۆڵم. هەستم ئەکرد کە سەرباری عەزابی ویژدانی ئەو سیناریۆ درۆینەی کە سازمکردبوو، قورساییەکی تر لە سەرشانم لاچووە و ئیتر تەنیا پرۆژەیەکم بۆ کاری سیاسیی پیشەیی بەبێ پێشگر و پاشگری کەس و کار.

نەجاتیش هاتەوە و ئینجا بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەو لەگەڵ خۆیدا یەکەمین ژمارەی بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی هێنابوو کە پێموابێ تەنها دوو ژمارەی لێ دەرچوو. گەر هەڵەنەبم ناوی (کارگەران) بوو. هەموو بابەتەکانم لەبیر نەماوە بەڵام بابەتێکیان شیکردنەوەیەک بوو سەبارەت بە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨. سێ هاوڕێ لەسەر هەمان بابەت نووسیبوویان و دیار بوو کە ئەوە پوختەی باسێکی ناو ڕابەرایەتیی ڕێکخراوە و لێرەدا چونکە بیروڕای جیاوازیان هەبووە کراوە بە سێ ووتار. گەر هەڵە نەبم یەکێک لە وتارەکان کە بە ناوی (پاڵە) ئیمزا کرابوو هی نەجات خۆی بوو. هەموو جارێک کە بیری ئەو وتارانەم ئەکەوێتەوە، گەر بەتەنهاش بم، خەندە و بزەیەک دێتە سەرلێوم.

تەوەرێکی باسەکە لەسەر ئەوەبوو کە ئایا چواردەی تەمووز ١٩٥٨ شۆڕش بووە یا نا و بەهەرحاڵ ئەو باسە لەناو ڕەوت و لایەنە سیاسیەکانی عێراقدا ئێستاش نەبڕاوەتەوە و ئەوانیش شتێکی تایبەتیان لەو بارەوە نەگوتبوو، جگە لە هەوڵی وەڵامدانەوە لە تیشکی تێڕوانینی مارکسی بۆ شۆڕش و ڕەهەندە کۆمەڵایەتی یا سیاسیەکانی شۆڕش. بەدروست پەنجە خرابووەسەر ئەوەی کە گوێزانەوەی دەسەڵاتی سیاسی بێ وەرگەڕانێکی ئابووریی ڕیشەیی جیاوازە لەگەڵ شۆڕش بەمانای گۆڕینی سیستمی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی بەڵام دیار بوو سەبارەت بە ١٤ ی تەمووز ١٩٥٨ بەدیاریکراوی، و لەچوارچێوەی شیکردنەوەیەکی کۆنکرێت بۆ دیاردە و بارودۆخێکی کۆنکرێت، نەئەشکانەوە بەسەر بابەتەکەدا.

دیوی کۆمێدیی بابەتەکە ئەوە نەبوو بگرە شتێکی تر بوو. لەوە گەڕێین کە ئەوە خۆی بۆخۆی ڕاکردنێک بوو بۆ دواوە بۆ باسێک سەبارەت بە مێژوویەکی بەسەرچووی عێراق لەبری تاووتوێی بابەتە زۆر وزەبەندەکانی ئەو ڕۆژگارەی تیا ئەژیاین، ئەوە بووبوو بە کرۆکی باسەکەیان کە ئایا ئەفسەرانی ئازاد (الضباط الاحرار) کە سەرکردایەتیی چواردەی تەممووزیان کرد (طغمة) بوون یاخود (زمرة Clique)؟

دیار بوو ئەو دوو زاراوەیەیان لە کتێبی (الحرب الاهلية في فرنسا) و(الصراع الطبقي في فرنسا) و(الثامن عشر من بروميير لويس بونابرت) وچەند کتێبی تری مارکس خوێندبۆوە و ئەیانویست بیخەنە ڕستەوە! لەوجۆرە تەرزە فکرەدا پەیوەندیی نێوان تیۆری و واقیع لنگەو قووچ ئەبنەوە. هاوڕێیانی ئێمە ئەیانەویست بۆ نیشاندانی ڕاست و ڕەوابوونی تیۆریەکانی مارکس، لە چواردەی تەمووزیشدا سەرە بەڵگەیەک بدۆزنەوە. ئێمەش سەرلەنوێ بە هەموو ئەو کتێبانەی مارکسدا چووینەوە و ئێستاش وەکوو هاوڕێیانی ناوەند نەگەیشتین بەوەی کە ئەو کۆمەڵە ئەفسەرە (زمرة)ن یا (طغمة).

سـەبتەمبەری سـاڵی ١٩٨٣ دوای چـاوەڕوانیەکی زۆر حیزبـی کۆمۆنیستی ئێران دامەزرا. بەرنامەی حیزب پێداگریی ئەکرد لە سەر شۆڕشی دیموکراتی وەکوو قۆناغی یەکسەرەی شۆڕش لە ئێران و بەرنامەی لانی کەمی حیزب تەرخان کرابوو بۆ ئەوە. هەرچی بەرنامەی لانی زۆرە تەرخان کرابوو بۆ شیکردنەوەی ئامانجی ستراتیجیی حیزبی کۆمۆنیست و شۆڕشی سۆسیالیستی. شۆڕشی دیموکراتی لەبەرنامەکەدا ناونرابوو قۆناغی دیموکراسی شۆڕشگێڕ.

هەم لە بەڵگەنامەی بەرنامەکە و هەم لە شیکردنەوەکانی دواتردا ئاماژە بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا نەکرابوو، بەڵام ئیدانەش نەکرابوو یا ڕەت نەکرابۆوە. بەڵگەنامەیەکی تری حیزب بریتی بوو لە بەرنامەی کۆمەڵە – ڕێکخراوی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، بۆ خودموختاریی کوردستان.

دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی ئیران بوو بە مایەی شۆڕوشەوقێکی عەجایب لەناو ڕێکخراوی ئێمەدا. ئیتر تا ئەهات قورسایی و نفوزی فکری و سیاسیی ئەوان لەناو ڕێکخراوی ئێمەدا زیادی ئەکرد. ئەوە لە هەمان کاتدا سەرەتای قۆناغێکی نوێی دوور و درێژ و ئاڵوز بوو لە بواری پەیوەندیی بزووتنەوەی مارکسی کوردستانی عێراق لەگەڵ ئەو ڕەوتەی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ئێراندا. ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ ئەوە بوو کە ئێمە تا ئەوکاتە شوناسی فکری و سیاسیی خۆمان بە مارکسی و مارکسیست ئەزانی و لەو سەردەمەوە بەرەبەرە ناوی کۆمۆنیست وەکوو شوناسێک سەپا بەسەرماندا و جێگیر بوو و دیارە نە ئەوسا و نە ئێستا ئەو ئاڵوگۆڕە لەو بوارەدا باسێکی بەدوای خۆیدا نەهێنا وڕوونکردنەوەیەکیش لەو بارەوە نەدرا. ئێمە هەر ئەوسەردەمە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ڕوومان کردە فێربوونی زمانی فارسی و وای لێهاتبوو زانین و شارەزایی فارسی خۆی ئەبووە مایەی جۆرێک لە میسداقیەتی سیاسیی بۆ کەسەکە. ماوەیەک وا باوبوو بە زمانی فارسیمان ئەووت زمانی شۆڕش!!.

حزبی کۆمۆنیستی ئێران خاوەنی هێزیکی گەورە و هەمەلایەنە بوو. هێزی سەربازی و میدیایی و مالی زۆر باشی هەبوو. ئەوان پەیوەندیان لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا هەبوو و سەرچاوەی زۆربەی ئیمکاناتی دارایی و چەکیان لە عێراقەوە بوو. هەرگیزیش باسی ئەو پەیوەندیەیان لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی عێراقدا نەئەکرد و بۆ مجامەلەش ڕای ئەوانیان لە گشتی تری ئاستیشدا لەو بارەوە نەدەپرسی. خاوەنی سەدان کادر و ڕابەرایەتی شارەزاو و دەسپڕ و بە ئەزموون بوون. وەزعی ئەوان لە گەڵ بزووتنەوەی چەپی ئێمە و ڕێکخراوی کارگەراندا ئەرز و ئاسمانی فەرق بوو. چەند هاوڕێیەکی کارگەران ماوەیەک لەبەر باری ئەمنی لە ئۆردووگاکانی ئەوان مابوونەوە و لە چادرێکدا نووستبوون و بۆ بەیانی بە دەنگی مارشی ئەنتەرناسیونال خەبەریان ببوەوە کە ئەوە ڕەسمی ئوردووگا بوو. یەکێک لەو هاوڕێیانە پرسیبووی ئەو دەنگە دەنگە چیە و ئەوی تر وەڵامی دابوەوە کە ئەوە لەشکری سووری پرۆلیتاریان و ڕیزیان بەستووە و سروودی ئەنتەرناسیونال ئەڵێنەوە. ئەو هاوڕێیەش کە داخ لەدڵی وەزعی نالەباری خۆمان بوو لە مدیو وتبووی: با ئێمەش بڕۆین لەولای ئەوانەوە ڕیز بین و لەداخا فەتەڕۆ بڵێین!!!
حیزبی کۆمۆنیستی ئێران دەیان بڵاوکراوە و نامیلکەی بەزمانی فارسی و کوردی بلاوئەکردەوە کە یارمەتیدەرێکی باش بوون بۆ کاری بانگەشەکردن بۆ فکر و سیاسەتی کۆمۆنیستی بۆ کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراقیش. گوێگرتن لە ڕادیۆی حیزبی کۆمۆنیست و کۆمەڵە ببوو بە دیاردەیەکی فراوان و چونکە لەناو عێراقدا تەشویشی لەسەر نەبوو، بە عەقڵی ئەوکاتەمان، نیوەی کاری ئێمەی ئەنجام دەدا. ئیتر مارکسیزمی شۆڕشگێڕ کە تایبەتمەندیی ڕەوتی فکری و سیاسیی ئەوان بوو، لای ئێمە ببوو بە تەنها مەرجەعی فکری و سیاسی و بە چاوی پیرۆزیەوە تێمان ئەڕوانی. بەڵام سەرسام بوون بە مارکسیزمی شۆڕشگێڕ بە بیانووی هاوخەتی

و هاوهەڵوێستیەوە بوو بەهۆی ئەوەی ئیتر چەپی کوردستانی عێراق و ڕێکخراوی ئێمە هەم ببێ بە پاشکۆی ئەو ڕەوتە سیاسی و فکریە و هەم توانای داهێنان و پشت بەخۆبەستن و لانی کەم خستنەگەڕی ئەو تێزە فکری و تاقیکردنەوە سیاسیەی ئەوان لە خزمەتی ناسینی تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگای عێراق و کوردستان و شیکردنەوەی کێشەکانی، لەدەست بدات و تەنها بکەوێتە کۆپیکردنێکی بێ ناوەڕۆکی ئەو تێزە فکری و سیاسیانە تا ئاستی زۆر ورد و باریک.

لێرەوە پرۆسەی بەدۆگماکردنی فکر کە لێرەدا نموونەکەی مارکسیزمی شۆڕشگێڕە، ئەبێ بە گرێیەکی گەورە بۆ بزووتنەوەی چەپی کوردستانی عێراق. ئیتر کار ئەگا بەوەی کە وتەزایەکی وەکوو (خەباتی چینایەتی) بەشێوەیەکی کاریکاتۆر لە دەزگای فکریی ئەم چەپەدا ئەبێ بە ئەکسیرێکی جادووئاسا کە بۆ تیماری هەموو دەردێک وشیکردنەوەی هەموو دیاردەیەک و چاری هەموو کێشەیەک پەنای بۆ دەبرا.

بەدوای دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیست ئێراندا، لە زۆربەی کۆبوونەوەکانی کۆمیتەکەماندا، باسی بایەخ و گرنگی پێکهێنانی ئەو حیزبە ئەبوون بە بابەتی قسەوباسی ئێمەش. ئەو حیزبە ببوو بەسەرمەشق و نموونەیەکی پیرۆز لای ئێمە کە پێمانوابوو لە سەردەمی لینین بەدواوە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی ڕیکخراوێکی وا لەسەر خەت و ڕۆشن و پایەداری بەخۆوە نەدیوە. کەسایەتیەکان و باسەکان و هەواڵەکانی ئەوان بوبوون بە ماتریاڵێکی باش کە ئێمەی بەخۆوە خەریک کردبوو، بەڵام ئێمە ئاسۆی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستیمان لە عێراقدا زۆر دوورتر ئەبینی و بگرە حەواڵەی دونیایەکی نادیارمان کردبوو. هەموو ڕیزەکانی ڕێکخراوی ئێمە و بگرە جگە لە ڕێکخراوی کار، کە تێڕوانینی فکری و سیاسییان جیاواز بوو لەخەتی ئێمە، زۆربەی چەپی کوردستانی عێراق، تا ئاستی کۆپیکردنێکی ڕووت، حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیان بە نموونە و

ئەلگوویەک دائەنا کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەمانیش چاوی لێ بکەن و ڕیزەکـــانی خۆیـــان بەپێـــی سیســـتەمی فکـــری و سیاســـی و ڕێکخراوەییەکەی ئەوان ڕیکبخەن.

بەکورتی، قۆناغی دوای دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، بوو بە وەرچەرخانێکی دیار لە ژیانی سیاسی و فکریی ڕێکخراوی ئێمەدا. ئیتر خەتی سیاسی و فکریی ئەو حیزبە بووبوو بە پێوانەی ڕاست و دروستیی تێزە فکریەکان، خەتە سیاسیەکان، پێکهاتەی ڕێکخراوەیی، کێشەکانی کۆمۆنیزم لە جیهان، قۆناغ بەندیەکانی شۆڕش، هەڵوێست لەســـەر مەســـەلەی لە بـــابەتی ژنـــان، زەحمەتکێشـــان، مەســـەلەی نەتەوایەتی و.. تاد.

یەکێک لەو کاریگەریانەی کە ئەو بارودۆخە لای ئێمە جێیهێشت بریتی بـوو لە کشـانەوەی زیـاتر بـۆ نـاوخۆی ژیـانی ڕێکخراوەیـی و ڕوو وەرگێڕانی زیاتر لە بارودۆخی ئاڵۆز و پڕ لە کێشمەکێشی ناوخۆی عێراق و کوردستان. ئیتر ڕیزەکانی ئەم ڕێکخراوە بووبوو بە شوێنی باس و جەدەل لەسەر پێشڕەویە تیۆری و سیاسیەکانی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و حیزبی کۆمۆنیستی ئێران. کە شیکردنەوەی ماهیەتی شـــوورەوی لەنـــاو حیزبـــی کۆمۆنیســـتی ئێرانـــدا دەســـتی پێکـــرد و بلاوەکراوەکانی (بسوی سوسیالیسم) و (بولتن مباحثات شوروی) لە ســـاڵی ١٩٨٤ دا بە دوورودرێـــژی ئەو باســـانەیان بڵاوکـــردەوە ئیتـــر ڕێکخـراوی کـارگەران بـابەتی بـۆ دروسـت بـوو بـۆ گفتوگـۆ و قـووڵ بـوونەوە تیایانـدا و لە ڕووی سیاســـی و پراکتیکیشـــەوە، هێنـدەی تـر ئیفلیج بوو. سەیر ئەوەبوو سەرباری ئەو سەرسامیە زۆرە بەو بابەت و باســـانە (مـن لێـرەدا قســـە لەســـەر ناوەڕۆکیـان نـاکەم) ڕێکخـراوی کـارگەران و ڕابەرایەتـیەکەی خـۆی هـیچ بەشـداریەکی نە ئەکـرد لەو بـــاس و گفتوگۆیـــانە و تەنهـــا قەبـــووڵکردنی بـــێ ئەمـــلاو ئەولا و سەرسامیی هەڵئەبژارد.

گەرچی یەکێتی نیشتیمانی پەیوەندیەکی نزیکیان لەگەڵ کۆمەڵەی ئێراندا هەبوو، بەڵام زۆر بەسارديەوە ئەيانڕوانیە پەیوەست بوونی کۆمەڵەی ئێران بەحیزبی کۆمۆنیستەوە. لە کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستدا جەلال تاڵەبانی و وەفدێکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەکێتی دەعوەتکرابوون. ئەوان زۆر لە نزیکەوە چاودێریی داهاتووی کۆمەڵەیان ئەکرد و ڕادیکاڵ بوونەوەی کۆمەڵەیان بە فشارێکی مەعنەوی و سیاسی دائەنا لەسەر خۆیان. جگە لەوەش تەنانەت لەناو کادر و ئەندامانی کۆمەڵەی ڕەنجدەراندا، چی لە ناو شارەکان و چی لە دەرەوە، هاوسۆزی بۆ کۆمەڵەی ئێران زۆر بوو و ئەوەش مایەی نیگەرانیی سەرکردایەتی یەکێتی بوو. ئەوان بەهەموو شێوەیەک ئەیانویست ئەو ڕەنگدانەوە بەهێزەی چەپی ئێران و کۆمەڵە لە کوردستانی عێراقدا کاڵ بکەنەوە و لە ڕوانگەیەکی نەتەوەییەوە دەیان پروپاگەندەیان بۆ کۆمەڵە بڵاوئەکردەوە و تەنانەت بۆ ئەو مەبەستە زۆرجار پەنایان ئەبردە بەر ناوناتۆرە و قسەی ئەخلاقی سەبارەت بە بەشداریی ژنان لە هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵەدا، بەمەبەستی لەکەدارکردنیان و لێدان لە پێگەی کۆمەڵەی ئێران لە ناو لایەنگرانی یەکێتیدا.

لەولاشەوە یەکێتی ئەوەی باش ئەزانی کە ئەو ئاڵوگۆڕانەی ناو کۆمەڵەی ئێران ئەبن بەهاندەر و بزوێنەری زیاتری بزووتنەوەی چەپ لە کوردستانی عێراقدا و هێندەی تر ڕادیکاڵتری ئەکا و هەڵوێستیان لە بەرانبەر یەکێتیدا توندتر ئەبێ هەر بۆیە بەوە هەراسان بووبوو.

پاش سەردانێکی سلێمانیی من ونەجات، لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵەکەی خۆمان لە بەلاشاوای هەولێر، بینیمان سێ کوڕی قوتابیی زانکۆی سەلاحەددین گوێزاویانەتەوە بۆ ژوورەکەمان. زۆرمان لا سەیر بوو و پاش پرسیار و ئەوەی ئێوە چی ئەکەن لێرە ئەوانیش لایان سەیر بوو و ئەیانووت ئێوە چی ئەکەن لێرە و چیتان ئەوێ. بەهەرحاڵ

بۆمـان دەرکەوت کە ئەم سـێ قوتـابییەش کە بریتـی بـوون لەسـالار ڕەشـید و سـەمیر نـوری و کـوڕێکی تـر، لەبەر دژواریی ژیـانی بەشـی نـاوخۆیی و سـەروکاریان بە ڕێکخـراوی کـۆمەڵە و گرووپـی تـری چەپەوە، بۆ ماڵێک گەڕاون و برادەرێکی من کە مـاڵی علی متمانەیـان پێکردبـوو ئەم خـانووەی ئـێمەی پێـدابوون و وای زانیبـوو ئـێمە بەم زووانە نـاگەڕێینەوە. خـانووەکە سـێ ژووری تیـا بـوو کە دوانیـان بـۆ شیروانی برای عەلی و نەنکیـان و ئەوەکەشـیان هـی ئێمە بـوو کە ئەو برادەرانە گرتبوویان. ئێمە زۆر هەوڵماندا و پێمان وتن کە ئەمە ماڵ و جێگەی ئێمەیە و دیارە هەڵەیەک ڕوویداوە و ئێمە خەڵکی سلێمانین و لێرە فەرمـانبەرین و کـار ئەکەیـن و چەنـد ڕۆژی تـر دایکـی یەکێکمـان دێت تا لەگەڵماندا بژیت بۆیە تکایە بۆمـان چـۆڵ بکەن، بەڵام بێسـوود بوو. شەوی بەسـەرداهات و پێکەوە مـاینەوە لەگەڵیـاندا و بەتەواویش خۆمـان ئەپاراسـت لەوەی کە هـیچ نیشـانەیەک سـەبارەت بە ژیـان و کـاری ڕاسـتەقینەی ئـێمە و بیروبڕوامـان بـزانن. لەبیـرمە نەجـات لەبەرچاوی ئەوان گۆڤارێکی (الف بـاء)ی عێراقیی گرتبـووە دەستیەوە ولە بەرچاویـان (کلمـات متقاطعـة)ی حەل ئەکرد. بیـرم نەمـاوە کامیـان بـوو ویسـتی سـەرنجمان بـۆ باسـی خوێنـدنەوەی کتێـب و قسـە ڕابکێشـێت، بەڵام ئـێمە تێمـان گەیانـدن کە بـابەتی ئەوە نـین و نەجـات وتی: من تەنهـا حەز بەخوێندنەوەی حەکـایەت ئەکەم و نەشـی ئەووت چیـرۆک و ئەو بـرادەرەش سـەری لەو وەڵامە سـوورمابوو. بەڵام سەرنجمدا کە یەکێکیان زۆر بە ووردی چاوی بڕیبووە من.

بەهەرحـاڵ ئەوان بـۆ ڕۆژی دواتـر ڕۆیشـتن بـۆ دەوامـی زانکـۆ و ئەم بـابەتە بـوو بەمـایەی نیگەرانیمـان، چـونکە ئەو مـاڵە وەکـوو بارەگـای کۆمیتەکەمان وابوو، جگە لەوەی جێی ژیان و گوزەرانی هەردووکمـان بـوو. کە ئەوان ڕۆیشـتن دەیـان ئیحتیمالمـان کـرد بەبـابەتی گفتوگـۆی هەردووکمـان و نەجـات دەسـتی کـرد بەگەڕان بە شـوێنی جێسـازیی کتێب و بلاوکراوەکانمان تا بزانێ چی ڕوویداوە. لەو گەڕانەدا هەندێ

کتێبی مارکسیی ئەوانی دوزیەوە کە لە بیرمە یەکێکیان نامیلکەیەکی بچووکی ترۆتسکی بوو سەبارەت بە شۆڕشی چین کە بەشێک بوو لەباسەکانی کۆمنترین لەو بارەوە. بۆمان دەرکەوت کە ئەوانیش خەریکی هەمان کەسابەتن، بەڵام نیگەرانی ئەوە بووین کە سەر بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بن، گەرچی ئێمە وامان زانی ئەوان باوەڕیان بەوە کردووە کە ئێمە فەرمانبەری ئاساییین و لێرە دەوام ئەکەین، دواتر هەرچۆنێک بوو ماڵ و حاڵیان گوێزایەوە و ئێمەش بووینەوە بە خاوەنی ماڵی خۆمان.

بارودۆخی عێراق و بەتایبەتی کوردستان هەتا ئەهات خراپتر دەبوو. لە کوردستاندا سەرکوت و داپڵۆسینی خەڵک لەلایەن دەزگاکانی ڕژێمەوە تا دەهات پەرەی دەسەند. بە بیانووی شەڕی ڕاونانی پێشمەرگە و شەڕ لەگەڵ ئێراندا کون و کەلەبەری شارەکان نەمابۆوە کە میلیتاریزە نەکرابێ. ڕاپێچکردنی خەڵک بۆ شەڕ و سەربازی جگە لە دە موالید، قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگا و هەموو کارگە و دائیرەکانی گرتبۆوە. ترس و ڕاونان و کوشت وبڕ و زیندان و سێدارە بووبوو بە دیمەنی ڕۆژانەی ژیانی خەڵک. تیربارانکردنی خەڵک لە سەر شەقامەکان بە مەبەستی سەپاندنی فەزای ترس و تۆقاندن زیادی ئەکرد. هەزاران دێهات ڕاپێچی ئۆردووگا زۆرە ملێکان کرابوون کە لە ئۆردووگای سەردەمی نازیەکان ئەچوون. بەبەعسی کردن و چاندنی تۆڕی چاودێری و سێخوڕی بۆ ڕژێم هەموو کون و قوژبنێکی تەنیبوو. بەهەرحاڵ سەرباری هەژاری و گرانی و نەبوونیی زۆر، کوردستان بووبوو بەسەربازگەیەکی گەورە و هەموو سیماکانی هەژموونیی دەسەلاتێکی تۆتالیتاری (شمولي) و حیزبیکی توندڕەوی نەتەوەپەرستی عروبیی بەخۆوە گرتبوو کە دەسەڵاتی لە دەستی تاقمێکی کەمدا چڕکردۆتەوە. سەدان هەزار لە خەڵکی کوردستان کە زۆربەیان ئامادە نەبوون بچن بۆشەڕی قادسیە لە دژی ئێران، ئێستا لە فەوجە خەفیفەکاندا بوونە بەچەکداری ڕژێم لە کوردستاندا. کردنی

بەزۆری خەڵک بە (الجیش الشعبي) تەنانەت منالانیشی گرتۆتەوە و ئێستا بە ناوی (الطلائع) و (الفتوة) دەیان هەزار منداڵ و مێردمناڵ لە ئۆردووگاکانـدا ڕاهێنـان و مێشـک شـۆردنەوەیان پـێ دەکرێـت. بزووتنەوە چەکداریەکەی شاخیش تا دێت قاڵبێکی میلیشیایی زیاتر بەخۆوە ئەگرێ وئێستا لایەنە سیاسیەکانی هێندەی سەرقاڵی شەڕی دەسەلاتن لە دژی یەک ئەوەندە نایان پەرژێتە شەڕ لەگەڵ سوپای حکوومەت. ڕۆژانە دێهاتەکانی کوردستانی ژێردەسەلاتی پێشمەرگە بەتاییەتی دەشتی هەولێر و شارباژێر ئەبن بە گۆڕەپانی شەڕی چەکداری یەکێتی نیشتیمانی لەگەڵ حسک یا شیوعي یا پارتی و پاسۆک. ئومێد و بەرگری و توانای خەڵک تا دێ لە پاشەکشە دایە و خەڵک ناشپەرژێتە سەر پاشەکشە و خۆپارێزی.

علـی حسـن المجیـد لە ۲۹/ ۳ / ۱۹۸۷ بە بڕیـارێکی ئەنجـوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشی کرا بە لێپرسراوی (مکتب تنظیم الشمال)ی بەعس و هەموو دەسەلاتەکانی صدامی لە کوردستان وکەرکووک و موسـڵدا پێـدراوە. دوو فەیلەقـی سـوپای عیـراق لە کوردسـتاندا مۆڵدراون.

شارەکانی تری عێراق لە کوردستان باشتر نین. سەربازگیری و میلیتاریزەکردن بووە بە سیمای ئەو شارانە. عێراق نزیکەی ملیۆنێک کەسی چەکدار کردووە. بەبەعسی کردن و فشار بۆ سەر خەڵکی بەغدا و شارەکانی جنووب هەموو سنوورێکی شکاندووە و ناوچە سنووریەکان بوون بەمەیدانی شەڕ و شارە دوورەکانیش بوون بە ئامانجی تۆپباران و بۆمببارانی هەر ڕۆژەی فڕۆکە جەنگیەکانی ئێران. ڕژێم لەبەر زۆریی زیندانی و پڕبوونی زیندانەکانی وەکوو ئەبوو غرێب و مووسڵ و شار و سەربازگەکانی تر، هەر ماوە جارێک سەدان زیندانی بەناوی هەڵمەتی پاککردنەوەی زیندانەکانەوە (حملات تنظیف السجون) لە سێدارە دەدات، کە هیچیان لەلایەن دادگاکانی خۆشیەوە حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرنەچووە. بە پێچەوانەی سەرەتای

هەشتاکان کە ڕژێم پێی وابوو کە شەڕ لەگەڵ ئێراندا گەشتێکی چەند مانگەی هێزەکانی ئەبێ بۆ تەمێکردنی ئێران و ترساندنی شیعەکان لە ناوخۆ، ئاسۆیەک بۆ وەستانی ئەم شەڕە دیار نیە. گەرچی لە سەرەتاوە بەهۆی کۆمەکی وڵاتانی کەنداوەوە، بژێوی خەڵک و بازاڕ جێگیرتر و باشتر بوو و نیشانەکانی شەڕیان پێوە دیار نەبوو، ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە گرانی و نەبوونی وقات وقڕی سەری کردۆتە هەموو خێزانێک و سەرباری دیکتاتۆریەت و سەرکووت، ئەمیش بووە بە ملۆزم و سەربارێکی قورس.

هەر لەم قۆناغەدا بوو کە صدام لەبەرانبەر میحوەری کوردی–ئێرانی و هاوپەیمانیی هێزەکانی پێشمەرگە لەگەڵ ئێراندا، میحوەری تورکی–عێراقیی بەهێزکرد و چەندین تەنازوڵاتی بۆیان کرد.

## لەدایکبوونی تۆتالیتاریزم لە منداڵدانی شەڕی یەکەمی کەنداودا

شەڕ لە گەڵ ئێراندا بوو بە چەکێکی ترسناک بەدەستی ڕژێمەوە بۆ سەپاندنی توندترین جۆری سەرکوت و دیکتاتۆریەت کە تا ئێستا لە عێراقدا وێنەی نەبووە. هەر لە پرۆسەی شەڕیشدا، پێکهاتەی دەزگای دەوڵەت وحوکمڕانی گۆڕانی ڕیشەیی بەسەرداهات و هەرچی زیاتر دەسەڵات لە دەستی خودی صدامدا کۆبۆوە. ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش (مجلس قیادة الثورة)[1]، کە صدام خۆی سەرکردایەتیی ئەکرد و خاوەنی دەسەڵاتی تەنفیزی و تەشریعی بوو، ئەندامەکانی وەکوو داشی دامەی دەستی ئەو بوون، بڕیارێکی تازەی دەرکرد کە بەپێی ئەوە، صدام، بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو دەزگایەش، ئەتوانێ هەموو بڕیارێک دەربکات و چەتری "شەرعی"ی بۆ دەسەڵاتی

---

[1] احمد حسن البکر سەرۆکی کۆمار وسەرۆکی (مجلس قیادة الثورة- ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش) بوو لەدوای کۆدەتاکەی بەعسیەکان لە ١٧ ی تەمووزی ١٩٦٨دا. ئەو ئەمینداری گشتیی هەرێمایەتیی عێراقی حیزبی بەعسی عەرەبیی سۆسیالیست وکەسی یەکەمی دەسەڵاتی دوای کۆدەتاکە بوو، بەڵام لەڕووی عملیەوە صدام حسین، کە جێگری ئەو بوو، هەموو دەسەڵاتەکانی بەدەستەوە بوو. لە تەمووزی ١٩٧٩ دا صدام حسین لە نمایشێکی نیمچە کۆدەتاییدا، احمد حسن البکری لەدەسەڵات لادا بە بیانووی ئەوەی باری تەندروستیی ڕێگەی پێنادا و خۆی خوازیاری وازهێنانە لەسەرۆکایەتی و گوایە هەر ئەویش واتە البکر، صدامی بۆ هەموو پۆستەکانی خۆی کاندید ئەکات. چەند ساڵ دوای ئەوە البکر مرد بەڵام گومانی زۆر هەبوو کە صدام لەناوی بردبێت.

تــاكڕەویی ئەو خەســتتر كــردەوە. ئیتــر دەزگـــای دەســـەڵاتدارێتی بەتەواوی چڕبـۆوە و كەوتە دەسـتی تـاقمێكی كەم بەو پێكهـاتەوە كە باسم كرد. ئەوە خەسڵەتێكی تەواوی نیزامی تۆتالیتاری (شمولی)یە بە مۆدێلی حوكمی تاكڕەوانەوە كە ئیتر حیزبیش (كە هەمـوو دەوڵەت و حكـوومەتی لە هەنـاوی خۆیـدا قـووت داوە) و هەمـوو دەزگاكـانی لە خۆیدا كورت كردۆتەوە و قووتی داون، تەنها ئەبێ بە تابلۆیەک بۆ شـــەرعیەتدان بە دەســـەڵاتی حـــاكمی مـــوتڵەق. دەەســـەڵاتدارێتی ئەو ســـەردەمەی عێـــراق، كـــۆپیەكی سیســـتمی سیاســـیی تۆتالیتـــاری ســـتالینیزمی ســـییەكانی یەكێتیـــی ســـۆڤیەت بـــوو، بە جیـــاوازیە ڕووكەشیەكانی كات و شوێنەوە.

عێراقی هەشتاكان جیاوازیی هەیە لە گەڵ حەفتاكاندا. بەعس گەرچی كودەتـــاكەی تەمـــووزی ١٩٦٨ی بەئاســـانی بۆچـــووە ســـەر، بەڵام لە یەكەم ڕۆژەوە دەســـەڵاتیان بەخـوێن ڕشـتن دەسـت پێكـرد. ئەوكـاتە ترسـیان لە شـیوعیەكان و بەتـایبەتی لە بـاڵی (القیـادة المركزیـة)ی حیزبی شیوعیی عێراق هەبوو. احمد حسن البكر لە ڕۆژانی یەكەمی دەســـەڵاتیاندا ئەنێـرێ بەدوای كـاظم الصـــفاری ئەنـدامی مەكتەبـی سیاسـیی قیـادەی مەركەزیـدا و داوایـان لـێ ئەكـات لاپەڕەیەكـی نـوێ هەڵبـدەنەوە و ئەوان یارمەتیـان بـدەن. ئەوان ئامـادە نـابن و وەڵامـی نەخێر ئەنێرنەوە بۆ البكر. بەڵام دواتر لە پەلامارێكی ئەمنی و پلانێكی ورد داڕێـژراودا ڕژێمـی تـازە لەســەركار توانیـان هەمـوو ئەنـدامانی سەركردایەتیی ئەو حیزبە دەسگیر بكەن و لە زیندانی (قصـر النهایـة) هەموویـان لەنـاوبەرن. (عزیـز الحـاج)ی سـكرتێری ئەو بـاڵەی حیزبـی شـیوعی كە لە بـاڵی لیـژنەی مەركەزی ڕادیكـاڵتربوون لەگەڵ دەیـان كـادری ســەركردایەتیی حیزبەكەیـدا، بـوون بەهاوكـاری بەعـس و لە تەلەفزیـۆنەوە ئاشـبەتاڵی ڕاگەیانـد و پیرۆزبـایی لە دەسـەڵاتی تـازەی بەعسیەكان كرد.

جیاوازیی سەرەکیی نێوان سیستمی دەسەلاتدارەتیی بەعس لە دەیەی حەفتاکان و هەشتاکاندا لەچەند خالێکدا کۆئەکەمەوە:

١/ حەفتاکان بەعس سەرکردایەتیی بەکۆمەلی هەبوو، بەلام هەشتاکان دەسەلاتی ڕاستەقینە بەدەستی صدامەوە بوو. حەفتاکان قۆناغی دەسەلاتی دیکتاتۆریی حیزبی تاقانە و هەشتاکان سەردەمی پەرەسەندنی بێ وێنەی دیکتاتۆریەتی سەرکردەی تاقانە بوو. هەشتاکان کۆتایی هێنا بە بوونی ناوەندەکانی دەسەلات و نفووز لەناو سەرکردایەتیی حیزبی بەعسدا کە لە حەفتاکاندا باو بوو ودەسەلاتی بەتەواوی چڕ کردەوە لە ناوەندێکی مالباتیدا کە صدام لەسەرووی هەرەمەکەیەوە دانیشتبوو.

لە پرۆسەیەکی شێنەیی ومانۆر و پلانێکی چنراوی ورددا، صدام لە حەفتاکاندا توانی احمد حسن البکر بکا بە دیکۆرێک بۆ لەناوبردنی یەک لە دوای یەکی بالی جەنەرالەکانی وەکوو سەعدوون غێدان و حەردان تکریتی وحەماد شەهاب وئینجا بالی عبدالخالق و گرووپەکەی عدنان الحمدانی و محمد عایش و لە کۆتاییشدا و پاش تەواوکردنی ئەرکەکانی زۆر بەئاسانی توانیی احمد حسن البکریش ڕەوانەی لای ئەوان بکات. ڕەوتی چڕبوونەوەی دەسەلات لە دەستی گرووپە خێزانیەکەی صدام لە نیوەی دووەمی هەشتاکاندا ئەگات بە ئاستێک کە کەسایەتیی لاواز و کەم نفوز وگوێ ڕایەلی وەکوو عدنان خیرالله ی خالۆزای خۆی و برای هاوسەرەکەشی پێ قەبوول نەئەکرا وسێبەری ئەوی وەکوو وەزیری بەرگری بەمەترسی ئەزانی و لەناوی برد.

٢/ ماوەی ٧٠-٧٤ بە هۆی ڕێکەوتنی حکوومەتی بەعس و پارتی دیموکراتی کوردستان و مۆرکردنی ڕێکەوتنی ١١ ی ئازار و پاشانیش ماوەی ٧٣ – ٧٨ و دامەزراندنی بەرەی نیشتیمانی و پیشکەوتنخواز لە نێوان حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی، جۆریک لە کرانەوە و بوار بۆ ڕۆژنامەی حیزبیی جیاواز و دیفاکتۆیی و فرە

حیزبی بوون هاتنەدی. ژیانی فکری ورۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری بووژانەوەیەکی بەهێز ڕووی تێکرد و دەیان ڕەوتی فکری و سیاسی لەناو کۆمەڵگای عێراقدا کەوتبوونە بەرانبەرکێ لەگەڵ یەکتر.
بەپێچەوانەوە لە هەشتاکاندا تەنانەت ئەو حیزبە کارتۆنیانەش قەدەغەکران کە بەعس لە حەفتاکاندا دوای ١٩٧٤ وەکوو دوکانی سیاسی و دیکۆر دروستی کردبوون لەبابەتی حیزبی شۆڕشگێڕی کوردستانی "ستار تایەر شەریف" و"مەلا ماتۆڕ" و حیزبی دیموکراتی کوردستانی "عەزیز عەقراوی" و "هاشم عەقراوی".
**٣/** لە حەفتاکاندا سوپا وەکوو دامەزراوەیەکی سەرەکی دەسەڵاتدارەتی بەتەواوی تەبعیس وکۆنترۆڵ نەکرابوو. ئەم دەزگایە لە شەستەکاندا ئامرازی ٤-٥ کودەتا بوو کە دواترینیان هاتنەسەرکاری بەعسیان لێکەوتەوە. جگە لەوەی لە کۆنەوە هەموو نفووزێکی شیوعیەکان لە سوپای عێراقدا پاکتاو کرابوو، بەڵام لە حەفتاکاندا، هێشتا پاشماوەی ناسیونالیستە ناسریەکان یا لایەنگرانی بەعسی سوریا یا تەنانەت جەنەڕالاتی سەرچڵی بەعسی لە سوپادا مابوون. یەکێک لەو ناوەندانەی خەوی لە چاوی صدام زڕاندبوو ئەم دەزگایا بوو. هەشتاکان قۆناغی کۆنترۆڵی یەکجاری و دووبارە شێلانەوە و دامەزراندنەوەی هەیکەلی سوپا بوو بەپێی پلانەکانی صدام کە دەزگای ئەمنیی تایبەتی ڕژێم و گرووپەکەی دەوروبەری بەتەواوی سوپایان کۆنترۆل کرد. لەم قۆناغەدایە کە گاردی کۆماری و هێزە تایبەتەکان و لیوای گاردی تایبەتی ئەبن بە بڕبڕەپشتی هێزی متمانەپێکراوی ناو سوپا. لە جیاتی بالّی جەنەراڵەکانی پێشوو، تاقمیکی نوێی دەست وپێوەندی صدام وەکوو علی حسن المجید و حسین کامل و عبد حمود، بوون بە هێزی دەسەڵاتداری ناو جەنەراڵەکانی سالانی هەشتاکانی سوپای عێراق.

٤/ دەزگــای ئەمــن بەهەمــوو بەشــەکانیەوە، کــۆڵەکەیەکی زاتــی وشوناسیی بەعس و بەشێک بوون لە فەلسەفەی سیاسەت کردن لای بەعسیەکان.

صــدام خــۆی، تەنــانەت پــێش ئەوەی بێــتە ســەر دەســەڵات، ڕۆڵەی دامەزراوەی ئەمنی بەعس بوو. یەکەمین ئیغتیالاتی سیاسی لە عێراقی کۆماریـدا، ئەو ئەنجامیـدا. دەزگـای (حنـین)[1] و تـاقمە چنـگ بەخـوێنە ناسـراوەکەی دەوری صـدام لەنـاو حیزبـی بەعسـدا، تەنـانەت پـێش سەرکەوتنی کۆدەتاکەیان، ترسیان خستبووە دڵی زۆربەی سـەرکردە بەعسیەکانیشەوە. گرووپی صباح میرزا وسعدون شاکر وعلی باوي و ناظم گزار و سالم الشگرة کە لە ناوخۆی بەعسیەکاندا بە گرووپەکەی صــدام ناســرابوون و لە کۆدەتــاکەی ١٩٦٣ دا هەزاران شــیوعی و کەسایەتیی تری ئۆپۆزیسیۆنیان کوشتبوو، دوای ١٧ی تەمووز ئەبن بە تۆوی یەکەمین دەزگای فەرمیی دەسەڵات کە ئەوکاتە نـاوێکی لـێ نرابـوو کە جێـی سـڵکردنەوە و تـرس نەبێـت کە ئەویـش دەزگـای پەیوەندیە گشتیەکانە (مکتب العلاقات العامة).

صــدام لە دوای ١٩٦٨ ەوە ئامــادە بــوو دەســت لە هەرپۆســت و مەقامێک هەڵگرێت، بەڵام دەسبەرداری ئەم دەزگایە نەبێت.

تاپۆکردنی ئەم دەزگایە لەسەر خۆی و کردنەوەی دەهـا لق و بەشـی تــری دەزگــای پرۆفیشــیناڵی کوشــتار و چــاودێریی خــاوەن بــازووی پۆڵایین، یەکێکی تـر لە دەرهاویشـتەکانی بیـر وفەلسـەفەی دەسـەڵاتی

---

[1] حنـین: دەزگـایەکی سـەرکوت بـوو کە صـدام لە سـالی ١٩٦٣ دروسـتی کردبوو. ئەندامەکانی کەسانی شەقاوە و پیاوکوژ و تاوانباری وەکوو نـاظم گــزار و صــباح میــرزا و ســعدون شــاکر بــوون. صـدام بـۆ لەنــاوبردنی نەیارەکــانی نــاو حــزبەکەی خــۆی و دەرەوەی بەکــاری ئەهێنــا و لەژێــر دەسەڵاتی تاقانەی خۆیدا بوون. لەسـەرەتای حەفتاکانـدا کردی بە دەزگـای الامـن العامـة کە ئەویش کـاری ئەشکەنجەدان و لەنـاوبردنی نەیـارانی ڕژێـم بوو.

صدام بوو که له هەشتاکاندا بەتەواوی جێگیری کرد وتەنانەت هەست و گوێقــولاغی لەڕادەبەدەری ئەمنیــی صــدام وای لــێ کردبــوو، چاودێریکردنەکەشـــی بســـپێرێت نەک بە نزیکتـــرین دۆســـتانی پرۆفیشینالی مخابەراتیی وەکوو سعدون شاکری دەستکرد و دۆستی گوێ لەمستی سەردەمی شەقاوەیی جادەی کیفاحی جارانی خۆی، بەڵکوو ئەو لێپرسراوەتیەی سپارد بە قصي کوڕی و لەژێر چاودێریی وردی خۆی لەپەنایدا.

(له دەساڵی هەشتاکاندا بڕی ١٩٨ ملیار دۆلار بۆ سوپا و دەزگا ئەمنیەکان خەرج ئەکرێ جگە لە تەرخانکردنی ٥٪ هەموو داهاتی نەوت بۆ خودی صدام حسین). الثقافة الجديدة العدد ٢٣٩، من عواقب حرب الخليج، ص ٦٣

٥/ دەزگـای میـدیایی زەبەلاح و چـالاکی ڕۆشـنبیری لە فکـر و فەلسەفەی بەعسدا جیگایەکی ستراتیجیان هەبوو.

کایەی ڕۆشنبیری و فکری لە عێراقدا تا کۆتایی حەفتاکانیش، بوارێکی گەشــە و نەش و نمــای بیــری مــۆدیرنیزم و چەپ بــوو. گووتــاری ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆجیی باوی عێراق بەکوردستانیشەوە مۆرکێکی ئازادیخوازانەی هەبوو و کاریگەریی ئەدەبی سۆڤیەتی و جیهانیی بە ئاشکرا بەسەرەوە بوو. ڕۆشنبیریی باوی حەفتاکان بارگاوی بوو بە گیـانێکی بەهێـزی بەرگـری و یـاخی بـوون و نـوێگەری. تەیـاری نەتەوەیی و ئیسلامی پێگەیان لەم بوارەدا لاواز بوو. بەعس جگە لە هەندێ کەسایەتی سەرکردایەتیی قیادە مەرکەزیی وەکوو سەباح سەلمان و پیتەر یوسف یا کەسایەتیی کۆنە شیوعی وەکوو عزیز السيد جاسمی لێ دەرچێت، کە خەڵک وەکوو هەڵگەڕاوە و قەڵەمێکی فرۆشراو تەماشایان ئەکردن، لەناو نوخبەی ڕۆشنبیری و نووسەراندا پایگای لاواز بوو. بەعس ترس و دڵەڕاوکێیەکی تایبەتیی هەبوو لەم بارەوە. دەمێک بوو صدام لە کەمیندا بوو بۆ بواری ڕۆشنبیری و میدیایی. داهاتی پترۆ – دۆلاری حەفتاکان و مۆبەلایزکردنی هەموو

تواناکانی دەسەڵات بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ حیزبی شیوعیی هاوپەیمان لە بـواری شـەڕە دەنـووکی میـدیایی سـاڵانی حەفتاکـان، یەکەمـین ڕاهێنـانی هەنگاوەکانی بەبەعسـی کردنـی کایەی ڕۆشـنبیری بـوون لە عێراقـدا. بەڵام لە هەشـتاکاندا و بەبیـانووی خسـتنەگەڕی هەمـوو تواناکـان بۆ پاڵپشـتیی شـەڕ لە دژی ئێران، ئاڵوگۆڕێکی ڕیشـەیی ئەم بوارەش ئەگرێتەوە. چیتر تەنها بەعسی کردنی ئەدەب و ڕۆشـنبیری، شەهیەی تۆتالیتاریزمی سەرکردە تێر ناکات و تەنها دیماگۆجیەت بە ئەرکی ڕۆشنبیر و نووسەران نازانرێ، بەڵکوو داوایان لێ ئەکرێ ببن بە ماشینێکی گەورەی پیاهەڵدان و بە بتکردنی سەرۆک و سـەرکردەی تاقانەی وڵات.

صـدام بە گـاڵتە بە میـدیای عێراقیـی نەئەووت (فەیلەقـی هەشـتەم). لە ڕووی چەندایەتیەوە، ئەدەبی جەنگ و قادسیە و گۆرانی و سرووود و شـانۆگەریی هەشـتاکان لە عێراقـدا بەتەنهـا هێنـدەی هەمـوو ٣٠-٤٠ سـاڵی پێشـوو بەرهەمیـان هەیە. ئیتـر ڕۆشـنبیری بەعسـی لە ژێـر هەژمـوونی تۆتالیتـاریزمی صـدامیدا ئەبـێ بە هاوتـایەکی تەواوی دەزگـای مێشـک شـتنەوەی زەمـانی سـتالینی لە کـۆپیە صـدامیەکەیدا. ئاکامی ئەم پرۆسەیە شتێک نابێ جگە لە داتەپین و ڕووخـانی دونیـای جوان و داهێنەری ڕۆشـنبیریی دەوڵەمەندی عێراقی و بێ بەشبوونی کـایەی سیاسـی و فکـری لە جـۆگەلەیەکی زینـدووی هۆشـیاری وجوانکاری کە تێکۆشانی ئازادیخوازیی دەیان ساڵی لە عێراقدا بەهێز و ڕۆشـن ئەکردەوە. لەم قۆنـاغەدا ئیتر تەنـانەت ڕۆژنـامە زەردەکـانی وەکـوو (العـراق) و (الراصـد) یـش نـاتوانن ببن بە مـایەی قەبـووڵ لە چوارچێـوەی فەلسـەفەی نـوێی ڕۆشـنبیریی صـدامیدا وهەموویـان دائەخرێن.

صـدام بەشـی زۆری ئەرکی ئەم ڕۆشـنبیریە خودپەرسـتیە پۆلیسـیەی سپاردبوو بە عدي کوڕی و دەیان کەناڵی تەلەفزیۆنی و خـانەی چاپ

و بڵاوکـردنەوە و وەرگێـڕان بە ملیارەهـا دۆلار خـرانە خزمەتـی ئەم پـڕۆژە گەورەیەی مێشـک شـتنەوە کە ئەبـێ بە ویـژدانەوە دان بەوەدا بنێن کە بۆ ئەوان بێ بەرهەم نەبوو.
٦/ بەرهەمێکی پرۆژە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی گەشـەی ئـابووریی حەفتاکـان لە عێراقـدا نەشـونماکردنی (ئەنتیلیجینسـیا) بـوو وەکـوو بەشـێک لەچینێکـی بەهێـزی ناوەنـدیی خوێنـدەوار وخـاوەن خەون و ڕوئیایەکی گەورە.
ئەم توێژە کۆمەڵایەتیە فراوان و چالاکە، کە بەتایبەتی زانکۆکان ببوو بە ژیـنگەی سـەرەکیی جـووڵە و چـالاکیی، بەهرەمەنـدبوو لە زۆر فاکتەری لەبار بۆ گەشەکردن و گێڕانی ڕۆڵـی سیاسـی و کۆمەڵایەتی. بووژانەوەی ئـابووریی ئەو سـاڵانە و خوێنـدنی خـۆڕایی زانکۆکـان، و تێر و تەسەلیی بەشی زۆری خێزانـی عێراقی، و فەزای نیمچەکراوەی سیاسی و برەوی ڕۆشنبیری و بیری مۆدرین و ... تـاد، زەمینەیەکی گونجاویان بۆ ئەو توێژە فراوانە ڕەخسـاندبوو و ئومێدی دواڕۆژێکی کاریگەریـان بـۆ سـازدابوو. بەعـس بە چـاوێکی تـێکەڵ لە ئومێـد وترسـەوە ئەیـڕوانیە ئەم دیـاردەیە. هەزمکـردن و مـۆبەلایزکردنی ئەم قەوارە کـۆمەڵایەتیە بزێـو و قەلەقە بـۆ ڕژێـم ئاسـان نەبـوو. بەتەنهـا سەرکوت و هەوڵی بەبەعسی کردنی ئەم کایە کۆمەڵایەتیەش کارسـاز نەبوو. جبەخانەی فکریی بەعسیش شـتێکی ئەوتـۆی پـێ نەبوو کە ئەم هێزە زەبەلاحە ڕام و دەستەمۆ و " تەسقیف " بکات.
هەشتاکان و شەڕ ئەو فرسەتەی بۆ تاقمەکەی صدام هێنایە ئاراوە بۆ تەفروتووناکردنی ئەم توێژە بەرینەی کۆمەڵگای عێراق. سـەربازگیری سەدان هەزار کەسی و تەبعیسی فەزای زانکۆکان وڕاونـان و گرتن و ئیعـدام و پەرەسـەندنی فەزای میلیتاریسـتیی ئەو سـاڵانە .... تـاد، لە کۆتـایی هەشـتاکاندا ئەم (چـین)ەی تەفروتونـا کـرد ومەگەر پاشماوەیەکی پۆزەتیڤی ئەم دیاردەیە لە کوردستاندا چنگ لەسەرشـان

لەو چارەنووسە ڕزگاری بووبێت یا ڕێگەی کۆچ و هەندەرانی گرتبێتەبەر.

ئەم تویژە کۆمەڵایەتیە، پێگە و سەرچاوەی هێزی بزووتنەوەی مارکسی بوون. ئەنتیلیجینسیای کوردستانی و کارلێکە سیاسی و فکریەکانی ناو ئەو تویژە، نەک چینی کرێکار، ئەو پێگە وهەڵگرە کۆمەڵایەتیە بوون کە چەپ و مارکسیزم لە کوردستاندا لە سەریان وەستابوو. هەموو کارلێک وهەڵچوون و داچوونەکانی چەپ و بزووتنەوەی مارکسیی کوردستانی عێراق، بەشێک بوون لە سەرهەڵدان و گەشە و پاشان پاشەکشەی ئەم تویژە کۆمەڵایەتیە. بەتەئکیدیش ئەو هەڵچوون و داچوون و گەشە یا پاشەکشەیەی ئەو توێژە کۆمەڵایەتیە تەنیا دیاردەیەکی کوردستانی یا عێراقی و ناوچەیی نیە و کاریگەری زۆری هاوتا عێراقی و ناوچەیی وجیهانیەکەی لەسەربوو. هیچ شیکردنەوە و لێکۆلینەوەیەک سەبارەت بە مارکسیزم و چەپ لە عێراق و کوردستاندا ناگاتە جێیەک و دەستی ناگات بە لوغزەکانی سەرهەڵدان و گەشە و پاشان پاشەکشەی ئەو بزووتنەوەیە، بە جیا لە بەدواداچوونی قۆناغ بە قۆناغی سەرهەڵدان و گەشە و پاشان پاشەکشەی ئەو توێژە کۆمەڵایەتیە. گەڕان بەدوای شوێن و قورسایی چینی کرێکار بۆ لێکدانەوەی بارودۆخی مارکسیزم لە قۆناغە جیاجیاکانیدا، جگە لە ڕیتۆریکێکی (جمل طنانة) ئایدیۆلۆجی و هەولێکی بێ ئەنجام و سەرابێک هیچی تر نیە.

## مفاوەزاتی ١٩٨٤

پــایزی ١٩٨٣ هەر لە خــانوەکەی هەولێــر ئەژیــاین کە دەنگــۆی مفاوەزاتی نێوان یەکێتیی نیشتیمانی و حکوومەتی عێراق بڵاوبووەوە. ئـێمە هەروەکـوو جـاران سـەرگەرمی چـالاکیی ڕێکخراوەیـی بـووین. نفـووزی ڕێکخراوەییمـان بەرەو زیـادبوون ئەڕۆیشـت. لای مـنەوە لە هەولێر خەتێکمان هەبوو. ئەوکاتەی هێشتا عەلی هاوڕێمان لە بەغدا ئەیخوێند وەستا جەلالی پێم ناساند کە پێشتر لە هـاتوچۆی مـاڵی عەلیدا بینیبووم. جگە لەوە ئەیادی حاجی نامیقیش پەیوەندیەکەی لە ڕێی منەوە بوو. وەستا جەلال بەهۆی کرێکارییەوە پەیوەندیی زۆری هەبـوو، بەڵام دیـار بـوو تەنهـا پەیوەنـدیی کـۆمەڵایەتی و پـێکەوە کارکردن بوون کە لەو ڕێگەیەشـەوە چـالاکیی سیاسیی خۆی ئەکرد. نەجـاتیش لەهەولێـر چـالاک بـوو و پەیوەنـدیی ڕێکخراوەیـی هەبـوو، بەڵام چـۆن بـوو ئەوە لەبەر تـێکەڵ نەبـوونی کارەکانمـان هیچـی لـێ ئاگادار نەبووم. سامی کە ئەندامێکی تری کۆمیتەکەمان بوو لە هەولێر و تەنهـا پەیوەنـدیمان لە کۆبوونەوەکانـدا بـوو و ئەو زیـاتر هـاوڕێی زەمانی زانکۆی نەجات و نوری کەریم بوو. نوری لە دهـۆک دەوامـی هەبوو و لەوێوە ئەهـاتەوە بـۆ کۆبوونەوەکـان. هەر لە کۆتـایی سـاڵی ١٩٨٣دا هـاوڕێ جەلیـل شـاباز کە خەڵکـی دهـۆک بـوو و لە زانکـۆی مووسـڵ لە کـۆلیجی ئیـدارە وئـابووری دەیخوێنـد بـوو بە ئەنـدامی کۆمیتەکەمـان. هـاوڕێ جەلیل کەسـێکی چـالاک و توانـایی سیاسـی و فکریی باش بوو. بەگەرمی بەشداریی لە گفتوگۆکـانی کۆبوونەوەکانـدا

دەکرد. زانکۆی مووسڵ سەنتەرێکی گرنگی جموجۆڵ و چالاکیی سیاسیی دژ بە ڕژێم بوو. جێی کارلێک و بەریەککەوتنی چەندین ڕەوتی فکری و سیاسی و حیزبی بوو. کۆمەڵەی ڕەنجدەران، حیزبی شیوعی بەتایبەت لەناو قوتابیانی کۆلێجەکاندا نفووز و چالاکیان هەبوو. کەسانی هەڵسووڕاوی مارکسیش زۆر بوون بەتایبەتی لەناو قوتابیە کوردەکاندا. هاوڕێ نووری کەریم هاوڕێیەکی کۆنی نەجات بوو ولەکۆنیشەوە پێکەوە چالاکی سیاسیان ئەکرد. پێش بوونی بە ئەندام لە کۆمیتەکەدا ئاشنایەتیەکی کەمم لەگەڵیدا هەبوو بەڵام لەدوای ئەوەوە و تا جیابوونەوەکەی ناو کارگەران هاورێیەکی نزیکم بوو. نوری کادرێکی بە تەجرووبە و کۆنەکار بوو. لەگەڵ نەجاتدا پەیوەندیەکی زۆر تایبەتیان هەبوو. نوری لە دوای کەبس کردنی خانووەکەمان لە هەولێر و جیابوونەوەمان لە کارگەران زۆر نەمایەوە بوو بە پێشمەرگەی کۆمەڵەی ئێران وپاشان لە سوید جێگیر بوو..

من و نەجات جاروبار کە پارەمان هەبوایە لەناو هەولێر لە مەتعەمی دەرەوە نانمان ئەخوارد. بەڵام لەبەر دەستکورتی فێری خواردنی مەتعەمێک ببووین لە نزیک مەزاتخانەکە هەم خواردنەکەی خۆش بوو هەم هەرزانیش بوو. پێموابێ برنج و فاسولیایەک کە پێیشی ئەڵێن (سادە) بە ٣٠٠ فلس بوو. شاگردەکە بووبوو بە ناسیاومان وای لێ هاتبوو هەرجاریک بڕۆیشتینایە نەیئەپرسی چی ئەخۆن چونکە ئەیزانی تەنها شلە وبرنج ئەخۆین تەنیا ئەیووت: شلەکەی چی بێت؟ ئێمەش زۆر جار داوای دوو جۆر شلەی جیامان ئەکرد و پێکەوە ئەمانخوارد. ڕۆژێک نوری دوای کۆبوونەوە وتی بابڕۆین دەعوەتتان ئەکەم وچیتان حەز لێیە ئەیخۆین. ئێمەش بردمان بۆ هەمان جێ و کابراش هەر لەڕیوە پرسی: شلەکەی چی بێت؟ وتمان کاکە وەرە ئەمجارەیان جیاوازە و دوای داواکردنی خواردنەکان بوو بە پیکەنین و چیرۆکەکەمان بۆ نوری گێڕایەوە.

پێموابێ کۆمیتەی هەولێر ناوی (کۆمیتەی شەهید سادق) بوو. پێش کۆتایی ساڵ نەجات لە جێی عوسمانی حاجی مارف بوو بە لێپرسراوی کۆمیتەکە وبەو جۆرە ژمارەمان بوو بە ٥ کەس. کۆبوونەوەی کۆمیتەکەمان هەر ٢-٣ هەفتە جارێک لە ماڵەکەی ئێمە ئەنجام ئەدا. لەبەر دەوامی نوری و سامی و جەلیل پاش تەواوکردنی کاری ئەوان ئێوارانی ڕۆژانی پێنجشەممە کۆئەبووینەوە. نەجات دوای ئەوەی بوو بە لێپرسراوی کۆمیتەکە بۆ کۆبوونەوەکانی خۆی لەگەل ڕێکخراودا زیاتر سەردانی سلێمانی ئەکرد و ئیتر لەجاران زیاتر ئاگاداری جموجۆڵ و گفتوگۆکانی ناو ڕێکخراو ئەبووین. نەجات لەولەبی کۆمیتەکەمان بوو. تا بڵێی بزێو و نەسرەوت بوو. خاوەنی عەقلیەتێکی قووڵ و ورد بوو. جگە لە توانا فکری و تیۆرییەکانی، تا بڵێی بۆ کاری عەمەلی بە تاقەت بوو. زۆر کەم ماندوو ئەبوو و هەر کارێکیان پێ بسپاردایە بەو پەڕی باشیەوە ئەنجامی ئەدا. کەسێکی خاوەن ڕای خۆی بوو و تا قەناعەتی بەشتێک نەکردایە گفتوگۆی لەگەڵتدا ئەکرد. لەبەرانبەر هەلپەرستیدا تا بڵێی ڕەق و توندبوو. زۆر ڕاشکاو بوو و مجامەلەی لە بیروباوەڕ و هەڵوێستەکانیدا نە دەزانی. ئەو ماوەیەی بەهۆی ئیختیفاوە سەرەتا ڕۆیشتبوو بۆ قەرەداغ هەر لەبەر ئەو گیانی ڕاشکاویی و هەڵوێستە ڕەقانەی زۆر زوو کێشەی بۆ دروست بووبوو لە گەڵ کادرەکانی یەکێتی لەوێ. لەگەڵ ئاواتی شێخ جەنابدا کە کادری کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو لەوێ دەمەقاڵێیەکی توندی ئەبێت و دواتر دێتەوە ناوشار. هەموو مەجلیسێکی ئەکرد بە شوێنی گفتوگۆی سیاسی و مەیدانی تەرویجدانی هەڵوێست و بیروباوەڕەکانی. بەکورتیەکەی نەجات تا ڕادەی توندڕەوی چالاک وڕاشکاو بوو.

کتێبەکانی (الثامن عشر من بروميں لويس بونابرت) و (الحرب الاهلية في فرنسا) و (الصراع الطبقي في فرنسا)مان کردبوو بە بابەتی دراسەی ئەو ماوەیەمان. شەوێکیان دوو قۆڵی دوای تەواوکردنی

گفتوگۆیەکی چڕوپڕ سەبارەت بە (پۆناپارتیزم) و هەڵوێستی توێژ و چینی جیاوازی کۆمەڵایەتی بە پێی تێزەکانی مارکس لەو سێ کتێبەیدا کە ئەو ماوەیە بە ووردی و چەندجار پێکەوە خوێندمانەوە، هاتینە سەر باسی وەزعی خۆمان. ئەو پێی وابوو کە خەریکە بزووتنەوەی جەماوەری لە شارەکانی کوردستان پەرە دەسەنێت و پێی وابوو کە ئەو ناڕەزایەتیانە باقی عێراقیش ئەگرێتەوە گەر لێرە زیاتر گەشە بکات. ئاکامی ئەم ناڕەزایەتیانە گەر بەو ئاقارەدا گەشە بکات و بەهێز ببێت، چارەنووسی ڕژێم ئەخاتە مەترسیەوە و ئەودەمە دروشمی (گۆڕینی شەڕی عێراق – ئێران بۆ شەڕی ناوخۆیی)، کە دروشمی ئەو سەردەمەی ئێمە بوو سەبارەت بە شەڕ، ئەبێ بە بزووتنەوەیەکی جەماوەری بۆ ڕووخاندنی ڕژێم. ئێمە ئەو دروشمەمان سەبارەت بە شەڕ لە دۆستە کۆمۆنیستە ئێرانیەکانمانەوە ئیستیعارە کردبوو. ئەو درێژەی پێداو وپێی وابوو کە ئەم مفاوەزاتەی حکوومەتیش لەگەڵ یەکێتیدا هەر لەو چوارچیوەیەدایە بۆ خامۆشکردنەوەی ئەو ناڕەزایەتیانە و لەناوبردنی ئەو مەترسیەیە بۆسەر ڕژێم. من لەوەدا هاوڕای بووم کە بزووتنەوەی ناڕەزایەتی لە کوردستاندا خەریکە بەهێز ئەبێ و مفاوەزاتیش یەکێک لە ئامانجەکانی پاشەکشە پێکردنی ئەو بزووتنەوەیە و تەشەنە نەکردنیەتی بۆ خوارووی عێراق. خاڵی ناکۆکمان ئەوە بوو کە من وتم: ئێستا ڕژێم ترسی لە ڕووخان نیە، چونکە بزووتنەوەی ناڕەزایەتی لە خوارووی عێراقدا لەو ئاستەدا نیە. جگە لەوەش ڕژێم شەڕی کردۆتە ئامرازێکی باش بۆ سەپاندنی دەسەلاتی خۆی. پشتیوانی ناوچەیی و جیهانی بۆ ڕژێم مسۆگەرە. شەڕیش بەتەنها ناتوانێ ڕژێم بڕووخێنێت گەر عێراق شەڕەکەیش بدۆڕێنێت.

لە دواییدا باسەکەم گۆڕی وتم: ئەبێ من و تۆش توێشووی سەفەرێکی دوور و درێژ هەڵگرین و گەر دەستگیر نەکرێین ساڵەهای ساڵ ئاوا بە ئیختیفا دەمێنینەوە. ئەو بایدایەوە وتی:

- دەی با هیچ نەبێ یەکێکمان زەواج بکەین ومالّی خۆمان دانێین؟
- من بۆ خۆم بەم وەزعە دژوارەوە کە هەمانە هەر بیریشم لە زەواج نەکردۆتەوە.

مەسەلەی مفاوەزات لە وتی وتی دەرچوو وئاشکرا بوو. دیار بوو ئاشکراکردنەکەی نیشانەی ئەوەبوو کە بەرەو ڕێکەوتن ئەڕۆن. بارودۆخێکی نوێی سیاسی لە کوردستاندا هاتە ئاراوە. زیاتر لە سێ سالّ شەڕ لە گەلّ ئێران و سەرکوتگەریی ڕژێم خەلّکی کوردستانیان ماندوو کردبوو. خەلّک گەرچی بەچاوی گومانی زۆرەوە ئەیانڕوانیە مفاوەزات، بەلاّم بۆ کەلێن و فرسەتێک ئەگەڕان کە تیایدا بحەوێنەوە وپێیان وابوو کە ئەمجارە وەکوو ١٩٧٠ – ١٩٧٤ کوردستان جۆرێک لە ئارامی و ئاسایش ڕووی تێ ئەکات.

چەپەکانی کوردستان هەمیشە بە دروستی پێیان لەسەر ئەوە دائەگرت کە یەکێتی و هەموو هێز و لایەنەکانی تری ناو بزووتنەوەی کوردستان بە پێی ماهیەتیان و چییەتییان ناتوانن چارەسەری مەسەلەی کورد بکەن. پێداگریمان ئەکرد کە ئەوان مەسەلەی کورد و ستەمی نەتەوەیی ئەکەن بە بابەتی دەسکەوتنی ئیمتیاز و سەودا لەگەلّ دەسەلاّتدا و لە قۆناغەکانی ١٩٥٨ ، ١٩٦٦ و ١٩٧٠ دا هەمان کاریان کردبوو. ئەو سەودایە بۆ ئەوە بوو کە ئەوان ببن بە شەریک و لە کوردستانەوە بەشداریی دەسەلاّتی سیاسیی سەرتاسەریی عێراق بکەن. جگە لەوەش دەسەلاّتەکانی تا ئێستای عێراق، جگە لە حکوومەتی عبدالکریم قاسم، هەموویان هێزی نەتەوەپەرستی عەرەبیی شۆفینی بوون کە بڕوایان بە یەکسانی گەلانی دانیشتووی عێراق نەبووە. حکوومەتی بەعس بە بڕوای ئەوکاتەی ئێمە دەسەلاّتێکی نەتەوەیی عروبیی فاشی بوو کە بەتایبەتی لەژێر دەسەلاّتی دیکتاتۆریەتی صدام حسیندا، ئامادەیی ئەوەی تیا نەبوو کە تەنانەت بە سیغەیەکی ڕیکەوتنی وەکوو ئەوەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠یش ڕازی بێت.

هەڵوێستی سیاسیی ئێمە پێداگریی لە سەر مافی دیاریکردنی چارەنووس بۆ کورد ئەکردەوە، کە بەبێ ڕووخانی ئەم ڕژێمە و هاتنە سەرکاری دەسەڵاتێکی دیموکراتیی شۆڕشگێڕ، ئیمکانی جێبەجێکردنی نیە.
ئەو هەڵوێستە سیاسیانەی ڕێکخراوی ئێمە زیاتر زارەکی بوون و نە بلاوکراوەیەکی ڕەسمیمان هەبوو کە بیروڕای خۆمانی تیا دەربڕین و بیگەیەنین بە جەماوەر و نە بلاوکراوەی ناوخۆییش هەبوو کە لانی کەم هەڵوێستی ڕەسمیی بۆ کادر و ئەندامەکانی تێدا ڕوون بکرێتەوە. بۆیە ئەو هەڵوێست و سیاسەتانە بە ناڕۆشنی ئەمانەوە و زیاتریش وەکوو باسی ناو مەحافیلی سیاسی لێ دەهات.
ڕێکخراوی کارگەران، جگە لە تەشهیری سیاسی، سیاسەتێکی ڕۆشنی نەبوو سەبارەت بە هێزەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی و ناسیۆنالیزم لە کوردستاندا. سیاسەتێک کە جگە لەدەرخستنی ماهیەتی چینایەتی و سیاسیی ئەوان، بتوانێ جێگە و شوێنی فیعلیی ئەوان ڕوون بکاتەوە تا بتوانێت خەباتی خەڵک لە دژی ڕژێمی بەعس وەکوو ڕژێمێکی شۆفینیی دژ بە کورد، بەئاقارێکی سەربەخۆدا ببات. ئێمە سیاسەتێکمان نەبوو کە بتوانێت ببێت بە بەدیلێک کە بتوانێت لەوکاتەدا کە خەباتی خەڵکی کوردستان لە دژی سیاسەتەکانی کوشت و بڕ و قەلاچۆی بەعس لە کوردستاندا یەکگرتوو بکات، لەهەمان کاتدا تێکۆشانی هەمەڕۆژەی خەڵکی کوردستان لە دژی ڕژێمی بەعس لەوە بپارێزێت کە ببێت بە دەسکەلایەک بۆ حیزبەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی کە دەیان ساڵ بوو لەناو ئەڵقەی (شەڕ- مفاوەزات - شەڕ)دا خەڵکیان گیردابوو. جگە لەوەش مەسەلە هەر تەنیا بوونی سیاسەتیکی ڕۆشنی سەرکاغەز نەبوو. هێزێکی وا گەر سیاسەتەکەشی دروست بوایە و ڕەنگدانەوەی پیویستیەکانی ژیان و خەباتی خەڵکیش بوایە، ئەبێ لە هەنگاوی دواتردا بتوانێ ببێت بە هێزێک کە چالاکی بنوێنێت لە ناو کۆمەڵگە و هاوکێشە سیاسیەکانیدا.

ڕێکخـــراوی ئـێمه و چەپ به گشــتی هیچـیەک لەوانەیــان نەبــوو و هیممەتـی ئەوەشـیان تیـا نەدەبینـرا کە ئەوە ئەنجـام بـدەن یـا وەکـوو ئەرکێکی خۆیان دەسنیشانی بکەن.

شـێوازی ناوزڕانـدن و داشـۆرینی سیاسـی و ڕسـواکردنی مـاهیەتی بـزووتنەوەی سیاســی – چەکـداری هێزەکـانی یەکێتــی و پـارتی و سەرجەم ناسیونالیزمی کورد، خالّی بەهێز و پۆزەتیڤی هەڵسووڕانی ڕێکخراوی ئێمه بوو، بەڵام به چەندین دیدگا و لێکدانەوەی چەوتەوە که ئیتر بایەخێکیان بۆ ئەو لایەنه پۆزەتیڤه نەئەهێشتەوە:

**یەکەم:** ڕێکخـراوەکه تووشــی نـاکۆکیەکی ســەیر بووبــوو. لەلایەکەوە ئامـانجی گەورەی وەکوو ڕووخـاندنی ڕژێمـی عێـراق بەدەسـتی چینـی کرێکـار له شۆڕشـێکی جەمـاوەریی سەرتاسـەریدا هەلگرتبـوو، وەکـوو هەنگـاوی یەکەم بـۆ شۆڕشــی سۆسیالیسـتی و لەولاشــەوە شـێوە و پێکهــاته و پراتیــک و هەڵســـوورانێکی تەواو میحفەلیــی هەبــوو. ئەو ڕێکخـراوە له ڕاسـتیدا بریتـی بـوو له گرووپیکـی بچـووکی کەسـانی سیاسـیی ڕۆشـنبیری مارکسـیی هـاوبیر له کوردسـتاندا، که سـەریان کـردووە بەیەکدا و خەریکـی سـاغکردنەوەی خەتـی سیاسـی وفکریـی خۆیــان، بــێ ئەوەی ئەولەویاتەکــان و ئامــانجه دوور و نزیکەکــان و دروشم و هەڵوێست و تاکتیک و سـتراتیجی و بەرنـامەی لانـی کەم و زۆریان له یەک جیاکردبێتەوە.

**دووەم:** له هیچیەک له مەیـدانەکانی خەبـاتی خەڵکدا ئەم ڕێکخـراوە نه دروشم یا پلاتفۆرم یا ڕۆڵی پراکتیکی و بەشداری نەبوو. مەیـدانەکانی ململانێی خەڵک و ڕژێم له چەند بواری تایبەتیدا بەرجەسته ببوونەوە: خەبات له دژی ستەمی نەتەوایەتی و بەرنامه و سیاسەته ڕۆژانەکانی ڕژێم لەو بـوارەدا، تێکۆشـانی هەمـوو خەڵکی عێـراق له پێنـاوی مـافه دیموکراتیەکـــان که ڕۆژانه له بەر پەلامـــاری دەزگـــا دیکتـــاتۆری و داپڵۆسـێنەرەکانی ڕژێمـدا بـوون، خەبـاتی خەڵـک له پێنـاوی نـان و گوزەراندا که لەو قۆناغەدا ژیانی ئابووری خەڵک تـا ئەهـات بەبۆنەی

شـەڕی ڕژێـمەوە بەرەو خراپـی ئەچـوو، خەبـات لە دژی هەوڵەکـانی ڕژێم بۆ سـەربازگیری و میلیتـاریزەکردنی هەمـوو مەیدانەکانی ژیـان، خەبـاتی ئـازادیخوازانەی قوتابیـانی زانکۆکـان کە تـا ئەهـات پەرەی ئەسـەند. ئەوانە سـەنگەرە سـەرەکیەکانی بەرانبەرکێـی خەڵکـی عێـراق بوون لەگەڵ ڕژێمی ئەوکاتەدا.

ڕێکخـراو یـا حیزبـی سیاسـی بەوە هێـز ئەگـرێ و جیـا ئەکـرێتەوە لە گرووپ و پێڕی باس و گفتوگۆ، کە ئەو مەیدانانەی خەباتی خەلک و بابەتەکـــانی خەباتەکەیـــان و داخوازیەکانیـــان ئەکـــات بە شــــوێنی هەڵسـووڕانی خـۆی و بـردن و سـەرخستنی ئەو خەبـاتە بە ئاراسـتەی سیاسەتێکی گشتگیر بەرەو ئاسۆیەکی ستراتیجی و ڕۆشنتر.

ڕاست و دروسـتیی هەڵوێسـت و سیاسـەتێک زۆر بـایەخی هەیە، بەڵام گەر تـێکەڵ نەبـێ بە کێشمەکێشـی خەڵـک و دەسـەڵات و ئـاوێتەی ئەو کێشمەکێشانە نەبێت و لەوێشدا کەم و کوڕیەکانی لە مەحەک نەدرێت، لەئەنجامدا تەنیـا وەکـوو بەڵگەنـامەیەکی سیاسـی و ئەدەبـی سیاسـیی باش و جوان لە ئەرشیفدا ئەمێنێتەوە.

**سێیەم:** ئەڵقەی دواتر کە تیۆری و فکر و سیاسەت لە ڕێگەی دروشـم وتاکتیـــک و هەڵوێســـتی دروســـتەوە ئەکـــا بە هێزێکـــی مـــادیی ئـــاڵوگۆڕبەخش بـــریتیە لە پراتیـــک کە پەیـــڕەوی لەو تیـــۆری و فکـــر وسیاسـەتە دەکات. دیارە پراتیک دەربڕینێکی زۆر گشـتیە و مەبەسـتی مـن لێی لە پەیوەند بەم باسـەوە بریتیە لە: دامەزرانـدنی ڕێکخراوێکـی بەهێز و بە نفووز، ئامادەبوون لە خەباتی فیعلیی پان و بەرینی خەڵـک لە دژی ڕژێـــم لە دەیـــان مەیدانیـــدا، ڕێکخســـتنی ئەو خەبـــاتە و سـەروسـامان پێدانی و نیشـاندانی ڕێگەی سـەرکەوتن و پەرەسـەندنی زیاتری، دامەزراندنی ڕێکخـراوەی جەمـاوەریی بەهێز لە جەرگەی ئەو خەباتە لە مەیدانە جیاجیاکاندا و دەیـان لـق و پۆپی تـر کە مەقوولەی پراتیـک بەرجەسـتە ئەکەنەوە و سیاسـەت لە ئەرشـیفەکانەوە دائەگـرنە جێی شیاوی خۆیان.

**چوارەم:** ئێمە نەک هەر هەڵوێستی یەکێتی و ئەو هێزانەمان وەکوو هێزێکی ئۆپۆزیسیۆن ڕەت ئەکردەوە، بەڵکوو سەرجەم بوونی ئەوانمان بەهێزێکی زیانبەخش بۆ خەباتی خەڵک ئەژمارد و تا ئێرە کێشەیەک نیە. ئەوەی ئەم هەڵوێستەی ئێمەی ئەکرد بە هەڵوێستێکی پاسیفیستی و تەسفەوی ئەوەبوو کە ئێمە هیچ بەدیلێکمان نەئەخستە جێی. مەبەستم لەبەدیل ئەوەیە کە ئەو بۆشاییەی نەمانی ئەوان بە ڕژێم پڕنەبێتەوە وبگرە ئێمە خۆمان، بە هێزی خەڵک و خۆمان، ئەو بۆشاییەی پاشەکشە یا نەمانی ئەوان، پڕبکەینەوە. ئێمە نە هێزی ئەوەمان هەبوو نە ڕێیەکمان گرتبووەبەر کە بمانکات بەو هێزە وەکوو لە دواییدا دەرکەوت.

**پێنجەم:** ڕێکخراوی سیاسی تەنیا بە ڕۆشنبینیی سیاسی و فکری کاری مەیسەر نابێت. گەر وابوایە کتێبە باشەکان و شاکارە تیۆریەکان بەس بوون بۆ گۆڕینی دونیا.

ڕێکخراوی سیاسی، بەتایبەتی لە وڵاتێکدا کە هەموو شتێک بەکونەدەرزیی سیاسەتدا تێپەڕبێت، دەزگایەکی زیندووی خاوەن کاراکتەری تەکنیکی و مادیی خۆشیەتی. ئەم ڕێکخراوە بە پێی تایبەتمەندیی سەردەمی خۆی و شوێنی هەڵسووڕانەکەی، تایبەتمەندیی جیاواز بەسەریدا ئەسەپێ و ئەبێ مرونەتی سیاسی و دینامیکیەتی ڕێکخراوەیی پێویستی وای تێدا بێت کە ڕەنگدانەوەی ئەو تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی سەردەم و شوێنەکە بێت.

ڕێکخراوی سیاسی کۆپیکردنێکی ئایدیۆلۆجی نیە. ناتوانی کۆپیەکی مۆدێلی ئەم وڵات و ئەو سەردەم بێنیت و ناوی بنێیت ڕێکخراوی سیاسی. ئەوەی من ئەیڵێم مانای ئەوە نیە کە پرەنسیپ و بنەما فکریە هاوبەشەکان وتاقیکردنەوەی وڵاتان بخەینە لاوە لەم بوارەدا، بەڵکوو مەبەستەکەم ئەوەیە کە ڕێکخراو، بەو تایبەتمەندیە فکری و سیاسیانەوە، ببەسترێتەوە بە بارودۆخی سەردەم و شوێنەوە و ئەو تایبەتمەندیانە لەخۆیدا، بنوێنێتەوە.

ئەو مەسەلانە لە میتۆدی سیاسی و ڕێکخراوەیی کارگەراندا جێگەیەکیان نەبوو و مایەی هیچ بایەخێک نەبوون.

+++

سەروبەندی زستانی ١٩٨٣ ئەیادی هاوڕێم سەردانێکی دایکمی کرد لە قەمچووغە. ئەیاد دواتر بۆی گێڕامەوە کە لە وەڵامی پرسیاری دایکمدا سەبارەت بە من ووتبووی کە هێشتا لە ئێرانە و چاوەڕوانی هەلی ڕۆیشتن دەکات بۆ ئەوروپا و دایکم دڵی بەو هەواڵە خۆشکردبوو. لەو کاتەدا کە ئەمان سەرقاڵی ئەم قسە و باسانە ئەبن عەلی بچکۆل، کە ئەوکاتە لێپرسراوی مەڵبەندی دووی یەکێتی بوو لە سەرگەلوو وئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانیش بوو، خۆی ئەکا بە ماڵی ئێمەدا و بەدایکم ئەڵێ: ئەرێ ئەم میوانەتان کوێندەریە؟ ودایکیشم ئەڵی ئەوە هاوڕێی عدنانە و بە سەردانمان هاتووە وعدنان ئێستا لە ئێران چاوەڕێی دەرچوونە بۆ ئەورووپا. ئەویش بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەستی دایکم ئەڵێ: ئەوە بە ڕاستە؟ ئەرووپای چی عدنان ئەوەتا لە هەولێر خەریکی تەنزیماتە تۆ ئاگات لێ نیە یا لە منی ئەشاریتەوە؟ ئەیاد وتی: زۆر ئیحراج بووم و دایکیشت زۆر دڵی داخورپا.

دوای ڕۆیشتنی عەلی بچکۆل دایکم دووبارە ڕووی لە ئەیاد نابوو کە پێی بڵێت ڕاستیی مەسەلەکە چۆنە و ئەیادیش هیچی بۆ نەمابووەوە وتبووی ڕاست ئەکا و گەڕاوەتەوە. دایکمیش سەرباری ئەوەی کە سێ کوڕی لەبەرەی شەڕی هەمیشەیی پێشمەرگایەتیدا بوو لانی کەم تا ئەو کاتە دڵی بەوە خۆش بوو کە من دوور و سەلامەتم، کەچی ئەو کابرایە هێندە بێ پرەنسیپ بوو بێ گوێدانە هەست و سۆزی دایکم دیسانەوە دڵی خستبووە مەترسی و دڵەڕاوکێیەکی زۆر ناخۆشەوە.

ئیتــر دایکــم بە ئەیــادی وتبــوو کە هــیچ نەبــێ ئێســتا مفــاوەزاتە و هــاتوچۆی شــارەکان و دەرەوە زۆر بــووە و نــازانم دونیــا چیمــان بەسەردێنێت ومەترسیەکی زۆر نیە، با لانی کەم سەرێکم لێبداتەوە.
کە ئەیـاد هەواڵەکەی هێنـایەوە دیسـانەوە نیگەرانیی ئەوەم لا زینـدوو بـووەوە کە بـووم بە مـایەی دڵەڕاوکێـی دایکـم وئەترسـام لەوەی کە شـتێکی بەسـەر بێـت و نەیبینـمەوە وتـا مـاوم لە دڵمـدا ببێـت بەگـرێ.
کیشــەکە ئەوە بـوو ئەو کـابرایە نـاوی گەڕەکەکەشـی هێنـابوو و لەوە ئەترســـام کە مـــاڵی عەلـــیش کە چاکەیـــان لەگەڵـــدا کردبـــووم و خانووەکەیـان خسـتبووە خـزمەتمەوە، تووشـی کێشـەیەک بـبن. ئـاخر کابرایەکی ئەنـدامی سـەرکردایەتیی ئەوان لە مەجلیسـێکدا وا بەئاسـانی و بــێ گوێــدان بە هــیچ بەهــایەکی ئینســانی و کــۆمەڵایەتی شــوێنی ئیختیفـای مـن بـدرکێنێ و ژیـانم بخـاتە مەترسـیەوە لەبەر ئەوەی مـن جیـاواز لەوان بیـرئەکەمەوە، ئەوەشـی لـێ ئەوەشـێتەوە کە لانـی کەم، گەر بە دەستی ئەنقەست ونیازخراپیش نەبێت، لەنـاو کۆڕ و کۆمەڵـی تری نـاو پێشـمەرگە و جێـی تـردا باسـی بکـات، کە حەتمەن هاوکـار و جاسووسـی ڕژێمیـان تیایە. کە ئەو مەسـەلەیەم لای هـەردوو هـاوڕێم نەجـات و عەلـی باسـکرد هـیچ سـەرەداویکمان شـک نەدەبـرد کە ئەم شوێنەی ئیختیفای من چۆن گەیشتووە بە یەکێتی.
ڕۆژێکـی مـانگی ١ یـا ٢ی سـاڵی ١٩٨٤ بـوو، ممنـد و میقدادی هـاوڕێم هــاتبوون بــۆ ســەردانیم و پــێکەوە لەگەڵ عەلــی، کە هەرچوارمــان هاوڕێی نزیکـی سـەردەمی زانکـۆی بەغـدا بـووین، لە مـاڵەکەی خۆمـان دانیشتبووین. بەهۆی مفاوەزاتەوە کەمێک کـرانەوە لە ڕووی ئەمنیەوە هاتبوە ئـاراوە. لەوکـاتەدا لە دەرگـای حەوشـەیان دا و شـیروانی بـرای عەلی دەرگاکەی کردەوە و هاتەوە وتی کوڕێک لە دەرگایە و هەواڵـی عـەدنان ئەپرسـێت؟ منـیش لام سـەیر بـوو، چـونکە کەسـی وا شـوێنم نازانێت وگەر یەکێکیش بێت بۆ لام لە ڕێی عەلییەوە یا لەڕێی سمکۆ جەبـاریەوە دێـت بـۆ لام. هاوڕێکـانم وتیـان تـۆ مەڕۆ بەڵام مـن خـۆم

ڕۆیشـتم و بینـیم "سـەمیر نـوری" بـوو. سـەمیرم نەئەناسـی و تەنیـا ئەوکـاتە بینیبـووم کە یەکێـک بـوو لەو سـێ قوتـابیەی زانکـۆ کە لە بەشـێکی تـردا وتـم مـاوەیەک بەهـۆی هـاوڕێیەکمەوە هـاتبوونە ژوورەکەی ئێمە ودواتر گوێزایانەوە. هـاتمەوە ئیزنێکم لە هاوڕێکانم وەرگرت و دڵنیام کردن کە هیچ نیە و لەگەڵ ئەودا بەناو کۆڵانەکانی گەڕەکەکەدا پیاسـەیەکمان کـرد. دیـار بـوو ئەو هەر لەو کـاتەوە کە لە ژوورەکە لە گەڵ دوو هـاوڕێکەی تریـدا بینیانمـان، منـی ناسـیبوو و ئاشنای بیروباوەڕ و باکگراوەندی من بوو. چۆن زانیبووی نەمئەزانی و نەشـم پرسـی. وتـی: مـن ئەزانـم تـۆ فڵانەکەسـیت و چ کارەیـت و بـۆ گەیشتووی بە ئێرە و ئەوانە هیچی کێشـەی مـن نیە و تەنـها هـاتووم ئاگـادارت بـکەم کە یەکێتـی شـوێنی ئیختیفـاکەی تۆیـان زانیـوە. ئەو نەیئەزانی من پێشتر هەواڵەکەم بیستووە بێ ئەوەی بزانم کە کێ ئەو هەواڵەی بە یەکێتی گەیانـدووە. منـیش لەبەرانـبەر ئەوەی کە ئەو زۆر شـتی لەسـەرم ئەزانـی تەنهـا هاشـام لە هەنـدێکیان پێکـراو وپـاش سوپاسکردنی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

ئەمزانی گەر بڵێم چۆن و کێ ئەم نهێنیانەی منی گەیاندۆتە یەکێتی ڕاسـتیەکەم پـێ ناڵێـت یـا تووشـی ئیحـراجییەک ئەبێـت، بەڵام لەوەدا مەعلـووم بـوو لام کە یەکێـک لەو دوو هـاوڕێیەی ئەم لە گەڵیـدا هـاتبوونە ژوورەکەمـان دەسـتی لەم کـارەدا هەیە. دەسـتەکەی عەلـی بچکۆلیش کەشـف بـوو و سـاڵانێک دواتـر بـۆم دەرکەوت کە (س . ڕ) کە یەکێـک لەو سـێ قوتـابیە بـوو کە هـاتبوونە مـاڵەکەی ئـێمە ئەو زانیاریانـەی دابـوو بە عەلـی بچکـۆل. ئەو کـوڕەی زانیاریەکـانی سـەبارەت بە مـن دابـوو بە یەکێتـی کـادری کـۆمەڵە بـوو و لە ڕووی دلسۆزیی بۆ کۆمەڵە ئەو کارەی کردبوو بێ ئەوەی بزانێت مەترسیی لە سـەر مـن هەیە و چەنـد سـاڵ دواتـریش جـگە لەداوای لێبـووردن ئەیـووت: کاتێـک ئەو مەعلوومـاتەی داوە بە علـی بچکـۆل ئەو مەسەلەکەی زۆر بەجدی وەرنەگرتووە!!!

نەجات لە سلێمانی گەڕایەوە و ئاگادارم کردەوە کە ئەبێ سەردانێکی قەمچووغە و کەس و کارم بکەم. ئەو زۆر هەوڵیدا کە پاشگەزم بکاتەوە، بەڵام من هەر سوور بووم لەسەر قسەی خۆم.

کە گەیشتمە گوندی قەمچووغە بەوە باش بوو عادلی برا گەورەم لە ماڵ بوو. ئەو لە ماوەی مفاوەزاتەکەدا ماڵی بردبووە گوندی هەیاسی لە بازیان. ڕاستیی مەسەلەی سەفەری ئێران و دەرەوەم بۆیان گێڕایەوە کە مەبەستم تەنها ئەوە بووە دڵنەواییەک بدەم بە ئێوە و سەرباری وەزعی خۆتان نیگەرانی منیش نەبن. هەر لەو سەفەرەدا یەک دووجار دایان بەگوێمدا کە بۆچی زەواج ناکەم و منیش بەبیانووی ناجێگیری و نادیاری زروفی عێراق وتم: جارێ بابزانین ئەم مفاوەزاتە چۆن ئەبێت. عادلی برام پێشنیاری کرد کە پێکەوە سەفەرێکی سلێمانی و کەرکووک بکەین. ئەو سەیارەیەکی پەیدا کرد و دیاربوو کە پسوولەی لیژنەی تەنسیقی پێبوو، بەڵام من پێم وت کە بە هەویەی تەزویر هاتوچۆ ئەکەم و بۆ ئاگاداریی ئەو ناوە تەزویرەکەم پێی وت نەوەک لە بازگەکان داوای هەویەم لێ بکەن و نەئەکرا ئەو ناوی سەر هەویەکە نەزانێت. دوای سەردانێکی کورتی سلێمانی لە ڕێگەی کەرکووک لە ماڵی مامۆستا جەلالی کانی شەیتان لە تەکیە لاماندا و شەو لای ئەوماینەوە. پاشان لە ڕێگەی کەرکووک بە درێژی باسی ڕای خۆم لەسەر یەکێتی و مفاوەزات لەگەڵ عادلدا کرد. ئەو پێی وابوو کە مفاوەزات سەربگرێت باشترە و ئەم بزووتنەوە و هێزە سیاسیانەی کوردستان لەوە زیاتریان لێ چاوەڕوان ناکرێت. گەر مفاوەزات بکرێت لانی کەم خەڵک ئەڕواتەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی بەو مەرجەی نیمچە کرانەوەیەک لە وەزعی سیاسی و ئەمنی کوردستاندا ڕووبدات. من خۆمیش گەرچی بڕوام بەوە بوو کە ئەم ڕژێمە چاری نیە و ئەبێ بڕووخێت، بەڵام ڕام وابوو کە ئەم بزووتنەوە سیاسی و چەکداریە تەنها حیکمەتی مانەوە و درێژەی تەمەنیان بوونی دیکتاتۆریەت و مانەوەی بەعسە لە

دەسەڵاتدا. ئەمان نموونەیەکی باڵاتر و جوانتر لە بەعسیان پێ نیە بەڵام بوونی دیکتاتۆریەت و نەبوونی بەدیلێکی لەمان باشتر، بووە بە بیانوویەک بۆ گردبوونەوەی جەماوەر لەمان و بەستنی ئومێد پێیان. جگە لەوەش وتم کە نەبوونی بەدیلێکی شۆڕشگێڕی تر کە بتوانێ جێ بەمان چۆڵ بکات و گەمەی سیاسەت کردن لە کوردستاندا لەڕەگەوە بگۆڕێت، ئەوەندی تر تەمەنی ئەمانی درێژ کردۆتەوە و دەستی کردوونەتەوە بۆ مانۆری سیاسی و یاری کردن بە چارەنوسی خەڵک.

کە باسی بەدیلم کرد ئەو هاتە وەڵام:

ئەی ئێوە و هێزە مارکسیەکان بۆ ئەو بۆشاییی نەبوونی بەدیلە پڕناکەنەوە؟

دیار بوو ئەیویست ئەو باسە زیاتر بووروژێنێت بۆیە وتی: ئێوە لە شیکردنەوە و لێکدانەوەدا عەیبتان نیە ولە ڕووی فکرەوە بەهێزن، بەڵام کێشەی ئێوە نەبوونی ڕوانگەیەکی واقیع بینانەیە بۆ کۆمەڵگای کوردستان.

لەم کەین و بەینەدا بووین گەیشتینە نزیکی سەیتەرەکەی نزیک کەرکووک و بەناچاری باسەکەمان وەستان و من وتم: پێمخۆشە کاتێکی تر زیاتر ئەم مەوزووعە باس بکەین.

لە کەرکووک بۆ نیوەڕۆ چووینە یانەی (العمال) و دوای سەردانی چەند هاوڕێ و ناسیاوێکی ئەو، ڕۆژی دواتر گەڕاینەوە بۆ قەمچووغە.

لەو ماوە کەمەدا کە لەوێ مامەوە چەندین هاوڕێم لە کەرکووک و سلێمانیەوە کە پێشتر نەیان ئەزانی لە کوێ ئەژیم، بە هۆی ماڵەوە دۆزیمیانەوە و سەردانیان ئەکردم. بەهۆی مفاوەزاتەوە جۆرێک لە جەوی کرانەوە و ئازادی بۆ جموجۆڵ هاتبووە ئاراوە. هەر لە قەمچووغەوە سەردانێکی ئۆردووگای کۆمەڵە و حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانم کرد لە مالوومە.

نــزیکەی ٣٥ کەســی ڕاکــردووی ســەربازیی شــارە جیاوازەکــان لە قەمچووغە گیرسابوونەوە.
لە قەمچـووغە گرووپـی چەپـی دروسـت ببـوو. گرووپێکـی لـێ بـوو کە زۆربەیان خەڵکی کەرکووک بوون و بەهۆی گونجاویی ئەم دێیەوە و ڕاکردن لە دەستی سـەربازی لەوێ ئەژیـان. جەودەت (شـیخ سـوارە) وهیـوا زەنـدی و هـێمن و سـەباح سـانی و سـەلام جاسـم و قاسـم وعدنان کەرکووکی وسید نوزاد، ماڵێکیان پیکەوە نابوو لە قەمچـووغە. سـامی سـەرپانی بـرای ئـازاد هەورامـیش ئەو مـاوەیە لەوێ ئەژیـا. نەجمەدینی فەقێ عبدالله هاتووچۆی ئەمـانی ئەکرد و لایـان ئەمـایەوە. حــــمەی ســـــانیش کە پێشــــتر لە زینــــدانی مووســــڵ چــــاوەڕوانی لەسێدارەدانی ئەکرد و دواتر داگیرابوو بۆ زیندانی ئەبەدی و پاشان لە لێبـووردنێکی ڕژێمـدا ئـازاد کرابـوو، هـاتووچۆی ئەو هاوڕێیـانەی خۆی ئەکرد لە قەمچـووغە. ئەو هاوڕێیـانە کە هەموویـان کەرکـووکی بــوون جێــی ڕێــزی دێــیەکە بــوون، بەڵام بەو هــۆیەوە کە بەچەپ ناسـرابوون زوو زوو ئەکەوتـنە بەر گـێچەڵ و لێپرسـینەوەی یەکێتـی. ئەمان زیـاتر خەریکـی خوێندنەوە و کـاری ڕۆشـنبیری و بایەخـدان بە هونەر بوون و کەمتر خۆیان وەرئەدا لە کاری ڕاستەوخۆی سیاسـی، بەڵام بەوەیشــەوە یەکێتـی لێیـان نەئەگەڕان و هەمیشـە ئەخـرانە ژێـر فشـارەوە. گونـدەکە وەکـوو سـەنتەرێکی حەوانەوە و سـەرەڕێ وابـوو بۆ بەستنەوەی بە دیوی قەڵاسـێوکە و چەمـی ڕێزان و ئەو نـاوچەیە. بەو کـــۆمەڵە گەنـــج و کەســـــایەتیە ڕۆشنبیرانەشـــــەوە کە لەوێ جیگیربووبوون ببوو بە جێیەکی بەرچاو بۆ یەکێتی و هەمیشـە لەڕێـی تۆڕێـک لە ڕێکخسـتن و لایەنگرانیـانەوە چـاودێریی خەڵکـی نـاڕازی و جیـــاواز لەبیرکردنەوەیـــان ئەکـــرد و لەمەڵبەنـــدی ســـەرگەڵوەوە سەرپەرشتی ئەکران. مـاڵی مامۆسـتا عـومەر و حەیدەر کە دوو بـرای خوێندەوار و ڕۆشـنبیری نـاو دێکە بـوون، کە بەداخەوە هەردووکیـان لە دونیـــادا نەمـــاون، کەوتبـــوونە ژێرکـــاریگەریی ئەو هـــاوڕێ

کەرکووکیانە و پەیوەندیەکی نزیکیان لەگەڵیاندا هەبوو. حەیدەر و عومەر خۆشیان خوێندەوار و چەپ بوون. هەر لەوێش خدر چەمچەماڵی ئەژیا کە پێشتر پێشمەرگەی یەکێتی بوو و ئەوکاتە دانیشتبوو ولە ڕێی پەیوەندی لەگەڵ مندا بووبوو بەدۆستێکی نزیکی ڕێکخراوی ئێمە.

مام عومەر دارتاش بە ماڵەوە لەوێ ئەژیا. مام عومەر ئەندامی کۆمیتەی ئاگری کەرکووکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بوو. ئەو لە گرتن و تەسفیەی خوێناویی کۆمیتەکە لەلایەن ئەمنەوە دەربازبوو وپاشان ببوو بە پێشمەرگە. ئەو پیاوێکی ڕاستگۆ و دڵسۆز و لەخۆبوردوو بوو و ساڵانێکی زۆر لەوەو پێش ئەندامی حیزبی شیوعی بوو. پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ مندا هەبوو و خۆشیی بە هاوڕێکانی منیشدا دەهات و هەرکە بیزانیایە میوانی لەو جۆرەم هەیە خۆی دەگەیاندە لامان بۆ گفتوگۆی سیاسی و قەت تاقەتی نەدەچوو لە باس و جەدەل سەبارەت بە سیاسەت و مارکسیەت. جارێکیان لەگەڵ من و هاوڕێیەکی ترمدا دانیشتبووین لەماڵی ئێمە و لەقسەکانیدا زۆر نموونەی لە لینین ئەهێنایەوە. هاوڕێکەم لێی پرسی مام عومەر تۆ خوێندەواریی ئەوەت هەیە تا ئەو کتێبانەی لینینی پێ بخوێنیتەوە؟ مام عومەر وەڵامێکی زۆر خۆشی دایەوە. ئەو وتی: نا من چەنەبازیەکە نازانم بەڵام هەر ئەوەندە خوێندەواریم هەیە ناوی لیستی حەرەسیات و ئەو شتانەی پێ بنووسم. مەبەستی مام عومەر لە (چەنەبازیەکە) مەسائیلی تیۆری بوو. بەداخەوە مام عومەر لە ئەنفالەکە دەستگیر کرا و بوو بە قوربانیی ستەمی بەعس.

هاوڕێ خەلیل کەسایەتیەکی زۆر تایبەتی تر بوو کە ئەو ماوەیە ناسیم و زوو بوو بەدۆستێکی نزیکم و لایەنگرێکی نزیکی کارگەران. خەلیل کە تا ساڵی ٢٠١٦ لە ژیاندا بوو، خەڵکی دێهاتی نزیک خانەقین بوو. دوای چەندین ساڵ بوو وازی لە ئەندامەتیی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی و پێشمەرگایەتی هێنابوو. ئەو لە ماوەی شۆڕشی ئێراندا

ڕۆیشتبوو بۆ ناو شارەکانی ئێران و لە نزیکەوە تاقیکردنەوەی ڕاپەڕینی گەلانی ئێرانی دیتبوو و تیایدا بەشدار بوو. خەلیل فارسیەکی زۆر باشی ئەزانی و زیاتر خوێندنەوەکانی بەو زمانە بوو. لە قەمچووغە هاوڕێ خەلیل کە ناوی منی بیستبوو هات بۆ لام و خۆی پێ ناساندم و جارێک پێکەوە چووین بۆ سەردانێکی ڕێکخراوە ئێرانیە چەپەکانی (دۆڵی ئەحزاب) و ئەو پەیوەندی و ناسیاویی لەگەڵ زۆربەیاندا هەبوو. لە مفاوەزاتەکەدا هاوڕێ خەلیل لە گوندی (کانی خان) ژوورێکی گرتبوو و لەوێ لەگەڵ دونیای کتێبەکانیدا بەتەنها ئەژیا و چەندین جار سەردانیم کرد. خەلیل بوو بە هاوڕێیەکی نزیکی کارگەران و نموونەیەکی ئەو کەسایەتیانە بوو کە تەنها چەند ساڵێکی کەم لە قوتابخانە خوێندبووی، بەڵام لە هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیری و سیاسی و فکری و هونەردا شارەزایی و هۆشیاریەکی بەرزی هەبوو.

لە سەردانەکەمدا بۆ لای ڕێکخراوە و حیزبە چەپە ئێرانیەکان لەگەڵ هاوڕێ خەلیلدا چاومان کەوت بە (وەحدەتی کۆمۆنیستی، ڕاهی کارگەر، چریکە فیدائیەکانی باڵی ئەشرەفی دەهقان) و لەدواییشدا سەردانێکی ئۆردووگای کۆمەڵەمان کرد لە مالوومە. من تازە فێری فارسی بووبووم و بلاوکراوەی هەموو لایەنەکانمان لەگەڵ دەستی خۆماندا هێنایەوە. هاوڕێ خەلیل کە بەئارامیەکی سەیر ناسرابوو لە هەمان کاتدا تا بڵێی قسەخۆش بوو. دوای جێهێشتنی ڕیکخراوی چریکەکان وتی: چریکی فیدایی کۆنترین باڵی چەپی ئێرانین و لە کاتی شۆڕشی ئێراندا بەهێزترین ڕێکخراوی چەپ بوون. بەدوای ڕووخانی ڕژێمی شا و دامەزرانی کۆماری ئیسلامی ئەم ڕێکخراوە تووشی پاشەکشە و لەت لەت بوون هات و تا ئێستا ٤ جار ئینشیقاقی تێکەوتووە. یەکێک لەو بالانەی چریک کە بۆمان نەکرا سەردانیان بکەین تەنیا دووکەسیان لێرە ماونەتەوە کە ئەوانیش ژن وپیاوێکن واتە هاوسەرن. ئەو ژن و پیاوەش لەیەک جیابوونەتەوە و یەکێک لە

گرووپە چریکە نەیارەکانی ئەوان کاریکاتۆریکیان درووستکردووە لە وێنەی یەک کەسدا کە ئەو تەنها کەسەش خەریکە ئەبێ بە دوو لەتەوە. جا بە ڕاستیش سەیر و سەمەرە بوو. زیاتر لە دە ڕێکخراوی چەپ و مارکسیی ئێرانی تەنها لەو دۆلەدا هەبوون. لەو سەردانە و سەردانەکانی دواتردا زۆر شت سەبارەت بە چەپی ئێرانی بۆم بووبوو بە پرسیار: باشە ئەمانە هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوانیاندا نیە؟ بۆ ئەم هەموو ڕێکخراوە هاوپەیمانێتییەکی سیاسیی لە سەر خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان پێک ناهێنن؟ بۆچی پەیوەندیەکی نۆرماڵی سیاسی لە نێوانیاندا نیە؟ بەم هێزە چەند نەفەری و دوور وڵاتەوە ئەبێ چۆن بتوانن ئەو هەموو دروشمە گەورانە سەبارەت بە شۆڕشی ئێران و ڕابەری کردنی چینی کرێکار و ئەنتەرناسیونالیزمی پرۆلیتاری و دەیان دروشم و داخوازی و ئامانجی گەورە وگران، بەدی بێنن؟
لەبەر دڵی دایکم و هەروەها نەبوونی مەترسیەکی ئەوتۆ لە سەرم و ئەو فەزا نوێیەی بە هۆی مفاوەزاتەوە پێکهاتبوو، تا کۆتایی مانگی ئازاری ١٩٨٤ لە قەمچووغە مامەوە و ئەو ماوەیە بوارێکی باشم بۆ ڕەخسا کە تۆزێک لەو جەوی کەئابەی ئیختیفا سەختەی هەولێر دووربکەومەوە و تێکەڵی ژیانی نۆرماڵی کۆمەڵایەتی و خێزان و کەس و کار و دۆست و ئاشنا ببم. هەر لەو ماوەیەدا نەجاتی هاوماڵ و هاوڕێ و هاوکارم سەردانێکی کردم لە قەمچووغە بۆ دڵنیابوون لە وەزعی من و گۆڕینەوەی بیروڕا و ئاگاداربوون لە دوایین باس و ئاڵوگۆڕەکانی ناو ڕێکخراو. ئەو پێداگریی لەسەر ئەوە کردەوە کە دەرەوە بۆ من گونجاو نیە و جگە لەوەش شارەکان جموجۆڵی زیاتری تێکەوتووە و بەگشتی وەزع ڕووی لە ئاڵوگۆڕە و هاتنەوەت بۆ هەولێر زۆر پێویستە. نەجاتم دڵنیاکردەوە کە من تەنها ئەم هەلەم قۆستۆتەوە بۆ سەردانی ماڵەوە وئەم ماوەیە منیش هەر لە چوارچێوەی نەهجی سیاسیی خۆماند ا سەرقاڵی هەڵسووڕان بووم و

سەردان و جەولەکانم زۆر بەکەڵک و بەبەر بوون و ئەمەوێ لێرەوە بەدەستی کراوەترەوە وبەسوودوەرگرتن لەم فەزا تازە و گونجاوە هەموو ئەو هاوڕێ و دۆستانە بەسەربکەمەوە کە بەهۆی ڕاکردن و ئیختیفاوە، لێیان دابڕاوم. ئەو گەڕایەوە بۆ سلێمانی و بەوردی ئاگاداری کردمەوە لە دەنگوباسی چالاکیەکانی ڕیکخراو وخۆی بە پەیوەند بە خۆپیشاندانەکانی سلێمانی کە چەندین مانگ درێژەیان بوو. بەهۆی ئەو جەوە سیاسیەی کە لە سەروبەندی مفاوەزاتدا کوردستانی گرتبۆوە بەهاری ئەو ساڵە شۆڕوشەوق و ئومێد لەناو خەڵکدا زیادی کردبوو. لێرەدا پێمخۆشە وەکوو بەشەکانی تری ئەم یادەوەریە چەند سەرەقەڵەم سەبارەت بە مفاوەزات و فەزای سیاسیی کوردستان و مانۆرەکانی ڕژێم بۆ خۆقوتارکردن لە ئەزمەی ئەو قۆناغە وهەروەها بارودۆخی چەپ و ڕێکخراوی کارگەران، باس بکەم.

ڕژێمی عێراق لەبەرەکانی شەڕ لەگەڵ ئێراندا یەک لە دوای یەک تووشی شکست ئەهات. پێشتر کۆنگرەی وڵاتانی بێ لایەن کە بڕیار بوو کۆتایی ساڵی ١٩٨٢ ببەسترێت وعێراق ئومێدێکی زۆری لەسەر هەڵچنیبوو لە بەغدا نەبەسترا. صدام ئەیویست ئەو کۆنگرەیە بکات بە سەکۆیەک بۆ زۆر ئامانج. ئەیویست هەم ئەو فشارە جیهانیەی لەسەری دروست بووبوو بەهۆی فایلی مافی مرۆڤ و دیکتاتۆریەت و داپلۆسین لە عێراقدا، بە بەستنی کۆنگرەی وڵاتانی بێ لایەن لە بەغدا پەردەپۆش بکات. جگە لەوە ڕژێم هەوڵی ئەدا کە سۆز و لایەنگریی جیهانی و بەتایبەت ڕۆژئاوا بۆ خۆی ڕابکێشێت لە بەرانبەر ئێران تا بتوانێت حکوومەتی ئیسلامیی ئەو وڵاتە بخاتە گۆشەیەکی تەسکەوە و ناچاری بکات کە شەڕ راوەستێنێت. لەبەر بادانەوەی عێراق بەرەولای ئەمریکا و فەرەنساوە، سۆڤیەت ئەو مەیلەی جارانی بەلای عێراقدا نەمابوو و گەرچی یارمەتیی سەربازیی لێیان نەبڕیبوو بەڵام کۆمەکی سەربازیی ئێرانیشی ئەکرد. لە جیهانی عەرەبیدا سوریا

و لیبیـا و جەزائیـر بووبـوون بەدۆسـتی نزیکـی ئێـران. عێـراق پێـی وانەبـوو کە شـەڕ لە گەڵ ئێـران هێنـدە بخایەنێت و پـلانە ئـابووری و سیاسـیەکانی لەســەر بنـاغەی شــەڕێکی کــورت و ســەرکەوتوو داڕشـتبوو، بـۆیە درێـژەی شـەڕ و بـێ دەربەسـتیی ئێـران لەوبـارەوە ڕژێمی عێراقی تەنگەتاو کردبوو. باری دارایی عێراق بەرەو تێکشکان و داڕووخـان ئەڕۆیشــت و بەقەرزی وڵاتـانی کەنـداو ئاشـی شــەڕ بەردەوام بــوو. گوشــاری شــەڕ و قوربــانیە زۆرەکــانی لە ڕیــزی سـەربازانی عێراقـی و بەسـیجکردنی سـەدان هەزارکەسـی شـارەکانی ناوەڕاســت و خــوارووی عێــراق، ســەرباری گەیشــتنی سیاســەتی داپڵۆسین و کوشت و بڕی ناوخۆ بەخراپترین ئاست، ڕژێمیـان لە نـاو خەڵکدا بە تەواوی ڕسواکردبوو و ئەو هەستەی لای خەڵک دروست کردبوو کە ئەمە زیاتر لە دەوڵەتێکی داگیرکەری خوێنخۆر ئەچێ کە عێراقی کەوتۆتە بن دەست نەک حکوومەتێکی نۆرماڵ. بێزاریی خەڵک لە هەمـوو عێراقـدا گەیشـتبوو بە ئاسـتێکی کەم وێـنە و ڕژێـم بـاش ئەیزانی کە لەسەر بەرمیلێک لە بارووتی تووڕەیی و بێزاریی خەڵکی هەموو عێراق دانیشتووە.

مفــاوەزاتی ڕژێــم لەگەڵ یەکێتیــی نیشــتیمانیی کوردســـتان لەو بارودۆخەدا زیاتر لە ئاگربەستێک ئەچوو کە ڕژێم وەکوو مـانۆڕێکی سیاسی گرتیەبەر. ساڵێک پێش مفاوەزات شەڕی یەکێتی و لایەنەکانی بەرەی جـوود کە پـارتی هێـزی ســەرکیی بـوو زۆر گەرم بووبـوو. یەکێتـی هێـزی پەلامـاردەری سـەرەکی و هێـزی فشـاری سـەربازیی سەرەکی بوو بۆسەر ڕژێم. نـاوچەیەکی فراوانـی کوردسـتان لە نزیک خــانەقینەوە تــا دەشــتی هەولێــر و هەمــوو هێڵەکــانی تەمــاس و بەریەککەوتن لەگەڵ سوپای عێراق، جگە لە بادینـان، لە ژێردەسـەڵاتی یەکێتیدا بوو. سەرباری سـەرقاڵیی هێزەکـانی بەشـەڕەوە لە گەڵ هێـزە نەیارەکـانی لە کوردسـتاندا، یەکێتـی زۆرتـرین فشـاری سـەربازیی بۆســەر ســوپای عێــراق دروســتکردبوو. شــارەکانی کوردســتانیش

بووبـوون بەمەڵبەنـدی نـاڕەزایەتی و تێکۆشـانێکی هەمەلایەنە لە دژی ڕژێـم و چیتـر بە تەنها بە داپڵۆسـین بـۆی کۆنترۆڵ نەئەکرا. نفووزی سیاسـیی یەکێتـیش لە شـارەکاندا زۆر بـوو ولایەنەکـانی تـری بەرەی جـوود و بەتـایبەتی پـارتی خـاوەنی پێگەیەکـی جەمـاوەریی ئەوتـۆ نەبوون بە بەراوورد بە یەکێتی. هەموو ئەو فاکتەرانە یەکێتییان لەلای ڕژێم کردبوو بە کاندیدی یەکەم بۆ دەسـپێکردنی مـانۆری مفاوەزات. کە ئەڵێم مانۆر مەبەستم چەند شتە:

یەکەم: ڕژێـم لە هەوڵدا بـوو کە گفتوگۆ زۆرتـرین مـاوە بخایەنێت بۆ کـــات کوشـــتن و بەکارهێنـــانی بەشـــێکی زۆری ســـوپاکەی، کە لە کوردستاندا سەرقاڵی شەڕی یەکێتـی بـوون، لە بەرەکانی شـەڕ لەگەڵ ئێراندا.

دووەم: خـــۆ ئەگەر ڕژێـــم لەم گفتوگـــۆیەدا یەکێتـــی ڕازی بکـــات و دەمچەوری بکات بەکۆمەڵێک پۆست و ئیمتیازاتی سیاسیی ڕواڵەتی و سپاردنی دەسەلاتی مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزی بەوان لە بەرانبەر مسـۆگەرکردنی ئاسایشـی کوردسـتان لە لایەن ئەوانەوە، ئەویشـیان بژاردەیەکـی کـاتیی بـاش و سـەرکەوتووە بـۆ ئەم قۆنـاغە تـا شـەڕ لە گەڵ ئێران بەلایەکدا ئەکەوێت.

سـێیەم: ڕژێـم بەم هەنگـاوەی ئەتـوانێ، جـا مفـاوەزات سـەربگرێت یـا وەکـوو ئـاگر بەسـتێک بـۆ سـاڵێک یـا زیـاتر بمێنێـتەوە، قڵشــت و دووبەرەکیەکــی گەورە بخــاتە ڕیــزی لایەنەکــانی نــاو بــزووتنەوەی سیاسـی و چەکـداری کوردسـتان و لە جیـاتی تەرخـانکردنی هێزێکـی زۆری خـۆی لەم تەنگـانە گەورەیەدا، تـۆپەکە بخـاتە گورەپـانی ئەو هێزانەوە و ڕەنگ بێ سبەی پارتی لە بەربەرەکانێ لەگەڵ یەکێتیدا، بە ئیمتیازێکی کەمتریش ئامادە بێت بابداتەوە بەلای ڕژێمدا.

چـوارەم: ئێـران لە زەمــانی شــاوە کــارتی کــوردی بەکارهێنــاوە لە سـاغکردنەوەی کێشـەکانی لەگەڵ عێراقـدا و زۆریـش سـوودی لێیـان بینیوە بۆ دۆشینی عێراق و هێزە کوردیەکانیش بە ئاسانی بوون بە

نێچیری ئەو سیاسەتە. مفاوەزات ئەتوانێ لەم شەڕە مێژووییە لەگەڵ ئێرانی ئیسلامیدا ئەو چەکە لە دەستی ئەوان دەربهێنێت و ئەوەش ئەوە ئەهێنێ کە بۆ نرخی ئەو سەودایە شتێک بدا بە یەکێتی، جا مفاوەزات بە ڕێکەوتنێکی درێژخایەن کۆتایی بێت یا وەکوو ئاگربەستێکی کاتی بێت.

پێنجەم: ڕژێم کەڵک لەم سیاسەتی ئارامکردنەویە لە کوردستان و دەسبەتاڵ بوونەی خۆی وەربگرێت بۆئەوەی بیپەرژێتە سەر خوارووو و ناوەڕاستی عێراق و لە ئەگەری هەر ئالوگۆڕێکی گەورەی وەک هاتنە ناوەوەی ئێران یا سەرهەڵدانی نارەزایەتیی شیعەکاندا، هەموو هێزی خۆی بۆ ئەوە تەرخان بکات و ترسێکی ئەوتۆی لە کوردستان نەبێت.

شەشەم: ڕژێم ئەیەویست لە ڕێی گفتوگۆ لەگەڵ یەکێتیدا، پەیامێکی ئەرێنی ئاراستەی وڵاتانی ڕۆژئاواش بکات کە ئەو ئامادەیە چاری مەسەلەی کورد بکات و ئەوەش نیشانەدەری ڕێزگرتنە لەمافی مرۆڤ و مافی گەلی کورد لە عێراقدا کە ئەو مەسەلەیە جاروبار لەلایەن هەندی ناوەندی ئەوروپییەوە ئەوروژێنران.

لەلایەن یەکێتیشەوە، دەمێک بووهەمان چاوشارکێ لەگەڵ ڕژێمدا ئەکرا و سەرکردایەتیەکەیان هەمیشە گوێقوڵاغی خەبەرێکی خۆش و قاسیدێکی لای ڕژێم بوون. هەمیشە ولە سەختترین قۆناغەکانی شەڕیشیاندا، ڕایەڵ و پۆیەک مابۆوە لە نێوان حکوومەت و یەکێتیدا. چەندین کەسی وەکوو شێخ مەحموودی کاریزە و مکرم تاڵەبانی وئەنوەر بەگی بێتواتە و حمەی شیخ عبدالکریم و سەرۆک عەشیرەت وئەفسەری ئیستیخباراتی عێراقی پەیامبەر و تەتەری ئەم پەیوەندیە بوون. یەکێتی ئەوکاتە لە ناو ڕیزەکانی خۆیاندا هاشایان لە بوونی پەیامبەر لەگەڵ بەعسدا ئەکردەوە، گەرچی چەندین جار وەفدەکانی ڕژێم لەسەرکردایەتی بینرابوون. هات و هاواری ڕادیۆکەی یەکێتی لە دژی صدام و ڕژێمەکەی و ناوهێنانی بە (ڕەفتار فاشی) و چی و چی

مەگەر بابـایەکی پێشـمەرگە یـا دامـاوێکی ئەنـدامی گـوێڕایەڵی نـاو شـارەکان یـا خەڵکی سـادەی گۆشـکراو بە ئومێد بە خەبـاتی شـاخ و پێشمەرگە باوەڕیان پێ بکردایە، ئەگینـا هەمـوو چاودێرێکی سیاسـیی سادە ئەیزانی کە یەکێتیی لە ڕووی پرەنسیپی سیاسیەوە مفاوەزات و ڕێکەوتـن و ئاگربەسـت لەگەڵ ڕژێمەکەی صـدامدا نەک ڕەتناکـاتەوە، بەڵکـوو ئامـادەیە بە وتەی جەلال تالەبـانی تـا ئەو شـوێنە پێـی لـێ هەڵبـڕێ کە لە گفتوگـۆیەکی ڕۆژنامەوانیـدا لەگەڵ گۆڤـاری (الوسـط)ی سعودي کە لە لەندەن دەرئەچوو بڵێ: صدام دوژمنی ئێمە نیە بەڵکوو ناوبژیوانمـانە (صـدام حكـم ولـيس خصـما لنـا). ئیتـر ئەوەی کە صـدام نـاوبژیوانی شــەڕی نێـوان یەکیتـیە لەگەڵ کـێ ئەوە یەکێتـی باشــتر ئەیزانـــی و ســـەرنەکەوتنی مفـــاوەزاتی ئەو ســـاڵە بـــواری ئەوەی نەڕەخسـاند ڕازی ئەو هەڵوێسـتەی یەکێتـی و جەلال تاڵەبـانی کەشـف ببێـت. بەهەرحـــاڵ یەکێتــیش پێویســـتی بە مفـــاوەزات هەبـــوو بـــۆیە هەردوولا لە نیوەی ڕێگادا بەیەک گەیشتن.

یەکێتـــی ســـاڵی ١٩٨٤ ئەو یەکێتــیەی جــاران نەمــابوو کە کــۆمەڵە داینەمۆکەی بوو. دەمێک بـوو لە سـایەی قۆنـاغی دوای ئـارام جەلالدا، ســەرکردایەتیی کـۆمەڵە ئەو ڕێکخراوەیـان لە ســەر ســینیەکی زێـڕین پێشکەشی جەلال تاڵەبـانی کردبـوو. دوانەی لێکدانەبڕاوی نەوشـیروان و مام جەلال ڕەمزی ئەو جێگە تازەیەی کۆمەڵە بوون لە ناو یەکێتیدا. مفـاوەزات بـۆ یەکێتـی دەریچەیەکی بـاش بـوو بـۆ خـۆ قوتـارکردن لە بارودۆخی بنبەست و بێ ئاسۆییەک کە تێی کەوتبوون.

دوای مــاوەیەک لە تەراتێنــی سیاســی و چەکـداریی یەکێتـی وەکــوو ڕابەری "شۆڕشـــی نـــوێ"، پـــارتی هـــاتبوونەوە کوردســـتان و بەهێزببـوونەوە و هێزێکـی زۆری دابـڕاو لە یەکێتـی، وەکـوو حسـک، جگە لە پاسۆک وحیزبی شیوعیی عێراق، ببون بە هاوپەیمانی نزیکی پــارتی و ڕێســـاکانی گەمەی " شۆڕشـــی نـــوێ " یـــان لە یەکێتـــی شـێواندبوو. سـەنگەرەکان وکارتەکـان تـا ئەهـات لە نێـوان ١٩٨٠ –

١٩٨٤ دا لە کوردستان تێکەڵتر و ئاڵۆزتر ئەبوون و بواری مانۆر و هەیمەنەیان لە یەکێتی تەسکتر ئەکردەوە. پارتی باکی بەوە نەبوو کە تا ڕووخانی شا، کە ئەوان دەسکەلای ناوچەیی دەستی ئەوبوون، دوای دامەزرانی کۆماری ئیسلامی لەوەش زیاتر پێیان لێ هەڵبڕیوە و بە ئاشکرا لە کوردستانی ئێراندا لەگەڵ پاسدارانی ئێراندا شەڕی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستانی ئێرانی ئەکرد. ئێستاش خەڵکی کوردستانی ئێران لەبیریانە کە خەڵک لە خۆپیشاندانەکانی شارەکانی کوردستانی ئێراندا ئەیانووت:(ڕەنجی کورد کێ بەبایدا – قیادە بوو قیادە) واتە قیادە موەقەتە کە ناوی ئەوکاتەی پارتی بوو.

لە شارەکانیشدا پێگەی یەکێتی بەرەو لاوازی ئەچوو. لە ناوخۆی خۆشیاندا، بەتایبەتی لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، ناڕەزایەتی و جیاوازیی زۆر سەریهەڵدابوو. باڵێکی بەهێزی کۆمەڵە خەریک بوون بە نیمچە ئاشکرا خۆیان ڕێک دەخست و بە سەرکردایەتیی مەلا بەختیار ناوی خۆیان نابوو (ئالای شۆڕش) و خوازیاری گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی کۆمەڵەی سەردەمی ئارام بوون  و گوێگریان کەم نەبوو.

یەکێتی لە تەنگژەدابوو و مفاوەزات  بۆ ئەمانیش چەترێ نەجات و شمشێرێکی دووسەرە بوو: سەری گرت ئەوە باشتر و سەریشی نەگرت ئەوە ئاگربەستێکی باشە بۆ حەوانەوە و پشوودانێک.

ئەم مفاوەزاتەی نێوان یەکێتیی نیشتیمانی و حکوومەتی عێراقی زیاتر لە (زەواجی متعە) ئەچوو تا گفتوگۆیەکی سیاسیی ڕاشکاو. یەکێتی بێ ئەوەی ناوەڕۆکێ گفتوگۆ و بابەتەکان و پێشکەوتنەکان و ئەنجامەکانی بۆ خەڵک باس بکات، وەکوو منداڵێکی هەرزەکار ئەیرِوانیە خەڵک و تەنیا ئەیووت (قۆناغی باشمان بڕیوە!!) بێ ئەوەی هیچ باسی دەستکەوتێکی ئەو قۆناغە باشانە بکات. دیار بوو تا نەورۆزی ١٩٨٤ گفتوگۆکان بەدڵی یەکێتی بوو بۆیە نەورۆزی ئەو ساڵەی کرد بە بۆنەیەک بۆ خۆشکردنی زەمینە بۆ گەیشتن بە ڕێکەوتن. لە سورداش گەورەترین ئاهەنگیان گێڕا و کردیان بە

فێستڤاڵێكی سیاسیی سەركەوتوو بۆ گردكردنەوەی جەماوەرێكی زۆری خەڵكی كوردستان بەمەبەستی بەهێزكردنی پێگەی خۆیان وهەروەها نیشاندانی هێزی جەماوەری خۆیان بەڕژێم. یەكێتی ئەیویست هێز و بازووی جەماوەریی خۆی تاقی بكاتەوە و لە هەمان كاتیشدا پەیامێك ئاراستەی ڕژێم بكات كە ئەوە تەنها، یەكێتیە نەك لایەنە كوردستانیەكانی تر، كە ئەتوانن جەماوەری كوردستان بۆ پشتگیری ڕێكەوتن لە گەڵ ئەواندا مسۆگەر بكەن.
ڕژێمیش سەرەڕای ئەوەی لە گەرمەی گفتوگۆدا بوو لە گەڵ یەكێتی بەڵام دەسبەرداری هیچیەك لە سیاسەت و كردەوەكانی جارانی نەبووبوو. لە كەركووك تەعریب بەردەوام بوو. لە زانكۆی سەلاحەددین ومووسڵ فشار لەسەر قوتابیان زیادی ئەكرد تا ببن بە جەیشی شەعبی و لە هاویناندا بەشداری بكەن لە سەنتەرەكانی ڕاهێنان لەسەر چەك.
بەشێكی زۆری قوتابیان بەشداریی ئەو خولی ڕاهێنانەیان ئەكرد بەڵام بەشێكیش لە كۆلیجەكانی زانكۆی سەلاحەددین و مووسڵ ئامادە نەبوون ببن بە جەیشی شەعبی. یەكێتیی خوێندكارانی كوردستان كە سەر بە یەكێتی بوو لە ناو خوێندكاراندا چالاكییان هەبوو. ئەوان بەوە خۆشباوەڕ بوون كە یەكێتی لە مفاوەزاتدایە و ترسیان نەبوو وبەو هۆیەوە زۆریان ئەو هەوڵەی ڕژێمیان بۆ ناردنیان بۆ ڕاهێنانی سەربازی ڕەتكردەوە. زۆربەی قوتابیانی سەر بە ڕەوتی چەپ و ماركسیش هەمان هەڵوێستیان هەبوو. یەكێتیی خوێندكاران وەفدێكیان پێكهێنابوو بۆ سەردانی سەركردایەتیی یەكێتی لە سورداش تا داوای پشتگیریان لێ بكەن و لای ڕژێم شەفاعەتیان بۆ بكەن كە نەڕۆن بۆ جەیشی شەعبی و لەوێ چاویان بە فەرەیدوون عبدالقادر كەوتبوو. ئەو بەناوی یەكێتیەوە پێی وتبوون باشتر وایە كە بڕۆن بۆ جەیشی شەعبی وسەرپێچی مەكەن. ئەوەش ئەوانی نائومێد كردبوو و هەڵوێستی ئەوانی لە بەرانبەر ڕێكخراوە چەپەكانی وەكوو كارگەراندا

لاوازکردبـوو کە چـالاکی سەرسـەخت و لایەنگـری بەرپەرچـدانەوەی ئەو سیاسـەتە و بەشـداری نەکـردن بـوون تیایـدا. وەفـدەکەی خوێندکاران وازیان نەهێنا و جارێکی تر ڕۆیشتنەوە بۆ سورداش و ویسـتبوویان خـودی جەلال تاڵەبـانی ببیـنن بەو ئومێـدەی کە ئەو پشتگیریان ئەکا و ڕەنگە ئەو هەڵوێستەی پیشووتری فەرەیدوون جێ پەسەندی ئەو نەبێت. کە مەسەلەکەیان لەگەڵ تاڵەبانیدا باسکردبوو کە فشاریان لەسەرە وگەر ئەوان فریایان نەکەون ڕەنگ بێ خوێندنیان لە کـیس بچـێ، جەلال تاڵەبـانی بە تـووڕەیی وتبـووی بـۆ تـا ئێسـتا نەڕۆیشـتوون بـۆ جەیشـی شـەعبی؟ ئەوانـیش ووتبوویـان نەخێـر و بەنیـاز نـین بـڕۆین و ئەی مفـاوەزات یـانی چـی و ئەو قسـانە. جەلال تاڵەبـانی وەکـوو پیشـەی هەمیشـەیی بـۆ ڕاییکردنـی خەڵـک زۆر بەسادەیی وتبووی: بابە ئێوە کەم شارەزان ئەوە کەشافەیە و ئێمەش لەزەمانی خۆیدا لە مەکتەب کردوومانە و گوێ مەدەنێ بڕۆن!!!!!
کێشەی ناو ڕیزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران تا ئەهات گەورەتر ئەبوو. دوای نەورۆز هێشـتا لە قەمچـووغە بـووم کە دەنگـۆی ئەوە بڵاوبـووەوە کە کـۆمیتەیەکی ڕێکخسـتنی یەکێتـی کە پێمـوابێ پێیـان ئەووت ڕێکخـراوی چـوار بارەگاکەیـان دێنـنە نـاو دێ. منـیش هەسـتم کـرد ئەوە بـۆ تەنگەبەرکـردنەوەی جموجـۆڵی ئێمەمانـان و چـاودێریی نزیکمانە. هێندەی پێنەچوو کە ڕێکخـراو بارەگایـان کـردەوە و گەرچـی هێشـتا نەمئەزانـی کە کـێ لێپرسـراویانە بەڵام نـزیکەی ٢٠ پێشـمەرگەیەکیان هەبـوو کە بەدێـیەکەدا بلاوبووبـوونەوە. ڕۆژێکـی کۆتـایی ئـازار بـوو کە پیشـمەرگەیەک هـات بـۆلام بـۆ مـاڵەوە و پـاش پرسیاری ناوم وتی کاک شیخ عەلی پێی خۆشە چاوی پێت بکەوێت و ئەڵێ حەزئەکەم لە ماڵی ئەو ببینیم. منیش وتم باشە پێی بڵێ تۆزێکی تـر دێـم بـۆلای. ماڵەکەیـان بیسـت مەتـر لەولامـانەوە بـوو. لە پێشـدا ڕۆیشـتم لە هیـوا زەنـدیم پرسـی ئەم پیـاوە کێـیە و ئێـوە هـیچ مەعلوومـاتێکتـان هەیە لە سـەری بەڵام هیـوا وتـی هـیچ نـازانین لە

بارەیەوە بەڵام مەعلوومە کە ئیتر هەراسانمان ئەکەن و هاتوونەتە ناو جەرگەی دێکەوە. پێموت کە جوابی بۆ من ناردووە و من ئێستا ئەچم چاوم پێی بکەوێت و دواتر ئاگادارتان ئەکەم و ڕۆیشتم بۆ لای شیخ عەلی. پاش سلاو خۆی پێ ناساندم وتی من بیستوومە تۆ کەسێکی چالاکی مارکسی و پێشتریش زیندانیی سیاسی بوویتە و زۆر خۆشحاڵم کە ببین بە هاوڕێ و ئەو ماوەیەی من لێرە لێپرسراوم هەرچی پێویستیەکت هەبوو یا هەر کەسێک دەستی هێنایە ڕێت ئەوە من لێرەم و ئاگادارم بکەرەوە و تۆ کارت پێی نەبێت. کە وای وت لام سەیر بوو و سەرەتا لاموابوو ئەمە داوێکی نوێیە وخەریکە ئینجا ئەم ڕێگا نەرمانە تاقی بکەنەوە. منیش وەکوو مجامەلە وتم وایە من کەسێکی مارکسیم و پێمخۆشە پەیوەندیەکی دۆستانەمان هەبێت. کە چاوم گێڕا بە ناو ژوورەکەیدا وینەیەک سەرنجی راکێشام کە لە خوارەوەی نووسرابوو: پاڵەوانی زیندان شەهید وەستا ئەنوەر. خۆم پێنەگیرا پرسیم: ئەوە وێنەی وەستا ئەنوەری هەڵەبجە نیە؟

- با، چۆن وەستا ئەنوەر ئەناسی؟
- یادی بەخێر لە هەیئەی ئیستیخباراتی کەرکووک تا حوکمی ئیعدام درا لەگەڵ ئێمە بوو.

شێخ عەلی پاش هەڵکێشانی ئاخێکی قووڵ وتی: من برای وەستا ئەنوەرم و منیش یەکسەر و بەزەردەخەنەیەکەوە ووتم کەواتە تۆ خولە کەشکۆڵی؟

- بەڵێ ئەوم.
- ئێستاش لە بیرمە لە کاتی ئەشکەنجەداندا هاواری ئەکرد: چی لە خولە کەشکۆڵ بکەم و ئەیویست کە لە بەرانبەر فشاری جەللادەکاندا وا نیشان بدا کە ئەو بەوە تاوانبار کراوە کە تەنها برای تۆیە و هیچی تر.

من پێشتر ناوی خوله کەشکۆڵم بیستبوو. ئەو یەکێک بوو لە پێشمەرگە و کادری مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە. پێش ئەوەیش لە نیوەی یەکەمی حەفتاکانەوە ئەندامی کۆمەلە بوو. لەکارەساتی هەکاریدا بەدەست چەکدارەکانی قیادە موەقەتە دەسگیر ئەکرێ و لە گەڵ ئازاد هەورامیدا لە زیندانی پارتی هەڵدێن. بە خۆشیم ووت کە نازناوی شێخ عەلیەکە لێی تێکدام، چونکە من تەنها ناوی ئەوم بە خولە کەشکۆڵ بیستبوو.

وەستا ئەنوەر لە زیندانی هەیئە بە پاڵەوانی زیندان ئەناسرا. دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر حوکمی ئیعدام درا وپایزی ساڵی ١٩٧٧ کە ئێمە لە ئەبوو غرێب بووین، لە زیندانی مووسڵ ئیعدام کرا.

پاشان شێخ عەلی زووخاو و دەردەدڵێکی زۆری هەڵڕشت لە دەست یەکێتی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و دیسانەوە پێداگریی کرد لەسەر درێژەدان بە هاوڕێتی و دۆستیمان. پێش ڕۆیشتن کتێبخانەکەی خۆی نیشاندام و وتی هەرچیت پیویست بوو ئەتوانی بیبەیت وهەروەها وتی من دەمانچەیەکی زیادەم لایە پێمخۆشە لات بێت و منیش چونکە نیازی مانەوەم نەبوو لە دەرەوە وتم کەی ویستم پێت ئەڵێم. هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە وتی: پێشمەرگەکانی لای من هەموو کوڕی چاکن و زۆریان دۆست و کەسی خۆمن، بەڵام چەند دانەیەکیان بۆ چاودێریی پەیوەندیەکانی من ناردووە و جگە لەوەش جێگرەکەم کەسێکە بەناوی شۆڕش حاجی کە هێشتا نەهاتووە و ئەو تا بڵێی کەسێکی ڕاستڕەو وئەنتی دیموکراتیکە و گەر ڕێگریەکی بۆخۆت یا ئەو کوڕە کەرکووکیانەی ناو دێ دروستکرد خۆم ئاگادار بکەنەوە و هەقتان نەبێت. ئەوم بە ئومێدی بینینی زیاتر و قسەوباسی تر جێهێشت و دوای نیوەڕۆ باسی دیدارەکەم لە گەڵ شێخ عەلیدا بۆ هیوا زەندی گێڕایەوە ئەویش زۆر بەوە دڵخۆش بوو بەڵام لاشی سەیر بوو.

تا ڕۆیشتنەوەم بۆ هەولێر پەیوەندیم لە گەڵ شێخ عەلیدا بەردەوام بوو. زۆری پێنەچوو ئەو بەپێی بڕوایەک کە بەمنی ئەکرد درکاندی کە

ئەو کەسێکی سەرکردایەتیی ڕێکخراوی ئاڵای شۆڕشە و بەردەوام نووسراوەکانی ئاڵای شۆڕشی ئەدا پێم و پرسیاری ڕای منی ئەکرد لە سەریان. منیش پاش خوێندنەوەی وردیان بەوپەڕی شەفافیەت و ڕاشکاویەوە بە پێی دیدگا و هەڵوێست و خوێندنەوەی ئەو کاتەم، سەرنجەکانی خۆم لە گەڵیدا باسکرد.

شێخ عەلی سەرباری ئەوەی پیاوێکی سیاسیی خاوەن باوەڕ بوو بەڵام نەزعەیەکی چریکی و عەسکەریی هەبوو. ئەو زۆر بەهەڵوێست و ڕاشکاو بوو لە بەرانبەر سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا. زۆر توونـد و ڕەق بوو لە سەر هەڵوێستی خۆی. خۆشەویستی و نفووزێکی فراوانی هەبوو و چ خۆی و چ کەس و کارەکەی قوربانیی زۆریان دابوو. جارێکیان لە سەر کێشەی خۆی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە، نەوشیروان مستەفا ئەنێرێ بەدوایدا کە بڕوات بۆ بەرگەڵوو کە ئەوکاتە سەرکردایەتیی یەکێتی و ناوەندیی کۆمەڵە بارەگایان لەوێ بوو. لەو سەردەمەدا بوو کە کێشەی ئەمان لەگەڵ ناوەندیی کۆمەڵەدا گەیشتبوو بە ئاستێکی زۆر بەرز. شێخ عەلی وەکوو تەحەددایەک، لەوەڵامدا بۆ داواکاریەکەی نەوشیروان مستەفا وتبووی، تۆ تا نیوەی ڕێگا وەرە و منیش دێم لەوێ ئەتبینم. ئەو هەموو کێشە و ئاڵوگۆڕەکانی ئاڵای شۆڕش و جموجۆڵەکانی خۆیان و چالاکیەکانیانی بۆم باس ئەکرد، ئەگەرچی بەڕۆشنی و بە وردی ڕەخنە و سەرنجەکانی منی بیستبوو. لە دوایین دانیشتنماندا پێش ئەوەی بڕۆمەوە بۆ ئیختیفا لە هەولێر کە هێشتا مفاوەزات بەبنبەست نەگەیشتبوو داوای لێکردم وەکوو میوان بەشداریی کۆنفرانسی ئاڵای شۆڕش بکەم لە قەرەداغ بەڵام ڕەتمکردەوە و وتم کە تۆ ئەتوانی ڕای من بگەیەنی گەر پێویستی کرد، چونکە هاوڕای جووڵە و هەڵوێست و سیاسەتی ئێوە نیم و وەکوو هاوڕێیەکیش دواترین قسەم لە گەڵیدا ئەوەبوو کە خۆشباوەڕ مەبن بە یەکێتی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و ئەوان لە کەمیندان بۆتان.

دواتـر شـێخ عەلـی لەگەڵ مەلا بەختیـار و پشـکۆ نەجمەدینـدا لەلایەن یەکێتیی نیشـتمانیەوە دەسـگیرکران و جگە لە ئەشـکەنجەدانێکی زۆر، سەرەتا حوکمی ئیعدامیان ئەدەن و پاشان لە زیندان قایمیـان ئەکەن و ئـالای شۆڕشـیش پەرتەوازە ئەبـن. بەداخەوە کـاک شـێخ عەلـی لەم ساڵانەی دواییدا ماڵ ئاوایی لە دونیاکرد.

یەکێـک لە پێشـمەرگەکانی هەمـان گرووپـی لای شـێخ عەلـی، حـاجی ئەنـوەر بـوو کە هەر زوو لەو کـاتەوە بـووین بەدۆسـتی نزیـک و دواتریش لەناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا پێش و دوای ڕاپەڕین و تا ئێسـتاش ئەو دۆسـتایەتیەمان مـاوە. حـاجی ئەنـوەر لە مفـاوەزاتەکەدا لەلایەن دەزگاکانی ڕژیمەوە گیرا و دوای مـاوەیەکی زۆر ئینجا ئـازاد کرا.

## گەڕانەوە بۆ هەولێر

هەرکە هـاتمەوە بـۆ هەولێـر، لە یەکەمـین پێنجشـەممەدا بەشـداریی کۆبـوونەوەی کۆمیتەکەی خۆمـانم کـرد. زۆر مەسـەلە هـاتبوونە پـیش لەوانە مفـاوەزاتی یەکێتـی وناڕەزایەتیەکـانی سـلێمانی و جموجـۆڵی نـاڕەزایەتی و سیاسـیی ڕیزەکـانی قوتابیـانی زانکۆکـان و چەنـدین مەسەلەی ڕێکخراوەیی لەو یەکەمین کۆبوونەوەیەدا باسکران. نەجاتی لێپرسـراوی کۆمیتەکەمـان تـازە لە کۆبـوونەوەی کـۆمیتەکەی خـۆی هاتبۆوە ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی بە زارەکی لەسـەر ناڕەزایەتیەکانی سـلێمانی باسـکرد. ڕێکخـراوی ئـێمە بەشـداریی چالاکـانەی لەو خۆپیشـاندانانەی سـلێمانیدا کردبـوو. نەجـات خۆشـی ئەو مـاوەیە ڕاستەوخۆ لەو ناڕەزایەتیانەدا بەشدار بووبوو. ئەو ڕۆڵەی کارگەران خاڵێکی پۆزەتیڤ ونیشاندەری ئاراستەیەکی سیاسیی دروست بوو بۆ بەشداری لە نـاڕەزایەتیە جەماوەریەکانـدا، گەرچـی لەسـەرەتادا ڕۆڵـی کەمـیش بێـت. مـن خـۆم پێموابـوو ئەوە سـەرەتایەکی باشـە بـۆ ڕووتێکردنی ڕێکخراوی ئێمە بۆ نـاو ململانێ جاریەکانی نـاو کۆمەڵ. بەڵام دیـار بـوو کە ئەم سیاسـەتە بەشـێک نەبـوو لە خوێنـدنەوەیەکی گشـتی بـۆ سـەرجەم بـارودۆخی کوردسـتان و ململانێ سیاسـیەکان تیایدا، بەتایبەتی بە پەیوەند بە پێشـهاتەکانی قۆنـاغی دوای مفـاوەزاتی ڕژێم و یەکێتی. بەشداریی بەرچاوی ڕێکخراوی کارگەران هێندەی تـر ئـێمەی خسـتە بەرانـبەر یەکێتـی وئیتـر ئەوان ڕێکخـراوی ئێمەیـان بە نەیارێکی سەرسەختی خۆیان ئەزانی. ئەبی لێرەدا چەند ڕاسـتی هەیە بیڵێم:

**یەکەم:** نفوز و هێزی ڕێکخراوی کارگەران تا ئەهات زیادی ئەکرد. کارگەران چەندە ئەندام و کادری هەبوو چەند بەرامبەر بەوە دۆست و لایەنگری بەتایبەتی لەناو توێژی خوێندەوار وقوتابیانی زانکۆدا هەبوون کە دڵی زیندووی بزووتنەوەی ناڕەزایەتیی ئەو قۆناغە بوون.

**دووەم:** ئیتر کۆمەڵەی ڕەنجدەران لەوە دەرچووبوون کە وەکوو هێزێکی چەپ و مارکسی چاویان لێ بکرێت. یەکێتیی نیشتیمانی و هاوپەیمانیی نەوشیروان – تاڵەبانی و ڕەوتی ڕاسترەوی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و زۆر فاکتەری بابەتیی تر، ڕۆژ بەڕۆژ کۆمەڵەیان ئەگۆڕی بەهێزێکی نەتەوەیی دژە دیموکراسی. ئێمە ئیتر وەکوو سالانی دوای ۱۹۷۵ پێویستمان بە ماندووبوونێکی زۆر نەبوو بۆ ناساندنی سروشتی چینایەتی و فکری و سیاسیی کۆمەڵە. بەکورتی ئیتر کۆمەڵە مونافیسی ئێمە نەبوو وەکوو ڕێکخراوێکی مارکسی بەڵکوو وەکوو پاشکۆیەکی یەکێتی و خەتی تاڵەبانی دەرکەوتبوو.

**سێیەم:** ڕێکخراوی چەپی تری وەکوو کار وبەرزە، بە پێچەوانەی کارگەرانەوە، ئەو نفووزەیان نەمابوو و بەرەو پاشەکشە ئەڕۆیشتن. بەوپێیە کارگەران زیاتر دەبوو بە جێی ئومێدی هەر کەسێک کە مارکسیزمی بە بیروباوەڕی فکری و سیاسیی خۆی بزانیایە لە کوردستاندا.

**چوارەم:** هەرچی ئاڵای شورشە ئەوە کەمتر وەکوو هێزێکی مارکسی دەناسراو وپێمانوابوو ئەوان باڵی چەپی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و ڕێکخراوێکی چەپی قەومین. ئاڵای شۆڕش بە ئاشکرا ئەیووت کە تەنها مارکسیزمە کە بتوانێت چاری مەسەلەی نەتەوایەتیی کورد بکات و ئەوە ناوەڕۆکی جیهانبینیی فکریی ئەوان بوو کە ئێمە دەمێک بوو ئەو دیدگایانەمان نەک هەر تەڵاق دابوو بگرە دوایین فیشەکی بەزەییشمان پێوەنابوو (رصاصة الرحمة). ئێمە و هەموو چاودێرێکی سیاسیش دەرکمان بەوەکردبوو کە ئەم ڕێکخراوە و چارەنووسی

بەستراوەتەوە بە کێشمەکێشەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی و سەرەنجام ئەوە یەکێتیە کە چارەنووسی کۆمەڵە دیاری ئەکا و ئالای شۆڕش شانسێکی زۆر و تەمەنێکی درێژی نابێ وناشبێ بە ڕەقیبی مارکسی بۆ ڕیکخراوی ئێمە.

بەهەرحاڵ لە ئێستادا قوتب بەندی و قڵشتی نێوان ئێمە و کۆمەڵە و ئەو جۆرە ڕەوتانە بەتەواوی بڕاوەتەوە و ئێمە خەریکین ڕووئەکەینە شوێن و ئاراستەیەک کە جگە لەوەی خاڵی پۆزەتیڤی ئەوەیە کە هێچ پردێکی هاوبەشی لەگەڵ جیهانبینیی چەپی قەومیی کوردستانی وئەو جۆرە دەرکەدا نەهێشتۆتەوە، بەڵام تادێت ڕادیکالیزمێکی بێ ناوەڕۆک لە ڕیزەکانیدا ڕەواج پەیدا ئەکا و نازانین سەرەنجام ئەو ڕادیکالیزمە تیۆری و فکریە چیمان بەسەر دێنێت و لە کوێدا ئەگیرسێینەوە بەڵام ئەوە دیاربوو کە بەو ئەندازەیەی کە لەو ڕووانەوە رادیکال ئەبینەوە بەهەمان ئەندازە پێمان ئەبڕێت لە کۆمەڵگا و کێشە و کارلێکە زۆر وزەبەندەکانی.

لە درێژەی کۆبوونەوەکەدا قسە وباسی زۆر سەبارەت بە مفاوەزات و لایەنە جوراوجۆرەکانی کرا و پێداگیری لەسەرئەوەکرا کە ڕێکەوتنی یەکێتی و ڕژێم سەرەتایەکی خراپ و ترسناکە لەسەر بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵک. لە ئەگەری ڕێکەوتنی ئەم دوو لایەنەدا، داهاتوو و چالاکی و خەباتی بزووتنەوەی چەپ و ڕێکخراوی ئێمەش ڕووبەڕووی کێشە و مەترسیی گەورە ئەبێتەوە. هەر لەپەراوێزی ئەم بەشە لە باسی کۆبوونەوەکەدا قسە لەوە کرا کە گوایە یەکێتی لەگەڵ ڕژێمدا لەسەر زۆربەی خاڵەکانی مفاوەزات کۆکن و لەو چوارچێوەیەشدا کۆمەڵێک لیژنەی هاوبەشیان پێکهێناوە و یەکێکیان لیژنەی هاوئاهەنگیی ئەمنیە و بەنیازن لیستێکی تەواو ئامادە بکەن لەناوی ئەو ڕێکخراو و کەسانەی کە بە نهێنی لە شارەکانی کوردستاندا چالاکی ڕێکخراوەیی ئەکەن و بەدیاریکراویش باسی ڕێکخراوی کارگەران کراوە. تەئکید لەوە کرا کە لە دوایین

کۆبوونەوەی وەفدی هەردوولادا لە سووورداش، بڕیاری پێویست لەوبارەوە دراوە وسەرچاوەی ئەو هەواڵەش کەسانێکی دۆستی خۆمانن لەناو یەکێتیدا.

بەشیکی زۆری ڕابەری و کادر و ئەندامانی ئێمە لای یەکێتی وەکوو کەسایەتیی چالاکی مارکسی ناسرابوون. خۆشمان گەر هاشامان لە ناسنامەی ڕێکخراوەییشمان بکردایە، بەڵام لە پرۆسەیەکی درێژی خەبات لە پەنای یەکدا چ لە شارەکان وچ لە زیندان و چی لە دەرەوە، سەرکردایەتی و کادرەکانی کۆمەڵە ئێمەیان وەکوو کەسانی چالاکی مارکسی ئەناسی. ڕێکەوتنی یەکێتی و ڕژێم بەو هەموو ئیمکانات و دەسەڵاتەوە، ڕێکەوتنێک کە ئەستەم نەبوو و بووبوو بە ئەگەری ئەمڕۆ و سبەی، دژواری و مەترسیی زۆری ڕووبەڕووی ئێمە ئەکردەوە. ڕابەریی ڕێکخراو نە تەعمیمێک لەو بارەوە، نە هۆشداری و ئیحتیاتاتێک ونە چێککردنێکی ڕیزەکانی ڕێکخستن و نە هیچ باس و ئیجرائێکی لەوبارەوە کرد. ئەبوایە هەر کەس و کۆمەڵە بە پێی دەرک و سەلیقە و لێکدانەوەی خۆی هەنگاوی پیویست لەوبارەوە بنێت. ئێمە کە ماڵەکەمان کەوتبووە بەرچاوی یەکێتی و شوێنەکەمانیان پێزانیبوو بڕیاری خۆمان دا کە چیتر گونجاو نیە لێرە بمێنینەوە جا گفتوگۆی یەکێتی و حکوومەت سەر بگرێت یا نا. ئێمە ئەمان زانی کە هەر کەمتەرخەمی و خۆشباوەڕیەک، گەرچی بچووکیش بێت، بۆی هەیە زۆر گران لە سەرمان بکەوێت بۆیە ئیحتیات باشترین چارەیە بەتایبەتی یەکێتیش بەهۆی منەوە شوێنەکەیان پێزانیبوو. ئاخر نزیکەی ساڵێکیش دەبوو کە لەو ماڵەدا بووین و کردبوومان بە (هەیئەی ئەرکانی) کۆمیتەکەمان ومانەوەی لەوە زیاتر ڕیسک بوو.

پێش گوێزانەوە لەم خانووە و لە کۆتایی مانگی نیساندا نەجات سەفەرێکی سلێمانیی کرد ولەهاتنەوەیدا نزیکەی ٢٠٠ دانە لە بەیانێکی ڕێکخراوی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو سەبارەت بە ١ ی ئایار. بەیانەکە بەنەفەسێکی چەپی و ڕۆشنفکری نووسرا بوو وەکوو شیکردنەوەی

ئەزمەی سەرمایەداری و ناکۆکیەکانی ئەو نیزامە وشتی لەوجۆرە. بەناچار ڕۆژی دواتر هەر دووکمان بڕیارمان دا هەر خۆمان بەشەو بە مالاندا بلاوی بکەینەوە. بۆ شەوەکەی لە گەڕەکی تەیراواوە دەستمان پێکرد. هەوا فێنکی کردبوو و ئێمەش دەوری سەعات ٩ ی شەو دەستمان کرد بە بڵاوکردنەوەی. ئەو مالانەی دیواری خانووەکانیان نزم بوو هەر لە دیوارەکەوە ئەمانخستە حەوشەوە و گەر بەرز بوایە لە سووچی خوار دەرگاکەوە ئەمانکردە ژوورەوە. دانەیەکمان لە دیوارەوە خستە حەوشێکەوە و ئەوەندەمان زانی بوو بەدەنگە دەنگ ئیتر نەمانزانی ئایا لەودیوی دیوارەکەوە بە دیوی حەوشەکەیاندا دانیشتوون یا ئیشێکیان هەیە لەوێدا. ئێمەش بەدوای دەنگەدەنگ و مقۆمقۆی ماڵەکەدا ڕامانکرد و لەو ناوە نەماین. ماوەیەک دوورکەوتینەوە دیسانەوە بە وریاییەوە دەستمان کردەوە بە بڵاوکردنەوەی بەیانەکان و تۆزێکی تر گەیشتینە لای ماڵێک کە پێ ئەچوو ماڵە موستەشار یا چەکداری ڕژێم بێت چونکە حەرەسی چەکداریان لەبەر ماڵەکە ڕاگرتبوو ئێمەش بە بێدەنگی بە بەردەمیاندا تێپەڕین. بەشێکی بەیانەکان مابوون و نەجات وتی با لەوە زیاتر لەم ناوە نەمێنین نەوەک هەواڵ بدرێ بە ئەمن و بێن ناوچەکە بگەڕێن. تەکسیەکمان گرت و دوور لەماڵی خۆمان دابەزین و گەڕاینەوە ماڵەوە بۆ نووستن و سەعاتمان خستە سەر زەنگ بۆ چواری بەیانی و ڕۆیشتین لە گەڕەکەکانی نزیک نەقلیاتی گەورەی شار ئەوەی مابوو بڵاومان کردەوە. بەرەبەرە ڕۆژهەڵئەهات و پێش ئەوەی بڕۆینە ماڵەوە لە مەتعەمێکی ناو بازاڕ نیسکێنەیەکمان خوارد و گەڕاینەوە. دوای خەوێکی باش کە نیوەڕۆ هەڵساین ودوای خوێندنەوەی سەرلەنوێی بەیانەکە وتم نەجات مەگەر بڕۆین ماڵ بە ماڵ پیایدا بێینەوە و بۆیان شەرح بکەین ئەو خەڵکە داماوە چۆن لەم بەیانە ئالۆزە تێئەگەن!!!

وەستا جەلال خانوویەکی بۆمان دۆزیەوە و لە بەلاشاوا گوێزامانەوە. پاشـــان لەوێ نەمـــاین و هەر لەو گەڕەکەی خۆیـــان (حـــی صـــدام) خـانوویەکی کرێـی گونجـاوتری سـەربەخۆی بۆمـان پەیـداکرد. ئیسـتا ماڵمـان گـوێزاوەتەوە و نیگەرانیی ئەمنیمـان کەمترە. ڕۆژێکـی کۆتـایی پـــایزی ١٩٨٤ نەجـــات لە دەرەوە ومـــن بەتەنهـــا لە مـــاڵەوەبووم. عەسـرێکی درەنـگ بـوو تـازە هیتەرێکـی کارەبـایی کۆنمـان کڕیبـوو خەریــک بــوو خەو ئەیبــردمەوە و هەر لەســـەر فەرشـــێکی ژووری نووستنەکە لە نزیک هیتەرەکە نووستم. کێبڵی هیتەرەکە گۆڕابوو و لە ناکـــاو لەبەر دووکەڵ و ئـــاگر لەخەو ڕاچڵەکـــیم و لەبەر چـــڕی دووکەڵەکە هەناسەم تەنگ بووبوو. تومەز کێبڵی هیتەرەکە زۆر گەرم بووبـوو و فەرشـەکە و هەنـدێ دۆشـەکەڵەی سـووتاندبوو و منـیش لەبەر خەوقورسی خەبەرم نەبوبۆوە. بەپەلە هیتەرەکەم کوژاندەوە و نەموێرا دەرگا و پەنجەرە هەمووی بکەمەوە تا سەرنجی دراوسێکان رانەکێشم. ماوەی چەند ڕۆژ ئێمە شوێنی ڕەشایی دووکەڵی ماڵمان پاک ئەکردەوە و جگە لەوەش ناو قورگم پربووبوو لە دوکەڵ.

زۆر لەم خـانووەش نەمـاینەوە و دیسـانەوە بە هـۆی وەسـتا جەلالەوە خـانوویەکی نـوێ تـر و مـودرین ترمـان بەکـرێ گـرت. ئەمیشـیان لە هەمـان گەڕەک و لە مـاڵی وەسـتاوە زۆر دوور نەبـوو. ئەم خـانووە دوو ژووری نووسـتن و هۆڵێـک و گەراجێکـی پێشـەوە و مەتـبەخ و حەمامێکی تیا بوو.

هەر زوو لێرەش یەکەمین شت جێسازیی و شاردنەوەی نووسـراوە و کتێب و هەندێ هەویەی تەزویر وکۆنی خۆمـان کـرد کە هێشـتا لامـان مـــابوون. یەکێکیـــان هەویەی بەشـــە ناوخۆییەکـــانی کـــۆلێجی یاســـای زانکۆی بەغدای من بوو کە وێنەی خۆمیشی پێوە بوو. لێرەش وەکوو جاران کۆبوونەوەکانمان دەستپێکردەوە و دیسانەوە ئێوارەی رۆژانـی پێنجشـەممە مـان دانـابوو بـۆ کۆبـوونەوەی کـۆمیتەکە. ئەم گەڕەکەش زۆر شەعبی بوو و ئێمەش تەنها و سەڵت بووین و ئەوەش دەبوو بە

مـایەی سـەرنجی دراوسـێکان بەتـایبەتی لە گەڕەکێکـی زەحمەتکـێش نشـینی وەکـوو (حـی صـدام)دا کە زۆربەی لە لادێـوە هـاتبوون و ڕانەهـاتبوون بە وەی کە زگـورتیی بـێ خێـزان و مـاڵ و منـداڵ ببیـنن پێکەوە بژین. جگە لەوەش یەک پانتۆڵ لەپێت لە گەڕەکەکەدا چاوپێ نەئەکەوت وکۆڵانەکەیش تەسک بوو. لانی کەم لە بەلاشاوا خانووەکە بە مـاڵی عەلـی ناسـرابوو و بـوونی شـێروانی بـرای و نەنکـی سەرپۆشـێکی کـۆمەڵایەتی و ئەمنیـی بـاش بـوون بـۆ ئـێمە و لێـرە ئەوەشمان نیە. زۆری پێ نەچوو نەجات وتی: کە هاوڕێیەکی تر دێتە ماڵەکە و لە ژوورێکدا ئەژی کە نەئەبـێ تـۆ ئەو ببینـی نە ئەویـش تـۆ ببینێت. جـا وتـم: لەم خـانووە بچـووکەدا کە جێـی مـانەوەی شـەو و ڕۆژمانە ئەوە چۆن تەرتیب ئەبێت و هەر بەریەک ئەکەوین و چاومان ئەتەقێت بەیەکدا. ئەو وتـی: تۆ هەقـی ئەو کێشـانەت نەبێ و ئەوانە لە ئەستۆی من و ئەو هاوڕێیە هەمیشە لە ژوورەکەی ئەبێت و گەر بیتە دەرەوە لە پێشـدا مـن ئاگـادار ئەکـات و تـا ئەو کـاری ئاودەسـت یـا حەمـام تەواو ئەکـات تـۆ مەیەرە دەرەوە. ئەمزانـی ئەم تـرەکەڵەکە بـۆ کۆمەڵێک کەس کە هەموویان داواکراوی دەزگاکانی سەرکوتی ڕژێمن و بەدوایانـدا ئەگەڕێـن و لە گەڕەکێکـی وا و لە بـارودۆخێکی زۆر نالەبـاری وادا وبـۆ کەسـانێک کە هیچیـان خەڵکـی ئێـرە نـین و شوێنەکەش مەقەڕی کۆبوونەوەی تر بێت، بە سـەلامەتی ناچێتەسـەر. هەرچەنـدم کـرد نەجـات بیانووەکـانمی ئەبـڕی و بەناچـاری تەسـلیم بووم.

نـوری کەریـم نەقـڵ کرابـوو بـۆ تکریـت و لەوێـوە بـۆ کۆبـوونەوە ئەهـاتەوە بـۆ لای ئـێمە. ئەو بەڕێـوەبەری دائیـرەکەی خۆیـان بـوو وشوققەیەکی تازەیان دابوو پێی بۆ مانەوەی خۆی. جارێکیان دوای کۆبـوونەوە وتـی: بـۆ نـایەی بـڕۆین بـۆ تکریـت. ئەو سـەیارەیەکی دائیـرەی پێبـوو وپـێکەوە ڕۆیشـتین بـۆ تکریـت. نـوری بەیـانی زوو ئەڕۆیشت بۆ دەوام و منیش لە ماڵەوە ئەمامەوە و چونکە شارەزای

شــارەکە نەبــووم نەمئەوێــرا بە هەویەی تەزویــرەوە بــڕۆمە دەرەوە. ڕۆژی دواتر نوری لە دەوام هاتەوە وتی: من بەیانی ئەڕۆم بۆ بەغدا و هەمــوو بەڕێوەبەرەکــان کۆبوونەوەمــان هەیە لەگەڵ وەزیــردا گەر پێتخۆشــە تــۆش ئەتــوانی بێیــت، چــونکە لەوە باشــترە بەتەنهــا لێــرە بمێنیتەوە. ڕۆژی دواتـر سـایەقەکەی نـوری کە نـاوی سـالار و خەڵکی هەولێـر بـوو دەوروبەری پێنجی بەیـانی لەگەڵ دوو فەرمـانبەری تـری دائیرەکەیانـدا هــاتن بەشــوێنماندا و بــۆ بەغــدا بەڕێکەوتــین و چــونکە نوری بەڕێوەبەر بوو لە پێشەوە دانیشت و من لەگەڵ دوو کەسـەکەی تر لە دواوە. من خۆم حەزم لە گۆرانی فەیرووز بـوو و کـاک سـالاری ســایەقیش پــاش مــاوەیەک کە هەمــوو خەو ئەیبــردینەوە کاســیتی گۆرانیی (اعطني الناي و غني)ی فەیروزی خستبووە سەر. لەو بەیانیە و لەو جێـــیەدا بەتەواوی کەوتبـــوومە نـــاو فەزای ڕۆمانســـیەتی گۆرانیەکەوە و تـا ئێسـتاش کە گوێم لەو گۆرانیە ئەبێت ئەو شـەوەی سەفەری ڕێگای تکریت – بەغدام دێتەوە یاد.

ئەم سـەفەرە بـۆ مـن زۆر بـاش بـوو، چـونکە نـزیکەی دوو سـاڵ بـوو بەغـــدام نەبینیبـــوو. لەوێ ئەو دوو فەرمـــانبەرە و ســـالار لە ئـــێمە جیـابوونەوە و مـن و نـوری لە ئـوتێلی زەیتـوونەی خـوار گـازینۆی (الکندي) دابەزیـن. کە نـوری ڕۆیشـت بـۆ کۆبـوونەوەکە مـن فرسـەتم بینــی وگەڕانێکــی باشــی ســەعدوون و تەحریــر و ئەو نــاوانەم کــرد. ڕۆژی دواتر گەڕاینەوە بۆ تکریت و لەوێشەوە بۆ هەولێر.

لە خـانووە تازەکەمـان مـن کلیلێکـی خـۆم هەبـوو بـۆ دەرگـای دەرەوە، بەڵام کە بهاتمـایەتەوە ئەبـوایە سـێ جـار لە دەرگـا بـدەم تـا (تۆفیـق)ی تـازە ماڵنشـینمان بـڕواتە ژوورەکەی خـۆی و دەرگـا لەخـۆی دابخـات. ئەڵـبەتە مـن ئێسـتا ئەزانـم کە ئەو هـاوڕێیە نـاوی (توفیـق نعمـة) بـووە وئەو کاتە بەناوێکی تر ناومان ئەهێنا کە ئێستا لە یادم نەماوە. کە مـن لەمـاڵ نەبوومـایە ئەو ئـازادتر بـوو بـۆ هـاتنەدەرەوە لە ژوورەکەی یـا

دانیشتن لەگەڵ نەجاتدا، بەڵام کە من ئەهاتمەوە ئەبووم بە هۆکاری زیندانیکردنی ئەو لە ژوورەکەی خۆیدا.
من قەمسەڵەیەکی چەرمم هەبوو کە تۆزێکی لە خانووەکەی پێشوومان لە دواوە سووتابوو. ئێوارەیەکی ڕۆیشتمە دەرەوە و پیمەوابێ لەگەڵ ئەیادی هاوڕێمدا لای بازاڕی باتا پیاسەمان ئەکرد. ئێواران ئەو جادەیە زۆر زۆر قەرەباڵغ بوو و زۆر بەزەحمەت ڕێگە بەرئەکەوت لەبەر قەرەباڵغیەکە وتەنانەت جاری وابوو خەڵک لە ڕۆیشتندا بەریەک ئەکەوتن یا ڕائەوەستان تا جووڵە ئەکەوتەوە ڕێگەکە. ڕێک لەبەردەمی خۆمدا قەمسەڵە سووتاوەکەی خۆمم لەبەر کەسێکدا بینی کە لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بۆ ماوەیەکی زۆر لە پێش ئێمەوە بەدەم ڕۆیشتنەوە قسەیان ئەکرد و زانیم کە ئەوە ئەو کوڕەیە کە لە ژوورەکەی تردایە. بۆ ئێوارە ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە و بەنەجاتم گوت: ئەو هاوڕێیە لەودیوەوە؟ و ئەویش وتی ئا بۆ؟ وتم: ئەمڕۆ لە بازاڕ بینیم، و نەجات هەڵچوو وتی: چۆن ئەی ئێمە بڕیارمان نەبووە کە یەک نەبینن؟ وتم حاڵ و مەسەلە ئاوا و حەکایەتی پیاسەی ئەو ڕۆژەم بۆی گێڕایەوە و وتی: ڕاست ئەکەیت قەمسەڵەکەی تۆی لەبەرکردبوو!!
پێموابێ بەهاری ١٩٨٥ بوو کە نووسراوەی (یەکێتی: ناسیونال ڕیفۆرمیست و پرۆسەی بنبەست بوون) گەر ناوەکەیم بەهەڵە نەنووسیبێت، لەلایەن ناوەندیی کارگەرانەوە سەبارەت بە مفاوەزات و یەکێتی نیشتیمانی بڵاوکرایەوە. نووسراوەکەمان چەند جار خوێندەوە. چ سەبارەت بەو نامیلکەیە و چ هاوزەمانیش لە گەڵ دەرکردنیدا مقۆمقۆی جیاوازی و کێشەی ناوخۆیی کەوتە ناو کارگەرانەوە. من بۆ خۆم کە سەرقاڵی چالاکیی ڕۆتینی خۆم بووم لە هەولێر و بەوهۆیەوە دوور بووم لە سلێمانی و دەمێکیش بوو چاوم نەکەوتبوو بەجەبار مستەفا، تەنها پەیوەندییم لەگەڵ فەزای ڕێکخراودا، ئۆرگانەکەی خۆم بوو. تا ئەوکاتەش هیچ هەواڵ و قسەوباسێکم

نەبیستبوو لەم ئۆرگانەدا سەبارەت بە بوونی بیروڕای جیاواز و بەتایبەتیش کە گەیشتبێ بە ئاستی جیاوازی. نەجاتیش گەر زانیبێتی هیچی لەوبارەوە لای من نەدرکاندبوو. بەڵام ئەمزانی کە نەجات لە سەفەرەکانی بۆ کۆبوونەوە لە سلێمانی چاوی بەجەبار ئەکەوێت. ئیتر ئەو ماوەیە بەرەبەرە سەرنج و ڕەخنە و پیاچوونەوە بە سیاسەت و ژیانی ڕێکخراوەییدا زیادی ئەکرد. لە ڕاستیشدا کارگەران کەوتبووە سەر دووڕیانێک و ئیتر دەبوایە ئەو ڕێکخراوە لە نێوان ئەو ژیانە تەسک و داخراوە مەحفەلی و باس و جەدەلە بیزەنتیانە و گۆڕان بەرەو بوون بە ڕێکخراوێکی سیاسیی چالاکی ناو کۆمەڵ و دەرگیر لە کێشمەکێش و ململانێ زۆرەکان، یەکیان هەڵبژێرێت. هەڵبژاردەی یەکەم تەمەنی بەسەرچووبوو و ئیتر خێری تەواو بووبوو و قۆناغی خۆی بە قنگەشەڕیش بێت تەواو کردبوو. لەولاشەوە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران کە بووبوو بە مۆدێلێکی سەرسامهێنەر بۆ ئێمە، هیچ نەبێ لە ئۆردووگا و ژیانی ڕێکخراوەیی و سیاسیی دەرەوەیدا، بووبوو بەنموونەیەکی سەرکەوتوو ولە پێشڕەویدا بوو. زۆربوونی نفووزی ڕێکخراوەیی و مانەوەی کارگەرانیش وەکوو تەنها ڕێکخراوی کۆمۆنیستی لە گوڕەپانی سیاسیی کوردستانی عێراقدا، چاوەڕوانیی لە کارگەران زیاتر کردبوو. ئیتر بە ڕوونی ئێمە بووبووین بە نوێنەری تاقانەی ڕەوتی مارکسیزم و چەپی مارکسی لە بەرانبەر دەرزەنێک ڕێکخراوەی قەومیی کوردستانی و ڕیفۆرمیستیی وەکو حیزبی شیوعیدا. بەڵام ئەوە وێنەی دەرەوە بوو سەبارەت بە ڕێکخراوی کارگەران وەهەر کە سەرت دەکرد بە ناوخۆی ئەم ڕێکخراوەدا شتێکی ترت ئەبینی کە زۆر لە خوار ئەو چاوەڕوانی و ڕوالەتە فۆرماڵیەوە بوو.

بەوجۆرە ئیتر مەعلووم بوو کە (یەکێتیی تێکۆشانی کارگەران) لە قەیران و بنبەستێکی قووڵدایە و ئەزمەکەی هاتۆتە سەرشانۆ. نووسراوەی ناوبراو تەنیا بزمارێک بوو لە تابووتی لەشی لە گیان

کەوتـووی کـارگەران درا و بیـانوو و بـۆنەیەک بـوو بـۆ تەقیـنەوەی دوومەڵی قەیرانی بنبەستبوونی کارگەران و هیچی تر. هـیچ عەقڵێکی سـەلیم ئەوە ناچێـت بە مێشـکیدا کە نووسـراوێک بەبـێ پێشــەکی و پاشەکی ببێت بە هۆی چەند لەتبوون و بنبەستی ڕێکخراوێک گەر ئەو ڕێکخـراوە خـاوەنی داینـامیزم و کـاراکتەری ڕاسـتەقینەی ڕێکخـراوی سیاسـی بێـت و تـا تەوقـی سـەری غەرقـی دونیـای مەحفەلیـزم و سوونەتی گرووپچێتی نەبێت.

نوری کەریم کە تا ئەو کاتەش ئەندامی کۆمیتەکە بوو نەقڵ کرابوو بە بەڕێـوەبەری فەرمانگەیـەکی هاوچەشـن، بەڵام ئەمجـارە لە دهـۆک. مـانگی ئـابی ١٩٨٥ بـوو کە دوای تەواوبـوونی کۆبوونەوەیەکمـان لە گەڕانەوەیدا وتی: بۆ نایەیت بۆ لای من، و پێکەوە بۆ دوورکەوتنەوە لە جەوی ڕەتیبی کونجی ماڵ چەند ڕۆژێک لای مامەوە و دووشـەممە یا سێشەممە بوو بڕیارمدا بگەڕیمەوە بۆ هەولێر ونەوەستام تـا ڕۆژی پێنجشـەممە لەگەڵ نوریـدا بگەڕێینەوە. لە نەقڵیـاتی هەولێـرەوە دوای گـۆڕینی دوو پـاس گەیشـتمەوە گەڕەکـی (حـی صـدام) کە سـەعات دەوری دووی ڕۆژێکـی گەرمـی مـانگی ئـاب بـوو. ئەمزانـی نەجـات لە سلێمانیە و تەنها ئەو هاوڕێیەی تر لە ماڵەوەیە و بیرم لەوە ئەکردەوە کە ئێسـتا ئەچمە بەر دووشـی حەمـامەکە وئینجـا خەوێکـی باشـی بـۆ ئەکەم. خانووەکەمـان لە کۆلانێکـدا بـوو کە دوور نەبـوو لە جـادەی سەرەکیی گەڕەکەکە. کە لە پاسەکە دابەزیم لەو خەیاڵاتەدا بووم خۆم کرد بە دووکانی سەرسووچی کۆڵانەکەماندا کە هەمووی ٥٠ مەترێک لە ماڵەکەمـانەوە دووربـوو. سـێ پاکەت جگەرەی سۆمەرم کـڕی بـۆ ئەوەی تـا پێنجشـەممە کە ڕۆژی کۆبوونەوەمـان بـوو نەیەمە دەرەوە. پـارەی جگەرەکـانم دا و ویسـتم بـڕۆم منـاڵێکی دەوری ١٠ سـاڵانم لـێ پەیدابوو و دوای تێڕوانینێک وتی: خارە خارە نەڕۆی لۆ مارێ هەمـوو برادەرەکانت گیراینە نەڕۆی نەڕۆی! منیش بەتەواوی دڵـم داخورپـا و سـەیرێکی دەوروبەری خـۆم کـرد و دڵنیـا بـووم کە قەومـاوە و ئەوە

ڕۆژەکەیە کە لێی ئەترسـام. وتـم: بـابە مـن خـەڵکی ئەم گەڕەکە نیم و مـاڵی خوشـکم لەولایەیە، و دەسـتم بـۆ لای ڕاسـتی مـالەکەی خۆمـان ڕاکێشـا و وتـم، بـۆ مـاڵی ئەوان ئەڕۆم. منـاڵی تـایین کە لیی مەعلـووم بوو کە وانیە لێم نەئەبووەوە و زۆر بە شڵەژاوی و ترسـەوە دووپاتی کردەوە: نەڕۆی .. نەڕۆی مامە بەخوا هەموویان گیران ولەمارەکە لۆ تـۆ دانیشـتوون! ئەوەنـدەم پێکـرا بـۆ ئەوەی لەوە زیـاتر لەونـاوە بەنـد نەبـم خـۆم تـووڕە کـرد وتـم: دەبـڕۆ واز بێـنە لـێم و یەکســەر خێـرا پاشەوپاش گەڕامەوە بۆ جادە سەرەکیەکە و تەکسیەکم گرت بـۆ مـاڵی ئەیاد و لەویَ ئەوم لە خەو هەڵسان. لە ڕێگە بیـرم لەوە ئەکردەوە کە ئەو منداڵە چۆن بوو بەفریادڕەس و بەم گەرمایە چۆن بۆ بەختـی مـن هــاتبووە دەرەوە و ئەو ســودفە بچــووکە گیــانی منــی لە مەرگێکــی مسۆگەر ڕزگارکرد. ئەیادم تێگەیاند کە کێشـەیەکی ئەمنیی گەورەمـان تــووش بــووە و ئەبــێ بەپەلە بــگەمە سـلێمانی. بەســەیارەکەی مــاڵی بـاوکی ئەیـاد ڕۆیشـتین بـۆ نزیکـی سـەیتەرەکەی نزیـک خەسـتەخانەی صــدام. لە دوورەوە ڕوانیمــان کە ســەیارەکان تەفتــیش نــاکەن و لە دوورەوە تەماشــــــایەکیان ئەکەن و ئیزنیــــــان ئەدەن. گەڕایــــــنەوە ســەیارەکەی ئەوانمــان بــردەوە بــۆ مــاڵ و لە نەقلیــاتی هەولێــرەوە سواری سەیارەیەکی نەفەراتی ٢١ کەسی بووین. تەگبیرمـان کـرد مـن بـۆ ئەوەی پشـتم لە دەرگـای پاسـەکە بێت لە کورسـیی ناوەڕاسـت لە دیوی دوای شۆفێرەکە دابنیشم و ئەیاد کە مەترسیی لەسەر نەبوو لە ڕیزەکانی دواوە دانیشێت تا گەر من گیرام خـۆی نەکـات بە خـاوەنم و تەنهـا هەواڵەکە بگەیەنێـت بە سـلێمانی. بـۆ شانسـی ئـێمە بـێ هـیچ مەترسیەک گەیشتینە سلێمانی و لەویَ بیرم کەوتەوە کە مـن هەویەی بەشـی نـاوخۆیی زانکـۆکەم بە نـاو و وێـنەی خـۆمەوە لە مـالەکەیە و ئێسـتا لە دەسـتی ئەمنـدایە، کەچـی بەسـەر ئەو هەمـوو سـەیتەرەیەدا هاتین.

نەجات هەمیشە نەسرەوت و گەڕۆک بوو، بەڵام ئەمڕۆ بەوە باش بوو لە ماڵەوە بوو و یەکسەر بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە تا ئەویش بتوانێت هاوڕێیانی تر ئاگادار بکات و ئیجرائاتی پێویست بگرنەبەر. بەلێکدانەوەی خۆم ئەمزانی کە ئەو هاوڕێ دەسگیرکراوە بەسەر سلێمانیدا گەیشتۆتە لای ئێمە و ماڵ و شوێنی تریشی بینیوە بۆیە خێرا خۆم گەیاندە نەجات تا جگە لە هاوڕێیانی کۆمیتەکەی خۆمان هاوڕێیانی ناوەندیش لەم مەسەلەیە ئاگاداربکاتەوە.
لە ڕاستیدا ئەو شێوە کارە لیبراڵیەی کە کارگەران لەو ماڵەدا پەیڕەوەی لێ ئەکرد هۆکاری یارمەتیدەری سەرکیی ئەو کارەساتە و قوربانیدانی ئەو هاوڕێیە واتە "توفیق نعمة" و "ئەڵوەند"ی هاوڕیی بوون کە پێکەوە دەسگیرکران و دواتر هەردووکیان لە سێدارە دران و چەندین کەسی تریش تووشی زیندانی و ئەشکەنجە و ڕاونان بوونەوە. ئاخر کام عەقلی سەلیم ئەوەی بۆ هەزم ئەکرێت کە کوڕێکی عەرەب لە ئەوروپا ودەرەوە گەڕاوەتەوە کوردستان، لە ناوزەنگ و ئالانەوە بهێنیتە خانوویەک و جێیەکی وەکوو ئەو خانووەی ئێمە کە دووکەسی تریشی تیایە کە هەردووکیان تاسەر ئیسقان داواکراون لەلایەن دەزگا داپلۆسێنەرەکانی بەعسەوە؟ ئەو لیبراڵیزمەی کە لەو ماڵەدا پیادە ئەکرا وێنەی کەم بوو. ماڵێک لەو شوێنە نەگونجاوەدا کە باسم کرد، کە سێ کەسی ئیختیفا بە هەمیشەیی تیا ئەژین، بەو باکگراوەندە ئەمنیە پڕ لە مەترسیەوە بە تەبیعەت ئەبن بە نیچیرێکی چەور بۆ دەزگای سەرکوت و داپلۆسین. شوێنێکی وا کە هەموو ڕۆژێک مەوعید و کۆبوونەوەی کۆمیتەیەکی تیا بکرێت و ئێستا هاوڕێیانێکی وەکوو بەختیار مستەفا ئەیگێڕنەوە کە ئەوانیش کردوویانە بەجێی کۆبوونەوە، زەحمەتە لە زەربەی ئەمنیی ئەو قۆناغە مەترسیدارەی ئەو کاتە، دەرباز ببێت. جگە لەوەش هەر لەو ماڵەدا دەیان نووسراوە و هەویەی تەزویر و کتێب و بەڵگەنامە و نووسراوەی کۆمیتە و ڕێکخراوی تیا کۆکرابۆوە. سەرباری ئەوەش

ئەو هاوڕێیەی کە گیرا ڕێگەی دابوو بە هاتنی هاوڕێی تری خۆی بۆ ئەو شوێنە بەبێ ئاگاداریی ئێمە و بەتایبەتی نەجات کە لێپرساوی کۆمیتەکە و سەرپەرشتیاری ماڵەکە بوو. هەموو ئەمانەش لە سەردەم و شارێکدا کە چاودێری و سەرکوت و تاقیبکردن و ڕاونان و کۆنترۆڵکردنی دەزگا ئەمنیەکان گەیشتبوو بە بەرزترین ئاست. ئێمەی نیشتەجێی ئەو خانووە لە چاوی گەڕەک و دراوسێکاندا هەموو شتێکمان جیاواز و نامۆ بوو. هیچ حسابی ئەوە نەئەکرا کە دەزگا ئەمنی و حیزبیەکانی ڕژێم چاودێر و سیخوڕیان لە هەموو شوێنێکدا چاندووە و هەیە و بۆهەر کار وکردەوەیەکی گوماناوی دەیان حساب ئەکەن. ڕاستی ئەو ماڵە وەکوو بۆمبێکی تەوقیتکراو وابوو کە هەموو چرکەیەک قابیلی تەقینەوە و خستنەوەی کارەساتێک بوو و ڕابەریی ئەو ڕێکخراوەش کەمترین خەمی ئەو کێشەیەی هەبوو کە بەقیمەتی گیانی دوو هاوڕێ و ڕزگار بوونی بە ڕێکەوتی چەندانی تر و پەرتەوازەبوونیان کۆتایی هات.

## کارگەران و ڕەوتی کۆمۆنیست و مارکسیزمی شۆڕشگێڕ

کاتێک دووبەرەکی کەوتە ناو کارگەرانەوە، ئەو هاوڕێیانەی مانەوە خۆیان ناونا (مارکسیزمی شۆڕشگێڕ). هەر گرووپ وتاقم و ڕێکخراوێک ئازادە لەوەی چی ناوێک لە خۆی ئەنێ و چۆن خۆی پێناسە ئەکات.

ئەوەندەی بەو هاوڕێیانە بگەڕێتەوە سەرچاوەی ئەم ناونانە پشتی بەستبوو بەو لێکدانەوەیەی ئەوان کە پێیان وابوو ئەوانەی وازیان هێناوە هێشتا لە ڕووی فکری و سیاسیەوە پۆپۆلیستن و ئەوە ئەو هاوڕێیانەن کە ماونەتەوە، نوێنەرایەتیی پاکی و بێگەردیی کۆمۆنیزم ئەکەن. بەومانایە ئەو باڵەی کە ئەبێ بە (ڕەوتی کۆمۆنیست) جگە لەوەی ناو و شوناس بۆ خۆی هەڵئەبژێرێت (کە وەکوو وتم ئەوە مافی سروشتیی خۆیەتی) هەر خۆشی شوناس وسروشتی چینایەتی بۆ هاوڕێکانی دوێنیی خۆشیان دەستنیشان ئەکەن کە ڕیزەکانی ئەو ڕێکخراوەیان جێهێشتووە و وەکوو ناتۆرە و تەشهیر وهەجوێکی سیاسی، ئەیدەن بەچاوی ئەواندا. ئەوە لە کاتێکدایە کە هیچ کەس و بەو ئەندامانەی ناوەندیشەوە نازانن یا ناتوانن بیسەلمێنن بۆ ئەم مارکسی و شۆڕشگێڕە و ئەوی تر پۆپۆلیست و چی و چیە؟ هەموو ئەو ئەندامانەی ڕێکخراو کە بیانەوێ هەڵبژاردنی دروست و ڕاستی سیاسیی خۆیان لەنێوان ئەو دوو بەرەیەدا بکەن چی بکەن؟ پشت بە چی دۆکیۆمێنت، نووسراوە، پرۆژەی جیاواز و .. تاد ببەستن؟ چۆن

لەو فەزای تەشـهیر و نـاو ناونـاتۆرانەدا هەڵبژاردنـی دروسـتی بەرەی خۆیـــان بـــکەن کە هـــیچ ماتریالێـــک و نووســـین و مینبەرێـــک لەبەردەسـتیاندا نـیە کە بیـروڕای لایەنەکـان بخـاتە ڕوو. ئـاخر خـۆ هیچیەک لە لایەنەکـان شـتێکی نـیە ونەبـووە بـۆ وتـن تـا بگەڕێینەوە سەری بۆ کردنی بە پێوەر لەم بەناو جیاییەدا.

کەم بزووتنەوە و هێزی سیاسی لە دونیـادا هەیە شـان بـدات لە شـانی بـزووتنەوەی کۆمۆنیسـتی لە بـواری چێژوەرگـرتن لە جیـابوونەوە و ئینشیقاق و نووسین لەسەر یەکتری وتەشهیر ولاقرتێی نـاو باڵەکانی. بەشـــی زۆری ئەدەبیـــاتی کۆمـــۆنیزم بەرهەمـــی پولمیـــک و ڕەخـــنە وپیـــاهەڵپژانی دەروون بزووتنەوەیـــی ونـــاوخۆییە. ئەو جیاییـــانەش ڕازێنراونەتەوە و تیۆریزە کراون. کـراون بەسـەرەتای قۆنـاغێکی نـوێ و قەلەمبازێـــک و چـــی و چـــی. زۆر کەمـــیش لەو پلمیـــک و ڕەخنەگرتنـانەی مێـژووی ئەم بـزووتنەوەیە بە یەکگـرتنەوەی دوو یـا چەنـد لایەنـی کێشمەکێشـەکان تەواو بـووە. زۆربەی ئەو نووسـین و بابەتـــانە لە جیـــاتی ئەوەی پـــردی یەکگـــرتنەوەی ڕیکخراوەیـــی یـــا نزیکـایەتیی سیاسـی و هاوخەبـاتی دروسـت بـکەن، دیـواری کیـنە و جیایی و پەراکەندەییان هەڵچنیوە. بۆ گەڕان بەدوای هۆکـاردا هەرچـی شـتێکی تـر بگێـڕینەوە بـۆ هۆکـاری دەسـتی "دوژمنـی چینـایەتی"، ئەوا دەستبردن بۆ ئەو هۆکارە بۆ ناسینی ئەم عیللەتەیان، دروست نیە.

لە ڕوانگەی لێکدانەوەی ئێسـتای منەوە یەک هۆکـاری تاقانە هەیە بۆ ئەو دیـــاردەیە: تێـــڕوانین بـــۆ کۆمـــۆنیزم وەکـــوو خـــاوەنی بـــێ ئەملاوئەولای تاپۆداری حەقیقەت و ڕاسـتی و هەر کەس و لایەنێکیش خـــۆی بەهەڵگـــری ئەو پەیـــامە زانـــی بەشـــێوەی ئۆتۆماتیـــک دەبـــێ بەهەڵگری ئەو پەتایە!

ئەمجـۆرە عەقلـیەتە بە ئێستاشـــەوە لەنـــاو چەپ و کۆمۆنیســـتەکانی عێراقدا ریشـە و ڕەواجـی هەیە و بەهێـزە ولە جدال و ململانێکانـدا نە بە پێویسـتی ئەزانێت پشـت بە بەڵگە و فاکت ونمـوونە ببەسـتێت و نە

هیچ بەڵگەیەک لە دونیای فراوانی واقیعدا ئەکات بەشایەد. بەڵگە و شایەدی ڕاستبوونی بەرەی ئەو تەنها زاتی خۆی ومتمانەیەکی یەکلایەنەیەتی بە خۆی و بڕواکانی خۆی، کە تا ئەندازەی (عەقیدە) یەک بێ منەتە لە بەڵگە هێنانەوە بۆ سەلماندنی ڕاستی و دروستییان.
ئەوە ڕێک ئەوەبوو کە لە پایزی ١٩٨٤ دا ناونرا سەرکەوتنی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ و لە منالدانی ئەویشدا (ڕەوتی کۆمۆنیست) لەدایک بوو. بوونەوەرێک لە ژینگەیەکی وا و لە منالدانی بوونەوەرێکی تری لەو چەشنەدا لەدایک بێت و مامانەکانی دەرچووانی هەمان قوتابخانە بن، زۆر زەحمەتە ببێت بە گیانلەبەرێکی زیندوو و ساغ و تەندروست.
لەوەش کاریکاتێر تر ئەوەبوو کە ئەو هاوڕێیانە نووسراوێکیان دەکرد بە بەڵگەی ئەو"سەرکەوتنە" (سەرکەوتن بەسەر کێدا نازانم!!)، کە سەبارەت بە گفتوگۆی یەکێتیی نیشتیمانی و ڕژێمی بەعس بوو. جێی بیرهێنانەوەیە کە چی بابەتی ئەو نووسینە و چی مەنهەجی شیکردنەوەی بابەتەکە، جا با بەفەرز هەمووشی دروست بێ، نەیئەتوانی ببێت بە بەڵگە بۆ بازدانی ئەوان لە پۆپۆلیزمەوە بۆ مارکسیزم یا کۆمۆنیزم. ئەوە قسەی من نیە بەڵکوو لە ڕوانگەی مارکسیەوە ئەو پرۆسەی ئالوگۆڕە (جا با تەنها لە بازنەی فکریشدا بێت) پێویستیی فکری و تیۆری و سیاسی و ڕێکخراوەیی زۆری هەیە. ڕەخنە لە ناسیونالیزم ومفاوەزات نەیان ئەتوانی و ناتوانن (دیسانەوە بە پێی میتۆدی مارکسی نەک قسەی من) پردی پەڕینەوە لە پۆپۆلیزمەوە بۆ کۆمۆنیزم ساز بکەن.
تا ئێستاش، بەهۆی نەبوونی مەحزەرێکی ڕەسمی و بەڵگەنامەی ڕێکخراوەیی، ئەبێ تەنها پشت ببەستین بە یادەوەریی ئەو هاوڕێیانەی دەرگیر بوونە لەو قۆناغەدا کە کارگەران ئەگات بە بنبەست و کۆمەڵێکی زۆر لە ڕابەری و کادر ڕیزەکانی ڕێکخراو جێ دەهێڵن و ئەو باڵەش کە ئەمێنێتەوە، دۆنکیشۆت ئاسا، ئیعلانی سەرکەوتنی

(مارکسـیزمی شۆڕشـگێڕ) دەکـا و نـاوی ڕێکخـراوەکە ئەگۆڕێـت بە (ڕەوتی کۆمۆنیست).
ئەوەی لەبـارەی ئەم وازهێنـان و دووبەرەکـیە مەعلـوم بێـت ئەوەبـوو کە، ئەو ڕووداوە ڕەنگدانەوەی بنبەسـتی ئەو ڕێکخـراوە بـوو بەهەمـوو لایەنە جیاوازیەکـانیەوە. نە بابەتێـک دیـار بـوو کە جیـاوازیەک بەیـان بکـــات گەر هەبووبێـــت، نە بەنووســـراو یـــا ســـەرزارەکی شـــتێک بڵاوکرایەوە. ئەو ووردە یاداشـتانەی ٣٠ سـاڵ دواتـریش بڵاو بۆتەوە ســـەبارەت بەو ڕووداوە هیچیـــان ڕۆشـــناییەک نـــاخەنە ســـەر ئەو جیاوازیانە تا، لانی کەم ئێستا، ئینسـان چۆنیەتیی ئەو مەسـەلەیەی بۆ ڕوون ببێتەوە.
بەڵام گومـــانی ســـەرەکی بـــۆ ئەوە دەچێـت کە لەنـــاو ناوەنـــدیی ئەو ڕێکخـراوەدا جۆرێـک لە حەساسـیەتی نێـوان ئەنـدامەکانی و کێشـەی تـری لاوەکـی ونەشـکانەوە بەســـەر نـاوەڕۆکی بنبەسـتی ڕێکخـراوی کـارگەران ونەبـوونی دیـدگایەکی ڕۆشـن سـەبارەت بە داهـاتووی ئەو ڕێکخراوە، ڕۆڵی سەرەکیی بووبێت لەو قەیرانەی کە تووشی هات.
بەوجۆرەش لەوە سروشـتی تـر نەبوو کە ئێمەش کە لە ئۆرگانەکـانی خـــوار ناوەندیـــدا چالاکیمـــان ئەکـــرد، بکەویـــنە بەرەی ئەو هـــاوڕێ و لایەنەی کە تەماســـی ڕاســـتەوخۆترمان لەگەڵیـدا هەیە و فـاکتەری تـر نەک جیـــاوازیی سیاســـی (کە نەبـــوو وەکـــوو وتـــم) بکەیـــن بە بنـــاغەی هەڵوێست و هەڵبژاردنی ئەو لایەنەی کە لەگەڵیدا ئەڕۆی.
(بـۆ ئەو مەبەسـتە پێمباشــە وەکـوو بەڵگەنـامەیەک بـڕواننە گفتوگـۆی جەبـــار مســـتەفا لە کتێبـــی مێـــژوویەک لەیادەوەریـــدا لە ئامـــادەکردنی سالار ڕەشید و بەتایبەتی لاپەڕەکانی ٥٧ تا ٦٥).
ئەو بە ڕۆشنی ئەڵێ: (لە هەموو ئەمانەش گرنگتر دۆشدامانی ڕابەریی ئەوسای کـارگەران بـوو بەرامبەر مەسـەلە سیاسیەکانی کۆمەڵگا لەو ســـەردەمەدا کە گرنگترینیـــان مەســـەلەی جەنگـــی عێـــراق–ئێـــران و مەسـەلەی مفـاوەزاتی یەنـک – بەعـس و هاتنەوەیـان بۆنـاو شـارەکان

وشەپۆلی نارەزایەتیی جەماوەری دژ بە سیاسەتی سەرکوتگەرانەی بەعس و نادیاری و نەبوونی ستراتیژێکی ڕۆشن لەبەردەم کارگەراندا، کە ئەم نارەزایەتیانە بەرەو کوێ ئەڕوات) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩

چەند دێر دواتر لە درێژەی ئەوەدا و لە بەرانبەر بەو بارودۆخ و ئەرکانەدا ئەڵی (کەچی سەرکردایەتیی کارگەران خەریکی تێپەڕاندنی پۆپۆلیزمەکەی بوو، ئەویش بە دیراسەکردن) ل ٥٩

ئەبێ بۆ مێژوو ئەوە بوترێ کە ئەوەی بووبوو بە هۆکاری ئەو جیاوازیانە تەنها بنبەست و چەقبەستنی خودی (کارگەران) بوو، بەو خەسڵەتانەوە کە من لە چەندین جێگادا بە درێژی ئاماژەم پێکردوون. بەلام بابەتی جیاوازیەکان هیچ مەسەلە و تەوەرێکی ڕۆشن نەبوو، گەرچی ئەو دوو بەرەکیە لە ناو ڕابەریەوە شۆڕ ببۆوە بۆ ناو بەشێکی زۆر لە کادرەکانیش.

یەکێک لە ئیشکالیەتەکانی ڕێکخراوی کارگەران مەسەلەی فکر بوو. ئەم ڕێکخراوە لە مناڵدانی هیچ بزووتنەوەیەکی سیاسی یا کۆمەلایەتیدا لەدایک نەبوبوو. درێژەی ڕێکخراوەیی هیچ جموجۆڵێکی ناو کۆمەڵگەی کوردستان نەبوو. مێژووی ئەم ڕێکخراوە ئەگەڕێتەوە بۆ ململانێکانی ناو کۆمەڵەی مارکسی – لینینی و هەوڵی ئەو ڕێکخراوە بۆ ڕێکخستنی ڕیزی مارکسیەکانی کوردستانی عێراق. دابڕانی کۆمەڵێک لە ئەندامانی کۆمەڵە و ڕەخنەکانیان سەبارەت بە سیاسەت و ڕێبازی ئەوکاتەی ڕێکخراو، ئەبێ بە پایەی هاوفکریی و نزیکایەتیی دواتریان، بەلام نابێ ئەوەش لە ئاستی ڕاستەقینەی خۆی گەورەتر بکرێت.

ئەو کەسایەتیانەی واز دێنن لە کۆمەڵەی مارکسی – لینینی خاوەنی دیدگایەکی ڕۆشن نەبوون و بەڵگەشم بۆ ئەوە قسەکان و یادەوەریاکانی ئێستای خۆیانە. ئەوان نە لێکدانەوەیەکی هەمەلایەنە و ڕۆشنیان کردووە بۆ ئەو ڕێکخراوە، نە خاوەنی میتۆدێکی ڕۆشنی

ڕەخنەگری سیاسی و فکری بوون. ئەو کەسانەی وازیان دەهێنا لە کۆمەڵە خاوەنی هیچ پرۆژەیەکی سیاسیی دیاریکراو نەبوون و خۆشیان هیچ جۆرە چالاکیەکی دیار و ڕۆشن و خاوەن بەرهەمی سیاسیان، بە بەراوورد بە کۆمەڵە، نەبووە. ڕەوتی ڕووداوەکانیش بەڵگەیەکی ترن بۆ ئەو ڕاستیە.

کۆمەڵە بەپێی کاراکتەرە سیاسی و فکریەکانی خۆی، درێژە بە تێکۆشانی سیاسیی خۆی دەدا، وەرچەرخانێک لە بزووتنەوەی سیاسی و فەزای تا ئەوکاتەی سیاسەتکردن لە کوردستانی عێراقدا پێک دەهێنێت و لەبەرانبەریشدا ئەو کەسانەی لەوان جیا دەبنەوە سەردەکەنە ناو دونیای (دراسەی مارکسیزم) و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ڕاستی و دروستیی بەرەی ئەلبانیا یا چین و لە بواری سیاسەت و پێویستی و تفاقەکانی خەباتی سیاسی و لە ئاستی گشتی کۆمەڵدا بەردێک ناخەنە سەربەردێک. وەکوو قاعیدەیەکی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیش ولەو قۆناغە پڕ لە ستەم و چەوسانەوە وتەفاعولاتەدا کۆمەڵگاش ناتوانێت بەدیار کەسەوە دابنیشێت و چاری کێشەکانی دوابخات تا ئێمە لەو (دراسەکردنەی مارکسیزمدا) ئەبینەوە تا چی چارەیەک بۆ دەردەکانی ئەو ئەدۆزینەوە. جەماوەر بەناچار لە لیستی هێزە سیاسیەکاندا دوای (باشترین خراپ) یان ئەکەوێت. ئەڵبەتە دراسەکردنی مارکسیەت تەنیا بیانوویەکە ئەگینا نە فکرو نە گەڕان بەدوای ئاسۆی ورد و ڕۆشنی سیاسیدا، نەک ناکۆک نین لەگەڵ پرۆژەی سیاسی و سیاسەتکردن، بەڵکوو وەکوو ماسی و ئاون بۆ ڕێکخراوی سیاسی. بەو مانایە لە نێوان بەرەی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی و بەرەی مارکسیە ڕادیکال و ڕەخنەگرەکانی ئەواندا دەتوانم بە جورئەتەوە بڵێم، بەرەی یەکەم هێزی ئەکتیڤ و چالاک و سیاسیی سەردەمی خۆیان و بەرەی دووەم پاسیڤ و بیکاریگەر لەسەر ڕەوتی ڕووداوەکان بوون و شانۆی سیاسەتکردن وچارەنووسی خەڵکی ئامادە وتینوو بۆخەباتی خەڵکی کوردستان وئاراستەکردنی ڕەوتی

ڕووداوەکانیان (بێ تەقە) جێهێشت بۆ بەرەی ڕاستڕەوی یەکەم. ئەوە کاریگەری و ئاکامی بێ ڕتووشی ئەو دەرک و میتۆدەیە سەبارەت بە سیاسەتکردن کە ئەو هاوڕێیانە پەیڕەویان لێ ئەکرد کە ڕیزەکانی کۆمەڵەیان بەو شێوەیە بەجێهێشت و زۆر جاریش وەکوو هەڵوێستێکی ڕادیکال و شۆڕشگێڕانە ئەخزێنرێتە ناو لاپەڕەکانی مێژووی چەپەوە لە کوردستان. لێرەدا قسە و سەرنجی من لەسەر وازهێنانەکە نیە لە کۆمەڵەی مارکسی – لینینی بەقەدەر ئەوەی چڕکردنەوەی زۆمی ڕەخنەیە لەسەر بێ بەدیلی و نەبوونی پرۆژەی سیاسی و نەبوونی روئیایەکی ڕۆشن لای ئەو تەیفە لە چالاکوانانی سیاسیی مارکسی.

ڕێکخراوی کارگەران لەسەر بناغەی یەکێتیی بیروباوەڕی کۆمەڵێک کەسایەتیی مارکسی پێکدێت لە پرۆسەیەک لە گەڕان بەشوێن شوناسێکدا کە جیاوازی و کاراکتەری فکریی ئەوان بەرجەستە بکات. تا ئیرە کیشەیەک نیە و هەموو ڕێکخراو یا قەوارەیەکی سیاسی پیویستی بە ڕوانگەیەکی فکری هەیە کە کۆمەکی بکات لە بواری ئەرک و ئامانجە سیاسیەکانیدا.

گەر لەو فاکتەرانەش بگەڕێین، ئاشکرایە کە یەکلابوونەوەی چارەنووسی ئەو ڕێکخراوە وەکوو کیانێکی سیاسی، لەحاڵەتی دەرکەوتنی هەر جیاوازیەکدا، جا لە بواری بیروڕا بێت یا جیابوونەوە و وازهێنانی بەشێکی، بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی کاری نهێنی و هەبوونی دیکتاتۆریەتێکی بێپەردە، پێش هەموو شتێک پێویستی بە بوونی ڕادەیەک لە فەزای دیموکراتیە لە دەروونی ڕێکخراوەکەدا.

فەزای میحفەلی و بەند و بەست و دەستەگەری و پاشقولگرتن لە نەیار و خاوەن ڕای جیاواز نەریتێکی کۆنی ناو ڕێکخراوە مارکسیستەکانە کە لە ناو کارگەرانیشدا زۆر بەهێزبوو. نەبوونی دیموکراسی لە ژیانی ناوخۆیی هەر ڕێکخراوەیەکدا، جا چەپ بێت یا ڕاست، کۆمۆنیست بێت یا نەتەوەپەرست، میکانیزم وئامرازێک

ناهێڵێتەوە بۆ چاری جیاوازی بیروڕا و هەڵوێستی سیاسی جگە لە ئینشیقاق و لێکترازان و بەیەکدادان وپەناابردنی لایەنەکان بۆ ناوزڕاندن، گەر دەسەلاتیان نەبێت، و بۆ کوشت و بڕ وتەسفیەی فیزیکی گەر دەستیان بڕوات.

سەرچاوەی ئەوەش یەک شتە: زەوت کردن و مۆنۆپۆلکردنی ڕاستی لە بواری هەڵوێست و خوێندنەوەی هەر لایەنە بۆ هەموو بابەتێک. ڕاستیی ڕەها و زەوتکردنی لە شیکردنەوەی هەموو دیاردەکانی گەردوون و جیهانی کۆمەلایەتی، وخۆلەسەرهەقزانینی موتڵەق سەبارەت بە هەر دیاردەیەک کە ئێستا یا تەنانەت ئەوەش کە لە دواڕۆژدا دێتە پێش، خەسڵەتێکی جەوهەریی بیری شمولیە، کە مارکسیزم یەکێک لە دیارترین نموونەکانیەتی.

ئەوکات و پێشتریش وئێستاش، هەموو مارکسیستێک پێیوایە، کە کلیلی حەقیقەت و کردنەوەی هەموو نهێنیەکانی دونیا لە گیرفانی ئەودایە. لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسەتەوە بگرە تا مێژوو و ئەدەب و هونەر و سایکۆلۆجی وزانست، قسەی کۆتایی و ڕەها لای مارکسیستێک، هەرقسەی ئەوە. ئەوە تەنها سیستمە فکری و تیۆریەکەی ئەوە کە دەبێ وەکوو تەنها مەرجەع و دوایین بەڵگە بۆی بگەڕێینەوە لە شیکردنەوەی هەر دیاردە و پێشهاتێک دا.

تا ئێرەش بەهەرحاڵ کێشە کە جیاوازە بۆیە ئەو کێشەیە ئەوکاتە قووڵتر دەبێتەوە کە هەردوو لایەنی کێشە یا ململانێ یا گفتوگۆکە سەر بەهەمان ڕەوت ومەنزوومەی فکری و تیۆری بن واتە هەردوولا خۆیان بە مارکسیست و کۆمۆنیست و سۆسیالیست بزانن، جا دەوڵەت بن یا لایەنی جیاوازی کێشەی ناوخۆیی حیزب و ڕێکخراوێک.

مێژووی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لێوانلێوە لەم جۆرە ململانێیانە. کەمترین بەشی ئەو ململانێیانە لە چوارچێوەی پرەنسیپە دیموکراتیەکاندا یەکلاکراونەتەوە. لەوەش دەگمەنتریان بە

یەکگـرتنەوەی دوولایەنـی ئینشـیقاق و جیـاوازیەکە دوایـی هـاتووە. کەمترین گـوێ بەوە دراوە کە دوژمـن یـا نەیـاری هاوبەشـی هەردوو لایەنـی کێشـەکە سـوود لەو شـێوازە لە ئیـدارەدانی ململانـێکەی ئەوان وەردەگـرن. هـیچ لایەنێـک گـوێی بەوە نەداوە کە ڕەنـگ بـێ نیـوەی ڕاستیەکان لای بەرەی ئەو و نیوەکەی تـر لای بەرەی بەرانـبەر بێت. سڵیان نەکـردۆتەوە لە گـرتنەبەری هەمـوو شـێوازێکی بەدنـاو کـردن وبەیەکداهەڵپژان و تەسفیەی فیزیکیی یەکتـر. لینـین هەرچی دەمپیسـی هەبـوو لەجەدەلـی سیاسـی لەگەڵ هـاوڕێ کۆمۆنیسـتەکانی دۆسـتی دوێنێی وەکوو بلیخـانۆف و مـارتۆف و ئەکسلرۆد دا بەکـاری دەهێنـا، تـا ئەو ڕادەیەی کەسـایەتیەکی خـاوەن توانـای تیـۆری و بەهەڵوێسـتی وەکـوو ڕۆزا لۆکسـمبۆرگی ئەشـوبهاند بە سـۆزانی! سـتالین ٧٠٪ هاوڕێکـانی ئەنـدامی کـۆمیتەی ناوەنـدیی حیزبـی بەلشـەفیی لەسـەر بیـروڕای جیـاواز کوشـت و بە مـردوویش نـاوی نـان بەکرێگیراوانـی هیتلەر. مێژووی ململانێی نێوان قیادە مەرکەزی و لیژنەی مەرکەزیی حیزبی شـیوعی عێراق پڕە لە نموونەی هاوچەشـن. ململانێکـانی نـاو ڕیزەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و پاشان کۆمۆنیزمی کرێکـاری و باڵەکـانی بەهەمـان شـێوە. لەهەمووشـی سـەیرتر ئەوەیە کە جیـابوونەوەی نێوان باڵەکانی کۆمۆنیزم لە هەر وڵات و سـەردەمێکدا بێت، بەداخستنی یەکجاریی دەرگا دوایی دێت لەبواری مـانەوەی هەر پەیوەندیەکی دوولایەنـی نـاکۆک، جـا ئەو وڵاتەی کە شـوێنی چـالاکیی ئەوانە ڕووبەڕووی هەر ئاڵوگۆڕێکیش ببێتەوە.

وەکـوو گەڕانەوەیەک بـۆ ڕەوتـی باسـەکە و ئەو ئەزمەیەی کە سـاڵی ١٩٨٥ ڕیزەکـانی (یەکێتـی تێکۆشـانی کـارگەران)ی گـرتەوە، نـابێ ئەو ڕاستیە لە بیر بکەین کە ئەو سـوونەتە لە ئیدارەدانی جیاییدا، ڕیشـەی ئەگەڕیتەوە بۆ سوونەتی کۆمۆنیستی لەو بوارەدا نەک لادانێک بێت لە سوونەتەکان و مێژووی ئەو بزووتنەوەیە.

جەبار مستەفا لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو قۆناغە ئەڵێ: (پاش ماوەیەک هاوڕێ جەمال ' نادر عبدالحمید ' بۆلام هات و پێی ڕاگەیاندم، کە ئەوان نوێنەرایەتیی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ ئەکەن، و من ' جەبار ' لەو ڕەوتەدا نیم).

بەوجۆرە هەوای لەسەرهەق بوون و زەوتکردنی ڕاستی مرۆڤ ئەگەیەنێت بەجێیەک کە لەشەو و ڕۆژێکدا و هەرئەوەندی نووری تابانی حەقیقەت بە مێشکی ئەمدا گوزەری کرد، بەئاسانی لە قوتابخانەیەکی فکری و بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و دونیایەکی چینایەتیەوە باز ئەدا بۆ یەکێکی تری پێچەوانەی ئەوی پێشووی، نەک هەر ئەوەش بگرە بێ ئەوەی داوا لەو هاوڕێیەی (کە نموونەکەی لێرەدا جەبار مستەفایە) بکات ئەویش بەو ڕیزەوە پەیوەست بێت و بێتە ڕیزی کاروانەکەی خۆیەوە وکۆمەکی بکات بۆ دەربازبوو لەو "گومڕاییەی" تێیکەوتووە، ئەویش بۆ کەسێک کە بەقسەی خۆی پێیوایە 'کەسایەتی یەکەمی کارگەران بوو' .... کەچی خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر ئەمدا ئەهێنێ و تەسفیەی مەعنەویی ئەکات!

بەدوای ئەوەدا چارەنووسی ئەم 'کەسی یەکەمە' ئەبێ بە مایەی غەزەبی زیاتری هاوڕێیانی تازە مارکسیستی شۆڕشگێڕ و جگە لەوەی ئامادە نین لەناو ڕێکخستندا بواری بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی بدەن، بەیەکجاری دەری ئەکەن.

جەبار چەند دێر دواتر ئەڵێت: (ئێستاشی لەسەر بێت نازانم لەسەر چی دەرکرام و ئیتر من پەیوەندی شەخسیم لەگەڵ پچڕین و یەکمان نەدیەوە، تا پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی کریکاریی عێراق).هەمان سەرچاوە.

مەبەستی من لە هێنانەوەی نموونەی قسەکانی جەبار بەوهۆیەوە نیە کە منیش هاوهەڵوێستی ئەوبووم و لەگەڵ ئەو و هاوڕێکانیدا وازم لە کارگەران هێنا و تەنانەت ئەوەش نیە کە ئێستا لایەنگری جۆری خوێندنەوەکەی بم بۆ ئەو ئەزمەیە. مەبەستی تەنهای من ئەوە بوو لە

زمـــانی یەکێــک لە ڕابەرانـــی ئەوکـــاتەی ڕێکخـــراوەکەوە ڕەوتـــی ڕووداوەکان و لاپەڕەیەکی ئەو مێژووە بەبیر بهێنمەوە وهیچی تر.

ئەو بەرەیەی کە وازیشــمان هێنــا لەڕووی مەنتیقــی سیاســەتکردن و بیرەوە زۆر لەوان جیاواز نەبووین بەڵام تەنها جیاوازیمان ئەوە بوو تووشـــی ئەو پەتـــای ســـکتاریزم و خۆفـــوودانە نەبوبـــووین. ئەو هاوڕێیـانەی بەرەی ئـێمەش وەکـوو نـاو و نـاتۆرە نـاوی (ڕەوتـی کۆمۆنیسـت) یـان نـابوو (اخـوان الریـف!) و هەر بەونـاوەوە ناویـان دەهێنـان و مـن بۆ خـۆم ئێسـتاش نەمزانـی کە مەغـزای ئەو ناوهێنـانە سەیرە چیە وهەرگیزیش بەکارم نەهێناوە.

لەم بەشەدا بەپێویستی ئەزانم ڕاستیەکی فەرامۆشکراویش بڵێم. گەر لە بەرزی و نزمیەکـانی دونیـای سیاســەت گەڕێــین، کۆمــۆنیزم و مارکسیزم لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا بریتیە لە کەلتوورێکی مودرن کە لەڕووی بـابەتیەوە، پێویســتی بە فەزا وســەرخانێکی مــۆدرن و ئاستێکی باڵای کەلتووری هەیە لەناو خەڵکدا تا بتوانێت لەناو خەڵکی سادەدا، نەک تەنها توێژی ڕۆشنبیر، نەشونما بکات. ئەم سەرخان و تەرزە لە هۆشیاریی مودرین لە کوردستانی ئەوکاتەدا بەتایبەتی لاواز بـوو. بەو مانـایە لە لێکـدانەوەی شکسـتی چەپ یـا کـارگەران و یـا سەرجەم لایەنەکانی تری پەیوەندیدار بە مارکسیزم و کۆمۆنیزمەوە، نـاکرێ تەنهـا بە کوتـانەوەی کـارگەران و چەپ و مارکسیستەکانەوە بنووسیین بۆ تێگەیشتن لە کەمی نفووزی ئەو ڕەوت و ڕێکخراوانە. ئەم هۆکـارە بـابەتیە ڕۆڵـی زۆری هەیە لە ڕیگـرتن لە گەشەســەندنی هێز و نفووزی کۆمۆنیزم و مارکسیزم کە، بۆ نموونە، جیای ئەکاتەوە لە بزووتنەوەی ناسیونالیستی.

+++

به چەند بیروڕا گۆڕینەوە و کۆبوونەوەیەک من و نەجات و جەبار زوو کەوتینە یەک بەرەوە و بناغەی هەندێک نزیکایەتی و کاری هاوبەشمان دیاری کرد. ئێستا وازمان لە کارگەران هێناوە و چاوەڕوانیەکی زۆرمان بەتایبەتی لە جەبارە. هەر یەکەشمان، بەتایبەتی جەبار، پەیوەندیەکی زۆرمان لە ناو ڕێکخراو ودەرەویدا هەیە. نەجات بەدوای گرتنی مەخفیگاکەمان لە هەولێر ناتوانێ لە ماڵی خۆیان بمێنێتەوە. منیش دیسانەوە دەربەدەر و جاروبار لە ماڵی جەبار ئەمامەوە. جەبار لەڕووی ئەمنیەوە وەزعی خراپ نەبوو، بەڵام زۆر بێتاقەت بوو و هەستی بەشکستێکی زۆر ئەکرد. هەر لەم سەردەمەدا پەیوەندیم لەگەڵ سیروانی برای جەباردا بەهێز بوو و ئەویش بەتەبیعەت بوو بە یەکێک لە ئەندامە چالاکەکانی ئەڵقەکەمان کە هێشتا هەر خەریکی گفتوگۆو هەڵسەنگاندنی ئەزمەی کارگەران و قۆناغی پێشووین. نەجات جموجۆڵی خستۆتە ناو هەمووگمانەوە. ئەو کۆمیتەیەی هەولێری کارگەران من و نوری کەریم و نەجات ئیستقالەمان داوە و سامی وازی هێناوە و بە پێی ئەوەی لە نەجاتم بیست جەلیل شاباز لەگەڵ ڕەوتدایە. نوری ڕۆیشت بۆ ناو کۆمەڵە و لەوێ بوو بە پێشمەرگە. دیاربوو ئێمە کەمایەتیەکین و ڕەوت زۆربەی قەواعیدی کارگەرانی جارانی لە گەڵدایە گەرچی لە ئەندامانی ناوەندیەکەی جاران تەنها هاوڕێیان مؤید ئەحمەد و نادر عبدالحمید و ئەمجەد غەفوور مانەوە. ئێمە لەڕێی جەبارەوە جاروبار هەواڵ و هەڵوێستی ئەوانمان پێ دەگەیشت.

ئەو ماوەیە لەڕێی سیروانی برای جەبارەوە کە پێشتر ئەندامی کارگەران و ئەوکاتە کەسێکی چالاکی ئەو ئەڵقەیەی ئێمەبوو، ماموستا ستارم ناسی کە ئێستا کادرێکی بزووتەوەی کۆمۆنیستیی کوردستانە. دیار بوو ئەویش ئەندامی کارگەران بوو و ئەوکاتە ئەویش وازی هێنابوو و لە ئێمەوە نزیک بوو. سیروان تەمەنی لە من و نەجات کەمتر بوو بەڵام زوو بووین بە هاوڕێی نزیک. ئەو

پەیوەندیی سیاسیی فراوانی هەبوو. ماوەیەکی زۆر لەماڵی ماموستا ستار بە ئیختیفا جێیان کردمەوە. ئەوان خۆیان لە بەختیاری لە خانوویەکی کرێدابوون بەڵام ماڵەکە و شوێنەکەی بۆ ئیختیفا گونجاو بوو. ماموستا نەڕۆیشتبوو بۆ سەربازیی حکوومەت و ئەویش بە هەویەی تەزویر ئەسووڕایەوە و دەستیان کورت بوو، بەڵام تابڵێی خیزانێکی باش بوون. ژێرزەمینێکیان هەبوو ومن زۆربەی کات لەویَ ئەمامەوە. ماموستا ستار باوکی نەمابوو تەنها خۆی و برایەک و خۆشکێکی لەگەڵ دایکی و کچێکی منالّی برایەکی لەو مالەدا ئەژیان. مامۆستا و سەرداری برابچووکی دوو کەسی چالاکی سیاسی بوون و زوو بووین بەهاوڕێی نزیک. ئەو ماوەیە زوو زوو لەگەڵ نەجات و جەباردا کۆئەبووینەوە وهەموو کۆبوونەوەکانیشمان لە ماڵی جەبار ئەکرد. نەجات وەکوو سەرەتایەک بۆ پەیداکردنی پارە بۆ قۆناغی داهاتووی چالاکیی سیاسیمان و بۆ گوزەران من و ئەو، لەگەڵ هاوڕی عەلی مورادی کۆنە کادری کۆمەڵە و هاوڕێی زیندانی ئێمە لە پرۆژەی زێرابکردنی کۆلانەکانی گەڕەکی زەرگەتە بوون بەشەریک. نەجات ئەندازیارێکی زیرەک و بەتوانا بوو. پرۆژەکە بەناوی وەستا فایەقەوە بوو کە مقاولێکی دیاری ئەوکاتەی سلێمانی بوو. نەجات دەستی کرد بە ئیش ومنیش پێم وت پێمخۆشە منیش بێم کرێکاری بکەم لای ئێوە. ئەو وتی تۆ بۆ کرێکاری ئەکەی برۆ دانیشە ئەی من پارە بۆکیَ پەیدا ئەکەم. منیش وتم ئەوە ئارەزووی خۆمە و حەز ئەکەم تۆزیَ ئەم ژیانی ئیختیفایە بگۆڕم چونکە ئەزانم تازە تاماوین وا ئەبین جا پێویستم بەوەیە شێوازی ژیانی ئیختیفاکەم تۆزێک کۆمەڵایەتی بکەمەوە. جگە لەوەش لەو سەردەمەدا ئێمە زۆر پێداگریمان ئەکرد لەسەرمەسەلەی تێکەڵی لەگەڵ کرێکاران و چوونە ناویان و دەخالەت لە خەباتیان و ڕێکخستیان. هەرچەندم کرد رازی نەبوو و پێی سەخت بوو لە شوێنێکدا ئەو خاوەن کار یا ئەندازیاری کارەکەبێت و من خۆم بخەمە بەر ژیانی سەختی کرێکاری. پاشان کە

زانیی هەر واز ناهێنم وتی باشە وەرە ببە بە سەرکار یا (مراقب عمل).
لەو ئیشەدا مامۆستا ستاریش بەکرێکاری دامەزرا و هەم مامۆستا ئەیزانی کە نەجات کەسێکی سیاسی و هاوڕێی منە و هەم نەجاتیش هەمان گومانی هەبوو لەسەر پەیوەندیی من و ستار. مامۆستا ستاریش لای خۆیەوە پەیوەندیی سیاسیی فراوانی هەبو و لەناو کۆڕ و کۆمەڵی کرێکاری و مارکسیدا چالاک بوو. جگە لەوەش هاوڕێیەکی نزیکی هەبوو بەناوی ماموستا سەدیقەوە، کە هاوڕێی زەمانی خوێندنی (دار المعلمین) بوون. سدیق خۆشنووسێکی زۆر بەسەلیقە بوو و دواترهەرچی نووسراوەی ئێمە هەبوو تا ساڵانێکی زۆر ئەو ئەینووسیەوە و ماموستاش هاوکاریی ئەکرد.
پاش ماوەیەک نەجات ووتی من ئەگەڕێمەوە بۆ ماڵی باوکم و ناتوانم هەر شەوەی لە ماڵ و جێگەیەک کارە سیاسیەکانی خۆم ڕایی بکەم. لە وەڵامی پرسیاری من سەبارەت بە مەترسیی ئەمنیی ئەو بەتایبەتی دوای گرتنی وەکرەکەی هەولێر ئەو وتی ئەو هاوڕێ گیراوانە کەسی ماڵی باوکم نازانن و شتکێکیش نەگیراوە لە ماڵەکە کە ناونیشانی منی پێوەبێت لە ماڵی باوکم. ئەو وتی کە ناکری من و تۆش دوور بەدوور و تەنها لە کاتی کۆبوونەوەکان قسە لە باسە سیاسیەکان و پلان و پرۆژەی داهاتوومان بکەین بۆیە باشترە تۆیش بێیتە ئەوێ و دڵنیای کردم کە هەم ماڵی باوکی ئامادیی تەواویان هەیە بۆ جێکردنەوەی من و هەم ئەوێش سەلامەتترە بۆ مانەوەمان. قسەکانی مەنتیقی بوون و گەرچی ماڵی ماموستا ستار شوێنێکی باش بوو بۆ من بڕیارم دا بگوێزمەوە ماڵی نەجات و پێش نەبڕم لە  ماڵی ماموستا.
من پیشتر هاتووچۆی ماڵی باوکی نەجاتم ئەکرد لە سەرشەقام. ماڵی ئەمان خانووی خۆیان بوو. حمە دروێشی باوکی نەجات پێشتر کرێکار بوو وئێستا تووشی باداری بووە و جووڵەی کەمبۆتەوە. من و نەجات ژووری خۆمان هەبوو کە بۆ نووستن و خوێندنەوەمان

گونجاو بوو. دایک و باوکی نەجات و ئاشتیی خوشکیان تا بلێی نەوازشیان لەگەڵ مندا بەکارئەهێنا. گەر پێکەوە بڕۆیشتینایە بەلایەکدا ئەیانووت تۆ هەقی ئەووت نەبێ و مەڕۆ و هەر لای ئێمە بمێنەرەوە. من لە ژیانی دوور ودرێژی ئیختیفادا و تا ئەوکاتەی ساڵی ١٩٨٧ هاوسەرگیریمان کرد و بووم بە خاوەنی ماڵی سەربەخۆی خۆم چاکەی ئەم چەند ماڵەم بیر ناچێتەوە. ماڵی عەلیی حاجی سمایل لە هەولێر، ماڵی ماموستا ستار و دایکی، ماڵی باوکی نەجات و کەس و کار و خزمەکانی وەکوو خالیدی مەلا عەلی و ماڵی هاوڕێیان عوسمان و ستار محمد کەریم.

جگە لەو ماڵانە بۆ ماوەی زۆریش سەردانی ماڵی هاوڕێیانی وەکوو هەلالە رافیع و شەماڵی حاجی تایەر و نەبەز خالیدم ئەکرد هەم بۆ گۆڕینی شوێن و هەم بۆ پەیوەندیی سیاسی.

ژیانی ئیختیفا و کاری سیاسیی نهێنی لە سایەی دیکتاتۆریەتدا بابەتی ئەوەیە کە ڕۆمانی لەسەر بنووسرێت و بکرێ بەفیلمی سینەمایی. من کە دوای دووساڵ و چەند مانگێک لە زیندانی ئەبووغرێب ئازاد کرام ئەوەندە نەحەسامەوە کە ڕاکردنی بەکۆمەڵی هەموو خێزانەکامانی بەسەرداهات. ئەو شێوە ژیانەی چالاکوانی سیاسی نهێنی لە ژێردەسەلاتی ڕژێمێکی خوێنخۆر و دڕندەی وەکوو بەعسدا سایکۆلۆجیەتێکی تایبەتیی لای تۆ ئەخوڵقاند. ئەیکردی بە ڕۆبۆتێکی تایبەت کە سڵ لەهەموو شتێکی غەریب بکەیتەوە. هەمیشە سێبەری مەرگ و گرتن بەسەرسەرتەوەیە. مەهارەت و تەکنیکی خۆی ئەویست تا نەبیت بەداوی دەزگاکانی ڕژێمەوە. دەبوایە واز لە زۆر حەز، ئارەزوو، خولیا، خۆشی وریتمی ژیانی ئاسایی پێشووت بهێنی ئەگینا ئەژدیهای دەسگیری هەڵت ئەلووشێ. لە هەمووشی ناخۆشتر دونیای دڵڕەقی ژیانی سیاسی و گرووپچێتیی چەپ بوو کە زۆر بە ئاسانی لە هاوڕێ و دۆستی نزیک و هاوچارەنووسەوە تووڕی هەڵئەدایتە ڕیزی " دوژمنی چینایەتی "یەوە. ئەوەی زیندە یاد جەبار

مستەفا لەو کتێبەدا باسی ئەکا، جا نازانم تا چەند مایەی ئیستێکی قووڵی ویژدانی بووبێت بۆ خۆی، کە ئەڵێ " ماڵی ئێمە و مؤید نزیکی یەکبووین و دواتریش ئەڵێ تا پیکهێنانی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری یەکمان نەدیەوە "، بۆ من مایەی تێفکرینێکی قووڵە لەم دیاردەیەی کە پێی ئەڵێن چەپ و کۆمۆنیزم.

ئەوکاتەی پاش گرتنی شوێنی خۆشاردنەوەکەمان لە هەولێر لە قەمچووغە دانیشتبووم، ئەمجەد غەفوور هات بۆ سەردانم. پاش هەندێ قسە و باس من ڕاشکاوانە بڕیاری وازهێنانی خۆم پێووت وئەویش گەڕایەوە. دوای گرتنی ماڵەکەمان و کەشف بوونەوەی سەرلەنوێی ناوی من لە وەکرەکە لەلایەن ئەمنەوە، لە ڕێگەی نەجاتەوە هاوڕێیانی ڕێکخراوی کارگەران بەڵێنی ئەوەیان پێدابووم کە هەویەیەکی تەزویرم بۆ پەیدابکەن چونکە وەزعی ئەمنیم چەندبارە وێران بووە. بەهەموو بڕوایەکم پێموابوو کە ئەمجەد لەم سەردانەدا هەویەکەم ئەداتێ چونکە بەتەواوی ئاگاداری بارودۆخەکەم بوو بۆیە پێش ماڵئاوایی وتم: ئەرێ هەویەکەم نادەنێ؟ ئەو بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: هەویەیشت ئەوێ؟ ئیتر زانیم کە دوای ئەو چەند ساڵە لە تێکۆشانی هاوبەش لە ڕیزی (کارگەران) دا و گیرۆدەبوونم بە خراپترین وەزعی ئەمنیەوە ئەم هاوڕێیانە چەند دڵڕەقن و تا چ ڕادەیەک ئامادەن سنووری هەموو بەها مرۆییەکانیش تێپەڕێنن کاتێک کە بەوپەڕی دیسپلینەوە ڕیزەکانی ئەوان جێدێڵیت!!

ئەو ڕەهەندە ئەخلاقی و مەعنەویەی پشتی ئەو هەڵوێست و سوونەت و کردارانە، توخمێکی گرنگ لە دونیابینیی ڕاستەقینەی ئەو بزووتنەوە و ڕێکخراوە سیاسیانە کەشف ئەکات. ئەوانە گەر دیاردەی نەشاز و دانسقە و دەگمەن بوونایە، یا لەناو ڕێکخراو و حیزبێکدا باو بوایە و لای ئەوی تر نا، لەم وڵاتی سیخناخ بە سوونەت وکەلتووری دیکتاتۆری هەبوایە و لەناو چەپی وڵاتانی دیموکراتیدا نەبینرایە بەهەرحاڵ. گەرچی ئەوانە نموونەی بچووکن، بەڵام بەداخەوە لە

پانتــایی هەمــوو دونیــادا ڕەواجیــان هەیە و بەشــێکن لە تەقالیــدی سەرسەختی ناو ڕێکخراوە کۆمۆنیست و چەپەکان.
گەرچـی لە ڕەوتـی مێژویـی گێڕانەوەکـان دەرئەچـم بەڵام پێمخۆشـە نمـوونەیەکی تـر لەو سـوونەتانە بگێـڕمەوە لە جەرگەی کەلتـووری دیموکراسیی ڕۆژئاواییدا.
ساڵی ١٩٩٥ تازە گەیشتبوومە ئوسترالیا کە لە ئەنجامی چالاکیەکی حیزبی کۆمۆنیستی کریکاریی عێراقدا هەندێ هاوڕێمان لە خوارووی عێراق کەوتنە بەرشالاوی ڕژێم ودەسگیرکران. ئێمەش لە ئوسترالیا وەکوو ولاتانی تر کەمپەینێکمان ریکخست بۆ کۆکردنەوەی هاوپشتی بۆیـان و فشـارهێنان بـۆ ڕژێمـی عێـراق تـا ئەو هاوڕێیـانە لە مەرگ ڕزگار بکەین. داوامان لە دام و دەزگا دەوڵەتیەکان و ڕێکخراوەکانی مـــافی مـــرۆڤ و پەرلەمانەکـــان و ڕێکخـــراوە کۆمۆنیســـتی و کرێکاریەکـــانیش ئەکـــرد بـــۆ نـــاردنی نـــامەی نـــاڕەزایەتی بـــۆ باڵوێزخانـــەکانی عێـــراق و حکـــوومەت وداواکردنـــی ئـــازادیی ئەو هاوڕێیانەمان. ئەوکاتە حیزبی لیبرالی ئوسترالی لەسەر کار بوو کە حزبێکـــی ڕاســـتڕەوە و ئـــێمەش وەکـــوو حیزبـــی کۆمۆنیســـت ئەو کەمپەینەمان ڕێکخستبوو. وەزیری دەرەوە و ئەندام پەرلەمانەکانیان و هەمـــوو لایەنە سیاســـی و نیقابیەکـــان بە ســـنگی فـــراوانەوە بەدەنگمانەوە هاتن. تەنیا ڕێکخراوێکی بچووکی کۆمۆنیست مابوو و دوای چەند ماوەیەک بۆ سۆراغی مەسەلەکە لە گەڵ فارس مەحموود ئەندامی ئەوسای کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا بەتەلەفوون قسەمان لەگەڵیان کرد، بەڵام وەڵامەکەیان تووشی شۆکی کردین. ئەوان ڕێک وتیان ئێمە ناتوانین نامەی وا بۆ پشتیوانی ئێوە بنێرین چونکە هێڵی فکری و سیاسیی ئێمە و ئێوە جیاوازە! هەرچەند ئێمە وتمان واز لە خەت و بـاوەڕی فکـری بهێـنن و بـابەتەکەی ئـێمە پەیوەندیـدارە بە کۆمەڵێک مرۆڤەوە کە لەبەر مەترسیی مەرگدان، بەڵام بێسوود بوو.

دەمێک بوو لەگەڵ جەباردا بە نیازی سەردانێکی عوسمان و ستار محمد (فوئاد سادق) بووین لە کەلار. ئەوان هاوڕێی نزیکمان و دوو کەسایەتیی گرووپەکەی زیندان بوون. من لە سەردەمی کارگەراندا پەیوەندی ڕاستەوخۆی ڕێکخراوەییم لەگەڵیاندا نەبوو، بەڵام هەستم ئەکرد کە ئەوانیش پەیوەندیان بەکارگەرانەوە هەیە و هاوکات لەگەڵ ئێمەدا وازیان هێناوە. جارێکیش ستار بۆ سەردانی من ڕۆیشتبوو بۆ قەمچووغە بەڵام من لەوێ نەبووم. تا ئەوکاتە بەهۆی ئیختیفاەوە نەمئەتوانی بیانبینم، بەڵام لە ڕێگەی جەبارەوە هەواڵیانم ئەزانی. نەجاتم ئاگادارکردەوە کە بۆ چەند ڕۆژێک نایەمەوە و ئەڕۆم بۆ سەفەر. ئەوان دوای ئەوەی لە کەرکووک ئەگوێزنەوە لە کەلار نیشتەجێ ئەبن و بە کاری زەڕەنگەریەوە خەریک بوون. دوای ٢ شەو مانەوە لە گەڕانەوەدا لە نەقلیاتی کەلار ئاگاداریان کردین کە دوێنی لە سلێمانی (منع التجول) بووە وهێشتاش ڕێگە بۆ سلێمانی نەکراوەتەوە. ئێمە کە دەیان هاوڕێمان لە سلێمانی داواکراوی دەزگاکانی ڕژێم بوون و ئیختیفا یا ڕاکردووی سەربازی بوون و بەتایبەتیش بۆ نەجات کەوتینە دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە. ماڵی هەر یەکێکیش دەیان نووسراو و کتێب و بابەتی قەدەغەی تیابوو. لەبەرئەوەش کە لەساڵی ١٩٦٣ بەدواوە (منع التجول) نەکرابوو، کەس پێشبینیی نەئەکرد تا ئامادەیی خۆی وەرگرێت. شاری سلێمانیش جگە لەوەی کە خۆی هەزاران چالاکوانی سیاسی و ڕاکردووی سەربازیی تیا بوو، لەهەمان کاتدا سەدانی وەکوو منیش لەشارەکانی ترەوە پەنای دابووە ئەو شارە بۆ خۆشاردنەوە لەدەستی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێم. عوسمانیش کە ئێمەی گەیاندبووە نەقلیاتەکە بە زانینی هەواڵەکە هەر لەگەڵماندا وەستابوو تا بزانین هەواڵێکی تازەمان دەستناکەوێت. دەوروبەری نیوەڕۆ سەیارە لە سلێمانیەوە هاتنەوە بۆ کەلار و ئێمەش لەگەڵ یەکەمین سەیارەدا گەڕاینەوە. بەهەرحاڵ بێ کێشە گەیشتینەوە ناو شار و لە سەرکارێز دابەزین و

تا مامۆستایان لە ترسی مەفرەزەی ناوشار لەگەڵ جەباردا پێکەوە بە پێ ڕۆیشتین بۆ ماڵی ئەوان. شار بۆنی خوێنی لێدێ و مەفرەزە بە جادەکاندا بڵاوەیان لێکردووە و خەڵک تووڕە و خەمبارن. تا ماڵی جەبار نەوەستاین و بەوە باش بوو کە سیروانی برای جەبار ماڵی پاک کردبۆوە بەڵام باوکی جەبار زۆر تووڕە دیاربوو. لەوێ زانیم کە نەجات سەلامەتە و لە جەبار جیابوومەوە و بە وریاییەوە گەڕامەوە بۆ سەرشەقام. لە ماڵی نەجات دانیشتم تا جوابیان بۆ نارد و هاتەوە.
وتی: باش بوو لێرە نەبوویت چونکە وەزع تا بڵێیت ناخۆش و دژوار بوو.
ئەو درێژەی پێدا: سەدان کەس دەستگیر کراون و قسە هەیە کە هەندێکیان لە فولکەی نالی و حامیە گولەباران کردووە. ئەوەی تۆ بیناسیت سەلامەتن و دەرباز بوون. من بۆ خۆم زوو فریاکەوتم و خۆم گەیاندە خەستەخانەی جامیعەکە و لەوێ لای هاورێیەکی دکتۆرم جلی دکتۆرم لەبەرکرد و سەماعەیەکم بەست و بە قاوشەکاندا پیاسەم ئەکرد و تا ئێوارە لەوێ مامەوە.
لە کاتی پشکنینی ماڵەکەماندا شتێکی سەیر ڕوویدابوو. مەفرەزەکان زۆر سڵیان لە ماڵان ئەکردەوە و زۆر ئەترسان. ژووری سەرەوەی ماڵی نەجات زۆر تاریک و نووتەک بوو. لەبەر باداری هەمیشە، باوکی نەجاتیان بەدوو سێ بەتانی دائەپۆشی و خۆشی بە دوو جامانە دەم و چاوی هەڵئەپێکا. کە مەفرەزەکە ئەڕۆنە ئەو ژوورە تاریکەوە ئەترسن لەو کەسەی کە لە ناو جێگەکەدایە ونازانن کە ئەو لەبەر نەخۆشی ئاگای لە خۆی نیە. ئەوان ئەنەڕێنن بەسەر دایکی نەجاتدا ودەڵێن (شنو هاي)؟ ئەویش نازانێت لە جیاتی (هذا مريض) ئەڵێ (هذا معارض)! کە وائەڵێ ئەوانیش ئەترسن، چونکە پێشتر ئەوەیان بردبوو بە مێشکیاندا و پێیان وتبوون کە (مخربين) خۆیانتان لێ ئەگۆڕن بۆیە میلی تفەنگیان هێنابووەوە و حاجیش لە جێگەکە خەبەری بووبووەوە و دایکی نەجاتیش عەلاگەیەک دەرمانی

دەرهێنـابوو و بـۆ ئەوەی ڕازییـان بکـات دیسـانەوە وتبـووی (واللـه معارض) تـا ئەوان تێگەیشـتبوون وتبوویـان: کچـێ بلّـێ (مـریض) بـاش بوو نەمان کوشت.

لەمـاڵەوە نووسـراوە و بـابەتی نهێنیمـان هەبـوو کە نەجـات دایکـی ڕاسپاردبوو بیان شـارێتەوە و پێش ئەوەی نۆرە بگاتە ئەوان بـاجی ئافتاوی دایکی هەمووی شاردبۆوە. نەجات دواتر وتی: کاتی ئەوە نیە درێژەی وەزعەکەت بۆ باس بکەم با فریای خۆمان بکەوین، چونکە قسە بڵاوە کە سەرلەنوێ و جارێکی تر (منع التجول) ئەکەنەوە و ئەو هێـزەی لە کەرکـووکەوە بـۆ ئەو مەبەسـتە هێناویـانە هێشـتا نەگەڕاونەتەوە. هەمـوو شـارەکە لە دلەڕاوکێدا ئەژیا. زۆر بەزەحمەت جـێگەیەک یـا ماڵێکـت دەسـئەکەوت کە جـێگەت بـکەنەوە. کەوتینـە تەگبیـری ئەوەی چـی بکەیـن و ڕوو لە کوێ بکەیـن باشـە؟ گەیشـتینە ئەو بڕیـارەی کە ئێسـتا دەرچـوون بـۆ لادێکـان بـاش نـیە و ئەو بژاردەیەمان خستەلاوە. لە ئێستاشدا ڕەنگ بێ سەیتەرەکان لیستیان پێبێـت بـۆ گەڕان بەدوای ئەوانەی خۆیـان شـاردۆتەوە و فەرمـانی گرتنیـان لەلایەن ڕژێمەوە هەیە، بۆیە بـا ١-٢ ڕۆژێـک لە نـاو شـاردا خۆمـان حەشـاربدەین و هەواڵـی سـەیتەرەکان بـزانین و گەر فشـار لەوێ زۆر نەبـوو ئەڕۆیـن بۆ بەغـدا. مـن پیشـنیارم کـرد بـا ئەمشـەو هەردووکمـان پێکەوە نەبین تـا گەر گیـراین هـیچ نەبێ هەردووکمـان دەسگیرنەکرێین. ئەو وتـی: مـن چۆن تـۆ بەجێبێڵم؟! بەڵام مـن دڵنیـام کردەوە کە بۆ ئەمشەو جێی خۆم ئەکەمەوە و سبەی یەک ئەبینینەوە تا تەگبیرێکی تر بکەین. وەستا برایمی حـاجی ئەحمەد کوڕێکی خزمم بوو مـاڵی لای ترایەکە بـوو. ئەو برایەکـی لە شـەڕی ئێرانـدا دیل بـوو، بۆیە بۆ ئەم کاتە جێیەکی گونجاو بوو. شـەو ڕۆیشـتم بـۆ مـاڵی ئەوان و زۆر بەدڵفراوانیەوە جێی کردمەوە و زۆریـش نیگەرانـی هەواڵـی مـن بـوو، چـونکە ئەیزانـی بە قاچـاخ لە سـلێمانی ئەژیـم. ئەو شـەوە هـیچ نەبوو و سبەی وەستا برایم گەیاندمیە ماڵەکەی خۆمـان لەسەرشـەقام

و ئاگاهانە شوێنەکەم پێناساند تا گەر شتێک هەبوو لێرە بمدۆزێتەوە و ئاگادارم بکات. گەرچی نەجات لەڕێی شۆفێری برادەری خۆیەوە لە خەتەکـانی دەرەوە لەوە دڵنیـابوو کە ســەیتەرەکان زۆر توونـد نـین، بڕیارماندا شەوێکی تریش لەشار بمێنینەوە و سبەی بڕۆین بۆ بەغدا و ماوەیەک لە ئوتێلە گرانبەهاکانی ئەوێ بمێنینەوە، چونکە ئەو جۆرە ئـوتێلانە کەمتـر جێـی گومـانن. عەسـری هەمـان ڕۆژ نەجـات وتـی ئەمشــەو ئەڕۆیـن بـۆ مـاڵی تەهـای حــەمە ســەعید کە هــاوڕێیەکی ئەنـدازیاری خـۆی بـوو و منـیش چەنـد جارێـک لە دانیشـتنی یـانەی ئەندازیاران بینیبووم. ماڵی کاک تەهـا لە گەڕەکی ئەندازیاران بـوو لە بەرانـبەر نەقلیـاتی گەورەی شـار. نەجـات وتـی قەیناکـا بـا ئەمشــەو دانەبـڕێین لە یەک و ئەو گەڕەکە لە ڕووی ئەمنـیەوە ســەلامەت تـرە. تەهـا ئەیزانـی کە نەجـات سـەروکاری لەگەڵ کـاری سیاسـیدا هەیە و گومانیشی هەبوو کە منیش هاوکاری ئەوم. لە ماڵەوە پێشوازیەکی وا گەرمـی لێکــردین کە زانیمــان نیشــانەی ئەوەیە کە دەســت نانێــت بەڕوومانەوە و یەکسەر وتی: بیانوو نەهێننەوە ئەمشـەو میوانی منن، وئێمەش گەرچی لە کۆدەکە تێگەیشتین، بەڵام بۆ مجامەلە وتمان تەنیا بـۆ ســەردان و پرسـیاری هەواڵـت هـاتووین و ئەبـێ بـڕۆین. تەهـا لەوکـاتەدا بەدەم قسەکردنەوە لە مەتبەخەکە بە دوو بیرەوە گەڕایەوە و وتی: بەشەرەفم نابێ بەهیچ لایەکدا بڕۆن و ئەمە جێگاتـانە. ئێمەش چـونکە هەر بـۆ ئەوە هـاتبووین کە بمێنیـنەوە چـی لەوە باشـترە وا بەحورمەتیشــەوە پێشــوازیت لێـبکەن، بـۆیە وتمــان لەبەر دڵــی تــۆ ئەمێنیــــنەوە. هەرکە وامــــان وت هاوســــەرەکەی لە یەکێــــک لە ژوورەکانەوە بانگی تەهای کرد و دوای چەند قسە لەم و لەو بوو بە هەرا. تـومەز هاوسـەرەکەی کە منـی نەئەناسـی و لەگەڵ نەجاتـدا لە دائیـرەیەک پـێکەوە کاریـان کردبـوو ئەیزانـی ئەم، بە قەولـی خەڵـک، سـەربەگۆبەنە، پێـی خـوش نەبـوو لەم زروفە سـەختەدا مـاڵ لە خـۆی وێران بکات بۆ شتێک کە ئیشی ئەو نەبوو و بڕواشی پێ نەبوو. ئیتر

تەها تووڕە بووبوو و کە زانی ئێمەش لە کێشەکەیان تێگەیشتین هات وئێمەش وتمان کاکە ئێمە ئەبێ بڕۆین و نەجات پێی وت تەها گیان ئێمە گرفتی جێگەمان نیە و ئەتوانین چاری خۆمان بکەین و با نەبینە هۆی سەرئێشە بۆ ئێوە و ئەویش ناهەقی نیە و زرووفەکە گاڵتەی لەگەڵدا ناکرێ. کاک تەها ئەوەندی تر شێت بوو و هەڵیدایەوە بەدەنگی بەرز ڕووشی لەو ژوورە ئەکرد کە هاوسەرەکەی تیابوو ونەڕاندی: بەشەرەفم گەر هەمووشمان لێرە ڕەمی بکەن ئێوە ناڕۆن تا ئەم وەزعە بەلایەکدا ئەکەوێت و چی بەسەر ئێوە هات با بەسەر ئێمەشدا بێت. بە هەرحاڵ تەها ئاگری لێ ئەبوەوە وبە پێکەنینێکەوە سوێندی لە ئێمەش خوارد گەر بڕۆینە دەرەوە خەبەرتان لێ ئەدەم!

ئەو شەوە ماینەوە و هاوسەری تەهاش بە ئیحراجیەکەوە دواتر بەخێرهاتنی کردین و خواردنی بۆمان ئامادەکرد و بۆ سبەی هەرچۆنێک بوو تەها دوای مکوڕبوون و ئیسرارێکی زۆری نەجات، ئیزنی داین.

دوو قۆڵی سەرێکی ماڵی جەبارمان دا و تێمان گەیاند کە نیازێکی وامان هەیە و ئەویش پێی باش بوو. لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە من و نەجات تەگبیری ئەوەمان کرد کە بۆ ماوەی دەوری هەفتەیەک لە بەغدا خۆمان بشارینەوە و بە تەلەفونیش ئاگاداری وەزعی ئێرە بین تا ئارام ئەبێتەوە و دێینەوە. من شڕە هەویەیەکی تەزویرم پێبوو کە بۆ ئەوە نە ئەگونجا بەسەر ئەو هەموو سەیتەرەیەدا و لەم زرووفە سەختەدا بەکاری بێنم. بڕیارماندا، گەرچی ڕیسک بوو، من دەفتەر خدمەی عەسکەریەکەی نەجات بەکار بهێنم. دەفتەرەکەی ئەو بە بڕیارێکی زۆر تایبەت تەسریح کرابوو کە لەهەموو عیراقدا ١٧٠ کەس بوون، بۆیە بانگ نەئەکرانەوە. ڕەسمەکەشی زۆر کۆن و تێکچووبوو بۆیە لەهەموو کەس ئەچوو. نەجات بۆ خۆشی پێشنیاری ئەوەی کرد کە هەویەی نیقابەی ئەندازیارانەکەی خۆی بەکار بهێنێت کە بەقسەی خۆی جێی گومانی زۆر نیە گەر لە سەیتەرەکان ناویان

پێ نەبێت و بەتایبەتی بۆ من نەگەڕێن. لەبەر ئەوەش کە هەویە و دەفتەر خدمەکە هەردووکیان بەناوی نەجاتەوە بوو نەئەکرا بەیەک سەیارە سەفەر بکەین بۆیە من بڕیارمدا لە خەتی کەلار وبەعقووبەوە بڕۆم و ئەویش لە کەرکووک و دووزەوە و ئێوارە لە چایخانەی کندی لە بەغدا بەیەک بگەین و بڕۆین بۆ ئوتێل شیراتۆن. بۆ ئوتێلیش من هەویەی ئەحوال مدنیی خۆمم هێنا تا بۆ ناونووسین ئەوە بەکار بهێنم. لە ڕێگا لە هەموو سەیتەرەکان بە بێ کێشە دەرچووم تا لە دەرەوەی بەعقووبە بەرەوە بەغدا مەفرەزەیەکی هاوبەشی ئەوکاتە کە پێکئەهات لە کەسێکی ئەمن و ئیستخبارات و جەیشی شەعبی و مونەزەممەی بەعسیەکان سەیارەکەمانیان وەستان. منیش پێشتر دەفتەر خدمەکەی نەجاتم لە گیرفانێکمدا و بۆ شوێن و کاتێکیش کە دوور بێ لەوەی بەتایبەتی بناسرێم، هەویەی زانکۆی بەغداکەی خۆمم هەر هەڵئەگرت. کە نۆرە هاتە سەرمن هەرچیم کرد نەموێرا دەفتەر خدمەکەی نەجات نیشان بدەم و لەخۆمەوە هەستم کرد ئەوەیان بۆ ئێرە باش نەبێت و هەویەی زانکۆکەم دایە دەستی یەکێکیان کە دیار بوو جەیشی شەعبیە. کابرا سەیرێکی کرد و پاشان سەیرێکی منی کرد و وتی: بەپێی بڕیاری تازە کە خۆشت ئەبێ باش بیزانیت ئێستا ئەبێ زانکۆکان ماوەی چوار ساڵەکە بە لانی زۆری ٥ ساڵ تەواو بکەن و ئەبێ تۆ ئێستا لە سەربازی بیت. قسەکەی ئەو ڕاست بوو، چونکە ئەوە بڕیارێکی (مجلس قیادة الثورة) بوو بۆ ئەو کۆلێجانەی کە ماوەی خوێندنیان ٤ ساڵە. منیش بێ ئەوەی خۆم بشڵەژێنم وتم: ڕاست ئەکەیت بەڵام کۆلیجی هەندەسەی معماری و قانوون ماوەی خوێندنیان پێنج ساڵە و ئەتوانن بە ٦ ساڵ تەواوی بکەن، و کابراش دیار بوو شارەزاییەکی ئەوتۆی نەبوو بڕوای کرد و وتی: ئێ ئێ وامزانی ئەوانیش خوێندنیان ٤ ساڵە، وبەو فرت و فیڵە کە ڕاستیش نەبوو ڕزگارم بوو.

لە گەراجی نەهزەوە بەتەکسیەک خۆم گەیاندە دەوروبەری چایخانەی (الكندي) و پاش ماوەیەک لەگەڵ نەجاتدا یەکمان گرتەوە و دیار بوو ئەویش بەقات و بۆینباغ و هەویەی نیقابەی ئەندازیارانەکەوە بەسەلامەتی گەیشتبوو. لە شیراتۆن جێمان گرت و ڕۆیشتین بۆ کەڕادە و دواتر شەوەکەی بۆ ئەبوو نەواس.

دوای یەک دوو ڕۆژ لە ناوچەی سەعدوون ڕیکلامی شانۆگەریەکمان بینی کە عادل ئیمام و محمد حسين عبدالرحيم و زۆر ئەکتەری تر لە هەموو ولاتانی عەرەبی بە هاوبەشی تیایدا بەشداربوون. ناوی شانۆگەریەکە بریتی بوو لە (ألف حكاية و حكاية من سوق عكاظ) کە ئەکتەری هەموو وولاتانی عەرەبیی تیا بەشداربوون کە یەکێک بوو لە چالاکیەکانی فیستیڤاڵی شانۆی عەرەبی کە هەر ساڵە لە پایتەختی ولاتێک وئەو ساڵە لە بەغدا ڕێکخرا. ئەو شەوە ڕۆیشتین بۆ ئەو شانۆگەریە و ڕۆژی دواتر ڕۆیشتین بۆ دەوروبەری چایخانەی (الكندي) کە جێی کۆبوونەوە و یەکتر بینینی کوردەکان بوو. ئەم چایخانەیە لە بەغدا پێیان ئەوت سەفارەتی کوردەکان. بەنەجاتم وت با نەڕۆین بۆ ئەوێ نەوەکوو خەڵکی ناسیاو بمان بینن و ئەو ناوە خەڵکی کوردی چاک و خراپی لێ کۆئەبێتەوە، بەڵام ئەو بەقسەی نەکردم. لەوێ کوڕێکی سەرباز بینیمی کە خەڵکی قەمچووغە و لایەنگری یەکێتی بوو و هێشتا وازی لە سەربازی نەهێنابوو. وتم نەجات ڕاپۆرتی ئەم سەفەرەمان ئەگات بە مەڵبەندی دووی یەکێتی و بۆم ڕوون کردەوە چۆن. زۆربەی شەوانیش نەجات هەر لە ئوتێلەکەوە پەیوەندیی تەلەفوونی بە سلێمانیەوە ئەکرد و کە دڵنیا بووین وەزع ئارام بۆتەوە بەهەمان شێوە و ڕێگە گەڕاینەوە.

نەجات دەستی کرد بە پەیوەندی و گەڕان تا بزانین ووردەکاریی ئەم هێرشەی ڕژێم چی بووە و بە وریایی و سەلیقەی خۆی نوسخەیەک لەو لیستەی دەستکەوت کە بەدەستی هەموو مەفرەزەکانەوە بوون کە ناوی ئەو کەسانەی تیا بوو کە بۆیان ئەگەڕان. لیستەکە ٢٦٩ کەس

بوو. ناوی من و نەجات و چەند ئاشنایەکی تری تیا بوو کە یەکێکیان هاوڕێیەکی کەرکووکیی من بوو کە کاتی خۆی لە زیندانی سەربازخانەی سەلام لای تاسلووجە ڕای کردبوو و بوو بەپێشمەرگەی یەکێتی. ئەو حەملەیە قوربانیی زۆری لێ کەوتەوە و زۆر توونـد و تیژ بوو. هەر مەفرەزەیەک پێکهاتبوو لە ئەمنێک و ئەندامێکی حیزبی و کەسێکی ئیستیخبارات و یەکێکی جەیشی شەعبی. زۆربەی ئەو هێزە لە کەرکووک و شارەکانی تری عێراقەوە هێنرابوون و لە کەرکووک کۆبوونەوەیان پێکرابوو. ئەم هێزە هەڵبژاردەیە مێشکیان پڕ کرابوو لەدژی خەڵکی سلێمانی و کوردستان و وا تەرتیب کرابوو کە لە ناوخۆشیاندا متمانە بەیەکتریش نەکەن. پێیان وتبوون کە شارەکە پڕە لە (متمرد) و ڕێکخراوی (مخربین). نەجات وتی کەسێکی چەپی وەکوو خەباتی شێخ محەمەد کە هاوڕێیەکی خۆی بوو بە بیانووی دۆزینەوەی کتابی (الاشتراكية الطوباوية والاشتراكية العلمية)ی فریدریک ئەنجلز لەماڵەکەیدا، گولەباران کرا.

دوای نزیکەی هەفتەیەک سێ قۆڵی لەگەڵ جەباردا کۆبووینەوە. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە سەر بارودۆخی تازە پێشنیاریان کرد کە من بۆ ماوەیەک بگەڕێمەوە بۆ قەمچووغە تا وەزع ئارامتر ئەبێتەوە و پێ ئەچێت مەسەلەی (ئەمر قەبزی) من و نەجات دووبارە دوای کەبسکردنی وەکرەکەی هەولێر و گرتنی هەویەکەم لەوێ گەرم بووبێتەوە، بۆیە ناومان لەو لیستەدا هەبووە. منیش بە قسەی ئەوانم کرد و گەڕامەوە بۆ قەمچوغە.

هەر کە گەیشتمەوە پێیان وتم کە مەفرەزەیەک لە مەڵبەندی دووی یەکێتیەوە هاتوون بەدوای تۆدا و لیستێکی ١٣ کەسیان پێ بووە کە هەندێکیان ناوی ئەو کوڕە کەرکوکیانە بوون کە پەنایان بۆ قەمچووغە هێنابوو، جگە لە چەند کوڕی تری دێیەکە کە هاوڕێتیی ئەوانیان ئەکرد. منیش زۆر گوێم پێ نەدا و لە ڕێی ئەو کوڕانەوە

بیستم کە زەخت و زۆری یەکێتی زیادی کردووە و بیانووی ئەوەیان پێ گرتوون کە ئێوە چالاکیی سیاسیتان هەیە و بە قەولی ئەوان (عێراقچی)ن. یەک دوو ڕۆژێک دوای ئەوە پێشمەرگەیەک کە بێستوون سابوراوایی کادری ناوچەی دووکان ناردبووی لەدەرگای دا وتی: لێپرسراوەکەمان داوات ئەکا. لەگەڵیدا ڕۆیشتم بۆ ناو دێ و هەرکە گەیشتمە لای وتی لە مەڵبەندەوە داوایان کردووی و بەپەلە برۆ. منیش بەکەم بایەخیەوە وتم باشە کەی بۆم کرا ئەڕۆم. نەڕاندی بەسەرمدا وتی: ئاقڵ بە تۆ مەفرووز بوو بە دەسبەسەرکراوی بتبەین کەچی ئاواش قسە ئەکەیت؟ لەسەر ئەوە دەستمدایە یەخەی و لەناکاو چەند پێشمەرگەیەکی کەرکووکیی تیپی ٢١ کە میوانی ماڵی ئێمە و هاوڕێم بوون پەیدابوون و پەلاماری بێستوونیان دا و بەربوونە سەرو گوێلاکی. بەهەرحاڵ ئەوان وتیان تۆ هەقت نەبێ و ئەوە شەڕی ئێمەیە و لەوکاتەدا باوکیشم پەیدا بوو کە وا تووڕە بووبوو بەکەس داگیر نەئەکرا. دێیەکە شلەژاو بێستوون دوای ئەوەی لێیدرا لەگەڵ دوو پێشمەرگەی هاوەڵیدا بۆ شکاتکردن ڕێی سەرگەڵوویان گرتەبەر. ئێمەش هەموومان ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە. ئەو پێشمەرگانەی میوانمان زۆر تووڕە بووبوون و وتیان ئێستا ئەچین بۆ مەڵبەند یا هەموومان چەک دائەنێین یا ئەبێ ئەو بێستوونە محاسەبە بکەن. منیش وتم گەر ئەڕۆن منیش دێم. نانمان خوارد و پێکەوە لەگەل باوکم و هیوا چاوشین وجەلیل بیکەیسی و یەکێکی تر کە ناویم لەبیرنەماوە بەرەو مەڵبەندی دووی یەکێتی لە سەرگەڵوو بەڕیکەوتین کە ئەو سەردەمە قادری حاجی عەلی لێپرسراوی بوو. هیوا و جەلیل و هەموو پێشمەرگەی یەکێتی ئەیانزانی من هەڵوێستم چۆنە بەرانبەر یەکێتی، بەڵام ئەیانووت ئەوە مەوزووعی سیاسیە و ئێمە چۆن ڕێگە ئەدەین پەلاماری تۆ بدرێت.

بێستوون پێش ئێمە لە مەڵبەند شکاتی کردبوو و بەقەولی خۆی بۆمنی تێچاندبوو کە ئەم کەسێکە لە دژی شۆڕش و پێشمەرگە و

یەکێتی و دڵی پێشمەرگە و خەڵک سارد ئەکاتەوە و خەریکی کاری ڕێکخستنە لە ناوچەکە و لەوجۆرە قسانە. وتبووشی بەشایەدی ئەو دوو پێشـــمەرگەیەی هـــاوەڵی خـــۆی لە ناوەڕاســـتی دێـــیەکەدا ئەو پێشمەرگانەی تیپی ٢١ لە جیاتی بەرگری کردن لە ئەم، لێیانداوە و لایەنی عدنانیان گرتووە.

کە گەیشتینە بارەگای قادری حاجی عەلی باوکم دەستی کرد بە هاوار وتی: لە هەر دێیەک خوێڕییەکتان داناوە بۆ گیانی خەڵک، و قادریش کە ئەیویست باوکم ئارام بکاتەوە تا قسە بکات بە هیوا و جەلیلی وت: ئەوە ئەو پیاوە (مەبەستی من بوو) بیروباوەڕی جیاوازە، بەڵام ئەی ئێوە بۆ پەلاماری بێستوونتان دا کە کادری ئێمەیە؟ جەلیل بیکەیسیش کە کوڕێکی کەڵەگەتی کەرکووکی بوو و لە حەفتاکاندا لای ڕێکخراوە فەلەستینیەکان بووبوو بە فیدائی و دواتر لە ٩٣ دا بەدەستی یەکێتی گولەباران کرا، دەستێکی بۆ لای من درێژ کرد وتی: کاک قادر من لە قۆناغی ئەی ڕەقیبدام و زۆر شت نازانم، بەڵام ئێمە لە کەرکووک لەمـانەوە فێـری سیاســەت وخـۆڕاگری ئەبـووین، ئێسـتا لەبەرچـاوم پەلامار بدرێ چۆن قەبووڵی ئەکەم؟

قادری حاجی عەلی کە لە تەنیشت منەوە دانیشتبوو وتی: ڕاپۆرتی زۆر لەسـەر تـۆ دەگـات پێمـان و ئـێمە نیـازی دەسـگیرکردنی تۆمـان نەبـووە، بەڵام جموجـۆڵی تـۆ زۆر زیـادی کـردووە و تەنـانەت لە بەغداش بینراوی؟ کە وای وت زانیم مەبەستی ئەو کوڕە سەربازە قەمچـووغەییە کە لە بەغـدا لەگەڵ نەجـاتی هاوڕێمـدا لە ڕاکـردن لە دەستی وەزعی ئەمنیی سلێمانی بینیمانی، بۆیە وتم: کاک قادر من هـیچ ئیلتیزامێکـی ڕێکخـراوەییم لەگەڵ ئێـوە نـیە و لەبەر مـاڵی بـاوکم جاروبار دێم بۆ دەرەوە، ئەگینا من لە ناو شار ئیختیفام و ئازادم بۆ کوێ بڕۆم و چی بکەم. جگە لەوەش ئێوە دڵی چیتان بە کەسێکی ڕاپۆرت نووس لەسەر من خۆشە کە خۆی خەڵکی دێیەکە کە دەیان کەس لە کەرکـووکەوە ڕادەکەن تـا لەوێ لە دەسـتی ڕژێـم خۆیـان

حەشـــار بــدەن، کەچــی ئەم ئەچــێ خزمەتــی ســـەربازی بەو ڕژێــمە ئەکات....... و ویستم نـاوی بێنم بـەڵام ئـەو وتـی: نـا تکایە نـاوی مەبە. پاشان وتی: وایە ڕاستە و بایدایەوە بە چرپە پێی وتـم: کاکە ئێمەش ساڵی ١٩٧٤ لە پێنجوێن بووین تووشی ئەوجۆرە فشارانە ئەبووینەوە لە لایەن پاراســتنی پـارتیەوە لە دەرەوە، بـۆیە تـۆش ئاگـاداری ئـیش وکــاری خــۆت بە. پــێش گەڕانەوەمــان قــادری حــاجی عەلــی داوای لێبــووردنی لە بــاوکم کــرد کە نەئەبــوایە ئەو ڕێــگە دوورە ببڕێــت و گەڕاینەوە.

من خۆم هەڵوێستی نەرمـی قادری حـاجی عەلیم بۆ ئەوە دەگێڕایەوە کە هاوســۆزیی لەگەڵ ئـاڵای شۆڕشــدا بــووبێ و پــێش دەســتگیری کردنیـــان ئەوەم لە شـــێخ عەلـــی بیســـتبوو کە زۆر هەن لەنـــاو سەرکردایەتی و کادرەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانن و لایەنگری ئەوانن، بەڵام چاوەڕێی ئەوە ئەکەن کە تـای تەرازووی ململانێکە بەلای ئـاڵای شۆڕشدا بشکێتەوە.

لە قەمجووغە مامەوە، چونکە وەزعی ئەمنیی سلێمانی تا ئەهات بەرەو خراپتـر ئەچـوو و ســەرکوت و مــاڵ گەڕان و زیـادی ئەکـرد و زۆر نیگەرانی هاوڕێکانم بووم لەوێ و لە باقی شارەکان. وەستا جەلال کە بەهۆی گرتنی خانوەکەی هەولێرەوە وەزعـی ئەمنیی تێکچووبو، هـات بۆ قەمچووغە و لەگەڵیدا وەکوو سپۆنســەر بـردم بـۆ پێشـمەرگایەتیی کۆمەڵە و ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە. نەجات و زۆر هاوڕێی تـر ئەو ماوەیە ئەهاتن بۆ سەردانم. دوای لێدان لە ئاڵای شۆڕش وتەسفیەیان، یەکێتـی زۆر توونـدتر مـامەڵەی لەگەڵ هەر نـاڕەزایەتیەک ئەکرد کە لە دێهاتەکــان یــا لە ڕیزەکــانی هێــزی پێشــمەرگەدا ببینــرایە. نەزعەی ســەرکوت و عەسکەرتاریەت بووبوو بە خەسڵەتی دیـار و ســەرەکیی یەکێتــی و بەبیــانووی (بــارودۆخی نائاســایی شــۆڕش) و مەترســیی ئەمنیەوە، فایلی ئاڵای شۆڕشیان کردبوو بە بیانوو بـۆ ســەرکووت و تەسـککردنەوەی ئـازادیی دەربـڕین. ئەمزانـی مەترسـیی مـانەوە لەبەر

دەستی یەکێتیدا بۆ من تادێ گرانتر ئەبێ و لەگەڵ نەجاتدا ئەوەم باسکردبوو و وەڵامی ئەو ئەوەبوو کە هەوڵ ئەدەین جێیەکی گونجاو لە شار بۆ نێشتەجێبوونمان پەیدا بکەین، بەڵام با پەلە نەکەین.
هەموو مانگێکی پێنەچوو، ئێوارەیەکیان دیسانەوە پێشمەرگەیەک هات بەدوامدا وتی خۆت بگۆڕە بەرپرسەکەمان کارێکی پێتە. تەنها خۆم و دایکم لە ماڵەوە بووین و پرسیم بەرپرسەکەتان کێیە وتی "هەڵۆی ئەحە سمێڵ" گەر ناوەکەم لە بیر نەچووبێت و ناوەکەم بەدایکم وت و دوای کەوتم بۆ ناو دێ و لەوێ چاوم پێی کەوت و ڕاستەوخۆ وتی ئەمری گرتنت دەرچووە و فەرمووو وەرە لەگەڵماندا. ئەو ڕۆژە ئاگاداربووم کە کۆمەڵێکی زۆر پێشمەرگەی تیپی ٢٣ ی سووورداش لە ناو دێیەکەدان. وتم ئەچم دایکم ئاگادار ئەکەم کە شتێکی واهەیە و دێمەوە بەڵام ڕێگەی نەدام. بەو تاریکانەی ئێوارە و لە کاتێکدا ئەمان لە بەیانیەوە لێرەن و هیچ دەنگێکیان نەبووە دڵمی خستمە مەترسیەوە بەڵام بیریشم لەوە ئەکردەوە تیرۆر کردنیش وا نابێت گەر نیازی وایان هەبێت. لەبەرچاوی دێیەکە منیان لەگەڵ خۆیان برد لە گەڵ هێزەکەیان بەئاراستەی سووورداش بە بناری شاخی سارادا. کاتەکەی کۆتایی ١٩٨٥ بوو بۆیە سارد بوو. چەندجار بەدەم ڕێگاوە لە هەڵۆم پرسی کە لەسەر چی منتان گرتووە؟ ئەیووت سەرکردایەتی ئەزانێت و تەنها ئەو وەڵامەی دەدامەوە. لە نیوەی ڕێگادا بووین پێشمەرگەیەک هاتە لامەوە و ئەو دوانەی ئیزندا کە هەڵۆ چاودێریی منی پێ سپاردبوون و بەدەم ڕۆیشتنەوە بردمی بەرەو ڕیزی دواوەی پێشمەرگەکان وزۆر بەڕێزەوە خۆی پێناساندم وتی: من "هیوا باڕۆی"یم و یاریدەدەری سەرتیپی ٢٣ ی سووورداشم. منیش ناویم بیستبوو کە کوڕێکی تێکۆشەری پاک و قەدیمیی پێشمەرگایەتی و لە کۆمەڵە کۆنەکانە. زۆر ناڕەحەت بوو بەگرتنی من و وتی: بڕوا بکەم هیچ کەس نەیوتووە کە فلانەکەسمان گرتووە و گەر ناوی تۆیان بهێنایە نەمئەهێشت و زۆر خەجاڵەتم. هەولمدا بزانم ئەو ئاگاداری

چیە وتی باوەڕ بکە نازانم بەڵام کە گەیشتینە سووورداش بۆ مانەوەی ئەمشەو من و تۆ ئەڕۆینە ماڵێک تا لەمن دانەبڕێیت. لە سووورداش هیوا قسەی لەگەڵ کاکی سەرتیپدا کردبوو کە من و ئەو پیکەوە تەوزیع ئەبین. لەوێ دەستمان کرد بەقسە و وتی: من ئەمزانی تۆ لەقەمچووغە دائەنیشی و سێ براشت پێشمەرگەن و خۆتیش چۆن بیرئەکەیتەوە. منیش ڕاستیەکەی وەکوو ئێوە بیر ئەکەمەوە بەڵام بەدەستی ئەم سەرکردایەتیە هیچ و پووچەوە گیرمان خورادووە و مەلا بەختیار و جەماعەتیش شتێکی وایان نەکرد کە ڕزگارمان بێت لە دەستی ئەمانە. ئەو زۆر تووڕە و ناڕازی بوو و زوو زوو داوای لێبووردنی ئەکرد و ئەیووت من شەرمەزارم کە تۆ لای ئێمە زیندانیت و منیش وێڕای سوپاسی هەڵوێستی جوامێرانەی پێموووت کە مەسەلەکە ئاسایی وەربگرێت و ئەمانە هەروابون و بردم بەلای باسی سیاسیدا. ئەو وتی: بڕواناکەم تازە بتوانن مەترسیەک بۆ ژیانت دروست بکەن و زیاتر بۆ فشار و ترساندن ئەمە ئەکەن وئەوە نیشانەی ترسیانە لە هەڵوێستی ڕاست و قسەی هەق.

هیوا بارۆیی ڕادیۆیەکی پێبوو پێش نووستن کردیە سەر بەرنامەکانی ڕادیۆی حیزبی دیموکراتی ئێران، بەڕێکەوت لەوکاتەدا بەرنامەیەکی بابەتی پرسیار و وەڵام بوو کە گوێگرێکیان پرسیبووی کورد لە ئوستڕالیا هەیە یان نا؟ ڕادیۆکە لە وەڵامدا بە کورتی باسی بوونی ڕەوەندێکی بچووکی کوردی کرد لە ئوسترالیا و لە درێژەی قسەکانیدا وتی ڕادیۆیەکی کوردیش لە ئوسترالیا هەیە وتۆزێک لەبەرنامەکانی ڕادیۆکەی بەنموونە پەخشکرد. هەرگیز ئەو ڕۆژە نەمئەزانی ڕۆژێک ئوسترالیا ئەبێ بە شوێنی ژیان ونیشتەجێبوونم و جاروبار لەهەمان ڕادیۆێشەوە ئەبم بە میوان و پەردە لەسەر ئەو هێز و لایەنە سیاسیە هەڵدەماڵم کە ئەو شەوە لە ژێر ناوی بەرژەوەندیی شۆڕش و کوردایەتی و قسەی بریق و باقی تردا مافی نەک قسە کردن بەڵکوو خەریکە مافی ژیانیشی لە منێک دەسەندەوە کە سێ

بــرام له ڕیزەکانیانــدا پێشــمەرگەیە و خــۆم ســاڵانێکی درێــژ له ئەبووغرێبـدا لەســەر تێکۆشـانی سیاسـی بـۆ ئـازادیی مـیللەتەکەم زینـدانی بـووم و ئێسـتاش مـافی ئەوەم پـێ ڕەوا نـابینن که دوای دوو ئەمر قەبزی تـازه لەدەسـت مەرگی بێ ئەملاوئەولا بەدەسـتی بەعس، وچانێک بدەم.

من ئاگادار نەبووم که هەر ئەو شەوه (حاجی عبدالله) که خەڵکی دێی قەمچووغه و دۆستێکی نزیکی باوکم بوو وەکوو مـن دەسـتگیرکراوه. ئەو تەمەنــی ســەرووی ٦٥ بــوو و بیــانووی ئەوەیــان پێئەگــرت که دۆسـتایەتیی پـارتی ئەکـات. ئەوکـاته مـن به گرتنـی ئەویشـم زانـی که کابرای سەرتیپ جیای کردمەوه بۆ گفتوگۆ و وتی کـاک عدنان منیش وەکوو تـۆ مارکسـیم و کۆمەڵەش ڕێکخراوێکی مارکسـیه و مـن خـۆم ئەنـدامی لیـژنەی بەرنـامەی کۆمەڵه بـووم لـه کۆنفرانس و پیمخۆشـه گفتوگۆ بکەین و بەڕاستی ئێوه توونـدڕەون و خۆ پرۆلیتاریـا لـەم شـاخ و کێوانه بوونی نیه و ...

- دەی کەواته تۆ ئەو هەموو ڕێیه بۆ ئەوه منت ڕاپێچکـردووه که پێم بڵێیت پرۆلیتاریا لەم شاخ و کێوانه نیه، خۆ ئەکرا هەر له قەمچووغه ئەوەت پێ بووتامایه.
- نا بڕوا بکه تۆ زینـدانی نیت و پێمخۆشـه سـەبارەت به بیروڕا و هەڵوێستی ئێوه گفتوگۆ بکەین.
- کاکه من تا لای ئێوه زینـدانی بـم گفتوگـۆ نـاکەم سـەبارەت به هیچ شتێک. جگه لەوەیش من باش ئەزانم لەسەرئەوه گیراوم که مارکسـیم وگەر مارکسـیەت له ناوچەکـانی ژێردەســەڵاتی یەکێتیـدا قەدەغەیه ئەوه باشــتره به ئاشـکرا ڕایـبگەیەنن تـا کەسـانی وەکـوو منـیش بەوه بزانێـت و حسـابێک بـۆ حـاڵی خۆی بکات.

- نـا تـۆ ئازادیـت و گەر پیتخـۆش نـیە گفتوگـۆ بکەیـن فەرمـوو ئازاد بە و ئەتوانیت بگەڕێیتەوە .

پەیـامەکەی ئەوانـم زانـی کە ئەمە ڕەنـگ بـێ دوایـین ئینـزار بێـت و مـانەوەی زیـاتر لەمە کـارێکی نەشـیاو و مەترسـیدار بێـت. پـاش ماڵئـاوایی لە هیـوا بـاڕۆیی لەگەڵ حـاجی عبداللـە دا دووقـۆڵی ڕێـی قمەچووغەمان گرتە بەر. حاجی بۆی هەزم نەئەکرا کە من لە ماڵێکی تـا سەرئێسـقان یەکێتـی و خـاوەنی سـێ بـرای پێشـمەرگە و بەمـاڵەوە دەربەدەری دەستی ڕژێم بەهۆی چالاکیەکی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە لە کەرکووک، ئێستا تووشی ئەو دەردە ببم بەدەست هەمان هێزەوە. زۆریشی لا سـەیر بوو کە وەکوو براکانم لە گەڵ یەکێتیدا نەک ئیش ناکەم، بگرە هێندەش نەیارێکی سەرسەختیانم.

زۆر بەداخەوە، هیـوا بـاڕۆیی، لەسـەروبەندی ئەنفالـدا بەر هەڵمەتـی ڕەشەکوژیی ڕژێم کەوت و گیانی سپارد.

گەڕامەوە مـاڵ و مەسـەلەکەم بـۆ دایکمـیش گێـڕایەوە و ئەویـش ڕای وابـوو کە ئەمـانە تـا بڵێـی خراپەکـارن و سـڵ لە هـیچ شـتێک نـاکەنەوە بۆیە سـەرەڕای ئەوەی ئەیزانی کە مـن لەسـەرهەقم، تکـای لـێ ئەکـردم کە ئاگاداری خۆم بم و خۆمیش نەخەمە تـالووکەوە و ئاگـاداری دڵ و هەستی ئەویش بم.

زۆری پێنەچوو ماڵەوە لەپڕ بڕیاریاندا بڕۆن بۆ دێی دێلێژە کە عـادلی براگەورەم لە دوای وەستانی مفاوەزات و هەڵگیرسانەوەی شەڕ مـاڵی بردبووە ئەوێ. ڕاسـتی نە ئەوان نە منیش نەمـان ئەزانـی کە هۆکـاری ئەم ماڵگوێزانەوەیە شتێکی ترە، پاش ئەوەی کە دایکم و بـاوکم ماڵیـان گوێزایەوە و ڕۆیشتن، منیش وتم ئەمە کاتێکی باشە و ئیتر ئەڕۆمەوە بۆ سلێمانی، بەڵام لەپڕ وەڵامیان بۆم نارد کە منیش بڕۆم بۆ لایـان و هەمـــوو مـــاڵەوە کۆبـــوونەتەوە بـــۆ تەگبیرکـــردن لە دواڕۆژی خێزانەکەمـان. مـن بەخەیـاڵی خـۆم وتـم ڕەنـگ بـێ بیریـان گۆڕیبێت و نیـازی دەرچـوون بـۆ دەرەوەیـان هەبێـت و بیانەوێـت هەمـوو پێکەوە

بڕۆین. لەگەڵ بەهمەندا کە لە کەرکوک شاگردی دووکان و وەکوو کوڕی ماڵەکە وابوو وئێستا لەگەڵ ئیحسانی برامدا پێشمەرگەیە، شەو لە قەمچووغەوە جادەی دووکانمان بڕی بەرەو بەری تەلان و سوورقاوشان پەڕینەوە و ئەو زۆر پەلەی لێم ئەکرد و نەیئەهێشت لابدەین تا سبەی گەیشتینە ماڵی مام ڕۆستەم کە ئەوکات فەرماندەی تیپی ٢١ ی کەرکووک بوو کە ئیحسانی برایشم فەرماندەی کەرتی تیپ و هاوڕێی نزیکی مام ڕۆستەم بوو. هەواڵی ئیحسانم پرسی وتیان ئەویش لە دێلێژەیە و بەرهەم دوای وچانێکی کەم وتی ئەبێ ئەمشەو لە جادەی تەکیەوە بپەڕینەوە تا هەرچی زووتر بگەینە دێلێژە و چاوەڕوانی تۆن. لە ماڵی مام ڕۆستەم چەند سەعاتێک نووستین. تا ئەو کاتەیش و لە پەڕینەوەی ئەو شەوەیش هەر بەڕوام بە بەهمەن کرد و بۆ سبەی لەو دێهاتانەی ناوچەکە لە نزیک دێی شۆڕاوە تووشی تراکتۆرێک بووین کە کۆمەڵێک خەڵکی ئەو دێهاتانەی تیا بوو و بەرەو دێی ژاڵە ئەڕۆیشت کە دوا دێی دیوی ناوچەی هەمەوەندە. لەوێوە تەنها دەربەندی باسەڕە ئەمێنیت بۆ دێی دێلێژە و دڵم خۆش بوو کە ساعاتێکی تر ئەگەمە لای هەموویان و ڕەنگ بێ مەشورەتی کارێکی گرنگیان هەبێ، بۆیە وا بەهمەنیشیان بەدوای مندا ناردووە. لەناو تراکتۆرەکە بووین کە پیاوێک لە تەنیشتمەوە دەستی کرد بە قسەو گوتی: زۆر بەداخەوە بۆ شەهید بوونی ماموستا عادل.... و بەهمەن نەیهێشت قسەکانی تەواوکات و لێی تووڕە بوو.

## شەهیدبوونی عادل و ئیحسانی برام لە کەمتر لە ٣ مانگدا!!

ئێستا هەموو شتێکم بۆ دەرکەوت.
ئای کە هەواڵێکی ناخۆش و جەرگبڕ بوو بۆ من. تومەز عادلی براگەورەم کە بەرپرسی کاروباری کۆمەڵایەتیی بازیانی تیپی ٥٧ ی سەگرمەیە رۆژی ٩/ ١٢ / ١٩٨٥ لە سەرگەڵوو شەهید بووە! ئەو کە شەهید بوو تەمەنی ٣٤ ساڵ بوو. بەهمەن دەستی کرد بەگریان و وتی: ببورە نەمئەویست لەدەمی منەوە بیبیستی. ماوەیەکی زۆر دامام و خەیاڵ بردمیەوە بۆ دەیان وسەدان ڕۆژگار لەگەڵ کاکمدا. کە من گەیشتمە دێلێژە دوو ڕۆژ بوو تەرمەکەیان بە خاک سپاردبوو. ئەو لەگەڵ هۆشیاری برای دکتور نەوزاد ڕەفعەتدا، کە کادری هەمان تیپ بوو، سەردانێکی سەرگەڵوویان کردبوو. وتبووی ئەڕۆم قسە لەگەڵ سەرکردایەتیی یەکێتی بکەم کە بزانم بۆ هەموو ڕۆژێک عدنانی برام بەو دەردە ئەبەن و یانی چی ئێمە سێ برا پێشمەرگەین و هەرچی ماڵ و دووکان و ئیمکاناتی هەردوو ماڵەکەمان تیاچووە و ئێستا ئاوارە و دەربەدەرین، واز لەعدنان ناهێنن و ئەو هەموو فشار و ڕاپێچکردنی هەر ڕۆژەی ئەو لەپای چی؟ ئەو و هۆشیاری هاوڕێی لە سەرگەڵوو ئەکەونە بەر تۆپبارانی سوپای عێراق لە سەربازگەی سوسێوە. عادلی برام دەسبەجێ گیان لەدەست ئەدات و هۆشیاریش بریندار ئەبێت.
دواتر لە زۆر کوڕی خەڵکی دێلێژەم بیست کە ئەوانیش چەپ بوون وتبووی براکەم کەسێکی چەپ و مارکسیە وەکوو ئێوە و ئەڕۆم بۆ

سـەری سـاڵ لە گەڵ خۆمـدا ئەیهێـنم بـۆ دێلێـژە تـا پـێکەوە ئـاهەنگی سەری ساڵ بگێڕین.

ئێستا سەرباری ئەو هەموو کێشە و بارە ناهەموارەی خۆم، دەرگیری کۆستێکی خێزانی و عاتیفیی گەورەش بووم. عادل خاوەنی ٥ کچ بـوو کە ئەوکاتە تەمەنی ڕۆژان کە بچووکترینیان بوو چەند مانگێک بـوو و یەکێکـی تریـان لەسـەر گـۆڕەکەی بـاوکی یـاری ئەکـرد و ئەمـدیو و ئەودیوی گۆڕەکە بازی ئەدا.

ئەم کۆسـتە خـانەوادەییە بـۆ لاولاوی هاوسـەری کـاکم و منداڵەکـانی (میدیا، ئاوێستا، تارا، ژوان و ڕۆژە) و دایکم زۆر سەخت بوو. بۆ مـن جگە لـە لەدەسـتدانی بـراو هـاوڕێیەکی نزیـک لەوەدا زۆر نـاخۆش بـوو کە یەکێتـی بەچـاوی دوژمنێـک ئەیـانڕوانیە مـن و منـیش بەهێـزێکم ئەزانــین کە دەیــان دەمــامکی شۆڕشــگێڕی و نیشــتیمانپەروەری و کوردایەتی و خەبـاتی پێشـمەرگانە و قوربـانی و چـی و چـی، نـاتوانێ لەچــاوی مــن و عەقڵــی منــدا جەوهەرە دزێــو و فریــودەر و دژە خەڵکیەکەیـان بشـارێتەوە یـاخود پاسـاوبدات. لەدوای ئەو ڕووداوەوە زیاتر و لەنزیکەوە زانیم کە یەکێتی چۆن تراجیدیا و مەینەتی هەزاران خێزانـی وەکـوو کەس و کـارەکەی مـن بەکاردێنێـت بـۆ کەڵەکەکردنـی سـەرمایە سیاســی و مەعــنەویەکەی خــۆی. خــوێنی شــەهیدان و ڕووبـاری خــوێن بــۆ یەکێتــی مانــایەک و بــۆ کەس وکـاری جەرگ سووتاو و برا یـا مێرد یـا دایک و بـاوکی کوڕ لەدەستچوو مانـایەکی تەواو جیاوازیــان هەبــوو. لەوە بەدواوە و بەتــایبەتی کە ســەرلەنوێ کەوتـنەوە گـێچەڵ پـێ کـردن و ڕاونـانی یەکجـاریم، ئیتـر بەئەنـدازەی خویندنەوەی دەیان کتێب ماهیەتی حیزبی کوردی و بەتـایبەتی حزبـی چەکداری کوردی و یەکێتیم ناسی. بۆم دەرکەوت کە ئەمجۆرە هێزانە تەنیا بە پاساوی بوونی بەعس و دوژمنـایەتیی سەرسـەختی ئەوان لە گەڵ ســـادەترین پرەنســـیپی دیمـــوکراتی لەم وڵاتەدا درێـــژە بە

گەمژەکردنـی لایەنگرانیـان و تەمەنـی سیاسـیی خوێنـاویی خۆشـیان ئەدەن.
کێشـەکە ئەوەبـوو ئەو جـۆرە هۆشـیاریە زۆر دەگمەن و تەنهـا لەنـاو تــوێژێکی کەمــدا ســەری هەڵــدابوو کە لە نــزیکەوە تــاقیکردنەوەی سیاسییان لەگەڵ ئەم حیزبە کوردیانەدا هەبوو، ئەگینا بەشێکی زۆری خەڵک، بەهۆی هۆشیاری سیاسیی نزم و کەمی تاقیکردنەوە، گرەوی ڕزگاری و بەووتەی سادەی خەڵک "رزگاریی کوردستان"یان لە سـەر یەکێتی کردبوو.
جگە لەوەش یەکێتـی هێزێکـی دیمـاغۆجیی تەواو بـوو. ئەیزانـی چـۆن یــاری بەهەسـتی ســادەی خەڵــک بکــات و لە هەر ســەردەمەدا و لە بەرانـبەر هەر لایەن و مەسـەلەیەک لە کـام وەتەری ناسکی هەسـت و سۆزی خەڵک بدات. تا ڕەواجی مارکسیەت و چەپڕەوی بـوو، یەکێتی بە سوودوەرگرتن لە کۆمەڵە و ساویلکەیی ڕابەرەکانی، خـۆی کـرد بە ڕۆڵەی لێنین وزۆر بـاش چەکـی ئایـدیۆلۆجیی مارکسیی خستەکار و زۆرتــرین ســوودی لــێ بینــی. کە کــۆمەڵەی بەتەواوی دەســتەمۆ و ڕامکــرد، ئینجــا لە گەمەی کوردایەتیــدا کەس لێــی نەدەبــردەوە. لە بەرانــبەر بە حیزبــی شــیوعیدا خــۆی دەکــرد بە نەوەی پەروەردەی دەستی مارکس، بۆ گیانی پارتی و هێزەکـانی تـری هاوچەشنی ئەبوو بە ڕۆڵەی قــازی مــحەمەد و شــێخ ســەعیدی پیــران. بەکــورتیەکەی یەکێتـی سـەرێکی هەبـوو و سـەدان سـەودا و داینـامیکیەت وتوانـایەکی سـەیری هەبـوو بـۆ خـۆڕەنگکردن بەپێـی گەمەی سیاسـەت و بـازاڕی ڕۆژگــار، خــاوەنی هــونەرێکی تــایبەت بــوو لە گەمژەکردنــی خەڵــک.
هەموو ئەمانەشی لە سایەی چەند هۆکارێکی گونجاودا بۆ دەلوا:
یەکەم: دژی کوردبوون خەسلەتێکی لە مێژینەی بەعس بـوو لە ١٩٦٣ بەدواوە. لە هەشـتاکاندا ئەم کـاراکتەرەی بەعـس گەیشـت بە لـوتکەی خـۆی تـا ئاسـتی جینۆسـایدی گەلـی کـورد بەهـۆی کوردبـوونیەوە. ئەمەش باشترین دیاری بوو بۆ یەکێتی و هێزەکانی تری کوردایەتی.

ڕژێمی بەعس سیاسەتێکی نۆرماڵی پیادە نەئەکرد لە کوردستاندا بە بەراورد بەوانەی پێش خۆی وتەنانەت بە بەراوورد بە شوێنەکانی تری عێراقیش. بۆ نموونە زەمانی عبدالرحمن عارف، گەرچی حکوومەت دانی نەئەنا بە مافەکانی گەلی کورددا بەوجۆرەی پارتی داوای ئەکرد، بەڵام کوشت و بڕی ئەو تەنها لە بواری شەڕ لەگەڵ پێشمەرگە و قەدەغەکردنێکی هاکەزایی ڕێکخراوەکانی ئەو حیزبەدا کورت  ببوونەوە و لە هەموو تەمەنی ئەو حکوومەتەدا ٥٠٠ کەسی کورد زیندانی نەکران.
ئەو سیاسەتەی بەعس بەشێوەی ئۆتۆماتیکی هەموو کوردێکی ئەکرد بە مەشرووعی دوژمنێک. بە وتەی یاساناسەکان بەعس پێیوابوو (هەموو کوردێک تاوانبارە تا ئەودەمەی پێچەوانەکەی ئەسەڵمێنێت) و پێچەوانەکەش بریتی بوو لە وازهێنان لە کوردبوون کە لەسایەی ئەو دەسەڵات و دەوڵەتە و بەو کاراکتەرە شۆفێنی و نەتەوەپەرستیەوە هاتنەدیی ئەوە ئەستەم بوو و بەعس تەنانەت بە میتۆدی (تواندنەوەی نەتەوەییش) نەیتوانی بەو ئامانجە بگات. بەوجۆرە دژی کوردبوون لە سیاسەتێکەوە بوو بە خەسڵەتێکی زاتیی و شوناسی سەرەکیی بەعس.
ئەوە باشترین دیاری بوو بۆ بزووتنەوەی سیاسی – چەکداری کوردایەتی و حیزبە سیاسیەکان لە کوردستانی عێراق. لێرەدا نموونەکە وئەو هێزەی کە زیاتر ئەو خەسڵەتانە بەرجەستە ئەکاتەوە یەکێتیە ئەگینا ئەوانی تر و بەتایبەتی پارتیش لەو پێناسە دەرناچن. بەوپێیە یەکێتی زۆر بەئاسانی وبە سوودوەرگرتن لەو خەسڵەتانەی بەعس، ئەیتوانی لە ئاستێکی بەرزدا سۆزی جەماوەری بێ شووماری خەڵک ڕابکێشێت و مۆبەلایزیان بکات چ لەڕووی سیاسیەوە و چ لە ڕیزی هێزە چەکدارەکانی خۆیدا.
دووەم: پارتی وەکوو هێزێکی عەشائیری و خێڵەکی و بنەماڵەیی بەدناو بوبوون و خەڵک تاقیکردنەوەیەکی تاڵی لەگەڵیاندا هەبوو.

ئاشبەتاڵ و بەکرێگیراویی ئەوان بۆ چەندین وڵاتی دەرەکی ناوی کوردیشی پیس و بەدناو کردبوو. ئەم حیزبە سەرباری ئەو ئاڵوگۆڕە ڕووکەشیانەی کە لە پاش ئاشبەتاڵەکەی بارزانیی باوکدا کردبوویان و هێنانە پێشەوەی هەندێ کەسایەتیی وەکوو علی عبداللە و سامی عبدالرحمن و ئیدیعای پەیڕەویکردنی لە "سۆسیالیزمی زانستی" و پیاچوونەوە بە تاقیکردنەوەی پێشوودا، هیچ ئیعتیبار و پێگەیەکیان لەناو خەڵکدا نەبوو. ئەمان خەباتی گەلی کوردیان کردبوو بە قوربانیی دواکەوتوویی خۆیان. لە چاوی خەڵکدا و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و فەرهەنگیانەی لە کوردستان لە نێوان ١٩٧٥ – ١٩٨٥ ڕوویاندابوو، پارتی بووبوو بە هێزێکی کۆن و بەسەرچوو کە لەگەڵ ژیانی سیاسی و فەرهەنگیی ئێستای کوردستاندا نەدەهاتەوە.

(بارزانی لە ئایاری ١٩٧٥ دا لە ئێران ڕایگەیاند کە "خەبات بۆ ئۆتۆنۆمی کۆتایی پێهات و هەرگیز تیهەڵناچێتەوە"). The Kurds of Iraq, Building a State Within a State, Ofra Bengio, P 181

ئەوەش بوو بە دەسمایەیەکی باش بۆ یەکێتی تا بتوانێ بەتایبەتی تا سەرەتای هەشتاکان خۆی بەبەراوورد لەگەڵ پارتیدا لە گۆڕەپانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فکریدا عەرز بکات و ڕسواکردنی ئەو و تاقیکردنەوە شکستخواردووەکەی پارتی لە ناو نەوەی تازە و ئیلیتی ڕۆشنبیری کورددا بکات بەدەسمایەیەکی سیاسی گەورە و سەرمایەگوزاریەکی زۆر باشی پێوە بکات.

سێیەم: حیزبی شیوعی عێراقی تا ١٩٧٨ چووبوونە بەرەیەکەوە لەگەڵ بەعسدا و بە دوو وەزیر بەشدار بوو لە دەسەڵاتدا. شیوعیەکان دوای شکستی بەرە لەگەڵ ڕژێمدا، بوون بە دۆستی پارتی و پێگەیان لەناو خەڵکدا نەبوو. شیوعیەکان بەتایبەتی لەناو ئیلیتی خوێندەواری ئەم قۆناغە و بە گشتیش لەناو جەماوەری خەڵکدا وەکوو هێزێکی جێ

متمانە بۆ ئەم قۆناغەی خەباتی سیاسی لە کوردستاندا، چاویان لێ نەئەکرا. بۆشایی ئەم پاشەکشەیەی حیزبی شیوعیش بەقازانجی یەکێتی ئەشکایەوە بەتایبەتی کە کۆمەڵەی مارکسی – لینینی تا درەنگانێک خۆی وەکوو هێزێکی چەپی ڕادیکالتر لە شیوعیەکان نیشان ئەدا و دیماغۆجیەتی یەکێتی بواری گەشەکردنی پایگای حیزبی شیوعیی لە کوردستاندا قورستر دەکرد.

چوارەم: هەم پاشماوەکانی قیادەی مەرکەزیی حیزبی شیوعی عیراق و هەمیش ئەو گرووپانەی تا ١٩٧٦ لە کۆمەڵەی مارکسی – لینینی جیا ئەبوونەوە، جگە لە ڕەخنەی فکری و ڕادیکالیزمێکی بێ بەرهەمی سیاسی هیچی تریان لێ شین نەبوو. ئەمانەش بە نۆرەی خۆیان نە خاوەنی روئیایەکی سیاسیی ڕوون، نەپشت ئەستوور بە خوێندنەوەیەکی ورد بۆ بارودۆخی سیاسیی تازەی پاش ١٩٧٥ وتایبەتمەندیەکانی قۆناغەکە بوون. ئەم گرووپانە لەناو هاوکێشەی کوردستانیەت و عێراقیبوون و شۆڕش و ئیسلاحات و کێشە ئاڵۆزەکانی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانیدا سەری خۆشیان بزرکردبوو و هیچ نموودێکی سیاسیان لە خۆیان نیشان نەئەدا و شوناسی سیاسیی خۆیان تەنها بە ڕەخنەگرتن لە کۆمەڵە و "ڕەتکردنەوە – نفي" کورتکردبۆوە.

ئەم فاکتەرەش لەڕووی زاتیەوە ڕۆڵی خۆی بینی لەوەی کە کۆمەڵە ببێت بە پاروویەکی چەور بۆ باڵی نەوشیروان – تاڵەبانی وەکوو دیکۆرێکی ڕادیکال بۆ ڕاوکردنی ئیلیتی خوێندەواری کەم سەوادی خۆ بەچەپزانی ئەو قۆناغەی کوردستانی عێراق.

لەپاڵ هەموو ئەمانەدا دیسانەوە و وەکوو ڕەسمی دەیان ساڵە یەکێتیی نیشتیمانی خەباتی چەکداری و پێشمەرگایەتیی کردەوە بە بت و تەوتەم وفیتیشێکی پیرۆز. بەعس لەمەشیاندا خزمەتی باشی بەوان کرد. ئاخر لە سایەی ڕژێمێکی درندەدا کە هێندەی سەرە سوزنێکیش بواری بۆ هیچ جۆرە دەرکەوتنێکی تری سیاسی، فکری و

کەلتووریی سەربەخۆ لە کوردستاندا نەئەدا، لەوە سروشتی تر نەبوو کە هەمـــوو بەربەرەکـــانێیەک لەبەرانـــبەر ئەو هەمـــوو ســـتەمەی دەسەڵاتداردا، قاڵبی توونـد و تیژ و چەکدارانە بگرێتە خۆی. لە هەندێ بـواری ڕووکەشـیدا نەبێت، چـالاکیی چەکـداریی یەکێتـی و دنیـابینیی ئەمان بۆ پێشمەرگایەتی جیاواز نەبوو لەگەڵ قۆناغەکانی پێشـووتری پارتی لەم بوارەدا. جیاوازیەکی یەکێتی ئەوەبوو کە سـەرتاپا چەکدار و میلیتـــاریزەکراوبوو. خەبـــاتی چەکـــداری لە عەقلیەتـــی یەکێتیـــدا قورسـاییەکی زۆر و هەیبەتێکـی نـیمچە دینیـی هەبـوو. سیاسـەت و هەموو کایەکانی تر بۆ ئەوە بوون کە خزمەت بەلوولەی تفەنگ بکەن. ڕوئیای سیاسی و شـەفافیەتی فکری و پەروەردەی سیاسـی و فکریـی ئەندام و پێشـمەرگە کەمترین بایەخیـان هەبوو. کەسایەتیەکی بـواری سەربازیی ناو هێزەکانی یەکێتی هێندەی دە کادری سیاسـی جێگە و ئیعتیباری هەبوو.

ئەم قورســاییەی چەک و چـۆڵ و پێشـــمەرگایەتی و دەستوەشـێنیی ســـەربازیی ئەوان لە ڕژێـــم لەگەڵ عەقلیەتـــی بـــاوی نەک تەنهـــا جەمـاوەری سـادەی کوردسـتاندا ئەهـاتەوە، بەڵکـوو تریـاکێکی زۆر بەهێـزیش بـوو بـۆ ڕاکێشـانی چینـی خوێندەواری کەم تەجـرووبەیش. ئیتر وای لێ هاتبوو جیاوازیی بەرنامە و تـاکتیکی سیاسـیی هێزەکانی گۆڕەپـانی سیاسـی کەمڕەنـگ ئەبوونەوە بە بەراوورد بە تواناییەکـانی هێـزی چەکـداری هەر لایەنە. ئەوە ڕۆڵێکـی کـاریگەری هەبـوو بـۆ چەپاندن و دامرکاندنەوەی هۆشیاریی سیاسیی، نەک هەر ئەندامەکانی یەکێتـی بگـرە هۆشـیاریی سیاسـیی گشـتیی جەماوەریشـیان تەپانـد و لەوتاندیان. ئاکامەکانی ئەم عەقڵیەتە کاتێک دەرکەوتن کە ڕژێم دوای وەسـتانی شـەڕی ئێـران دەسـتی کـرایەوە لە کوردسـتاندا و بە (کـش مەلیک)ێـک ئەو هەمـوو هێـزە چەکـدارەی ئەوانـی پێچـایەوە و بەو جـــۆرەش هەمـــوو هاوکێشـــەکانی سیاســـەتکردن و ململانێـــی لە کوردســـتاندا بەقـــازانجی بەعـــس گـــۆڕی. ئەم ئـــاڵوگۆڕە درێـــژەی

پرۆسەیەکی دوورودرێژی گۆڕانی یەکێتی و سەرجەم بزووتنەوەی سیاسی – پێشمەرگەی کوردستانی بوو بۆ هێزێکی دژی دیموکراسیی چەکداری بێ ڕوئیای سیاسی. بەنەمانی هێزە چەکدارەکە وپاشەکشە لە خەباتی چەکداریدا قورسایی سیاسیشیان تا ئاستێکی زۆر هاتەخوارەوە، هەتا ڕاپەڕینی ١٩٩١ لەو تەریکی و پەراوێزییە ڕزگاری کردن.

+++

بەهۆی پێشهاتی مەرگی عادلی برامەوە تووشی پەرپرسیارەتیەکی قورس بووم بەتایبەتی لەبەرانبەر دایکم و بەناچاری زۆرتر بەوانەوە بەسترامەوە و نە ئەکرا وا بەئاسانی بەم بارە نالەبارەوە جێیان بهێڵم. ئەم ڕووداوە کارەساتێکی گەورەی خێزانی بوو بۆ ئێمە بەتایبەتیش کە ئەو ٥ کچی لەدوا بەجێمابوو و میدیا کە گەورەترینیان بوو تەمەنی ٩ سال نەئەبوو. بەبۆنەی پرسەشەوە و بەتایبەتیش چونکە لە لادێ ئەژیاین ماوەیەکی زۆر میوانمان لێ نەئەبڕا و پێشمەرگە و بەرپرسەکانیشیان زۆرتر لە جاران سەردانیان ئەکرد و زیاتر ئەکەوتمە بەرسەرنجیان. لەو سەردانانەی چەند جاری ئازاد حەمەغەریبی سەرتیپی ٥٧ ی سەگرمە و هاوڕێکانی چاوم کەوت بە د. ساجیدی هاوڕێی سەردەمی زیندانم کە ئەوکاتە لە گوندی قازانقایە دانیشتبوو. ئەو هاوڕێی لەوەوپێشی ئازاد و پێکەوە لە کۆمەڵەدا بوون. ساجید کە ناوی خۆی زەینەددین بوو –چەند ساڵ لەمەوبەر لە سلێمانی ماڵئاوایی لە ژیان کرد– ئەو بە بینینی من گەشایەوە وپێموابێ تا ئازاد و جەماعەتەکەی گومانی هیچ شتێک نەکەن هەر لەبەرچاوی ئەو وتی: کەی پێتکرا ڕۆژێک سەردانێکم بکە لە قازانقایە. کە تۆزێ جەوی پرسە ڕەویەوە خەڵکی دێکەم زیاتر ناسی و پێشتریش ئەمزانی کە کۆمەڵێکی زۆر گەنجی چەپ و مارکسی لەوێن.

لەنـاو دێڵێـژەدا کۆمەڵێـک گەنجـی کەرکـووکی تیـابوو کە لەدەسـت سـەربازی هەڵاتبـوون و پەنایـان بـۆ ئێـرە هێنـابوو کە مـن دوانیـانم لە نزیکەوە ناسی، ئەوانیش "عمر مولـود" و "خەلیل" بـوون. دواتـر خەلیل بەکارەساتی وەرگەڕانـی تراکتـۆر گیانی لەدەستدا. دێڵێژە بەوهـۆیەوە کە دیـوی هەمەوەنـد و گەرمیـانی ئەبەسـت بە قەرەداغەوە سـەرەڕێی هاتوچۆی ئەو دوو بەشەی ناوچەکەبوو. جگە لەوەش چـونکە دێیەکی زۆر پاک و تەمیز و دڵگیـر بـوو هەروەهـا خەڵکەکەشـی لەچـاو دێهاتی دەوروبەریـدا مـۆدرێنتر بـوون، نـاوی دەرکردبـوو. کـابرایەکی یەکێتیی لێ بوو بەناوی "عەبەی خورشـە" کە بەنـاو پێشـمەرگەبوو، بەڵام مـاڵی هێنابووە دێڵێژە و هەر لەوێ ئەمـایەوە. کـاری ئەو کـابرایە چـاودێریی خەڵک و ڕاپـۆرت نووسـین بـوو بـۆ سـەرەوەی خـۆی و بەتـایبەتی بـۆ تیپـی ٥٧ ی سـەگرمە. ئەم عەبەیە بە بیـانووی ئەوەی کە مـاڵی ئـێمە پێشـمەرگەن و تووشـی کۆسـتێکی وا بـوون هەمـوو ڕۆژێـک خـۆی ئەکـرد بەماڵـدا و گەر میوانمـان بهاتـایە خزمەتـی میـوانی ئەکـرد و یـارمەتیی دایـک و بـاوکمی ئەدا، بەڵام زوو ئاگاداریـان کـردمەوە کە چ کارەیە. عمر مولودیش کە بوو بە هاوڕێم زیاتر ئاگاداری کردمەوە کە بـارودۆخی دێڵێـژە و نـاوچەکە چـۆنە. کە بەرپرسـەکانی یەکێتـی هـاتوچۆی مـاڵی ئێمەیـان ئەکـرد بە ڕواڵەت زۆر بەڕێـزەوە مامەڵەیـان لەگەڵ منـدا ئەکـرد، بەڵام ئەمزانـی کە بـوونم لەوێ جێـی خۆشـحاڵیی ئەوان نیە.

مـن کتێبخـانەکەی خـۆم لە قەمچـووغەوە گەیانـدبووە دێڵێـژە و لە ژوورێکـدا دامنـابوو. بەشـی زۆری کـاتەکەم بە خوێنـدنەوەوە بەسـەرئەبرد. ئەمویسـت لەم کـاتە ناسـکەدا تووشـی لێپێچینـەوەی یەکێتـی نەبـم وتـا ئەتـوانم خـۆم لە گێچەڵیـان لادەم. جگە لەوە ئەبـێ تەنانەت کەسێک گەر بەنیازی چـالاکیی سیاسـیش بێت، لەم دێهاتـانەدا چی هەیە تا بیکات؟ لەولاشەوە بیستبووم کە یەکێتی چەند قین لەدڵن بەرانـبەر دێڵێـژە، چـونکە بە مەڵبەنـدێکی ڕۆشـبیری و بـوونی گەنجـی

چەپ ناسـرابوو. ئەو سـەردەمەش، واتە سـەرەتای ١٩٨٦ بەبیـانووی تەسـفیەکردنی ئـاڵای شـۆڕش و دەسـتگیریی مەلا بەختیـار و هاوڕێکانیەوە، هەڵمەتێکی فراوانی دەستگیری و ڕاپێچکردنی خەڵکی مەدەنی وپێشمەرگەی لایەنگری ئەوانیان کرد و فەزای داپڵۆسینیان برەوپێدابوو. کار گەیشتبوو بەوەی هەر کەسێک بە مارکسی ناوی دەربکردایە جێی گومان و تەنگ پێهەڵچنین بوو وگوندەکانی قەرەداغیش لەو جۆرە کەسایەتیانەی زۆر تیابوو، چی خەڵکی ناوچەکە خۆی و چی خەڵکی شارەکان کە لە ترسی کوشت و بڕی ڕژێم ڕوویان کردبووە دیهاتەکان.

لە دێی خالەبازیانیی لای قەرەحەسەن کە دێیەکی گەورەی گەرمیان بوو، دەیان گەنجی کەرکووکی تیابوو و بەشێکی زۆریان خەریکی گفتوگۆ ودراسەی مارکسیەت بوون. ئەو فەزایە بۆ یەکێتی مایەی قەبووڵ نەبوو، بۆیە کەوتبونە هەڵمەتێکی ڕێکخراو بۆ تەنگەهەڵچنین بەوجۆرە کۆڕ وکۆمەڵانە و ناچارکردنیان بە ڕاکردن و پاڵ پێوەنانیان بۆگەڕانەوە بۆ ناو شارەکان یا تەسلیمبوونەوە بە ڕژێم لە ژێر زەبری ئەو گوشار و ئەزیەت و ئازاردانانەدا.

لە دێی سۆڵەی نزیک دێلێژەش، گرووپێکی گەنجی چەپ گیرسابوونەوە. ئەو کۆڕ وکۆمەڵە گەنجانەش کە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەی مارکسیەت و گفتوگۆی سیاسی بوون لە دێهاتەکاندا، لە هەر ناوچەیەک تۆڕێک لە پەیوەندیی توند لە نێوانیان هەبوو کە بۆ گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا وکتێب و نووسراوە و هاوئاهەنگی، هاتوچۆی یەکتریان ئەکرد. ئەم دیاردەیە تەنها لەم ناوچەیەدا بەرچاو نەبوو، بەڵکوو لە هەموو ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی پێشمەرگە و بەتایبەتی ناوچەکانی دەسەلاتی یەکێتیدا وەکوو شارباژێر، پشدەر، ڕانیە، و قەرەداغ و گەرمیاندا برەوی سەندبوو، چونکە لەو ساڵانەدا دەیان هەزار گەنجی شارەکان و بەتایبەتی دەرچووانی زانکۆ و پەیمانگا و ئامادەییەکان، وەکوو شێوازێک بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ

ڕژێــم لە کوردســتان و بەتــایبەتیش بــۆ ڕەتکــردنەوەی سیاســەتی ڕەشبگیری سەربازی و جەیشی شـەعبی، ڕوویـان ئەکردە دێهاتەکـان. زۆربەی زۆری ئەو گەنجانەش لەڕووی سیاسیەوە متمانەیان بە هێزە سیاسیەکانی کوردستان نەئەکرد، بۆیە ئەو هێزانە بەتایبەتی یەکێتی دەیان ناووناتۆرەی سووکیان لێ ئەنان و بێ ڕێزیان پێ ئەکردن، بە تایبەتی بۆ گیانی ئەو کەسانەی کە مەیلی سیاسی و فکریی جیاوازیان هەبوایە و ڕەخنەگری سیاسەت و کردەوەی هێزەکانی ئەوان بوونـایە. ئیتر ڕاپۆرت نووسین و گیروگاز و ڕاپێچکردنی هەررۆژە بۆ مەڵبەند و بارەگاکـــانی تیپەکـــان و لێـــدان و ســـــووکایەتی و تەنــــانەت ئەشـکەنجەدانی چالاکوانـانی نـاڕازی و بەتـایبەتی چەپ لە ناویانـدا تـا ئەهات پەرەی ئەسەند.

هەر بۆ نموونە جارێکیان "ڕەحیم ئەمین" و"حەسەن هەژار کاکەیی" کە هەردووکیـان هـاوڕێی مـن بـوون بەر ئەو هەڵمەتـی گـرتنە کەوتـن. ڕەحــیم لە دێلێــژە و حەســەن لە گونــدی خاڵۆبازیــانی نیشــتەجێ بووبــوون و بە دوو چــالاکوانی مارکســیی ناســرابوون، دەســتگیر و ڕەوانەی گوندی تەکیەی قەرەداغ کران. تەکیە ئەوکاتە جێی بارەگای مەڵبەندی ١ ی یەکێتیی نیشتیمانی بوو. ئەمان بە قسەی یەکێتیش هـیچ تاوانێکیان نەبوو ئەوە نەبێت یەکێتـی نەبـوون و ڕەخنەگری سیاسـەت و ڕێبـاز و کردەوەکـانی ئەوان بـوون ئەویـش بەپـارێز و نەرمـیەوە و سـەرقاڵی ژیـانی ڕۆتـین وبێـزاری لادێنشـینی بـوون لەگەڵ هـاوڕێ و کۆڕ و کۆمەڵی بـابەتی خۆیانـدا سـەردانی یەکتریـان ئەکرد. لە تەکیە خرانە ژێر ئەشکەنجە و لێدانێکی زۆرەوە و قۆڵێکی حەسەن هەژاریان شکاند و پاش هەڕەشە و ئیهانەیەکی زۆر ئـازادکران بەو مەرجەی بە هیچ جۆرێک تووخنی باس و خواسی سیاسی و ڕەخنەگرتن لەیەکێتـی نەکەون. هەر ئەوکاتەی ئەمان دەسـتگیرکران کـادرێکی تـری یەکێتـیش لەگەڵیانـدا زینـدانی و ئەشـکەنجەدرابوو بە نـاوی (حــەمە حسـێن) بە تۆمەتی هاوسۆزی لەگەڵ ئاڵای شۆڕشدا.

بەهەرحاڵ من بە هۆی سەرقاڵیی ئەو ماوەیە بە باری خیزانیی کەس و کارەوە جموجۆڵێکی ئەوتۆم پێ نەئەکرا و ئەمویست ئەم ماوەی قەیرانەی خێزانەکەمان تێپەڕێنم پاشان بیرێک لە پەیوەندیە سیاسیەکانم بکەمەوە کە ئەویش زۆربەی لەشار و بەتایبەتی لە سلێمانی بوو. کوڕێکی پێشمەرگەی گەنجی خزمم هەبوو بەناوی سەرکەوتەوە جاروبار بڵاوکراوەی پێشڕەوی کۆمەڵەی ئێرانی دەست ئەکەوت و بۆی ئەهێنام. لەگەڵ عومەر مەولوود و هاوڕێکانی کە لە ژوورێکدا ئەژیان هاتووچۆ و باسی مەسائیلی گشتیمان ئەکرد و دووقۆڵیش لەگەڵ ئەودا پەیوەندیی نزیکترمان هەبوو. عومەر و کوڕە گەنجەکانی ئاوایی تیمێکی فوتبۆڵیان دامەزراندبوو کە جاروبار لەگەڵیاندا بەشدارئەبووم. زۆر هاوڕێی عادلی برام ناسی چ لە ناو هێزی پێشمەرگە و چ خەڵکی ناوچەکە. دیار بوو ئەو جێی خۆشەویستی و ڕێزێکی تایبەتی ناو خەڵک بوو و بەهۆی ئەوەوە زۆر ڕێزیان ئەگرتم و لێمان نزیک ئەبوونەوە. گەنجە چەپەکانی دێلێژە باسی مامەڵەی هاوڕێیانەی عادلیان بۆم ئەگێڕایەوە لەگەڵیاندا. بەڕاستی ئەو ماوەیە چی خەڵکی دێلێژە و ناوچەکە و چ هاوڕێ دڵسۆزەکانی عادلی برام بەشێک لە قورسایی ئەو قەیرانەی خێزانەکەمانیان سووک کرد. لە هاوڕێکانی عادلی برام "شێخ محەمەد" کە پێشمەرگەیەکی قەدیمی و کاک "تەهای مەلا وەهاب" و "شەرمن"ی هاوژینی زۆرتر هاتوچۆیان ئەکردین و بوون بەهاوڕێم. ئەوان و بەتایبەتی کاک تەها کە دواتر لە دێی داریکەلی جێگیربوو و وازی لەپیشمەرگایەتیی یەکێتی هێنابوو، ئاگاداریان دەکردمەوە کە ئاگام لە خۆم بێت و سەبارەت بە بیروڕا و ڕەخنەکانی خۆی زۆر شتی لەگەڵمدا باس ئەکرد. دواتر پەیوەندیم لەگەڵ کاک تەهادا پتەوتر بوو و بە وردتر باسی تەجرووبەی یەکێتی نیشتیمانی و بزووتنەوە سیاسیی کوردستان و هۆکارەکانی پاشەکشەی ئەم بزووتنەوەیەمان ئەکرد.

هاوڕێکانی ناو شارم ئاگادار کردبۆوە کە سەردانی من نەکەن و خۆیان بپارێزن لە هاتن بۆ دێهاتەکانی ژێردەسەڵاتی یەکێتی، چونکە هەڵمەتێکی فراوانی فشار وسەرکوت و گێچەڵی سیاسی دەستی پێکردووە.

مانگی یەکی ١٩٨٦ سەردانێکی د. ساجیدی کۆنە هاوڕێم کرد لە گوندی قازانقایە. هاوژینەکەی ئەو سەفەری سلێمانیی کردبوو و ئەو شەوە هەر خۆمان لە ماڵەوە بووین و جگە لە هەندێ هەواڵی دەستگیریی مەلا بەختیار و هاوڕێکانی ئەو بەهیچ جۆرێک تووخنی باس و خواسی سیاسی نەکەوت. شەوەکەمان بە باسی یادگاری و بەسەرهاتەکانی سەردەمی زیندانی ئەبووغرێب تەواو کرد و "ئاواتی شێخ جەناب" کە ئەویش لەوێ دانیشتبوو بۆ بەخێر هاتنی من سەردانێکی کردین. بۆ ڕۆژی دواتر من گەڕامەوە بۆ دێلێژە و ماڵەوە پێیان خۆش بوو کە جاروبار سەردانی دێهاتی دەوروبەر یا دیوی گەرمیان بکەم تا فەزای کەئیبی پرسە تێپەڕێنین.

"سەلاحی شیخ یەحیا" کە دراوسێی سەردەمی کەرکووک وئاشنای خێزانیمان بوون لە دێلێژە دانیشتبوو، چونکە هەموو دێکە خزم و کەس و کاری خۆی بوون. ئەو کە ڕاکردووی کەرکووک بوو ئێستا بووە بە مامۆستای قوتابخانە سەرەتاییەکەی دێلێژە و پێشنیاری بۆ منیش کرد کە هاوکاریی بکەم لە دەرس وتنەوەدا. منیش لەبەر پیویستیی منداڵەکانی قوتابخانەکە ئەو ماوەیە لەگەڵ ئەودا بەشداریی وانەوتنەوەم بە قوتابییەکان ئەکرد.

بارودۆخی عێراق تا ئەهات خراپتر ئەبوو. شەڕ لەگەڵ ئێران درێژەی هەبوو و هەردوولا هەموو توانای جەنگیی خۆیان خستبووە گەڕ، بەڵام هیچیان توانای یەکلاکردنەوەی شەڕەکەی بەقازانجی خۆی نەبوو. هەردوولا لەبەر شەکەتبوونی هێزەکانیان دەستیان کردبوو بە تاکتیکی بۆمبارانی شارەکان بە ڕۆکێتی دوورهاوێژ کە بە (شەڕی شارەکان) ناسرابوو. ماڵوێرانیی شەڕ، جگە لە کوشتاری بەرەکانی

شـەڕ، شارەکانیشـی ویـران کردبـوو. جـگە لەوەش تـا ئەهـات ڕژێـم پەلامـار و کوشـت و بـڕ و سـەرکوتی لە شـارەکاندا پەرە پـێ ئەدا و ئاسۆیەک دیار نەبوو بۆ کۆتایی شەڕ. ناڕەزایەتیی شـارەکانیش دوای مـاوەیەک لە پەرەسـەندن، خـامۆش ببـوونەوە. ڕژێـم سـەربارى تەرخـانکردنی هەمـوو تواناکـانی بـۆ شـەڕی ئێـران، لە کوردستانیشـدا دەسـتی بە هێرشـی بەهێزتـر کـرد و بەبیـانووی بەربەرەکـانێی هەوڵەکانی ئێران بۆ دزەکردن لە بەرەکانی کوردسـتانەوە، هێنـدەی تر سـوپای لە کوردسـتاندا مـۆل دابـوو و فەیلەقـی ١ و ٥ بـۆ ئەم بـوارە تەرخان کرابوون. دوای شکستی مفاوەزات، یەکێتی پەیوەنـدیی لەگەڵ ئێرانـدا زۆر بەهێزکردبـوو و لە هەمـان کاتیشـدا شـەڕی لەگەڵ بەرەی جـوود و پارتیـدا هەربەردەوام بـوو. ئەو مـاوەیە یەکێتـی زۆرجـار ئەبوون بەچاوساغی هێزی پاسداری ئێران و تا قووڵایی نـاو خـاکی کوردستان و دەوروبەری کەرکووکیش ئەیانهێنان.
ڕیزی بزووتنەوەی چەپ و مارکسیش لە جاران پەرش و بڵاوتر بـوو. ڕێکخـراوی (کـار) بەرەو پاشەکشـە و لاوازی ئەڕۆیشـت و (بەرزە) تەنها گرووپێکی نـاوەکیی بچووک زیـاتر نەبـوو. (کارگەران) تووشـی لێکترازان بووبوو وزۆر کەسی ناوەندی و کـادر و ئەندام ڕیزەکانیـان جێهێشـتبوو و ئەوەی مـابوونەوە لەژێرنـاوی (ڕەوتـی کۆمۆنیسـت) دا کــز و لاوازن و چـــوونەتەوە خـــولی متبـــوون و ســـەرلە نـــوێ دراسـەکردنەوە و ئەڵـێن ئەڵـقەی ناوەنـدیی خەبـاتی ئەمـڕۆ بـریتیە لە دەست گەیشتن بە بەرنامە و ڕێگەی گەیشـتن بە بەرنـامەش بـریتیە لە خەباتی تیۆری و خوێندنەوەی کلاسیکی مارکسیزم.
(ئاڵای شۆڕش) زەربەیەکی گەورەی لێدرا وسێ کەسایەتیی یەکەمیـان مەحکـووم کـراون بە ئیعـدام و لە زیندانـدا توونـدکراون و لەلایەن ناوەنـــدیی کـــۆمەڵە و هاوڕێکـــانی دوێنێـــی خۆیـــانەوە زۆرتـــرین ئەشکەنجەدراون و تاڵاو ئەکرێ بەقوڕگیانـدا. ئاسـۆی سیاسـیی ووڵات تادێ نالەبارتر و نادیارتر ئەبێ و خەڵک بەناچـاری هیـوای بەوەیە کە

سەرکەوتنی ئێران لەشەڕدا ببێتە هۆی ڕووخانی ڕژێم. زیندانەکان پڕن لە خەلک و تەنانەت بۆ چاوترساندنی خەڵک ڕژێم لاوانی زیندانی ئەهێنێتە سەر شەقامەکان و بەزۆر خەڵک کۆئەکاتەوە بۆ نمایشکردنی گوولەباران کردنیان. هەڵمەتی چەکدارکردنی خەڵک و کردنیان بە جەیشی شەعبی لە دائیرە وکارگە و قوتابخانە و زانکۆکان لە جاران زیاتر پەرەی سەندووە. شکستی مفاوەزات و هێرشە سەربازیەکانی سوپا بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگە، ئومێدی خەڵکی بە یەکێتی لە جاران کەمتر کردۆتەوە. هەڵمەتی تەسفیەی ئالای شۆڕش ودەرکردنی حوکمی مەرگ بەسەر سەرکردایەتیەکەیاندا ترسی لەناو هێزەکانی پێشمەرگەشدا ناوەتەوە و مەیلی سەرکوتگەری و داپلۆسین لای یەکێتی بووە بە سیمایەکی زاڵ و زەق و کەس ناوێرێ فزە بکات.

لەو بارە ناهەموارە سیاسی و شەخسیەدا بووم کە هێشتا جاروبار خەڵک بەبۆنەی مەرگی عادلی برامەوە سەردانیان ئەکردین، بەیانیی ڕۆژی ٢/٢٣/ ١٩٨٦ کە ڕۆژێکی زۆر ساردبوو، ئێمە هەموومان سەرقاڵی خواردنی نانی بەیانی بووین. چەند کوڕێکی خەڵکی ئاواییەکە لە دەرگایان دا و کە کردیانەوە داوای منیان کرد. ئەوان وتیان کوڕێکی پێشمەرگە لە گەرمیان شەهید بووە و لەبەر ئەوەی هاوڕێی شەهید عادلی براتە، پێشتر وەسیەتی کردووە گەر شەهید بوو لە پەنای ئەودا بینێژن. ئیحسان و پۆلا کە هەردووکیان پێشمەرگەبوون و دوای ماوەیەک لە مانەوە لە ماڵەوە لەدوای شەهیدبوونی عادل گەڕابوونەوە بۆ ناوچەی شوان و کەرکووک. ئەو کوڕە دێلێژەییانە وتیان تۆش وەرە لەگەڵماندا ولە سەر گۆڕستان خەڵکەکە ئامادەن بۆ ناشتنی ئەو کوڕە پێشمەرگەیە و پێیان خۆش بوو ئیزنی ئێوەش وەرگرن. منیش کەسوکارم تێ گەیاند کە من ئەڕۆم بۆ گۆڕستانی ناودێ، چونکە کوڕێک بەوجۆرە شەهید بووە و لەگەڵ ئەواندا کەوتمە ڕێ. گۆڕستانەکە هەمووی ١٥٠ مەتر لە

سەرووی ئاواییەکەوە بوو لە نیوەی ڕێگاوە هەندێ هاوڕێی ئیحسانی برام بینی لەناو خەڵکەکەدا و تۆزێک وردتر کەوتمە چاوگێڕان بەناو خەڵکەکە و کە گەیشتمە ئەوێ مام ڕۆستەم و هاوڕێکانی ئەگریان و هاواری ئیحسانیان ئەکرد. ئینجا زانیم کە ئیحسانیش شەهید بووە و کارەساتێکی تر دەرگای پیگرتووین!!!! بەدوای مندا دایکم و باوکم و هەمووماڵەوەشیان لە مەسەلەکە ئاگادارکردبۆوە و ئەوانیش ڕژانە سەر گۆڕستانەکە. من لەوێ خۆم پێ نەگیرا هەندێ هێرشم کردە سەر یەکێتی و بێ دەربەستبوون و بێ پەیوەندیی ئەوان بە ژیانی خەڵکەوە.

ئیحسان فەرماندەی کەرتی تیپی ٢١ ی کەرکوک بوو. پێش شەهیدبوونی گوێزرابۆوە بۆ مەکتەبی عەسکەری و هێشتا نەڕۆیشتبوو لەناوچەی شوان لە گوندی تۆمار لەگەڵ مام ئاراس و شوکور کە ئەوانیش پێشمەرگە و هاوڕێی خۆی بوون، تووشی شەڕێکی قورس ئەبن لە گەڵ کۆمەڵێکی زۆری سەربازدا و پاش برینداربوونیان شەهید ئەبن. ئیحسانی برام ئەو کاتەی شەهید بوو تەمەنی ٢٦ ساڵ بوو.

شەهیدبوونی ئیحسان کاریگەریەکی زۆری لەناو یەک بە یەکی خێزانەکەماندا جێهێشت. ئەو لە کاتێکدا شەهیدبوو کە هێشتا خەڵک لە زۆر لاوە بۆ پرسەی شەهید عادل ئەهاتن بۆ لامان. من زۆر خەمی دایکم بوو کە چۆن ئەتوانێ بەرگەی مەرگی ناوادەی دوو کوڕی لاوی بگرێت لە ماوەیەکی زۆر کورتدا. هیچ شتێک ئەو زامەی بۆ سارێژ نەئەکردین. جگە لەوە ئەوان کە بە بڕوای خۆیان لە پێناوی خەڵکدا و بۆ خۆشگوزەرانی و سەرفرازی و ئازادیی میللەتەکەیان شەهید بوون، بەڵام یەکێتیی نیشتیمانی بووە بە هێزێکی دژە ئازادی و دیموکراتی و ئەوەش مایەی ناکۆکیەک بوو بۆ من لە نێوان هەست و سۆزی برایانەم لە لایەک و قێزکردنەوە لە هێزێکی سیاسی کە تاسەر ئێسقان بەگیانی دژایەتی لەگەڵ سادەترین پرەنسیپی دیموکراتی

بارگاوی کراوە. ئێستا ئێمە تووشی کارەساتێکی گەورەی خێزانی بووین کە بەهیچ شتێک چارەسەر ناکرێت. دایکم پێش ئەوەی هەواڵی مەرگی ئیحسان بگات لە زمانی هاوڕێی پێشمەرگەی ئەوەوە بیستبووی کە بەم زوانە دێتەوە بۆ سەردان و خۆی بۆ ئەوە ئامادەکردبوو، کەچی وا تەرمەکەیان بۆ هێنایەوە. دایک و باوکم پێیان وابوو کە دوای شەهیدکردنی عادلی برام یەکێتی ئیحسان دوورئەخەنەوە لە ناوچەی پڕ لە شەڕو شۆڕی وەکوو کەرکووک تا ئەویش بەهەمان دەرد نەچێت، بەڵام دەرکەوت ئەوەی یەکێتی خەیاڵی لای نەبێ و گوێی پێ نەدا ژیان و چارەنووسی ئیحسان و ئیحسانەکانە. ئەوان زۆریی ژمارەی شەهیدان ئەکەن بە سەرمایەیەکی ڕەمزی بۆ دەسکەوتی سیاسیی خۆیان و خۆبادان پێوەی لەناو خەڵکدا. گەر ئەوکاتە ئەوە هەڵوێستی من و کەسانی هاوچەشنی من و کەمایەتیەکی خەڵک بووبێت سەبارەت بەیەکێتی، ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی کوردستان باش لەوە تێگەیشتوون و ئەزانن کە (حیزبی ڕووباری خوێن و هەزاران شەهید) لە کوێدا گیرساوەتەوە و چ تاڵاو و زووخاوێک ئەکا بەگەرووی خەڵک و کەس و کاری شەهیداندا. دیماگۆجیەتی سیاسی ناتوانێت تا سەر پەردە بدات بەسەر وێنەی قێزەون و نەفرەت لێکراوی یەکێتیدا. من هەر ئەوکاتە ماهیەتی ڕاستەقینەی یەکێتیم بەوچەشنە ئەناسی، بەڵام هێشتا زۆری مابوو کە ئەوە ببێت بە خودئاگایی زۆرینەی خەڵک.

من نەفرەت و قینم تا ئەهات لە یەکێتی و سیاسەت وکردەوەکانی زیادی ئەکرد وئێستاش ئەوان لەوپەڕی بێ باکیدا بایانداوەتەوە و لەبری قسەکانی دوێنێی سکرتێرەکەیان کە لە گەرمەی مفاوەزاتدا لە سورداش بەئاشکرا ئەیووت (صدام حەکەمە نەک دوژمنی ئێمە) و (ئێمە لەپشتەوە خەنجەری ژەهراوی نادەین لە سوپای عیراق)، ئەمڕۆ صدام حسین بە (ڕەفتار فاشی) ناو ئەبەن و بوونە بە چاوساغ و هاوکاری تەواوی ئێران و سوپای پاسداران.

تەنها شتێک کە ئەو ماوەیە دایک و باوکم بیریان لێ نەئەکردەوە ئەوەبوو یەکێتی دوای ئەو هەموو قوربانیەی خێزانەکەمان و لەگەرمەی شەهید بوونی دووەم برام لە ماوەی ٢ مانگ و نیودا، دەستبکەنەوە بە گێچەڵ بە من. من لەبەر باری دژواری خێزانی و لەژێر قورسایی ئەو جەوە سایکۆلۆجیەی کۆستی براکانمدا ئەو ماوەیە تەنانەت خولقی خوێندنەوەی کتێبێکیشم نەبوو، چ جای چالاکیی سیاسی و ڕێکخراوەیی کە ئەمیشیان مافێکی سروشتیی خۆم بوو. هێندەی پێنەچوو، بێ هیچ بەڵگە و هۆیەک کەوتنەوە بڕوبیانوو گرتن وئەزیەتدانم.
نەجاتی هاوڕێم نامەیەکی ناردبوو بۆم بەدەستی شۆفێرەکانی دێی قازانقایەدا گەیشتبوو بە د. ساجید کە لەوەوە بگات بە من. نامەکە ١٠٠ دیناری تیابوو کە ئەیادی حاجی نامیقی هاوڕێم دابووی بەنەجات تا ڕەوانەی منی بکات وەکوو یارمەتیەک. ساجیدیش ئەو ماوەیە ڕێی نەکەوتبووە دێلێژە تا بەدەستی خۆی بیگەیەنێ بە من بۆیە دابووی بە کوڕێک بەناوی شێخ مەحموود (حسیب سەمەد) کە فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٥٧ و خزمی خۆمیش بوو. ساجید دواتر بۆی باسکردم کە نەوەکوو نامەکە قسە و نهێنیەکی منی تیابێت بۆیە وای بەباش زانیبوو بیدات بە شێخ مەحموود کە کەسی ئێمەیە و ناپاکی ناکات. کەچی شێخ مەحموود، دوای وەرگرتنی نامەکە لە ساجید، لەدەرەوەی قازانقایە ئەیکاتەوە و ئەیخوێنێتەوە و لە بری من ئەیبات بۆ ئازادی سەرتیپ. نامەکە هیچ شتێکی تایبەت و نهێنیی تیا نەبوو، بەڵام ئەوان وەکوو بیانوویەک کردبوویان بە بەڵگە کە من کاری ڕێکخستن ئەکەم و ئەو پارەیەش ئابوونەی کەسێکە بۆ منی ناردووە، بەمەرجێک نەجات لەنامەکەدا نووسیبووی کە ئەوە پارەی ئەیادە وەکوو یارمەتیەک بۆ تۆی ناردووە. قسە وبیانووەکان زۆر بێسەروبەر و ناکۆک بوون لە گەڵ قسەی ناو نامەکەدا، بەڵام ئەوان گوێیان بەوە نەدەدا، تەنها مەبەستیان ئەوە بوو شتێک بۆمن

هەڵبەستن. نەجات بەناوی خۆیەوە نووسیبووی ئەو پارەیە ئەیاد داویەتی بە من تا ڕەوانەی تۆی بکەم، چونکە پێویستت بە پارە ئەبێت بۆ گوزەرانی ڕۆژانەت. جگە لەوەش نەجات بەچەند دێڕێک باسی لە مەغزای ئەم هێرشانەی یەکێتیی کردبوو لە دژی ئاڵای شۆڕش وخەڵکی لە لادێکان و بە دژی ئازادی و دژی دیموکراتی ناوی بردبوو. ئەو جگە لەوە هیچی تری نەنووسیبوو. منیش بێ ئاگابووم لە بوونی نامەیەکی وا و بەتایبەتیش گیرانی. ئازادی سەرتیپ و هاوڕێکانی زوزوو ئەهاتن بۆ سەردانی ماڵەوە و بە ڕواڵەت مجامەلەیان ئەکرد و خوڵقی ئەوەی ئەکرد کە بارەگای تیپ لە مێوڵی نیو سەعاتە و جارێک سەردانێکمان بکە و شتی لەوجۆرە. شێخ مەحموودیش کە ئەهات هیچ باسی نامە و شتی لەو جۆرەی نەئەکرد.
ڕۆژێکیان بێ ئاگاداریی من هاوڕێیان "جەبار مستەفا" و "نەجات" و "سمایل جەباری" هاتن بۆ سەردانم بۆ دێلێژە. ئەوان بۆ پرسە هاتبوون. عەبەی خورشەی ڕاپۆرت نووسی لای ئازادیش هەرکە بیبینیایە کەسێک خۆی ئەکات بەماڵماندا و بەتایبەتی بیزانیایە کە میوانی منە یەکسەر ڕای ئەکرد بۆ ماڵمان و دەستی ئەکرد بە چا تێکردن بۆ میوان و لە بەرگی چاکەکردن لەگەڵ ئێمەدا، چاودێریی منی ئەکرد. کە جەبار وئەوان هاتن عەبە خێرا خۆی گەیاندە ماڵمان کە هەموو خیزان و میوانەکان دانیشتبووین. دیاربوو عەبە یا نەجاتی ناسیبوو یا ئاگاداریان کردبوو کە شکڵ و سیمای ئەو چۆنە تا گەر هات بە پەلە ئازاد ئاگادار بکاتەوە. ئازاد خۆشی نەجاتی ئەناسی چونکە کوڕی یەک گەڕەک بوون. دوای ئەوەی یەکدوو چای تێکرد، عەبە خۆی ونکرد و زانیم کە خێرا براکەی نارد بۆ مێوڵی کە ئازاد ئاگادار بکاتەوە لەهاتنی نەجات و هاوڕێکانی من. من کە هەستم بەو جموجۆڵەی عەبەکرد مەسەلەکەم بە هاوڕێکانم گەیاند و وتم باشترە بڕۆن، چونکە ئەزانم دێن بۆ گرتنتان. ئەوانیش خەمی منیان بوو، بەڵام قەناعەتم پێکردن کە هەرچی زووە بڕۆن. من پێمووتن کە

بەرەو ئەللایی برِۆن، بەڵام ئەوان بە ئاراستەی قازانقایە ڕۆیشتبوون و لەڕێگە تووشیان بووبوو بە توشی ئازاد و پیشمەرگەکانی. ودوایی نازانم چۆن لە دەستی ئەوان ڕزگاریان بووبوو.
هاتنی نەجات بووە هۆی ئەوەی بەگرتنی نامەکە بزانم. دواتر شێخ مەحموود لە دێلێژە پێی وتم کە نامەکەت گیراوە و بەزمانی خۆی وتی کە من بردوومە بۆ ئازاد و ناتوانم هیچ شتێک لە یەکێتیی بشارمەوە. من پێم وت کە ئەوە نامەی منە و هەقت نیە وا بکەیت و ئەوە ناپاکیە و نامەکە شتێکی تیا نەبووە کە بیکەن بە بەڵگە بەسەرمنەوە. پاشان ئەو پارەیەش کە لەگەڵ نامەکەدا هاتووە زۆر باش دیارە کە دیاریی شەخسیی برادەرێکمە لە شارەوە ناردوویەتی کە خۆی توانای سەردانی نەبووە. شێخ مەحموود هیچی بۆ نەمابۆوە بۆ بەرگری کردن لەو کارە نامەردانەیەی و جاسووسی کردن بەسەر منەوە وتی: نابێ دڵگیر بیت، چونکە من ئەوکاتەی کە مەلا بەختیاریان دەستگیر کرد لە ڕێگای بردنی بۆ سەرکردایەتی شەوێکیان هێنایانە مێوڵی لای ئێمە زیندان بوو. شێخ مەحموود درێژەی پێدا تا وتی: ئەبوایە خۆمان ئێشکگری بین و لەنۆرەکەی مندا لە نیوە شەودا مەلا بەختیار داوای لێ کردم کە دەرگاکەی لێ بکەمەوە ڕابکات و منیش لەگەڵ خۆیدا ڕابکەم. دواتر شێخە وتی: منیش لە جیاتی دەرگاکردنەوە، یەکسەر چووم ئازادی سەرتیپم ئاگادار کردەوە لێی. ئەوە قسەی شێخە بوو بۆ پاساوی ئەو ناپاکیەی جا نەمزانی ڕاستە یا درۆ.
دوای نزیکەی مانگێک لە شەهیدبوونی ئیحسانی برام ڕۆژێکیان (عمر فتاح) و (شەوکەتی حاجی موشیر) و (جەمیل هەورامی) بەناوی سەردانەوە خۆیان کرد بەماڵماندا و من و باوکم لەگەڵیاندا دانیشتبووین. دوای نیو سەعاتێک ڕۆیشتن و من لە ژوورەوە مامەوە، بەڵام باوکم تا دەرەوە بۆ ماڵئاوایی لەگەڵیان ڕۆیشت. ئاگادار بووم کە لای دەرگای حەوشە لەگەڵ باوکمدا قسە ئەکەن و نزیکەی ١٥

خولەکی پێچوو تا باوکم هاتەوە. لێم پرسی چی بوو زۆرت پێچوو لەگەڵیاندا باسی چیتان ئەکرد؟ باوکم وەڵامی دامەوە کە ڕاستیەکەی باسی تۆیان ئەکرد؟

- باسی چی من؟
- ئەڵێن شوولی لێ هەڵکێشاوە و با واز بێنێت و ئێمە ئاگاداری هەموو شتێکی ئەوین و لەبەر ئێوە هیچ ناکەین و نەوەک کەسێکی تر لە پەناوە زەفەری پێ ببات و ناوی ئێمەی پێ خراپ بکرێت.
- باشە هیچ شتێکیان باسکرد. نموونەیەک لەو شتانەی من کردوومە وا ئەوان پێی هەراسان بوون؟
- نا ئەوان بەگشتی قسەیان ئەکرد.

باوکم و کەس و کارم گەرچی دەمێک بوو هەڵوێستی منیان سەبارەت بە یەکێتی ئەزانی، بەڵام ئاگاداری ئەوە نەبوون کە من پەیوەندیی ڕێکخراوەییم هەیە یان نا، بەس ئەیانزانی کە من ئەو ماوەیە بەهۆی ئەو قەیران و کۆستە گەورە خیزانیەوە هیچ جموجۆڵێکم نیە. هەر لە ڕاستیشدا دوای وازهێنانی بەکۆمەڵمان لە کارگەران لە گەڵ هاوڕێکانمدا هێشتا جموجۆڵێکی ڕێکخراوم نەبوو، ئەوە نەبێت کە لە ڕووی سیاسیەوە هەڵوێستێکی دیارم هەبوو بەرانبەر بە یەکێتی.

ئاخر تێڕوانینی جیاواز و هەڵوێستی فکری و سیاسی لەسەر لایەنێکی سیاسی لەلایەن کەسێکەوە، لە سایەی فاشیترین دەسەڵات و دیکتاتۆرترین سیستمیشدا نابن بە بابەتی تۆمەتی جینایی و بیانوویەک بۆ تەسککردنەوەی ئازادیی ئەو کەسە و چ جای ڕاپێچکردن و تەنانەت هەوڵی تیرۆرکردنی. ئەوانە هەمووی لەلایەک و لەولاکەی ترەوە من هەم خۆم پێشتر زیندانی سیاسی و ڕاکردووی دەستی ڕژێم بووم و چەندین ئەمر قەبز بەدوامەوە بوو و هەرچی ماڵ و ئیمکاناتمان هەیە بەهۆی یەکێتی بوونی براکەمەوە لەلایەن

ڕژێــمەوە زەوت کــراوە و ڕاونــراوین و لە دەرەوەش دوو بــرام لە ماوەی کەمتر لە سێ مانگدا شـەهیدی ئەو لایەنە سیاسیـەن کە ئێستا بەبـێ بـوونی هـیچ بەڵـگەیەک وا بـۆ جـاری چەنـدەم تەنگیـان پـێم هەڵچنیوە. جگە لەهەموو ئەمانەش من گەر بۆ دڵنەوایی دایکم نەبوایە ئامـادە نەبـووم یەک سـەعات لە نـاوچەی ژێردەسـەڵاتی یەکێتـی و لایەنی کوردیدا دانیشـم و ژیانی ئیختیفای شـار، سـەرباری مەترسیی مەرگـــی هەر چـــرکەیەک، زۆر شـــەریفانەتر بـــوو لە گـــێچەڵ و چاوسـووورکردنەوە و ڕاپێچـی ئەم میلیشـیایانەی یەکێتـی. ئێسـتاش ئەوەی دەسـتی بەسـتوومەتەوە ئەو بـارە کۆسـت کەوتـووەی دایکـم و کەس وکارمە کە پێم خۆش نەبوو تا هیچ نەبێت تۆزێک ئارام ئەبنەوە جێیان بهێڵم. بەڵام سەرباری ئەمانە زانیم کە ئەو قسانەی عمـر فەتـاح و شـــەوکەت وئەوان هەڕەشـــەیەکی ناڕاســـتەوخۆ و ئینــزار و بگــرە بیانووە بۆ هۆنینەوەی پلانـی لەناوبردنمـە گەر هەڵویستم نەگۆڕم، کە ئەوەش ئەستەم بوو بۆ من.

ڕۆژی دواتر عومەر مەولودی هاوڕێمیان بانگ کرد بۆ لێپێچینەوە لە بارەگـای تیـپ لەلایەن "ئـازاد حـەمە غـەریب"ەوە. دیـار بـوو جـگە لە هەڕەشـە و قسـەی سـووک هـیچ تۆمەتێک نەبوو بیدەنە پـاڵ عـومەر، بەڵام پاش هەڕەشەیەکی زۆر پرسیاری منیان لـێ کردبوو و ئەویش وەڵامــی دابــوونەوە و لە هــاتنەوەدا وتبووبــان جــارێ بــڕۆرەوە و ئەنێـرین بەدواتـدا و بە عـەدنانیش بڵـێ کە سـەردانمان بکـات. ئاگـادار بووم کە زۆر کەسی تر راپێچ و زیندانی کراون. مـن بە عـومەرم وت کە لەوە زیاتر لێرە نامێنمەوە و هەست ئەکەم نـابێ ئەم هەڕەشـانەیان بەکەم بگـرین. عـومەر وتـی تـۆ بـڕۆی منـیش لێـرە نـامێنمەوە منـیش ئامـادەم لەگەڵ تـۆدا بـێم. بڕیارمـان دا شـەوی دواتـر بەنهێنـی بەرەو سـلێمانی بکەویـنە ڕێ. بـاوکم سـەفەری دیـوی گەرمیـانی کردبـوو و تەنهـا دایکـم و منالەکـانی عـادلی بـرام و هاوسـەرەکەی لە مـاڵ بـوون. پلانەکەمـان وادانـا کە سـەعات چـواری بەیـانی ئێـرە جـێ بهێڵین بەبـێ

ئەوەی کەس ئاگـادار بێـت. ئەمـان زانـی لێـرەوە بەرەو سـلێمانی بە ئاراسـتەی داریکەلیـدا نـزیکەی ٤ - ٥ سـەعات ڕێـگەیە. ئەو شـەوە بەدایکم وت پێش ئەوەی بنویت حەز ئەکەم چەند قسەیەک بکەین.

- قسـەی چـی؟ دایکـم لە نـاو پێخەفـی نووسـتنەکەوە پرسی.

- من ناتوانم لەوە زیاتر لێرە بژیم. پێ ئەچێ ئەمانە نیازیان خراپ بێت و مانەوەی زیاتری من لێرە باش نیە و نمـوونەی زۆرم بـۆ باسـکرد کە چـۆن یەکێتـی نەیـارانی سیاسـیی خـۆی لەنـاوبردووە و هاشـای لەوە کـردووە کە ئەوان بەو کارانە هەڵسابن.

- جا تۆیەک کە لەلایەن حکوومەتەوە بەخوێنی سەرت تینـوون لە مـردن زیـاتر هـیچ چارەنووسـێکت نابێـت کـوڕم. ئەوان لە کەرکـووک کە تـۆ خەریکـی خوێنـدن بـووی هەمـوو ڕۆژێـک ڕاپێچـی ئەمنیـان ئەکـردی، ئێسـتا پـاش ئەو هەمـوو بەزمە ئەڕۆیتەوە بەردەستیان؟

- من ئەوانە ئەزانم و پێم خـۆش نەبوو ڕوو بکەمەوە ئیختیفا وئەو مەترسیە، بەڵام ئەمەی لێرە بەسـەرم دێت لەو باشـتر نابێـت و ئەم هەمـوو زیلـلەت و ئەزیەتەشـم پـێ تەحەممول ناکرێت و ئەزانم بەوەشەوە ناوەستن.

دایکـم پـاش هەڵکێشـانی ئـاهێکی قـووڵی گەرم و پـڕ لە حەسـرەت هەڵیدایەوە:

کوڕم من لێم مەعلوومە کە تۆ لەسـەر هەقی، بەڵام ئەزانـم گەر بڕۆی جارێکی تر ناتبینمەوە و لانی کەم عادل و ئیحسـان گۆڕەکەیـان دیارە و بـۆ سـەبووری جاروبـار سـەردانێکیان ئەکەم، بەڵام تـۆ ئەوەش جێناهێڵی.

من گەرچی بڕیاری بێگەڕانەوەی خۆم دابوو، بەڵام هیچکات وەکوو ئەو شــەوە و لەبەرانــبەر ئەو قســانەی دایکمــدا دۆش دانەمــابووم. لەلایەکەوە خـۆم زۆر بە دڵ ڕەق ئەزانــی کە ئەبـم بە مـایەی خەم و تێشکانێکی ڕووحیی سـەرباری تر بۆ ئەو و لەلایەکی تریشـەوە ئەوە لەلام بڕیـارێکی سیاسـی بـوو و هەر مـانەوەیەکم ئەبـوایە بە بەهـای سەرکزکردن بوایە لەبەرانبەر ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی یەکێتی.

لە چەنـد چرکەیەکـی بێدەنگیـدا لە مێشـکی خۆمـدا بـۆ دواجـار هەمـوو بژاردەکانم هێنا و برد و تاووتوێیەکی ترم کـردنەوە و وتـم: دایە گیـان مـن هەر ئەڕۆم و مەرجـیش نـیە تووشـی ئەوە بـم کە تـۆ پێشـبینیی ئەکەیت و بە گەرمییەکی کەم وێنەوە لەباوەشـم گـرت وبۆنێکم کـرد و وتم بنوو بەیانی من ئەڕۆم وخەمت نەبێت دواتر وەڵامت بۆ ئەنێرم.

هەرگیـز ئەو چرکەسـاتەی بـاوەش پیاکردن و ماڵئـاوایی دایکمـم لەبیـر ناچێت و ئێستاش وەکوو ڤیدیۆیەک بەهەموو هەست و جووڵەکانیەوە لەبەرچــاومە. هەرگیــزیش ئەوەم لەبیــر ناچێــت کە ســەرکوتگەری و خەسڵەتی میلیشیابوون و دژە ئازادیی یەکێتیی نیشتیمانی بوونە هـۆی ئەو دڵسووتان و خورپە عاتیفیەی دایکم و لێیان خۆش نابم.

دوای ڕاکـردنم "ئـازادی حـەمە غەریـب"ی سـەرتیپی ٥٧ لای کەسـێک وتبووی: عدنان توانیی لە دەستمان هەڵبێت و من چەند جـار دەمـووت با بیکوژین، بەڵام کاک نەوشیروان دەیگووت جارێ مەیکوژن!!

بەدوای ئەوەدا بەدڵێکــی پــڕ لە ژان و قیــنەوە، بەڵام بە بڕوایەکــی بەهێزیشەوە بە ڕاستیی هەڵوێست و پێداگریم لەسـەر ئـازادیی خـۆم و دەســبەردارنەبوون لێـی لەژێـر هـیچ هەڕەشــە و ترسـێکدا، زەنگـی سەعاتەکەم بۆ چواری بەیـانی نـایەوە و بەو هەمـوو هەسـت و خەیـاڵ و چـاوی پـڕ فرمێسـکەوە لە پەنـای دایکمـدا نووسـتم. سـبەی پـێش سەعات چوار بەئاگا هاتمەوە و پاشـان عـومەر بە پێ دزە خـۆی کـرد بە ماڵمانـدا و زۆر بە وریـاییەوە ڕێگەمـان گـرتە بەر و خۆمـان دوور ئەگرت لە دێهاتی سـەرەڕێ تـا لەبەر سـەگوەڕ، خەڵـک یـان پێشـمەرگە

پێمـان نەزانـن. پـێش کـاتژمێری ٧ ی بەیـانی خـۆرهەڵات و بەجـوانی سلێمانیمان لێوە دیاربوو. عومەر وتی: من ماڵی خۆشکم، کە هـاوژینی "تەیب جەبار"ی ئەندازیارە لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕێگاو بانی سلێمانی، لە شارە و با لە ڕێوە بڕۆین بۆ ئەوێ و پاشـان لەوێوە تۆ بـڕۆ بۆ لای هاوڕێکانـت و دواتـر یەک ئەدۆزیـنەوە. دەوروبەری ٨ ی بەیـانی لە کانی و ئاوێکی ئەو ناوە دەموچاومان شت و خۆمـان لە تەپ و تۆزی ڕێگـا پـاک کـردەوە و لە ئاسـتی کـارگەی ئەلبیسـەکەی سـلێمانیەوە لەسـەر جـادە گشـتیەکە تەکسیەکمان ڕاگرت تـا گەیشـتینە مـاڵی کـاک تەیب کە ئەوکاتە لەناوەڕاستی شاردا بوو. پاش هـاتنەوەی کـاک تەیب لە کـار بەخێرهـاتنی گەرمـی لێکـردین و مـن مـاڵی نەجـاتم ئەناسـی و ڕۆیشتم بۆ لای ئەو. تەیب کە خۆشی یەکێتی بوو پیاوێکی ئازادیخواز و ڕۆشـنبیرێکی ورد بـوو کە لەو ڕۆژەوە بـوو بە هـاوڕێیەکی نـزیکم. ئەو سەرباری ئەوەی کە لایەنگری لە یەکێتی ئەکرد، بەڵام ئەو جۆرە کـردەوانەی شـەرمەزار ئەکـرد و خـاوەنی هەڵوێسـتێکی ئـازادیخوازانە بوو.

پاش ئەوەی نەجات لە دەرەوە هاتەوە بەسـەرهاتی خـۆم بۆ گێڕایەوە و ئەویـش زۆری پـێ بـاش بـوو کە ڕامکـردووە و گەڕاومەتەوە بـۆ سـلێمانی. هەر ئەو شـەوە یـا شـەوی دواتـر بـوو لەگەڵ جەبـاردا سـێ قۆڵی کۆبونەوەیەکی دووررودرێژمان کرد وگەیشتین بە کۆمەڵێ بڕیـار. ئەوان هەردووکیــان لەو مــاوەیەدا کە مــن ڕۆیشــتبووم، بەتــایبەتی نەجـات، کـاری باشـیان کردبـوو و هەرچـی پەیوەنـدیی سیاسـی و ڕێکخراوەیـی پێشـووتری سـەردەمی کـارگەران هەبـوو بەسـەریان کردبـۆوە. پـوختەی لێکـدانەوەکەمان وابـوو کە سـەرباری پەرش و بلاوی و پاشەکشـەی زۆر، هێشـتا بزووتنەوەی کۆمۆنیستی زیندووە و لەناوخۆیدا تەفاعولات ئەکا. بەشێکی زۆری کەسایەتیی مارکسیی کوردسـتانی عێـراق لەبەر نائومێـدی و نەبـوونی ڕێکخراوێکـی کۆمۆنیستیی چالاک لە کۆمەڵدا، سـەریان کـردۆتە ئەدەبیـاتی حیزبـی

کۆمۆنیستی ئێران و تەنانەت هەشیانە ڕاستەوخۆ بەوانەوە پەیوەست ئەبن. بزووتنەوەی کۆمۆنیستی لێرە پێویستی بە خەت و ڕێبازی سیاسیی خۆیەتی کە بیخاتە سەر پێ تا وەکوو بزووتنەوەیەکی سیاسی لە کۆمەڵدا دەرکەوێ و ببێت بە بەدیلێک. ناڕەزایەتی لە ناو خەڵکدا شەپۆل ئەدا و گەرچی هێزەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە کوردستاندا پاشەکشەی زۆریان کردووە، بەڵام بەهۆی نەبوونی ڕێکخراوێکی مارکسیی و ئازادیخوازانە ئەتوانن خەباتی خەڵک بکەنەوە بە پەیژەیەک و دیسانەوە خەڵک لەدەوری خۆیان بئاڵێنن. سەرباری پەرەسەندنی سەرکووت و دیکتاتۆریەت بەڵام ڕژێم لەناو خەڵکدا پایگای نیە و بەپێچەوانەوە جێی نەفرەتە. بوونی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و پێشڕەویەکانی ئەوان بوارێکی گونجاوتر بۆ ئێمە ئەڕەخسێنن بۆ گەشەکردن. ئێمە بەهرەمەندین لە پایگا و تاقیکردنەوە و ڕابووردوویەکی باش کە ئەتوانێت یارمەتیدەرمان بێت لە قۆناغی نوێی تێکۆشانی سیاسیماندا. ئەوانە پوختەی بیروڕا وشرۆڤەی ئێمە بوو بۆ بارودۆخی ئەوکاتە.

هەرچی (ڕەوتی کۆمۆنیست)ە ئەوان پێیان وایە کە ئێستا سەردەمی خەباتی تیۆری و فکریە بۆ ساغکردنەوەی بەرنامە. ئەوان زیاتر ڕوویان کردۆتە کاری محفەلی و زیاتر سەریان کردۆتە ناو لاکی خۆیان و گوایە بەو جۆرە و بەدابڕاو لە خەباتی چینایەتی و ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵگە دەستیان ئەگا بە بەرنامە. ئێمە پێمان وابوو کە ئەو تێڕوانینەی ڕەوت بەرنامە و سەربەخۆیی سیاسی ئەکا بە بەڵگەنامەیەکی سەر کاغەز نەک پرۆسەیەکی دانەبڕاو لە تەفاعولی نێوان مارکسیزم و خەباتی چینایەتی لە جەرگەی ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ناو کۆمەڵگای عێراق. ئێمە ئەمان وت بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی سیاسی و بەرنامەیی ئەبێ لەچەند ڕێگە و مەیدانەوە درێژە بە تێکۆشانی خۆمان بدەین:

**یەکەم:** لە خەبـاتی سیاسـی و نـاڕەزایەتیی نـاو کـۆمەڵ، بەهەمـوو مەیدانەکانیەوە، وەکوو کۆمۆنیست، بەشدار بین و ڕووی تێ بکەین، یاخود لانی کەم ئەوە میتۆدی سیاسەتکردنمان وناوەڕکی تێڕوانینمان بێت. ڕەنگ بێ لە سەرەتاوە هێزمان نەبێ بەڵام خەباتی مەیدانەکانی نـاو کۆمەڵگـا هەم جێـی خۆگرێـدانەوەی ئـێمەیە بە چینـی کرێکـار وخەڵکەوە و هەم ئەو شوێنەشە کە چارەنووسی ئەم کۆمەڵگایە تیایدا دیـاری ئەکرێـت. جـگە لەوانەش ئەوە ئەو جـێگەیەیە کە ڕاسـت و دروستی بۆچوون و سیاسەت و هەڵوێستەکانی ئێمەش تیایدا تاقی ئەکرێتەوە و تەکمیل و پوخت ئەکرێتەوە.

**دووەم:** خەبـاتی تیـۆری و فکـری هەم بـۆ ڕۆشـنکردنەوەی کێشـە و گرفتەکـانی خەبـاتی سیاسـیە و لەوێـوە بـایەخ پەیـدا ئەکـات و هەم بەشـێکە لەخەبـاتێکی جیهـانی و سەرتاسـەری. ئـێمە بـۆ گەیشـتن بەسەربەخۆیی سیاسی و بەرنامەیی پێویستمان بە خەباتی تیۆری و فکریە، بەڵام بەو مانایە و لەو سیاقە سەلیمەدا نەک کردنی تیۆری و خەباتی تیۆری بە جیهانێکی دابڕاو لە کێشـە و گرفت و ململانێکانی ناو کۆمەڵ، کە بەتووندی درێژەیان هەیە و لەڕاستیشدا بە بێ بوونی سـەنگەرێکی سـەربەخۆی کۆمۆنیسـتی درێـژەی هەیە. ئـێمە ڕەخنەی زۆرمان هەبوو لەو میتۆد و عەقڵیەتەی کە ڕەوت پەیڕەوی لێ ئەکرد و توانا و وزەی کۆمۆنیستەکانی تووشی ئیفلیج بوون ئەکرد بەناوی خەبات بۆ بەرنامە ودەستگەیشتن بە تیۆریی ڕەسەنی مارکسیزم. ئێمە ئەوەمان ناو نابوو (ئەکادیمیزم) وەکوو گرفتێکی ئەم قۆناغەی بەشێکی گەورەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی کوردستان کە (ڕەوتی کۆمۆنیست) نوێنەرایەتیی ئەکرد. لەبەرانبەر بەوەدا ئێمە پێداگریمان دەکـرد لە بەشـداری (دەخـالەت) لە خەبـاتی ڕۆژانە و دابینکردنـی پێویستیەکانی گەشەی ئەو خەباتە بەپێی ئەو دەرکەی ئەو سەردەمە هەمان بوو.

**سێیەم:** بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و چەپ و مارکسی بزووتنەوەیەکی فراوانە وئەو دەرکە (ئەکادیمیستی)یە نەخۆشیی ناو کەمینەیەکی بزووتنەوەکەیە. هێشتا و لەپەنای ئەودا هەزاران کەسی چالاکی ئەم بزووتنەوەیە دەرگیری هەوڵێکی بەردەوامن بۆ ئاوێتەبوون بە خەباتی ڕۆژانەی ناو کۆمەڵگا لە چوارچێوە و لەبەر ڕۆشنایی مارکسیزمدا. ئێمە بەشێکین لەو تەییارە پان و بەرینەی کۆمەڵگا و ئەوێ مەیدانێکی گرنگی خەباتی ئێمە و کارلێکی ئێمەیە بە ئامانجی ڕێکخستن و سەروسامانداان پێی لە ڕێگای خەتێکی سیاسی وبەرنامەیی و دیدگایەکی فکریی ساغ و دروستەوە کە بە تەواوی جیاواز بێت لەو میتۆد و عەقلیەتە گۆشەگیر و دابڕاوەی ناو ڕابەریی ڕەوتی کۆمۆنیست.

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو کە ڕەوتی کۆمۆنیست پاش ئەو هەموو ساڵە لە پێداگری لەسەر تیۆری و دراسە و چوونە ناو جیهانی داخراوی خۆیان، هەتا پەیوەستبوونیان بە پرۆسەی دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستیی کرێکاریی عێراقەوە، یەک لاپەڕە دەسکەوتیان لەبواری فکر و تیۆری و بەرنامە لێ جێنەماوە و بەیەک ناملیکەش نەیانتوانی ئەو خەباتە تیۆریە بخەنە بەردەستی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و کێشە زۆر و زەبەندەکانی ئەم بزووتنەوەیەی پێ شیبکەنەوە. ئەوان بە شێوازێکی زۆر ئۆپۆرتۆنیستانە وبگرە کاریکاتۆر ئاسا، ڕائەوەستان تا حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بەرهەمێکی تیۆری یا فکریی سەبارەت بە یەکێک لە مەسەلەکانی مارکسیزم بڵاوئەکردەوە، لە هەردوو قۆناغی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ یا کۆمۆنیزمی کرێکاری، و دوای خوێندنەوە و وەرگێڕانی بۆ کوردی، ئینجا ڕایان ئەگەیاند کە ئەوانیش لە خەباتیاندا پێیان ناوەتە قۆناغێکی نوێ و یا بوونە بە هەڵگرانی پەیامی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ یا کۆمۆنیزمی کرێکاری. بەوجۆرە بەشێوازێکی منداڵانە وکاریکاتێر ئەیانەویست بڵێن کە ئەوە ئەوانن کە یەکەم هەنگاویان لە عێراقدا ناوە

و ئـاڵوگۆڕێکی ڕیشـەییان بەسـەرداهاتووە و لە بڵاوکـردنەوەی فـلاَنە نووسـراوەوە ئیتـر بـوونە بە کۆمـۆنیزمی کرێکـاری و لە جیهـانی ناکرێکاریی دوێنێ و میتۆدی (چەپی سوونەتی) دابڕاون. ڕاستیەکەی ئەوە بە کاریکـاتۆرکردنی ئەو مارکسـیزمی شۆڕشـگێڕ و کۆمـۆنیزمی کرێکاریە زیاتر شتێکی تر نەبوو، بەدەر لەوەی نوسخە ئەسڵیەکەی ئەو تێـز و لێکـدانەوانەی حیزبـی کۆمۆنیسـتی ئێـران چەنـد دروسـت بـوون لە ڕووی میتـۆدی شـیکردنەوەوە یـا لە ڕووی ئەنجـامگیریە سیاسیەکانیەوە بێت.

ڕاستیی لەوەش تاڵتر ئەوەبوو لە بەرامبەر ئەم بە کاریکـاتۆرکردنەی مارکسـیزم بەگشـتی و دەسـکەوتە تیـۆری و فکـری و سیاسـیەکانی خۆیانـدا، حیزبـی کۆمۆنیسـتی ئێـران لەهەردوو قۆنـاغی مارکسـیزمی شۆڕشـگێڕ و کۆمـۆنیزمی کرێکاریشـدا، نقەیـان لێـوە نەئەهـات و لە چوارچێـوەی پەیوەنـدیە دۆسـتانەکانیاندا نە ڕەخنەیـان لەو پرۆسـەی بەکاریکـاتۆرکردنە دەگـرت نە سـەرنجی هـاوڕێ عێراقیەکـانی خۆیـان ڕائەکێشا بۆ نادروستی ئەو شێوازە لە سیاسەتکردن بە گشتی و ئەو شـیواندن و (مەسـخ)کردنەی مارکسـیزم و سـەرئەنجامە خراپەکـانی، بەتـایبەتی ئەوان پەیوەنـدیەکانی خۆیـان لەسـەر بنەمـای تەفـاعولێکی ئۆرگانیـک و ڕەخنەگـرانە و کـارلێکی پۆزەتیـڤ لەگەڵ کۆمۆنیسـتە عێراقیەکـان بنیـات نەدەنـا، بەڵکـوو زیـاتر پەیوەنـدیەکی دیبلۆمـاتیکی ناهاوتـــا بـــوو و ئەوەی لێـــی کەوتەوە لایەنگریەکـــی ســـەتحی و ڕووکەشیی بەرەی هـاوڕێ عێراقیەکـان بـوو کە مجـامەلە و ڕەسـمیات ئاکامێکی دانەبڕاوی بوو.

لە پەیوەنـدیی لە گەڵ کۆمۆنیسـتەکانی کوردسـتانی عێراقـدا، حیزبـی کۆمۆنیسـت دیبلۆماسـیانە هەنگاویـان دەنـا و مجـامەلە و ڕووپۆشـی تەشـــریفاتی زاڵ بـــوو بەســـەر هەڵوێســـتیاندا و کەمتـــر دەکەوتـــنە گفتوگۆیەکی ڕۆشن و ڕاستەوخۆ وڕاشـکاو سـەبارەت بە کێشـەکان و گرفتەکـانی بزووتنەوەی چەپ لە کوردستانی عێراقدا. ئەوان ئەوەیـان

زیاتر لامەبەست و گرنگ بوو کە لایەنگر پەیدا بکەن لەناو کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراقدا ئەگینا، بەپێی تێڕوانینی ئێستای من، ئەبوایە وەکوو بەرپرسیارێتییەکی سیاسی سەرنج و ڕەخنەکانی خۆیان سەبارەت بە واقیعی ئەو بزووتنەوەیە، لە کەناڵی تایبەتیی خۆیەوە، دەربڕیایە و ڕابگەیاندایە.

لێرەدا نابێ بۆ مێژوو چاوپۆشی لەو ڕاستیە بکەم کە گەرچی (ڕەوتی کۆمۆنیست) نموونەی تیپیکاڵ (نموذجي)ی ئەو میتۆد و عەقڵیەتە بوو سەبارەت بە تێڕوانین بۆ (دەسکەوتەکانی) حیزبی کۆمۆنیستی ئێران، بەڵام گرووپ وکۆڕ و کۆمەڵەکانی تری چەپی عێراقی زۆر لەوان جیاوازتر و باشتر نەبووین. هەموومان بەچاوی ئەبڵەق بوون و سەرسامییەکی چاوداخراوەوە ئەمانڕوانیە ئەو باس و بڕوا سیاسی و تیۆریانەی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران. هۆکاری ئەوە زۆرن و ڕەنگ بێ ئەم لاپەڕانە جێی گونجاوی خستنەڕوویان نەبێ.

## بڵێسه

تا ئەهات سازان و ئینسیجامی فکری و سیاسیی ئەو گرووپەی ئێمە پتەوتر ئەبوو. من و نەجات پێکەوە لە ماڵی ئەوان ئەژیاین و ئەوەش زەمینەیەکی باشی بۆمان ڕەخساندا کە جگە لە ئاوێتەبوونی تەواوی فکریمان و هاوڕاییمان لەسەر سەرجەم ئەرکە سیاسیەکانمان، کاری زۆرتریش لە بواری ساغکردنەوەی خەت و ڕێبازی قۆناغی نوێی هەڵسووڕانماندا بکەین. هەر چەند ڕۆژێک بە هەندێ ئەنجامگیری و پێشنیار و ڕوونکردنەوەی نوێوە ئەڕۆیشتین بۆ لای جەبار و ئەویش بەهەمان شێوە باس و بڕیارەکانی دەولەمەندتر ئەکرد. ئێمە ئەو کاتە هاوکات و هاوتەریب لە گەڵ قووڵبوونەوەی زیاتر و پێشڕەوی زیاتری ئەم گرووپە سێ کەسیە، هەریەکەش لای خۆمانەوە تۆڕێک پەیوەندیی فراوانمان لەهەموو شار و شارۆچکەکانی کوردستان و زانکۆکانی بەغدا و مووسڵ هەبوو. پێ بەپێی گەشەکردن وڕوونبوونەوەی ڕێبازی سیاسیمان و دیاریکردنی جیاوازیەکانمان لەگەڵ (ڕەوتی کۆمۆنیست) و سەروسامانداان بە تایبەتمەندیەکانی گرووپەکەمان، لەناو ئەو تۆڕی پەیوەندیە فراوانەشماندا هەمان باس و مەسەلەمان ئەورووژان و بەرەوپێشمان ئەبرد. جەبار پەیوەندیەکانی زیاتر لە سلێمانی بوو، جگە لە پەیوەندیی لەگەڵ "عوسمان محمد کەریم" و "ستار"ی برای لە کەلار وهەندێکی تر لە کەرکووک. نەجات لە سلیمانی وکەرکووک و هەولیر پەیوەندیی فراوانی هەبوو. من جگە لە سلێمانی لە هەولێر و کەرکووک ودووزخورماتوو پەیوەندی و هاوڕێم هەبوو. هەرسێکمان لە

زانکۆکاندا پەیوەندیی سیاسیمان هەبوو. "سیروان"ی برای جەبار کادریکی چالاکی گرووپەکەمان بوو کە پەیوەندییەکی فراوانی هەبوو. ماموستا ستار کادرێکی چالاکی گرووپەکەی ئێمە بوو و ئەویش لای خۆیەوە پەیوەندیی زۆر بوو. ئەو ماوەیە جگە لە چێککردنەوەی ئەو پەیوەندیانە و پیاجوونەوە و بەسەرکردنەوەیان بەشیوەی هەڵمەتێکی فراوان و چڕو پڕ دەستمان کردەوە بە چالاکی و چەندین پلان و بەرنامەی کارمان بۆخۆمان دیاریکرد.

لە دریژەی ئەو باس وچالاکی و گفتوگۆ چڕو پڕانەدا کە لەناو ئەو ئەڵقە سێ کەسیە و لەگەڵ ئەو کۆڕ و کۆمەڵە فراوانەدا ئەنجامماندا، گەیشتین بەو بڕیارەی کە کاتی ئەوە هاتووە کە ڕیزەکانی خۆمان ڕێکبخەین و چوارچێوەیەکی سیاسی و ڕێکخراوەیی بۆ چالاکیەکانمان دەستنیشان بکەین. جەبار مستەفا لە وەڵام بە سالار ڕەشید لە کتێبی (مێژوویەک لە یادەوەریدا) پێکهاتنی بڵێسە ئەگێڕێتەوە بۆ زستانی ١٩٨٥، بەڵام من گومانم نیە کە بڵێسە لەبەهاری ١٩٨٦ دامەزرا، چونکە من بەهۆی سەرقاڵبوونم بەهۆی شەهید بوونی براکانمەوە لەنێوان دیسەمبەری ١٩٨٥ و شوباتی ١٩٨٦ لە دێلێژە بووم و ناوەڕاستی مانگی نیسانی هەمان ساڵ هاتمەوە بۆ سلێمانی و زنجیرە کۆبوونەوە وهەڵمەتی پەیوەندیەکانمان دەستپێکرد کە ئەڵقەی کۆمۆنیستیی بڵێسەی لێ بەرهەم هات.

دامەزراندنی بڵێسە ئێمەی خستە بەردەم ئەرک و بەرپرسیارەتیی زۆر. لەو ئەڵقە سەرەکیە سێ کەسیە جگە لە جەبار کە ئەویش کەسایەتیەکی سیاسیی دیار و پێشتر زیندانیی سیاسی بوو، من و نەجات بە ئیختیفا ئەژیاین. ئەو ژیانی ئیختیفایە، سەرباری کێشە وگرفتی زۆر و تایبەتیی خۆی، بەڵام نەبوو بە ڕێگرێک لە بەردەم چالاکی و جموجۆڵەکانماندا. بەو هۆیەشەوە کە لێپرساوەتیی خیزانیمان لە ئەستۆ نەبوو و کاریشمان نەئەکرد، سەرجەم ژیان و کاتمان تەنها بۆ ڕایی کردنی ئەرکە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانمان

تەرخـان کردبـوو. بـۆ دابینکردنـی پێویسـتیە ماددیەکانیشـمان، نەجـات سـاڵانە کـارێکی قـۆنتەراتی بچـووکی ئەگـرت کە بەزیـادەوە پـارەی پێویستی پەیدا ئەکرد ولەو بارەشەوە بێ خەم بووین.
زنجیرەی کۆبوونەوەی سێ قۆڵیمان بەردەوام بوو و جاری وابوو لە هەفتەیەکدا دوو جار کۆئەبووینەوە ولە سەرەتاوە ماڵی باوکی جەبار شـوێنی یەکتـر بینینمـان بـوو. مـن و نەجـاتیش شـەو و ڕۆژ پـێکەوە بووین و ئەوەش خزمەتی باشی پێکردین.
سەرەتا دەستمان کرد بە دیاریکردنی ئەرکەکانمان وەکوو گرووپێکی سیاسـی. بەپێـی خوێنـدنەوەی خۆمـان بـۆ ئەرکەکانمـان مەیـدانەکانی هەڵسووڕانی خۆمان بەم شێوەیە دیاریکرد:
**یەکەم:** کـار لەنـاو کرێکـاران و پێکهێنـانی گرووپـی چەنـد کەسـی لە کرێکارانی پێشڕەو وڕابەرانی عەمەلی.
ئێمە بڕوامان وابوو کە گرووپ و مەحافیلی کرێکاران لە شوێنی کارو ژیانـدا باشـترین و گونجاوترین شـێوەیە بە لەبەرچاوگرتنی سـەرجەم بارودۆخی زاتی و بابەتیی ئەوکاتە. ئێمە پێمان وابـوو هەر لە درێژەی ئەم چـالاکی و پەیوەنـدیی بەم ناوەنـدانەوە هاوڕێیـانی ئـێمە ئەرکیـانە کەسـایەتیی سۆسیالیسـتی وکرێکـاری بێنـنە ڕیـزی ڕێکخـراوەوە تـا وەکـوو ئەنـدامێکی گرووپەکەمـان ئەرکەکـانی لە ئەسـتۆ بگرێـت. بەتاقیکردنەوەی زیاتر لە ساڵی یەکەمی ئێمە سـەرکەوتنی باشـمان لەم بوارەدا بەدەست هێنا.
**دووەم:** خەبـات لە دژی ڕژێمـی دیکتـاتۆری کە زیـاتر لە بەرگریـی خەڵـک لە بەرانـبەر سـەرکوتی ڕۆژانەی دەزگاکـانی داپڵۆسـین وسـەربازگیری و کردنـی بەزۆری خەڵـک بەجەیشـی شـەعبی لە قوتابخـانە و دائیـرە و زانکۆکانـدا بەڕێـوە ئەچـوو. بەگشـتی خەبـات لە دژی سەرکوت و دیکتاتۆریەت گرنگترین و زەقترین مەیدانی خەباتی سیاسیی هەموو خەڵکی کوردستان بوو.

**سێیەم:** خەبات لە دژی شەڕی نێوان عێراق و ئێران مەیدانێکی تایبەت بەخۆی بوو. گەرچی شەڕ لەگەڵ سەرجەم بوارەکانی ململانێ سیاسییەکانی ئەو کاتەی نێوان خەڵک و ڕژێمدا بەریەک ئەکەوتن، بەڵام بەهۆی خۆشباوەڕیی خەڵک بە ماهیەتی شەڕ و کاریگەری هێزە سیاسیە کوردستانیەکانی ئۆپۆزیسیۆن و گرەوکردنیان لەسەر درێژەی شەڕ تا سەرکەوتنی ئێران و ڕووخانی ڕژێم، هەموو فایلەکانی سیاسەت و ململانێکان تێکەڵ بووبوون.
ئێمە پێمان وابوو لە ئێستادا شەڕ و دیکتاتۆریەت دوودیوی یەک دراون. ئەم شەڕە جگە لەوەی بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی کۆنەپەرستی نێوان دوو ڕژێمە بە دوو ئایدیۆلۆجی و سیستمی سیاسیی کۆنەپەرستەوە، لە هەمان کاتیشدا بووە بە دەستاڕێک کە ژیانی خەڵک ئەهاڕێت. شەڕی عێراق – ئێران بۆ صدام بوو بە کەرەستە و پرۆسەیەک بۆ ساغکردنەوەی تەواوەتیی و سەپاندنی سیستمی تۆتالیتاری و شمولی لە وڵاتدا. جگە لەوەش شەڕ ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا بۆ کرانەوەی دەستی ڕژێم بۆ ویرانکردنی سەرجەم پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و شیرازەی کۆمەڵگای عێراق بەتایبەتی لە خوارووی وڵاتدا. لە کوردستانیشدا ئیتر پەرەسەندنی دیاردەی خەفیفە و موستەشار و دامەزراندنی تۆڕی جاسوسی و هێنانی پاسدار و کردنی کوردستان بە مەیدانی شەڕی ئێران و عێراق وتووندبوونەوەی تەعریب و تەبعیس بەشێک بوون لە کاریگەریەکانی سیاسەتی شەڕخوازیی بەعس کە بە سووتانی کوردستان و جینۆساید و ئەنفال و کیمیاباران دوایی هات.
ئەوکاتە لە ڕوانگەی ئێمەوە وەستانی شەڕ، نەک درێژەپێدانی، ڕێگەی ڕووخانی ڕژێمی خۆش ئەکرد. لەو ڕووەوە ئێمە هەم چەند نووسراوەمان لە فارسیەوە وەرگێڕایە سەر کوردی و بەیاننامەیەکی درێژیشمان سەبارەت بەشەڕ بڵاوکردەوە.

**چـوارەم:** خەبـات لە دژی سـتەمی نەتەوایەتـی لەسـەر گەلـی کـورد بوارێکی تری چالاکیی سیاسی و فکری و پراکتیکی ئێمە بوو.
ئــێمە ســەرباری پشــتگیریی تەواومــان لە خەبــاتی ڕەوای خەڵکــی کوردســتان بـۆ وەسـتانەوە لە دژی سیاسـەتە شـۆفێنیەکانی ڕژێمـی عێراق، پێمان وابوو کە بزووتنەوەی چەکداری و سیاسیی نەتەوەیی کـورد و هێـزە سیاسـیەکانی نـاتوانن ئەم مەسـەلەیە چارەسـەربکەن، بەڵکوو ئەوان ئەم داوا ڕەوایەی خەڵک ئەکەن بە نەردەوانێک تـا بـبن بەشــەریکی دەســەڵات و ڕژێــم لە عێراقـدا. شـیعاری ئـێمە (مــافی دیــاریکردنی چــارەنووس بــۆ گەلــی کــورد) بــوو، بەڵام چــۆنیەتی بەدیهـاتنی و قۆناغەکـانی و پێویسـتیەکانیمان ڕوون نەکردبـۆوە. مـن وتـارێکی درێژم لەو بـارەوە نووسی کە وەکوو نـامیلکەیەک بە نـاوی ڕێکخراوەوە بڵاوکرایەوە.
سـەرەتای ١٩٨٧ ڕژێـم بە بڕیـارێکی (مجلـس قيـادة الثـورة) یاسـای گـۆڕینی کرێکـاران بە فەرمـانبەری دەرکـرد بەنـاوی (قـانون تحويـل العمال الى موظفين). ئێمە دوای چەندین کۆبوونەوە و باس لەوبارەوە، پێداگریمان کـرد کە یاسـای نـاوبراو مەغزایەکـی چینـایەتیی ئاشـکرای هەیە و مەبەسـت لە سـڕینەوەی نـاوی کرێکـاران هەنگـاوی یەکەمە بۆهاشـاکردن لە مافەکانیـان. ڕژێـم لەپـاڵ ئەوەشـدا دەسـتی کـرد بە فرۆشـتنی هەمـوو موڵـک و کارخـانە و کـارگە زۆرو زەبەنـدەکانی دەوڵەت بە کەرتـی تـایبەت و دەسـت وپێوەنـدەکانی خـۆی. ئەو دوو ڕەوتە ئاڵوگۆڕێـک بـوون لە بەرنـامە و سیاسـەتی کـۆمەڵایەتی و ئـابووری تـا ئەوکـاتەی بەعـس، چـونکە لەوەو پـێش دەوڵەت خـۆی هەمـوو کەرتە ئابووریەکـانی کۆنترۆڵ کردبـوو. پـاش ڕوونبـوونەوەی شـیکردنەوە و هەڵوێسـتمان لەوبـارەوە، جەبارمـان ڕاسـپارد کە ئەو گفتوگۆیـانە بکـات بە نووسـراوەیەک کە دواتـر وەکـوو نـامیلکەیەک بەناوی گرووپەکەمانەوە بڵاومانکردەوە.

ئەو نووسراوانە ڕۆڵی باشیان ئەبینی وەکوو ماتریاڵێک بۆ کاری ئێمە لە دەرەوە و ناوەوەی خۆماندا. ئەو باسانە جگە لەوەی بابەتی باشی ئەدایە دەست کادر و هاوڕێیانی ئێمە تا شوناسی گرووپەکەمانی پێ ڕابگەیەنن، لەعەینی کاتدا ڕۆڵی باشیان گێڕا لە ئینسیجامدان بە ریزێکی فراوان لە ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا و دەشبوو بە مایەی ئومێدێک، بەتایبەتی لە بارودۆخێکدا کە ڕەوتی کۆمۆنیست جگە لە چالاکیی تەسکی ڕێکخراوەیی و مەشغووڵ بوون بە "خەباتە تیۆریەکەیانەوە"، قسەیەکی ئەوتۆیان پێ نەبوو ڕوو بەدەرەوە.
هەر یەک لەو سێ هاوڕێیەی ئەڵقەی سەرەکیی یا ناوەندیی بلێسە پەیوەندیمان بە چەندین خەتی ڕێکخستنەوە هەبوو.
من لە ڕێگەی سەردانی دایکم یا باوکمەوە بۆ لام بۆ ماڵی نەجاتی هاوڕێم پەیوەندیم لەگەڵ کەس وکارمدا دامەزراندەوە. ماڵی باوکی نەجات کە بووبوو بە جێی خۆشاردنەوەم، لە گەڕەکی سەرشەقام بوو. لەدەوروبەریان کۆمەڵێکی زۆر خزمی ئەوان هەبوون. من نەک هەر بووبووم بە کوڕێکی ماڵی نەجات بەڵکوو دوای ماوەیەک تێکەڵییەکی بەهێزم دروست کردبوو لە گەڵ هەموو خزمەکانیان لە گەڕەکەکە. ئیتر لە سلێمانی چی بەهۆی مانەوەم لە ماڵی جەبار ودواتریش نیشتەجێبوونم لە ماڵی نەجاتدا، و چی بەهۆی پەیوەندیە سیاسیەکانی تری خۆم، تێکەڵیەکی کۆمەڵایەتیی زۆرم پەیداکردبوو.
لە خزمەکانی نەجات لە سەرشەقام بووم بە هاوڕێی نزیکی "خالیدی مەلا عەلی" کە لە ڕاپەڕینی دووەم لە تەمووزی ١٩٩١ لەکاتی هێرش بۆ سەر سەرای سلێمانی گیانی بەختکرد. خالید کوڕی خاڵی نەجات بوو. ماوەیەکی زۆر پێشمەرگەی یەکێتی بوو، بەڵام بەهۆی ناسینی زیاتری چەوت و چێڵیی یەکێتی و هەروەها لە ژێر کاریگەریی نەجاتدا، لەسەروبەندی مفاوەزاتەکەی یەکێتی و بەعس، وازی لە پێشمەرگایەتی هێنابوو. پاشان لە هێرشێکی هێزەکانی حکوومەتدا بۆ قەرەداغ لە هێرشێکی سوپا دەسگیرکرا و لە مووسڵ زیندان بوو و

لەوێوە بەئازایەتیی خۆی ڕایکردبوو. منیش لەلای خۆمەوە لەڕێی ناسیاویی ماڵی ئەیادی حاجی نامیقەوە هەندێ هەوڵماندا بۆ بەردانی خالید بەڵام سوودی نەبوو. ئەو تا بڵێی کەسێکی خۆشەویست وقسەخۆش و بەهەڵوێست و هۆشیاربوو و لەڕووی سیاسییەوە و زۆر نزیک بوو لە ئێمە. خالید خاوەنی پایگا و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی خۆش و سروشتیی جەماوەری بوو لە ناوچەکە. خالید جگە لەوەی لەڕووی فیزیکیەوە کوڕێکی باڵابەرز و زۆر بەهێز بوو، خاوەنی کەسایەتیەکی زۆر بەهێز و جێ بڕوا وکوڕی ڕۆژانی تەنگانە بوو. دواتر لە درێژەی ئەم یادەوەریەدا دێمەوە سەر ئەو ڕۆڵ و ئازایەتیەی کە لە یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕیندا گێڕای.

هەر لە ڕێگەی خالیدی مەلا عەلیەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ "نەبەز خالید"دا پەیداکرد کە دواتر پەیوەندیەکی سیاسیی نزیکیش کۆیکردینەوە.

ماوەیەک بوو نەجات گەڕی لێ ئاڵاندبووم کە بۆچی هاوسەرگیری ناکەم و زووزوو ئەو باسەی دەهێنایە ئاراوە. من ئەمزانی ئەو ئەیویست بڵێم بڕۆ خۆت هاوسەرگیری بکە، چونکە ئەیزانی ڕای من لەوبارەوە چیە و پێم وتبوو کە لەم زرووفەدا من شتی وا ناکەم. ئەو هەمیشە ئەیووت ئێمە پێویستمان بە ماڵێکی سەربەخۆ و گونجاوی خۆمانە و ئەبێ یەکێکمان هاوسەرگیری بکەین. لە ناخی خۆشمدا هێندە نەجاتم خۆشئەویست حەزم نەئەکرد هاوسەرگیری بکات، لە بەر دوو هۆ:

**یەکەم:** هێندە نێوانمان لە هەموو ڕوویەکەوە بەهێز بووبوو کە حەزم نەئەکرد کەسی سێیەم بێتە نێوانمانەوە جا با هاوسەری ئەویش بێت.

**دووەم:** لەوە دوودڵ بووم کە لەگەڵ کەسێکدا هاوسەرگیری بکات کە خولق و خووی لە خۆی نەچێت وهاوسەرگیریەکەی لەسەر حیسابی ئەم پەیوەندیە بەهێزە بێت کە ئێمە هەمانە.

ئەوە هەستێکی باشە یا نا زۆر مەسەلەم نەبوو و ئێستاش مەبەستم شیکردنەوەی سەرچاوەی ئەو هەستە نیە بەقەد ئەوەی گێڕانەوەیەتی

بەشـــێوەیەکی ڕاســـتگۆیانە. باشــیش دەمزانـــی کە ئەو پێویســـتی بەهاوســــەرگیری هەیە، بەڵام ئەو نیگەرانـــی و هێنـــان و بـــردنە سایکۆلۆجیانەشم هەبوو. سەرەنجام وا ڕێکەوتین کە ئەو ئازاد بێت لە مەسەلەی هاوسەرگیری و لەسەر من نەوەستێت.
ئەو مـاوەیە جەبـاری کەسـی سـێیەمی سێگۆشـەی ئەڵـقەی سـەرەکیی گرووپەکەمــان کەمتــر ئامــادەی کۆبوونەوەکــان دەبــوو. ئەو هــیچ سەرنجێکی جیاوازی دەرنەبڕیبوو، بەڵام زۆرتر ئەڕۆیشت بۆ بەغدا و گەرمیان و لەگەڵ عوسمان و ستاری برای و کۆمەڵێک هـاوڕێی تری خۆیـدا زۆرتـر لەســەفەر بـوو. ئـێمە پێویسـتمان بە وزە و تواناکـانی جەبـار هەبـوو، ئەگینـا ئەوەی چـی ئەکـات زۆر مەســەلەمان نەبـوو. چەندجار مەوعیدمان دائەنا کەچی ئەو دیارنەئەبوو. ڕۆژێکیان لە ماڵی جەبار کۆبووینەوە بۆ باسکردنی کاری ڕۆتینیی گرووپەکەمـان. پـێش کۆتـایی کۆبوونەوەکەمـان جەبـار ڕوویکردە هەردووکمـان وتـی: ئێوە بەوەزعـی ئەمنیی خۆتـان ئەزانـن کە چەنـد خراپە؟ بەراسـتی مـن زۆر نیگەرانی وەزعی ئێوەم، چونکە لەبەر زۆریی ئەمـر قەبزەکانتـان گـرتن و تیاچوونتان یەکە. ئێمەش بەدوای یەکدا وتمـان ئەزانین وبۆ هیچی تـازەت بیسـتووە یـا هـیچ ڕوویـداوە؟ ئەو وتـی: نـا بەڵام مـن پێشـنیار ئەکەم کە ئێــوە بــڕۆن بــۆ دەرەوە تـــا لە مەترســیی مەرگــی ئێــرە ڕزگارتــان بێــت، و وەکــوو دوو کەســایەتیی بــزووتنەوەکە بمێنــنەوە. ئێمەیەک کە دوو قۆڵی هەرگیز بیرمـان لە چوونە دەرەوە نەکردبۆوە، ئەو پێشـنیارەمان لا سـەیر و تـازە بـوو. ئـاخر خـۆ ئەم وەزعەی ئـێمە تـازە نـیە ئەی بـۆ جەبـار پێشـتر ئەم پێشـنیارەی نەئەکـرد؟ ئەو هەقـی بوو لەوەدا، چونکە ئێستا سەردەمی شۆڕشگێڕانە و زرووفـی خەبـاتی شۆڕشــگێڕانە نـــیە، بەڵام بــۆ لە چوارچێــوەی باســێکی سیاســیدا مەســەلەکە پێشـنیاز ناکـات. ئـێمە تـازە خۆمـان ڕێکخسـتووە و دەیـان ئەرکمـان بـۆ خۆمـان دیـاریکردووە ئیتـر دەرەوەی چـی. مـن لە نـاخی

خۆمـــدا وبـــێ ئەوەی وەڵام بـــدەمەوە بەوشـــیوەیەی پێشـــوو بیـــرم ئەکردەوە.
نەجات باسەکەی داخست و وتی: ئێمە دوو قۆڵی قسەی لێ ئەکەین و وەڵامت ئەدەینەوە.
لە ماڵەوە پێشنیارەکەی جەبار بوو بە بابەتی گفتوگۆی دووقۆڵیی من و نەجات. لە وەڵامی ڕای مندا بە نەجاتم وت خۆت باش ئەزانی من دەمـێکە بڕیـاری یەکجـاریم داوە کە نیـازی ڕۆیشـتنە دەرەوەم نـیە و کاتی خۆشی ماڵەوەیش زۆر هەوڵیاندا، بەڵام ڕازی نەبووم، بۆیە من هەمان ڕای جارانم هەیە. ئەشـزانم ڕای تـۆ چۆنە. ئەویـش لای وابـوو کە سـەیرە ئێسـتا ئەو پێشـنیارە دێـتە ئـاراوە بەمەرجێـک ئـێمە یەک کۆمەڵ بەرنامە و کارمان بە تەگبیری هـاوبەش دیاری کـردووە. ئەوە بـوو بەجێی پرسـیارێک کە جگە لە هەنـدێ مەزەنـە(تخمین) وەڵامێکـی ڕوونمـان بـۆی نەبـوو. چەنـد ڕۆژ دواتـر چاومـان بە جەبـار کەوت و نەجات بەناوی هەردووکمـانەوە وەڵامـی پێشـنیارەکەی ئەوی دایەوە و ئیتر دەرگای ئەو بابەتە داخرا.
ئێمە لە بلێسەدا[1] پەیوەندیی دۆستانەمان لەگەڵ هەمـوو کۆڕ و کۆمەڵ و کەسایەتیەکانی ناو بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بەهێزبوو، بێ گوێدانـە

---

[1]گەر بیرم بەهەڵەدا نەچووبێت لە کۆتایی ١٩٨٧و سـەرەتای١٩٨٨دا، بلێســە تووشــی جۆرێـک لە پەراکەنـدەیی وئیفلـیج بـوون بووبـوو. زۆربەی کادرەکــانی ســەرەوەی پەراکەنــدە بووبــوون، لەو قۆنــاغە بەدواوە ناوی گرووپەکەمان گۆڕی بۆ یەکێتی خەباتی کۆمۆنیستەکان و بەڵگەنـامە و نووسـینەکانمان و بەتـایبەتیش پلاتفـۆرمی نـان، کـار، ئــازادی؛ حکــوومەتی شــووراییمان بەو نــاوەوە ئیمزائەکــرد تــا دامەزرانــدنی یەکێتــی خەبــاتی کۆمــۆنیزمی کرێکــاری بەو نــاوەوە چالاکیمان درێژە پێدا، لەڕووی مێژووییەوە جێگیرکردنی ئەو ڕاستیەم بە پێویست زانی.

جیاوازیی بیروڕا یا ڕەخنەگرتن لە هەڵوێست یا بیروڕای ئێمە. تەنها لایەن کە هــیچ پەیوەنــدیەکی نە ڕەســمی و نە ناڕاســتەوخۆش لە نێوانماندا نەبوو ڕەوتی کۆمۆنیست بوو. من بیرم نایەت کە ئێمەش لای خۆمــانەوە هەوڵــی دروســتکردنی پەیوەنــدییەکی لەو جۆرەمــان لەگەڵ ڕەوتدا دابێت، بەڵام لای ئەوانیشەوە هیچ دەستپێشکەریەکمان نەبینی وئەم دیاردەیە تا پێکهێنانی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق درێژەی هەبوو، کە لایەنەکانی تر پەیوەندی و هاوکاری و هاوئــاهەنگی لەنێوانیانــدا هەبــوو، بەڵام ڕەوت هەر بەردەوام بــوو لە سیاسەتی گۆشەگیریی خۆی لەم بوارەدا.

## هاوسەرگیریی نەجات

دەوروبەری نەورۆزی ١٩٨٧ بوو کە نەجات ئاگاداری کردم کە بەپێی بڕیاری پێشووترمان بە نیازی هاوسەرگیریە و کەسێکی هاوڕێی دۆزیوەتەوە و لەوبارەوە ڕێکەوتوون. لەسەر داوای ئەو بڕیارمان دا کە سەردانی خێزانی دەزگیرانەکەی بکەین بۆ یەکتر ناسینی زیاتر و ڕەخساندنی پێویستیەکانی هاوسەرگیریان و ناسینی کەس و کاری "چنوور غەریب" کە لە چوارچێوەی ناسیاویی براکانی و نزیکایەتیی گەڕەک یەکیان ناسیبوو. ئەوانیش ماڵێکی زەحمەتکێش بوون و ئەکرەم و ئەنوەر و جەمالی برای چنووریش سەروسوختیان لەگەڵ فەزای سیاسی و چەپدا هەبوو.

پاش ماوەیەکی کەم هاوسەرگیریان کرد و پێشتر نەجات خانوویەکی لە شەهیدانی زەرگەتە بەکرێ گرت کە هی ماڵی کاک "خەسرەوی عەبە ڕەش" بوو کە هاوڕێی خۆی بوو. من پێشنیارم کرد کە دوای ئەو هەموو زەخت وفشارە زۆرەی ژیانی ئیختیفا و ڕاکەڕاکی کاری سیاسی نهێنی، وا باشە کە بۆ چەند ڕۆژێک بۆ مانگی هەنگوینی بڕۆن بۆ بەغدا. دایک و باوکی نەجات و لەتیفی برای و ئاشتیی خوشکی زۆر دڵخۆش بوون بە هاوسەرگیرییان. ڕۆژی پێش ڕۆیشتنیان بۆ بەغدا ئێوارە لە ماڵی باوکی کۆببوینەوە و منیش وتم کە تۆ ڕۆیشتی چەند شەوێک ئەڕۆم بۆ دەوری هەندێ هاوڕێی خۆم و کە هاتیتەوە پێکەوە تەگبیری ماڵی تازەمان ئەکەین. دایک و باوکی نەجات ئەوەندە دڵی منیان ڕائەگرت وتیان ئەو هاوسەرگیریی کردووە بۆیە ئەڕوا بۆیە تۆش کوڕی ئێمەیت و تاهاوسەرگیری نەکەیت نابێ لەگەڵ ئەودا

برۆیت وجێمان بهێڵیت. ئەوکاتە لەتیفی برای نەجات تازە لە دەرەوە هاتبۆوە و پێکەوە لە ماڵەوە لە گەڵماندا ئەژیا. منیش وتم پەیمانتان ئەدەمێ کە هەفتانە یەک دوو جارێک سەرتان لێ بدەم و لێتان دانەبڕێم وئەوە لەتیفتان لایە و بە تەنها نابن، چونکە من ونەجات ئەبێ جاروبار شوێن گۆڕکێ بکەین و خەمی ئێمەتان نابێ.

نەجات و چنوور جەولەیەکی بەغدا و کەرکووک و هەولێریان کردو و دوای ٤ رۆژێک گەڕانەوە و منیش ئەو چەند ڕۆژەم لای ماموستا ستار بردەسەر.

گوێزامانەوە ماڵی تازە لە زەرگەتە کە خانوویەکی نوێ بوو لە سێ ژووری نووستن و هۆڵێک پێکهاتبوو و من بووم بە خاوەنی ژووری سەربەخۆی خۆم و ژوورێکیشمان دانابوو بۆ جێی نووسین و کۆبوونەوە.

ئەو ماوەیە ئیتر کۆبوونەوەکانی ئەڵقە سێ کەسیەکەمان لەوێ ئەنجام ئەدا و نووسینەکانمان بە ڕۆنیۆ ئامادە ئەکرد.

لێرە دەسکراوەتر بووین و زنجیرەیەک کار و چالاکیمان دیاریکرد. ئەو ماوەیە جەبار بەهۆی مەشغەڵەی هاتوچۆی بەغدا و گەرمیانەوە کەمتر دەرئەکەوت، بۆیە من و نەجات زیاتر بەشداریی کۆبوونەوەکانمان ئەکرد و کارەکانمان ڕایی ئەکرد.

جگە لە وتاریکی درێژ سەبارت بە گۆڕینی کرێکاران بە فەرمانبەر کە دوای گفتوگۆی درێژ جەبار نووسیەوە، هەندێ بابەتی ترمان لە فارسیەوە وەرگێڕا بۆ کوردی و عەرەبی سەبارەت بەشەڕی عێراق - ئێران. نیازمان وابوو ئەم ماڵە تازەیە بکەین بە نیمچە بارەگایەکی نهێنیی بڵێسە و شوێنی شاردنەوەی نووسین و بڵاوکراوەمان تەرتیب کردبوو. یەک دوو جاریش هەندێ هاوڕێی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش شەو لامان دەمانەوە. هەر لەو ماوەیەدا بەیاننامەیەکمان دەرکرد سەبارەت بەشەڕی عێراق وئێران و بەڕۆنیۆ چاپمان کرد و چونکە من شارەزایی کاری ڕۆنیۆ نەبووم هەموو گیانی خۆم کردبوو

بە ڕەنگ و نەجات کردیە گاڵتە ووتی: مەگەر بە فاس خۆت بشۆیت ئەگینا کەشف ئەبین کە تۆ ئیشت لەسەر ڕۆنیۆ کردووە. ئەو بابەتانەمان لە ناو هاوڕێیانی خۆمان لە سلێمانی بلاوکردەوە و ڕۆژی ١٩٨٧ /٤/٢٧ کۆبوونەوەیەکی سێقۆڵیمان کرد و ئەو بابەتانەمان هەمووی پەسەندکرد وچەند بڕیاری ترمان دا. بەپێی تەگبیری کۆبوونەوەی ئەو شەوە ئەبوایە ئەو نووسراوانە بگەیەنین بە کەرکووک و هەولێر وشارەکانی تر. من وتم من ئەوکارە ئەکەم و نەجات وتی نا من بڕۆم باشترە. ئەو بەڵگەکەی ئەوە بوو کە ئەو هاوڕێیانەی هەولێر کە من ئەیانناسم ئەویش ئەیانناسێت بەڵام هەندێ هاوڕێی ئەو هەبوون لەهەولێر کە من نەمئەناسین. جگە لەوەش ئەو هاوڕێیەکی ئەندازیاری هەبوو کە سەرپەرشتیاری پرۆژەکان بوو لە ئەمینداریتیی گشتیی ئەوقافی ئەنجوومەنی تەنفیزی و هەرکات پێویستمان بە پارە بوایە هەندێ مقاوەلاتی چاککردنی مزگەوتەکانی ئەوقافی لێ وەرئەگرت و ئەو ماوەیەش مەسرەفمان زۆر بووبوو.
بەناچاری و مەلا بەزێنیی نەجات هاتینە سەر ڕاکەی ئەو بەو مەرجەی کە زۆر وریای ڕێگە بێت و حسابی هەموو شتێک بکات. پێمان وت کە ئەبێ هاوسەرەکەت لەگەڵتدا بێت و جگە لەوەش بەیانیی زوو سەفەر بکە، چونکە کەمتر گومان ئەکرێ و ڕێگریی سەیتەرەکان کەمترن و ناشبێ لە یەک شەو زیاتر لەوێ بمێننەوە و ئێوارەی ٢٩/ ٤ هەر لێرە دوبارە کۆئەبینەوە بۆ ئەنجامدانی کاری تر. بەدوای ڕۆیشتنی جەباردا منیش وتم: ئەمشەو سەردانێکی ماڵی هاوڕێیەکم ئەکەم و کلیلم پێیە بۆ هاتنەوەم. بە دووقۆڵیش چنوورم بردە لاوە وتم کە ئەو بەنیازی سەفەری هەولێرە و نەیەڵێت بە تەنها بڕوات.
لێرەدا لەبری گێڕانەوەی چیرۆکی تراجیدیی گرتنەکەی نەجات لەلایەن ڕژێمەوە لە سەیتەرەکەی پێش کەرکووک، وتارێکی خۆم دائەنێم کە وەکوو پۆستێکی فەیسبووک دوو ساڵ لەمەوبەر بلاوم کردەوە:

**هاوڕێ دیار نیت!!!!!**

**لەیادی مەرگی بێ ناونیشانی هاوڕێم نەجاتی موهەندیسدا**

"تعال بحلم
احسبها الک جیه و اگولن جیت "
شیعرێکی مظفر النواب کە یاس خضر کردوویە بە گۆرانی
لەخەویشدا گەر بێی بۆلام هەر قەبوولمە
ئەڵێم شوکور کەوا هاتیت.
لە کوێ بۆت بگەڕێم؟

لە وەکـرە نهێنـیەکەی هەولێـر سـۆراغت کەم یـا لە مـاڵە هەژارێکـی دەوری وولۆوبە وسەرشەقام؟ لە دێهاتێکی قەراغ یا لە کۆڕی گەرمـی گفتوگـۆی هاوڕێیانـدا؟ لە ئەبووغرێـب یـا لە ژوورێکـی تاریکـدا کە ســـەرقاڵی کۆبوونەوەیـــت. لە بەلاشـــاوای هەولێـــر یـــا لە بـــاڕێکی ئەبوونەواس؟

هاوڕێ لەکوێی؟ سـوێم بۆوە بـۆ دیـار نیت؟ تـۆ ٣١ پـایزە لەسـەفەری ڕێگا دوورەکەدایت. هەموو شەوێک بـۆ تـۆ ئەکەومە کەمینەوە بەڵکوو لە سـووچی خەونێکدا یـا لە سـەرابی خەیاڵێکدا تـۆ دەرکەویـت. بەڵام ئەفسووس!!

تۆ نەلە ڕاپەڕیندا سۆراغێکت بوو. نەلەشووراکاندا شیعارێکت چڕی!!!
دڵم ڕوا هەر نەهات!!!!!!

**باکگراوەندی یەکەم:**

ئەو ڕۆژە لەدەرگـای ژوورە تـاریکەکەی مەخفیگـاکەی بەلاشـاوات دا وبــووی بەمیــوانی تەنیــاییەکەم. یەکترمــان ئەناســی ولەڕۆژانــی مـواجەهەی تـۆوە بـۆ لای هاوڕێکانـت لە ئەبـوو غرێـب بووبـووین بە ئاشنا. چەند جاریش لەبەغدا لە کۆلێجی قانوون سـەرت لێدابووین و لە وەزیـریە پـێکەوە مـابووینەوە. پـێکەوە پیاســەی ئێـوارانی ئەبـوو نەواس و سلاومان لە نەورەسەکانی کەناری دیجلە کردبوو .

تۆش ئەتزانی من خەریکی چیم و منیش بەتۆم ئەزانی. داوای ئیزنی مـانەوەت کـرد لای مـن. هاوڕێیـان بـۆ لای منیـان نـاردبووی تـا ببیـتە هــاودەمی خەڵوەتگــاکەم. دیســانەوە دەردی هــاوبەش لە ســەنگەری ئیختیفـادا کـۆی کـردینەوە. منـی داواکـراوی چەنـد جـارە وڕاکـردووی دەسـتی پیاوکۆژەکـانی بەعـس و یەکێتـی و تـۆی تـازە ڕاکـردووی دەستی هەردوولا. ئەو ڕۆژە تۆ تاریکستانی ئیختیفای ژوورە سارد و سـڕەکەی بەلاشـاوات لێکـردم بە ئـوتێلی پێنج ئەسـتێرە. ڕووحێکـی تـرت کـرد بە بەرمـدا . تـۆی سـرک و بزێـو مەگەر لە خەوتـن یـا ..... لەوەسـتان و جووڵە بوەستایتایە. تۆ کە خواوەنـدی جووڵە و بزێوی ونەسرەوتن و سەرچڵی بوویت .

نەجات گیان

ژاوەژاو وچەلەحانێی دونیا بێکۆتاییەکەی سیاسەت، جەدەلی نەپسـاوە و نەبـڕاوەی مریشـک و هـێلکەکە، ئەفسـانەی قۆناغەکـانی شـۆڕش، تەخمینەکان و گریمانەکانی هێزەکانی بەرەی شـۆڕش و دژە شـۆڕش، وەهـمە بەلەزەتەکـان، دۆگـمە نەپسـاوەکان لەسـەر خەونەکـان و دژە خەونەکان، شەڕی هاوڕێکان، تۆمەت باراندنەکان و شەڕی زاراوەکـان ...... ئێسـتاش بەردەوامـن و هێشـتا سـەرەدەزوویەک لەگەڵ ئەوکاتـدا فەرقی نەکردووە و چڵە گەنمێکیان لێ سەوز نەبووە .

**باکگراوەندی دووەم:**

ئێستا لەیەک ئۆرگانـدا لە ژوورەکەی بەلاشاواوە حەشر ونەشر کراوین و یەکەمین تاقیکردنەوەی ژیانی ئیختیفامانە کەچی بە ئومێدین کرێکارانی شارەکە ڕێکخەیـن و هۆشیاریان بکەینەوە. ئەمە مالی هاوڕێ عەلیە کە ئەویش هاوڕێیەکی خۆمانە. ڕۆژگارێکە باوک هاشا لە کوڕی سەربەگۆبەندی وەکوو ئێمە ئەکات، بەڵام ماڵی علی بەسنگی فراوانەوە وەکوو کوڕی خۆیان ماڵ ئەخەنە خزمەتی من و تۆ وهاوڕێکانمان. نە من نە تۆ خەڵکی ئێرە نین. ئۆرگانێکی پێنج کەسیی ڕێکخراوی کارگەرانین کە ژوورەکەی ئێمە بارەگای هەیئەی ئەرکانەکەیەتی. ژوورێکی کەمتر لە ٣ X ٤ ی شێدار و سارد و سڕ. ئەمبەر و ئەوبەر و لای سەرەوە سێ ڕایەخی درێژکۆڵەی تیا ڕاخراوە. تەباخێکی نەوت لەناوەڕاست ژوورەکەدایە. کتێبخانەیەکی بچووکمان هەیە کە ئەبێ هەمیشە پاش خوێندنەوەی هەر کتابێک بەووریاییەوە لەشوێنی تایبەتی خۆی بیشارینەوە. جل و بەرگ هەر ئەو دەستەن کە بۆ ناوماڵ یا بۆ دەرەوە لەبەریان ئەکەین. گیرفانمان خاڵی و ورە بەرز و باڵا. گەڕەکێکی تا بڵێی شەعبی کە ڕەنگ بێ بە دەگمەن پانتۆڵ لەپێیەکی تیا پەیدا بێت. لێرە بە پانتۆڵ لەپێ ئەڵێن مامۆستا!!

بەهەویە تەزویرەکانتەوە سەرێکی سلێمانی ئەدەیت و من هەر دڵم لاتە. خۆپیشاندانی قوتابخانە و گەڕەکەکان لەبەهاری ١٩٨٤ دەستی پێکردووە. تۆ لەوێ بەڕۆژ سەرقاڵی کۆبوونەوەی کارگەران و شەوانیش سەرگەرمی ڕێکخستن و ڕابەرایەتی کردنی جەماوەری خۆپیشاندەری. دڵم لاتە و نەتەلەفوونێک نە قاسیدێک نە پۆستێک هەیە هەواڵێکی تۆم بۆ بهێنێ تا ئاوێک بکات بەسەر دڵە پڕ جۆشەکەم بۆ هەواڵی سەلامەتیی تۆ. ئێستا باش ئەتناسم بۆیە ترسم زۆر زیاترە. ئەزانم تۆ نازانی مانای سرەوتن وترس و هەدادان چیە. تکایە وەرەوە!!!!

ئەم ئێوارەیە لەپڕ خۆت ئەکەیتەوە بەژووردا. تا چەند لەحزە نامەوێ پرسیاری هیچ بکەم. تەنیا ئەمەوێ بێدەنگ تێت بڕوانم. ئەمجارەش هاتەوە!!!!!!

بریا ئا ئێستا لێرەبای.. نا نا، چ باشتر کە لێرە نیت....

هاورێ ئەزانی دوای سەفەرەکەی تۆ چی ڕووی دا؟ خۆ ئەزانیت سووتماک چیە. خۆ ئەزانی تاریکستان چۆنە؟

دوای تۆ سوپای کوشتار و ئیعدام و سەرکووت، خواوەندی فاشیەتی عروبی وولاتیان کرد بە سووتماک و ئێمە لەناو ئەو خۆڵەمێشەدا گێنگڵمان ئەدا و لەڕێی هیواکانمانەوە هەر ڕۆژە خاراوتر و پێداگرتر ئەماینەوە.

من نیوەم مابۆوە و تۆ نیوەکەی ترت بردبووم!!!!

نا نا، من هێزم دووبەرابەر بووبۆوە چونکی تۆ هەموو ووزەی خۆت لای من جێهێشتبوو!!!

**باكگراوەندی سێیەم:**

ئەمرۆ لە ماڵە تازە و پۆشتەکەی زەرگەتە تازەترین کۆبوونەوەمان کرد. سێقۆڵی تۆ و جەبار و من زۆربەی بابەتەکانمان پەسەند کرد. دوایی مناقەشەی نامیلکەکەی (گۆڕینی کرێکاران بە فەرمانبەر: بۆ؟) کرا. تەرجومەی بابەتێکی کورتمان لە فارسیەوە ئامادەکرد. هەمویان بەدەسخەتی هاوڕێ خۆشنووسەکەی لای ماموستا ئامادەن. تۆ وەکوو قیرسیچمە دەسبەرداری گفتوگۆ نابیت و تەماعەکانت و تمووحەکانت کۆتاییان نایات. تۆ هەڵپەتە و ئەڵێی سبەی موعدی شۆڕشیان پێڕاگەیاندوویت و پلانی شۆڕشەکە لەگیرفانتدایە. تۆ پێشنیارئەکەی کە بیانگەیەنین بە هەولێر. لەوێ کۆمەڵێ هاوڕێمان هەن. من هەندێکیان ئەناسم و هەندێکی تریان ناناسم تۆ هەموویان ئەناسی بەوانەی لای منیشەوە. من و تۆ دوای کەبس کردنی مەخفیگاکەی هەولێر و ئیعدام کردنی ئەو هاوڕێ هاوماڵەمان جارێکی تر ئەمر قەبزێکی مزری ترمان بۆ دەرچووە و ئێستا هەوارمان هێناوەتەوە سلێمانی. خۆت پێشنیار ئەکەیت کە تۆ نووسراوەکان ببەی بۆ هەولێر و کۆبوونەوەش لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە بکەیت. من ووتم با من بچم تۆ قایل نەبوویت، چونکە ئەو هاوڕێیانەی لای تۆ ناناسم. دەمم ناهێنێت بڵێم باشە تۆ بڕۆ. تۆ ئەڵێی هەقتان نەبێ من خۆم ئەڕۆم و جاری تریش ڕۆیشتووم. دڵمان هەر ئاو ناخواتەوە. بەناچاری مل بۆ ئارەزووەکەی تۆ ئەدەین بەڵام من شەو پێشئەوەی بڕۆم بۆ مانەوە لە ماڵی هاوڕێیەکمان دوو شتم کرد. لەگەڵ تۆدا پێم لەسەر ئەوە داگرت کە ئەبێ چنووری هاوڕێ وتازە هاوژینت لەگەڵتدا بێت وەکوو سەرپۆشێکی ئەمنی. تۆ بەڵێن ئەدەیت کە وابکەیت. دووەمیش: بەجیا لەگەڵ چنووردا قسە ئەکەم و گفتی تەواوی لێوەرئەگرم کە بێهیچ بیانوویەک هاوسەفەریی نەجات بکەیت و ئەویش دڵنیای کردمەوە کە وائەکات.

بڕیارمان وابوو ئێوه بەیانیی زووەکەی بڕۆن تا بتوانن ڕۆژی دواتر بێنەوە. ئێوارەش پێش ڕۆیشتنت هەر لەماڵەوە وەعدی کۆبوونەوەی سێقۆڵیمان دانا. بۆ سبەی دەمەوعەسرەکەی ، کە پێموابێ ٢٩ ی نیسان ١٩٨٧بوو من گەڕامەوە بەو ئومێدەی چاوەڕوانی ئێوە بکەم لەهەولێرەوە بێنەوە. وەختێک دەرگای حەوشەم کردەوە وچنوورم لەماڵ بینی دڵم داخورپا. مشتومڕێکی کورتمان کرد کە بۆچی لەگەڵ تۆدا نەڕۆیشتووە و ئەو تێیگەیاندم کە خۆی ئامادەکردووە، بەڵام کە بەیانی لەخەو هەڵساوە بەتەنیا ڕۆیشتوویت و ئەوت نەبردووە. چنوورم ڕەوانەی ماڵی باوکی کرد بەو ئومێدەی ئێستا نا تۆزێکی تر تۆ ئەگەیتەوە و دەست بەکۆبوونەوە ئەکەین. شار بۆنی باروت و خوێن و خیانەت و ترس دایگرتووە. ژمارەی ئەمر قەبزەکانی تۆ کەس نایزانێ چەندە. جەبار هات و دووقۆڵی دەستمان کرد بەقسە و ئەویش نیگەران بوو کە تۆ بەتەنها ڕۆیشتوویت. هەوا بەرەبەرە بەرەو تاریکی ئەڕۆیشت.

ئەمڕۆ هەوا بۆ وا قورسە!!. تەم بۆوا سەردڵمانی گرتووە!!!. هەناسە بۆوا قورس و گران بووە!

ئێمە قسەوباس گەرم ئەکەین و چاوەڕوانی گەیشتنەوەی تۆین. ناو شار بە مەفرەزە تەنراوە و بێئومێد ئەبین لەگەڕانەوەت. یان دڵمان نایات یان ووردەکار نین، چونکە بیر لە گرتنی تۆ ناکەینەوە. کاغەز و نووسراوەمان لە حەشارگەکە دەرهێناوە وتاووتوێیان ئەکەین . دەست لەوە ئەشۆین کە ئەمشەو بگەڕێیتەوە و مەوعیدی سبەی دائەنێین پاش هاتنەوەی تۆ. نزیکەی ١٠ ی شەوە. لەدەرگا ئەدرێ و بەپەلە نووسراوەکان ئەپێچینەوە. هێشتا هەر ختوورەی دەسگیرکردنی تۆمان نیە. گڵۆپەکان ئەکوژێنینەوە و لەپەنجەرەکەوە تەماشایەکی دەرگای دەرەوە ئەکەم. دڵم وەکوو شووشەی باڵەخانەیەکی بەرز هاڕەیەک ئەکات. دایکت و لەتیفی برات و

چنوورن!!!!! چی بەمشەوە ناوەخت و پڕ لەمەترسیە هێناویانی. تۆ بڵێییییی!!!!!!

چیی بووە. زمانم ووشک ئەبێ و بەرەودەرگا هەنگاوی تێکەڵ و پێکەڵ ئەنێم. لەتیف ئەمباتە لاوە و هەواڵە جەرگبڕەکەم پێ ئەڵێت.!!!! کورتەیەک لە لەتیف وەرئەگرم و خێرا پێکەوە ئەوێ جێدێڵین. درەنگە و باکەس پێمان نەزانێت. شار کش و ماتە. دەنگی سەیارەی مەفرەزەکان نەبێت هیچی تر نابیستین. بەهەزار پەلەپڕووزێ سیارەیەکی تۆیۆتای پیکاپ ڕائەگرین و ئەوان ڕەوانەی ماڵەوە ئەکەین بۆ لای باوکە دەردەدارەکەت کە چەندین ساڵە کەنەفتی ناو جێگەیە. خۆمان کۆلانە و کۆڵان ئەگەیەنین بە ماڵی هاوڕێیەک تا ئەمشەو دوای ئەم زەربە گورچکبڕەی گورگەکانی فاشیزم تەگبیرێک بکەین.

## هاوڕێکەم

جیاوازیی من لەگەڵ هاوڕیکانی ترماندا لەم کۆستەدا زۆر بوو .

من و تۆ لەبۆتەی خەبات و ئیختیفای چەند ساڵەماندا تەواو لەیەکتردا توابووینەوە. لەسەر زۆر مەسەلە و پێشهات گەر هەڵوێستم بۆ دیاری نەکرایە یا ڕۆشن نەبوومایە، هەڵوێست و ڕاکەی تۆم بەس بوو تا پەیڕەوی لێبکەم.

دوو گفتوگۆی کورتی ژووره بجووکەکەی خوارەوەی ماڵی باوکت کە مەخفیگا و مەنزڵی من و تۆ بوو بەس بوو بۆ ئەوەی ئاڵۆزترین پرسیار و کێشە دەستەمۆ بکەین. هەمیشە ئەکەوتینە یەک سەنگەرەوە. ڕاگۆڕینەوەیەکی کورتمان بەس بوو تا بگەین بەقەناعەتی هاوبەش.

لەهەمووشی گرنگتر تۆ ئیتر بووبوویت بە نیوەی لەش و هەست و سۆز و بوونی من و تۆش هەروا.

من ئێستا لەدوای تۆ بە نیوە لەشێک و نیوە هەستێک و نیوە سۆز و بوونێکەوە ئەیگوزەرێنم. جگە لەوەش تۆ کێوێک لە وورە و تەجرووبە و بیر و هۆشیاری و ئینێرجی و تەگبیر و ئیمکانیات بوویت ومن ئەو قەڵایەم هەرەسی هێناوە .

لە ساتەکان و ڕۆژە ڕاستەوخۆکانی دوای دەستگیریی تۆدا وورەم نەڕووخا بوو، بڕوام لەق نەبووبوو، هیوام درزی تێنەکەوتبوو.... بەڵام بۆشاییەکی ڕووحیی گەوەرم توش ببوو. تووشی نامۆییەکی سەیر هاتووم . یەکەمجارە دوای تۆ بیر لە مەرگ ئەکەمەوە. بۆشایی غیابی یەکجاریی تۆ. من لە غیابی تۆدا تووشی بۆشایی حوزوور بووم. شەو و ڕۆژ وەسوەسەی چارەنووسی تۆ گێنگڵم پێئەدا. چەند ڕۆژ پێش ئەو دوایین سەفەرەت، سەفەرێکی تری کەلارت کرد. ڕۆژی پێش کارەساتەکە ناساغ بوویت و لە سەر دەوا و دەرمان بوویت.

ئێستا ئەبێ چی لێبکەن!!! ڕەنگ بێ هەر من باش بزانم کەڵبەکانی بەعس چەند چاوەڕوانی لەشی تۆبوون.

**فلاش باگێک**

شوێن: ژووری مەخفیگاکەی بەلاشاوای هەولێر.

کات شەوە .

وەکوو پیشەیی هەمیشەییمان سەرقاڵی خوێندنەوەین. مۆتەکەی بێدەنگیی ئەمشەو بە پرسیارێک شەق ئەکەیت: گەر من دەسگیربکرێم تۆ چی ئەکەیت؟ پرسیارێکی گریمانەییە، بەڵام هەمیشە لەبناگوێمان دایە. پرسیارێک کە هەمیشە ئاگاهانە لەبیری خۆمی ئەبەمەوە!!!

ئیستێک ئەکەم. کتێبەکە ئەخەمە لاوە و بۆ بیانووی ووچان و جگەرەیەک ئەگەڕێم. بەدەم دووکەڵهەڵکێشانی جگەرەکەوە وەڵام دەدەمەوە: ئەزانی چی ئەکەم؟ درێژەم پێدا: ئەڕۆم بۆ سەر دواخاڵی سنووری ئێران و عێراق. پێیەکم لەودیو و ئەوی تر لەم دیو تا هەواڵی چارەنووسی تۆ ئەزانم .

-بۆ ئەوەندە بێمتمانەیت بە من؟

- نا. متمانەم بە تۆ زۆر زۆرە. متمانەم بە دوژمن نیە .

کاتێ وام ئەووت پێم لەسەر پێ دانابوو .

لە بیرتە چی وەڵامێکت دامەوە؟

- گەر دەسگیرکرام ئێستا چۆن دانیشتووی لەجێی خۆت مەجووڵێ.

بە پێکەنین و بەدەم جگەرەکێشانەوە ووتم: جا ئەوە ڕای خۆتە .

پاش یەک لەحزە بێدەنگی تۆ هاتیتەوە وەڵام: ئەزانی چۆن، من و تۆ هیچمان پیوەنەماوە بۆیە گرتن و کوشتنمان یەکە.

-ئێ؟

- جا باشترین ڕێگە لەکاتی گرتنماندا ئەوەیە کە هەڵبێین و ڕاکەین لەدەستیان تا لەدواوە بمان پێکن و بکوژرێین، وایە؟

-ئەم بەزمە چی بوو ئەمشەو دات مەزراند. ئەمشەو فلیمەکەمان خوێناوی بوو.

هەردووکمان بەدەم پێکەنینەوە کۆتاییمان بەبابەتەکە هێنا!!!!

## باکگراوەندی چوارەم:

تۆ لە ناو سەیارەی نەفەرات دای تا بەسەر کەرکووکدا بەرەو هەولێر بڕۆی. خاڵی پشکنینەکەیان هێناوەتە بانی مەقان. بڵاوکراوەکانت لە لەشتدا جێسازی کردووە. داتان ئەگرن و دەست ئەکەن بە پشکنینی لەشتان. دەسگیرت ئەکەن. هەرچی چۆنێک بووە ژمارەی تەلەفوونێک ئەدەی بە کچێک لەسەیارەکەدا تا بەڵکوو هەواڵێک بگاتەوە بە هاوڕێکانت. هەواڵەکە دەگاتەوە ماڵی باوکت و ئەوانیش ئێمە ئاگادار ئەکەنەوە.

تۆ گل ئەدەنەوە تا بەباڵ بەستکراوی بتبەن بۆ ئەشکەنجەگا ترسناکەکەی ئەمنی کەرکووک. تۆ خۆت لەدەستیان ڕائەپسکێنیت وبەو دۆڵ و شیوانەی ئەو ناوەدا ڕائەکەیت. ئەوە ڕێک ئەو سیناریۆیەیە کە شەوەکەی بەلاشاوا هۆنیبووتەوە. باش ئەتزانی کە لەو دۆلانەدا هیچ فریادڕەسێک دادت نادا. تەنیا مەبەستت ئەوە بوو ببی بە نێچیرێکی ئەوان و لەدواوە بتپێکن و لەوێوە هەموو ئەڵقەکانی مەرامەکەیان بپچڕێنیت. بەلاّم تۆ نەتزانی کە تۆ نیچیرێکی ئاسایی نیت. تۆ لای ئەوان زۆر بەنرخیت و پێ ئەچێ یا کۆدی ڕیسکەکەی تۆیان خوێندبێتەوە و یا پەیوەندیان بە سەرووی خۆیانەوە کردبێت و بۆیان دەرکەوتبێت کە ئەوان چی نێجیرێکیان چنگکەوتبێت.

ئەوان دەسڕێژت لێئەکەن، بەلاّم بەدڵی تۆ ناکەن!!!!! پێت یا ئەژنۆت زامدار ئەکەن و دێنەوە سەرت و سواری سەیارەت ئەکەن بەرەو کەرکووک. لەقەرەباڵغیی لای چاخانە حەسیرەکەی ناو کەرکووک دیسانەوە فرسەت دێنیتەوە بەلاّم دیسانەوە دەسگیرت ئەکەنەوە. ١-٢ ڕۆژ ئەشکەنجەیەکی وەحشیانەت ئەدەن، بەلاّم هەیهوو تۆ بڕیاری خۆت هەر ئەو شەوەی هەولێر بڕاندۆتەوە.

ئیتر تۆ ........لەدەست ئەدەی و ئێمەش هیچ سۆراغێکت نازانین وپاش مانگێک کاک سدیقی زیندە یادی زاواتان دەچێ بۆ ئەمنی کەرکووک بۆ سۆراغێک لەوێ "وەفاتنامە"ی تۆی ئەدەنێ و ئەڵێن لێرە بەجەڵتەی دڵ گیانی لەدەست داوە!!!!!

## تووندبوونەوەی ئەڵقەکانی ئیختیفا

ئەو شەوەی من و جەبار دوای ئاگاداربوونمان لە دەستگیریی نەجات ماڵەکەمان جێهێشت، ڕوومان کردە ماڵی مامۆستا ستار لە بەختیاری. کاتەکە درەنگانی شەو بوو و شاریش بەشەو پڕدەبوو لە مەفرەزە خاسە و ئەمن و هەموو جادە و کۆڵانەکانیان دەگرت. جگە لە چنووری تازە هاوسەری نەجات، لەتیفی برای و دایکیشی هاتبوون بۆ گەیاندنی هەواڵەکە بە ئێمە. ماڵەکەش نووسراو و بڵاوکراوەی زۆری تیایە. گەڕەک وکۆڵان کپ و خامۆشە و هەرچۆنێک بوو ئەوانمان بەسەیارەیەکی نەناس ناردەوە. بە دزە بە کۆڵانەکاندا و بەترس و دڵەڕاوکێ و دڵێکی پڕ لە داغەوە لە زەرگەتەوە خۆمان گەیاندە ماڵی مامۆستا ستار کە هاوڕێی گرووپەکەمان بوو. بە مامۆستا ستارم ڕاگەیاند کە مەسەلەیەکی واڕوویداوە و ئەو ناوە چۆڵ بکەن با من لە گەڵ ئەو هاوڕێیەمدا کە ئێوە نایناسن بڕۆینە ژێرزەمینەکەتان تا بەیانی.

لەگەڵ جەباردا لەو ژێرزەمینەی ماڵی مامۆستا هەندێ وردە تەگبیری خێرامان کرد وبڕیار بوو کە ئەو هەموو خەتەکانی لای خۆی و خەڵکی تریش لەم پێشهاتە ئاگادار بکاتەوە. بۆ سبەی ئەوێمان جێهێشت و لەگەڵ مامۆستا ستاریشدا هەندێ ڕاوتەگبیرمان کرد. لەگەڵ جەباردا ڕێکەوتین کە ئەم ماوەیە کارەکانی گرووپەکەمان ڕاگرین تا هەواڵێک سەبارەت بە چارەنووسی نەجات ئەگات. بۆ ئیحتیاتیش بڕیارماندا گەر لە یەک بزر بووین لەڕێی سیروانی برایەوە یەکتر بدۆزینەوە و ئەو تەتەری نێوانمان بێت.

دەستگیریی نەجات شۆکێکی گەورە بوو کە تووشی من بوو. لە هەموو ڕوویەکەوە کاریگەریی قووڵی لەسەرم دانا. نەجات زۆرترین پەیوەندیی سیاسیی لە هەموو کوردستاندا هەبوو. بەکورتی ئەو کۆگای نهێنیەکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بوو. ئەو هەموو نهێنیەکانی ژیانی سیاسی وڕێکخراوەیی منی پێ دەزانی. گەر نەشی زانیبایە ئەوە گومانی دەکرد. مەسەلە ئەوە نەبوو کە من ئەو نهێنیانەم خستبێتە بەردەستی بەڵکوو زۆربەی پەیوەندیە سسیاسیەکانی سەردەمی خوێندنی زانکۆ و ڕێکخستنی ناو کارگەران و گشت چالاکیەکانم لە پەنای ئەودا وبەشی زۆریان لەگەڵ ئەودا ئەنجامدابوو. سیستمی نهێنی کار و شێوازی کاری ئێمەش دەیان کەم و کوڕی و کون و کەلەبەری تیا بوو کە نموونەی وەکرەکەی هەولێر یەکێکیان بوو. نەجات خۆشی زۆر بزێو و کونجکاو بوو. ئێستا هەرچی شوێنێک و ماڵێک کە من بمەوێ ڕووی تێبکەم یا ئەو خۆی پێی ناساندووم یا ئەیزانێ یا گومانی لەسەری هەیە. لەو کاتەشدا من جگە لە سلێمانی شوێنێکی ترم بۆ نەمابۆوە بۆ خۆحەشاردان وئێرە دوایین شوێنمە. من گەرچی زۆرترین وردەکاریی تەکنیکی کاری نهێنیم ڕەچاو ئەکرد، بەڵام سەرئەنجام ئێستا چارەنووس و ژیانم بەسترابۆوە بە چارەنووسی ئەوەوە. ڕاستە من بڕوای تەواوم بە خۆراگریی ئەو هەبوو، بەڵام ناکرێ هێشتا ئەشکەنجە و کەڵبەی هاری بەعس بەکەم بگرم. ئێمە هێشتا نەشمان ئەزانی کە ئەو تەنها دوو ڕۆژ ژیاوە و دواتر لە ئەمنی کەرکووک لەژێر ئەشکەنجەی قورسدا لەناویان بردووە.

من جاروبار بە نهێنی و شەوان سەردانی ماڵی باوکی نەجاتم ئەکرد و لەوێوە سۆراخمان ئەکرد. کوڕە گەنجەکانی خزمی ئەو دەستبەجێ ماڵەکەی زەرگەتە و سەرشەقامیان لەهەموو شتێک پاککردبۆوە. کەس وکاری لە کەلار و سلێمانی هەوڵی واستەیان دابوو. جارێکیان بۆ پەیداکردنی پارەی واستە لەگەڵ شەهید خالیدی مەلا عەلیدا ڕۆیشتین

بۆ ماڵی برادەرێکی خۆمان کە زۆر جار کاری قۆنتەراتی هاوبەشیان ئەگرت لە گەڵ نەجاتدا، بەڵام بە بیانووی ئەوەی پارەکە ئەفەوتێ و ئەوە تەنها دەسبڕینە و شتی لەو جۆرە دەستی نا بەڕوومانەوە. چنووریش کە کەمتر لە دوو مانگ لەگەڵ نەجاتدا ژیانی هاوسەریان بردەسەر گەڕایەوە ماڵی باوکی و ئەویش مایەی خەمێکی قورسی تر بوو و جاروبار سەردانێکی ئەویشم ئەکرد. بەکورتی ئەو ماوەیە مەسەلەی سەرەکیمان دەرکەوتنی چارەنووسی نەجات بوو.

من ماوەیەکی کەم پێش دەستگیریی نەجات پەیوەندیی سۆزداریم لەگەڵ "نەسرین"ی هاوسەری دواترمدا پەیدا کردبوو. نەسرین هاوڕێی سیروانی برای جەبار بوو کە بەهۆی نەوزادی برایەوە کە پێکەوە لەئامادیی دەیانخوێند، یەکیان ئەناسی. جەبار و نەجاتیش ئاگاداری ئەو پەیوەندیەم بوون. نەجات هەمیشە ئەیووت خۆتۆ ئەتووت تا زرووف وابێت هاوسەرگیری ناکەم ئەی ئەم بەزمەت لەچی؟ وەڵامەکەی منیش ئەوەبوو ئەمووت وامزانی ئەم ڕژێمە ئەڕووخێ چووزانم ئەوەندە چیرە درێژە و قەت تیاناچێت و بەگاڵتەوە ئەمووت بەقسەی جەلال تاڵەبانی خەڵەتام کە هەموو ساڵێک ئەیووت ئەم بەهارە صدام ئەڕووخێت. نەجات ئازادی برای نەسرین و سابیری خاڵی ئەناسی. جەباریش لەگەڵ "شیرین"ی هاوسەری دواتریدا یەکیان ناسیبوو و هەموو شتێکیان بڕاندبۆوە. نەسرین لە ڕێگەی سیروانەوە بووبوو بە ئەندامی کارگەران و لە چەندین خۆپیشاندانی سلێمانیدا لەساڵانی ٨٢ - ٨٤ بەشدار بووبوو و لە دەوروبەری گرووپی بڵێسەدا مابۆوە. ئەو لە کارگەی ئەلبیسە لە بەشی دیزاین (تصمیم) ئیشی دەکرد. یەکەم یەکتر بینینمان لەماڵی باوکی جەباربوو کە کاسێتێکی گۆرانیی فەیرووزم بە دیاری بۆ برد، چونکە ئەمزانی عەرەبیەکەی باشە. لەو یەکەمین ژوانەماندا لێم پرسی کە چی ئەخوێنیتەوە و تا لە ژیاندا بوو گاڵتەی بەو پرسیارە ناوەختەم ئەکرد. جەبار کردبووی بە نوکتە لەسەرم و ئەیووت: تۆ کە تەلەفوون

بۆ نەسرین ئەکەی مجامەلەی عاتیفی نازانی، و گوایە من ووتوومە هەی بێوەفا!!! ئەو سەردەمە جەبار و بەتایبەتیش نەجات ڕایان وابوو کە بۆ ئەوەی لەگەڵ ژیانی سیاسیماندا گونجاو بێت، باشترە کە ئێمە لە ناوەندی کرێکاری و خێزانی کرێکاری هاوسەرگیری بکەین. منیش پەیڕەویم لە هەمان ڕێسا کرد. نەجات هێشتا نەسرینی نەناسیبوو و چەندین جار بەو نیازەبووین کە سێ قۆڵی یەکتر ببینین یا نەسرین سەرێک لەماڵەکەمان بدات، بەڵام ڕێ نەئەکەوت. بەڵام نەسرین ئەیووت لە مەکتەبی خاڵی سابیر نەجاتی بینیوە وجگە لەوەش لەگەڵ ئازادی برایدا هاوڕێ بوون. ئێمە تا نەجات مابوو بڕیاری یەکجاریی هاوسەرگیریمان نەدابوو، چونکە پەلەم نەبوو.

ماوەیەک بەسەر گرتنی نەجاتدا تێ پەڕیبووبوو وئیتر دیار بوو کە هیچکەس بەهۆی ئەوەوە تووشی هیچ نەبووە بۆیە تۆزێک ترسمان ڕەویبۆوە. نەسرین وتی: کە بەشی دیزاینی کارگەی ئەلبیسە کە ئەو کاری تیا ئەکات بە سەردانێک ئەڕۆن بۆ بەغدا فرسەتێکی باشە تۆش وەرە و لەوێ ئەو دوو ڕۆژە دوای کارەکانم پێکەوە ئەبین. منیش هەویەیەکی تازەم دروست کردبوو ڕازی بووم. کە بە جەبارم وت نیازی شتێکی وام هەیە هەڵچوو و سەری سووڕما وتی: تۆ یاری بە چارەنووسی خۆتەوە ئەکەیت؟ پاش بگرە وبەردەیەکی زۆر بەگاڵتەوە وتم ئاگری دڵ هەڵی گرتووم هەر ئەڕۆم و لەم شارە ناتوانین دووقۆڵی پیاسەیەکی ناو بازاڕیش بکەین. من بەجیا و نەسرین لەگەڵ هاوڕێکانیدا سەفەری بەغدامان کرد و بەرپرسی کارەکەی ئەیزانی کە ئەو دەزگیراندارە ڕێگەی دابوو کە هەموو ڕۆژێک زوو کارەکەی تەواو بکات تا بێت بۆ ئوتێل بەدوای مندا. ئەو دوو ڕۆژە فرسەتێکی زۆر باش بوو بۆ تەگبیر وراکردن سەبارەت بە ژیانی هاوسەری و ناسینی وردتری جۆری ژیانی من. هەر لەوێ بڕیارماندا پاش گەڕانەوە یەکسەر بڕۆینە ماڵی خۆمان.

ئەو ماوەیە هەر شەوەی لە ماڵێک ئەمامەوە. زۆرتریش لە ماڵی خێزانێکی خزمی خۆم ئەمامەوە لە چوارباخ یا لە ماڵی وەستا برایمی خزمم کە نەجات ئەمانی نەئەناسی. جاروباریش یا لە ماڵی مامۆستا ستار یا لە ماڵی نەبەز خالیدی هاوڕێم کە ئەو ماوەیە سێقۆڵی وەکوو شانەیەک لەگەڵ ئەو و ستاردا کۆبوونەوەی ڕێکخستنمان ئەکرد. جاروبار لەگەڵ جەباردا یەکترمان دەبینی و دوایین ئاڵوگۆڕ و مەسەلەمان باس ئەکرد و ئەویش ئاگاداری کردم کە لەوە زیاتر ناتوانێ ماڵەوماڵ بکات و دەیان ساڵە ماڵی باوکی کردووە بە شوێنی چالاکیی سیاسی، بۆیە جگە لەوەی منی هاندا کە پەلە بکەم لە هاوسەرگیری تا ببین بە خاوەنی ماڵ و جێگەی خۆمان، خۆشی لەوبارەوە هەمان بڕیاری دابوو. نەسرینیش کە زۆر نیگەرانی وەزعی من بوو هەمان ڕای هەبوو، بۆیە پاش تەواوکردنی ڕەسمیاتی هاوسەرگیری لەسەر ماڵ دانان براینەوە و خانوویەکم لە ڕزگاری لە پشتی دەزگای سەردەمی ئێستاوە بە کرێ گرت. جەبار پیش من هاوسەرگیریی کرد و ماڵی دانا. ماموستا ستارو "شەماڵی حاجی تایەر" و عوسمان و ستاری هاوڕێم لە هاوسەرگیریدا یارمەتیی زۆریان دام.

بڕیارماندا ڕۆژی هەینیی دوای هاتنەوە لە بەغدا بگوێزینەوە بۆ ماڵی خۆمان. هەر بەڕاستیش سادەترین هاوسەرگیریمان کرد بەهەموو قۆناغەکان و ڕێ و ڕەسمەکانیەوە. شەوی پێشتر بۆ خۆئامادەکردن بۆ گوێزانەوە لە ماڵی "هەڵالە ڕافیع" و شەماڵی حاجی تاهیر مامەوە و سەلاح میرزا (حەیدەر هیدایەت)یشمان لەگەڵدا بوو. هەر ئەو شەوە ڕووناک شوانیی هاوڕێم و کچێکی تری هاوڕێی ئەو یارمەتیان دام و شەو لای نەسرین مانەوە. وا ڕێکەوتین کە بەسەیارەکەی شەماڵ بڕۆین نەسرین هەڵگرین و بەبێ دابەزین لە سەرچنار پیاسەیەکی ئەو ناوە بکەین و بڕۆینەوە بۆ ماڵەکەمان کە ئامادەمان کردبوو. حەیدەر هیدایەتی زیندە یاد وڕکی لێم گرت وتی بەیانی منیش لەگەڵتاندا دێم

هەتا دەتگەیەنینە ماڵەوە. هەرچەند وتم تۆ مەیە و نابێ بێیت و هیچ مانایەکی نیە زرتەبۆزێکی وەکوو تۆ دوای خۆم بخەم بێ فایدە بوو لەبەر خۆشەویستیی من هەر هات. لە ڕێگە بۆ ماڵی نەسرین وتم حەمە (بە حەیدەرمان ئەووت حەمە) ئێستا لەو ماڵە ڕەنگە دەست بکەن بە گریان، چونکە ئەوە عادەتە کە کچیان ئەڕوا وا ئەکەن جا ئاگادار بە. ئەویش وتی: گەر گریان بڵێ باشە کاکە ئەوە کچەکەتان و نایبەم و خواحافیز!!

شەماڵ بردمانی بۆ سەرچنار و بێ ئەوەی دابەزین گەیاندمانیە ماڵەوە وتیشی خۆم خواردنی بەیانیانتان لە بازاڕەوە بۆ دێنم و هەندێ وێنەمان گرت و ئەوان ڕۆیشتن.

نەسرین پشوویی هاوسەرگیریی بۆماوەی ١٠ ڕۆژ وەرگرتبوو. ماوەیەک بوو دایکم لەبەر نەخۆشی لە دێلێژەوە هاتبوو بۆ شار وتا ئەوکاتە من لەبەر ئەوەی خۆشم جێیەکم نەبوو، سەرەتا لە ماڵی کاملی خاڵۆزام دامان نابوو دواتر گوێزامانەوە بۆ ماڵی کاک عوسمانی باوکی "ڕووناک شوانی" کە ماڵێکی ئاشنای نزیکی خۆمان بوو کە لەبەر کوڕی پێشمەرگەیان لە کەرکووکەوە ڕایان کردبوو بۆ سلێمانی وماڵیان لە نزیک کارەباکە و بارەگاکانی کۆمەڵەبوو. ئەو ماوەیە یا خۆم شەویش لە گەڵ دایکمدا ئەمامەوە یا سەرێکم لێی ئەدا لەبەر جێگوڕکێی خۆم. ڕۆژێکیان کە وەزعی ئەمنیی شار زۆر خراپ بوو لەگەڵ حەیدەر هیدایەتدا کە ماڵی خاڵی نزیکی ئەو ماڵە بوو سەرێکمان لە دایکم دا و دیار بوو سەرباری گێڕانی بەچەند دکتۆردا وەزعی بەرەو خراپی ئەچوو. حەیدەر وتی تۆ مەیەرە دەرەوە من خۆم ئەیبەم بۆ لای دکتۆر یادگار و منیش تا هاتنەوە هەر لە ماڵی کاک عوسمانی باوکی ڕووناک شوانی و کاک "هیوا چاوشین" کە ئەو پێشمەرگە و ئەمانیش ڕاکردووی کەرکووک بوون مامەوە. ماڵی کاک عوسمان وەکوو ماڵی مامم وابوو. پاش قەدەرێک دواتر حەیەدر و دایکم هاتنەوە بە هەندێ داودەرمانەوە. حەیدەر بردمیە لاوە وتی

کوڕی خوا تۆ لە هەزار لاوە بەڵا بەسەرتا ئەبارێ. لە وەڵامی چی بووەی مندا وتی: سەرەتانی جگەری هەیە و لە دوایین قۆناغی دایە و لە مانگێک زیاتر تەمەنی نەماوە و ئەو دەرمانانەش تەنها بۆ دڵخۆشی ئەو دایانناوە و هیچی تر.

جارێکی تر خەمێکی زۆر قورس هەموو لەشمی داگرت. هەموو خۆڕاگریەکەی دایکم لەبەرانبەر ئاوارەیی و ڕاکەڕاک و شەهیدبوونی دوو کوڕی لە دوو مانگدا و خەفەتی ڕاکەڕاکی من لەدەستی یەکێتی و بەعس، شتێکی ڕواڵەتی بوو تا لای ئێمە وانیشانی بدات کە ئەو کۆنترۆڵی هەست و سۆزی خۆی کردووە. هەموو ئەو خۆنواندنەی لەبەر ئێمە و لەترسی نەگەیاندنی سەدمەی عاتیفیی زیاتر بە ئێمە بوو بۆیە واخۆی نیشان ئەدا. ئێستا هەموو شتێک دەرکەوت. شریتی هەموو تەمەنی خێزان و دایکم و تێکۆشانی ئەو بۆ پێگەیاندنمان و قۆناغی شەڕەکانی لەگەڵ باوکمدا لەسەر خوێندنی ئێمە و پێداگریی لە سەر بەردەوامی خوێندنمان و سەردانەکانی زیندان و کۆی ئەزیەت وئازارەکانی وەکوو فلیمێک بە بەرچاوی پڕ فرمێسکمدا ئەهاتن و ئەچوون. دایکم مرۆڤێکی زۆر تایبەتی و ڕۆڵ مۆدێل یا (قدوة) یەکی تایبەتی ژیانی من بوو. ژیانی ئەو زنجیرەیەک لە ڕەنج و ماندوو بوون و خۆڕاگری و تێکۆشان و قوربانیدان بوو بۆ ئێمە. بەری چاوم تەواو تاریک بوو. وەکوو لەناو ئەرزێکی پڕ لە میندا وەستابم وابوو. لەهەرچوار لاوە مەینەتی و کێشە و خەم دەوریان داوم و هێزیان لەبەر بڕیوم. پرسیارە وجوودیەکانی ژیان و مەرگ و ئازادی و نەمان لە مێشکمدا بەیەکیاندا دەدا. پار عادل و ئیحسان جێیان هێشتین و دایکم بەو دەردە چوو بەدەست بۆشایی کۆچی ئەوانەوە. بەدوایدا یەکێتی منیان ڕاونا و ئەوەیان پێ ڕەوا نەبینیم کە کەمێک لە خەمەکانی دایکم بڕەوێنمەوە و بەپێچەوانەوە بووم بەخەمێکی سەربار بۆی. ئەوە چارەنووسی نەجاتە کە لێم ڕوونە هەر مەرگە و هێشتا سۆراغی تەواوی نازانم کەچی وا دایکیشمی هاتە سەر.

دوای یەکەم شەوی گویزانەوەی ماڵمان دایکمم بردە لای خۆم و چاوەڕوانی مەرگی هەر لەحزەیەکی بووم. ئێمە ٢٧/ ٧/ ١٩٨٧ چووینە ماڵی هاوبەشمان و نەسرین ڕۆژی ٨/ ٨ ئیجازەکەی تەواو بوو بۆیە دەستی کردەوە بەدەوام. هێشتا ئەو لەکار نەگەڕابۆوە وەزیرەی خوشکم کە لە کەرکووکەوە بە نهێنی هاتبوو بۆ سەردانی دایکم ویستی بگەڕێتەوە و من گەیاندمە نەقلیاتەکە و دایکمم بەدیار کچەکەی ئەوەوە جیهێشت کە لای ئێمە مایەوە. کە گەیشتمە ماڵەوە بەگریانی ئەو کچە بچووکەدا زانیم کە دایکم بۆ یەکجاری دونیای پڕ لە ڕاکەڕاک و جەور و مەینەتی جێ هێشتووە!!!!

مەرگی دایکم چاوەڕوان کراوبوو، بەڵام سروشتی ئینسان وایە ئەو لەحزەیەی کە ئەزانی خۆشەویستێکت مەرگ ڕاپێچی ئەکات زۆر جیاوازە لە کاتەکانی پێشوو و تەنانەت لە چرکەی پێش مەرگیشی.

جا وەرە لەم هەموو کێشەیە دەربە. لە حاڵەتی وادا بە تاقیکردنەوەی خۆم گرنگترین شت ئەوە نیە کە پێش بەو هەموو کارەساتە بگریت، چونکە ناتوانی، بەڵکوو گرنگ ڕێکخستنی کێشەکان و دەست وپەنجە نەرم کردن لەگەڵیان و لەدەست نەدانی کۆنترۆڵی ڕێکخستنی ئەو قەیرانانەیە.

من پێشتر بەرنامەم دانابوو کە تا چەندین ساڵ ئەم ماڵەم نەبێ بەجێی سەرنج و پێزانینی خەڵک و خزم و ناسیاو کەچی ئێستا ئەبێ دەرگا بخەمە سەرپشت و خۆم ئەدرەسەکەم بۆ چاک و خراپ ڕەوانە بکەم بۆ هاتنیان بۆ پرسە. زۆربەی خزم وناسیاوەکانیشمان وایان دەزانی منیش وەکوو براکانم لە دەرەوەم و پێشمەرگەم. ئێ خۆ ناسیاو وخزمیش چاک و خراپی تیایە ئەوەش بەتایبەتی بۆ ئەم کاتە ناسکەی من مەترسیی کەم نیە. بەهەرحاڵ بەهۆی کۆمەکی مامۆستا ستار و شەماڵ و جەبار و هەلاڵە و برادەر و کەسی وەکوو ماڵی کاک عوسمان و ماڵی خەزوورم و هەندێ خزمی سلێمانیمان دوای

ناشتنی سەرقەبران پرسەمان لە مزگەوتی حاجی جەمالی نزیک ماڵی خۆمان دانا کە ئەکەوێتە سەرشەقامی سالم.
لە پرسەکە باوکمیش هاتبوو و لە گەڵ جەبار و هاوڕێ نزیکەکانی خۆمدا ڕێکەوتین کە نەوەک ئەمن بەهۆی بڵاوبوونەوەی هەواڵی مەرگی دایکمەوە پێم بزانن و لێرە تووشی دەستگیری بم ئەوان زۆر بەووردی چاودێریی وەزعەکەیان ئەکرد و ئیحتیاتاتی هەڵاتنم وەکوو دوایین چارە دانابوو.
چەند ڕۆژی پرسەمان بێ کێشەیەکی ئەوتۆ بردە سەر و پاشان سەردانی ماڵ نەئەبڕایەوە و بە پرسیار لە کەرکووک و شارانی ترەوە میوانمان ئەهات و ماڵمان بوو بەسەرەڕێ. زانیم ئەگەر ئێستاش نەبێ بەڵام مەترسیی دواتر بەشوێنمەوەیە بۆیە لەگەڵ ماڵی خەسوومدا بڕیاری گوێزانەوەی ئەم ماڵەمان دا کە هەمووی بەسەریەکەوە کەمتر لە ٣٠ ڕۆژێک تیاماینەوە. بەبۆنەی پرسەکەمانەوە خزمەکانی نەجات ماڵەکەمیان دۆزیەوە و پێش گوێزانەوە سەردانیان ئەکردم. ڕۆژێکیان ئەوان مەلا سدیقی زاوای نەجاتیان ناردبوو بۆ سەردانی ئەمنی کەرکووک بە بیانووی هێنانی جل وبەرگەوە و لەوێ وەڵامیان دابۆوە کە ئەو کەسەی ئێوە واتە نەجات بە جەڵتەی دڵ لێرە گیانی لەدەستداوە و وەفاتنامەیەکیان پێدابوو کە دیار بوو تەنها دوای دوو ڕۆژ کوشتوویانە. ئەم هەواڵە بوو بەسەرتۆپی زنجیرەی تراجیدیەکانی ژیانی من و سەرلەنوێ فەزای مەرگ دەوری دامەوە.
مەرگی نەجات بۆ من مایەی داڕووخانێکی عاتیفی وا بوو کە لە پاڵ مەرگی براکانم ودایکمدا تا چەندین ساڵ مانایەکیان بۆ خۆشی لە ژیانمدا نەهێشتەوە وئیتر ژیانی هاوسەرگیریشمی کرد بە عەزاب. جگە لە خەسارەتە گەورەکەی بۆ کەس و کار و هاوڕێ سیاسیەکانی، ئەم تراجیدیە بۆ من مانایەکی ڕووحیی قووڵی هەبوو. ئەمە چ هاوسەرگیریەک بوو کە من کردم؟ ئەم هەموو مینە چی بوون لەم کاتەدا بەچواردەوری مندا تەقینەوە؟

لەم سـاڵانەی دواییدا وپێش هاوسـەرگیری لەگەڵ جێنیی هاوسـەری ئێسـتامدا، ژنێکـی ئوسـترالی بـوو بە هـاوڕێم کە لێپرسـراوی بەشـی دارایی ئەمنیستی ئەنتەرناسیونالی ئوستراليا بوو. ئەو ژنە ناوی لیا ئۆلیڤەر بـوو و زۆر سـەری ئەخسـتە سـەرم کە ئەو بەسـەرهاتانەی ژیانی من بکەین بە کتێبێک بە زمانی ئینگلیزی و چەند بەشیشمان لێی نووسـی و دواتـر ڕامـان گـرت. لە وەڵامـی پرسـیارێکی ئەودا کە ئەو هەمـوو کارەسـاتانە لەڕووی سـایکۆلۆجیەوە زۆر پێتەوە دیـار نـیە و تێکی نەشکاندوویت من پێمووت: کارەسات و تراجیدیەکان یا لە ژیان بێـزارت ئەکەن و تووشـی لادانـی سـایکۆلۆجی و خۆخـورادنەوە و داخران و تێکشکان و دوورە پەرێزی و کۆمەڵێک دیاردە و نەخۆشیی ترت ئەکەن یاخود زیاتر پەیوەندیت بەژیان و ئازادی و تێکۆشانەوە بەهێزتـر ئەکەن و مەیل بـۆ خۆشەویسـتی وخۆشـبەختی مرۆڤت تیا ئەچێنن و پتەوتر و مەحکەمترت ئەکەن. قسەکەی نیتشەشم لەوبارەوە بیـردەکەوتەوە کە دەڵـێ: ئەوەی کە نەبێـتە هـۆی مەرگـم بەهێزتـرم ئەکات.

مـن لەوەڵامـی (لیـا)ی هاوڕێمـدا وتـم: کە پـێ دەچـێ مـن لە جـۆری دووەمیان بم و بۆ گاڵتەش وتم (ئەوەش نەگبەتیەکی ترە)!

لەبەر پرسـەی نەجـات مـاڵ گوێزانەوەکەمـان چەنـد ڕۆژ دواخسـت. پرسـەکەیان لە ماڵی حاجی سـاڵحی خاڵی نەجات لەسەرشـەقام دانـا. خەڵکێکی زۆر ئەهـاتن بۆ پرسـەکە چونکە نەجات لەنـاو خەڵکدا زۆر خۆشەویست و جێی ڕێز بوو.

دوای کوشـتنی لەژێـر ئەشـکەنجە لە ئەمنـی کەرکـووک، لەڕێـی شـارەوانیەوە تەرمەکەی نەجاتیـان بە نهێنـی لە شـوێنێکی تـایبەت لە گۆڕستانی شـێخ محی الـدین ناشـتبوو. دواتر جەبـار لە سـەردانیدا بۆ کەرکـووک لە ڕێـی هـاوڕێ ئیسـماعیل جەبـاریەوە شـوێنی ناشـتنی تەرمەکەیان لە گۆڕستانەکە دۆزیەوە.

پاش تەواوبوونی پرسەکەی نەجات ئێمەماڵمان گوێزایەوە بۆ گەڕەکی برایم پاشا لە نزیکی ماڵی باوکی نەسرینی هاوسەرم.

ئێستا دەرکەوت کە نەجات لێوی هەڵنەهێناوەتەوە بۆیە لە بەرامبەر خۆڕاگریی ئەودا جەللادەکانی تووشی هیستیریا بووبوون و شێتانە بەربووونە گیانی. مەرگی نەجات بۆ من شۆکێکی نەفسیی گەورە بوو کە تاماوەیەکی زۆر پێوەی ئەمناڵاند. جگە لەوەش بەڕاستی ئەو توانا فکری و سیاسی و ئامادەیی و دەسپێشکەریانەی لەوم دیبوو، بە ئێستاشەوە، لەهیچ قۆناغێکی ژیانی سیاسیمدا، لەکەسی تری هاوڕێ وهاوکاری سیاسیم نەدیبوو. گیانی دینامیکی ئەو وسەرچڵیەکی سیاسی و بەریقێکی فکریی تایبەتی هەبوو. بەڵام ئەو بە هەموو مانایەک شۆڕشگێڕ بوو لەسەردەمێکی ناشۆڕشگێڕدا. هەر دەرکنەکردنی ئەو هاوکێشەیەش سەرچاوەی هەڵپە و عەجوولی ونەبزێویەکانی بوو. تا ساڵەهای ساڵی دواتر کە دەرگیر ببوومایە لەگەڵ هەڵوێستێکی سەخت یا ڕووبەڕووی مەسەلەیەکی ئاڵۆزی فکری و سیاسی بوومایە، هەوڵم ئەدا کە ئیلهامی هێز لەو وەرگرم. لە یەکەمین ڕۆژی ڕاپەڕیندا و بەتایبەتی لەسەرکەوتنی خەباتی خەڵک لەو ڕۆژەدا، غەرقی بیرکردنەوەی نەجات ببووم و لەهەر هەنگاوێکدا لەدڵی خۆمدا ئەمووت بریا نەجاتیش لێرە بوایە.

من ئێستا بۆم دەرئەکەوێ کە سەرسەختترین بوونەوەر مرۆڤە، ئەگەرنا ئێمە چۆن بەرگەی ئەو هەموو فشارە ئەمنی و عاتیفی وسایکۆلۆجی ومادی و مەعنەوییانەمان ئەگرت و لێی دەرباز ئەبووین؟ پێموایە ڕازی ئەوە لەوەدایە کە کاتێک باوەڕ لە کۆمەڵێک بەهای فکری و سیاسیەوە ئەبێ بە بەشێک لە کەسایەتیت ئیتر بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەگۆڕێ و ئەبێ بە ماتۆڕێک کە هێز و وزەی ڕووحی و مەعنەویت بەرهەم و دووبارە بەرهەم دێنێتەوە. ئێمە سەرباری ئەو گورزە قورسەی بە مەرگی نەجات بەرمان کەوت،

بەڵام بە فیعلی مەرگی ئەومان گۆڕی بە سەرچاوەیەکی تری هێز و وزە بۆ کار و تێکۆشانی دوای ئەو.
ئەو ماوەیە دوای وەستانێکی کەم دەستمان کردەوە بە جموجۆڵ و چالاکیەکانمان.
ئێمەماڵێکی بچووکمان لە گەڕەکی برایم پاشا بەکرێ گرت کە بوو بە بارەگا و جێی کۆبوونەوە و چالاکیەکانمان. پاش تەرمیمکردنی، ئەڵقەی ناوەندیی بڵێسەمان چالاک کردەوە. هەردوو هاوڕێی جووتە برا عوسمان محمد کەریم و ستار هاتنە ناو ئەڵقەی ناوەندیی بڵێسەوە بۆیە بەجەبارەوە بووین بە چوار کەس. پاش ماوەیەک لەتیفی شێخ عومەریش، کە پێشتر ئەندامی ناوەندیی کارگەران و یەکێک بوو لەوانەی لە ململانێکانی ئەو ڕێکخراوە لە ١٩٨٤ دا وازی هێنابوو، لە ڕێی جەبارەوە بە ئێمەوە پەیوەست بوو و بوو بە ئەندامی پێنجەمی ئەڵقە ناوەندیەکەی گروپەکەمان. ئەبوایە ستار و عوسمان لە کەلارەوە ئامادەی کۆبوونەوە دەوریەکانی ئێمە ببن و ئەوان زووزوو سەردانی ئێمەیان ئەکرد و کۆئەبووینەوە. پەیوەندیە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانمان لە هەموو شارەکان پەرەی ئەسەند و لەولاشەوە پەیوەندیەکی نزیک و هەمیشەییمان لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا دامەزراندەوە. لەتیف لەبەر نزیکییماڵیان لە ئێمەوە زۆربەی کات دوای ڕۆیشتنی نەسرینی هاوسەرم بۆ کار، ئەهات بۆ ماڵی ئێمە بۆ ڕاییکردنی باس و چالاکیەکانمان. ئەو ماوەیە چەند باسی خۆمان و وەرگێڕانی ئەدەبیاتی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانمان بڵاو ئەکردەوە. ئەو نووسراوانە لەلایەن مامۆستا سدیقی خۆشنووسەوە دەنووسرانەوە کە هاوڕێی مامۆستا ستار بوو. من بە هۆی پەیوەندیەکانی نەسرینی هاوسەرمەوە لە کارگەی جل و بەرگی سلێمانی پەیوەندیی باشم لەگەڵ کۆمەڵێک کرێکاری ئەو کارگەیە دامەزراندبوو کە بەشێوەی مەحفەلێک خۆیان ڕێکخستبوو. نەسرین و هاوڕێکانی چالاکیی باشیان لە کارگەکە هەبوو چی لە بواری هۆشیارکردنەوەی کرێکارانی

کارگەکە و چی لە بواری ناڕەزایەتی بەرانبەر هەل و مەرجی ژیان و کاریان وبەتایبەتی سەبارەت بە هەوڵی ئیدارەی کارگەکە بۆ سەپاندنی جەیشی شەعبی بەسەریاندا. بڵاوکراوە و نووسراوەکانمان بە زۆر ناوەندی کرێکاری و مارکسیی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و کەلار و کفری ودووزخورماتوو و قەڵادزێ وزانکۆی سەلاحەدین دەگەیشت. لە هەمان ئەو شارانەش ڕایەڵ و پۆی ڕێکخراوەیی و دۆستایەتیمان هەبوو. مامۆستا ستار کۆمەڵێک پەیوەندیی سیاسی و ڕێکخراوەیی بەدەورەوە بوو. من لە گەڵ هاوڕێیانێکی زۆری کەرکووک وهەولێر و دوزخورماتوو پەیوەندیم هەبوو کە یا ئەوان ئەهاتن بۆ سەردانی من یا من ئەڕۆیشتم بۆ لایان. نەبەز خالید هاوڕێیەکی نزیکمان بوو و پێکەوە پەیوەندیەکی سیاسیی بەهێزمان هەبوو لەگەڵ گرووپی هاوڕێیانی سەرشەقام کە دیارترینیان خالیدی مەلا عەلی بوو کە هەر دوو هەفتەجارێک یا ئەو یا من ئەڕۆیشتم بۆ لایان بۆ یەکتربینین و گۆڕینەوەی بیروڕا.
جەبار لەگەڵ سیروانی برای و هەندێ برادەری خۆیاندا بەهۆی دۆزینەوەی کارێکی کونتراتی کارەبایی چووبون بۆ بێجی و زۆر کەم سەریان ئەدایەوە.
ئەو ماوەیە پەیوەندیی نزیکم هەبوو لەگەڵ حەیدەر هیدایەت کە بەهۆی ڕاکردنی سەربازیەوە لە سلێمانی ئەژیا. ئەو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خۆیدا (دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریا)یان لە کۆتایی ١٩٨٧ دا پێکهێنابوو. دەستە نامیلکەیەکیان دەرکرد کە پێموابێ نووسینی حەیدەر بوو کە زیاتر لاسایی کردنەوە و کۆپیی نووسراوەیەکی کۆنی (مەنسوور حیکمەت) بوو کە دوای ڕاپەڕینی ئێران بە ناوی (تێڕوانینێک سەبارەت بە تیۆریی مارکسیی قەیران و چەند ئەنجامگیریەک سەبارەت بە سەرمایەداریی وابەستە لە ئێران – نظری به تئوری مارکسیستی بحران واستنتاجاتی در مورد سرمایەداری وابسته در ایران). لەو نووسراوەیەدا کۆپیی نەک تەنها

تێزەکـــان و میتــۆدی شــیکردنەوە، بەڵکــوو قۆناغەکـــان و پرۆســـەی ســـەرهەڵدانی ســـەرمایەداری لە ئێــران کرابــوو و تەنهــا ناوەکـــان و ســـاڵەکانی لە گەڵ بـــارودۆخی عێــراق و ڕووداوەکـــانی ئەم وڵاتەدا تەرهــیم کرابــوون. ئەو هاوڕێیــانە ئێرانەکەیــان کردبــوو بە عێــراق و هەمــان ئەنجــامگیریش لەبــارەی عێــراقەوە کرابــوو بە بـێ گوێــدان بەو تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتی و سیاسیانە و ئەو ئـاڵوگۆڕە جیاوازانەی ئەم وڵاتە پیایــدا تێپەڕبــووە و ئەو ئاکامــانەی کە بەجێیــان هێشــتووە. ئەو مــاوەیە ئەو نووســراوەیە جێی گفتوگۆی زۆری نێوان مـن و حەیــدەر بوو کە من پێموابوو ئەو شیکردنەوەیە پشتی نەبەستووە بە فاکت و ڕووداو وئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵگای عێراق بەهەموو تایبەتمەندیەکانیەوە ئەگینــا تەنهــا شــێوازی هاوبەشـــی ســـەرهەڵدانی ســـەرمایەداری و خەســڵەتی وابەســتەبوونی ئەو پرۆســـەیە بە ســـەرمایەی جیهــانیەوە خۆبەخـۆ بەس نـین بـۆ بەدیهێنـانی هەمـان ئەنجـامگیریی هاوچەشـنی ئێران، چونکە ئەو پرۆسەیە لە هێڵە گشتیەکانیدا لە زۆربەی ووڵاتـانی ئاسیا وەکوو یەک بووە. ئەو پێیوابوو کە جگە لەخاڵە هاوبەشـەکانی نێــوان ئەو دوو باســـە، تەئکیــدیش کــراوەتە ســـەر تایبەتمەنــدیەکانی عێراق. ئەو سەرنج و ڕەخنـانە کـاری لە ئـەو و هاوڕێکانی نەئەکرد و بەدەســتکەوتێکی گرنگیــان ئەژمـــارد بـــۆ بـــزووتنەوەی کۆمۆنیســـتیی کوردستانی عێراق.

ســەرباری جیـاوازیە سیاسـی وڕێکخراوەییەکانمـان پەیوەنـدیی نـزیکم لەگەڵ حەیــدەر هیــدایەت هەر بەردەوام بــوو تــا مــاوەیەک دوای ئەوە دیــار نەمــا و دواتــر بیســتمەوە کە پــێش ڕاپەڕیــن بــوو بەســەرباز لە ســـــوپای عێـــــراق و ئەوەش تەڵاقـــــی یەکجـــــاریی ئەو بـــــوو لە گەڵ بزووتنەوەی چەپ و سیاسەتدا بە گشتی، تـا بەداخەوە لە ٢٠٠٤ دا بە کارەســاتی ئۆتۆمبیــل لە ڕێگــای نێــوان خــانەقین و ســلێمانی گیــانی لەدەستدا.

## له دیکتاتۆریەتی حیزبەوە بۆ دەسەڵاتی ڕەهای صدام!!!

هەمــوو نیشــانەکان و ڕەوتەکــانی سیاســەت لە عێراقــدا ڕوویــان لە چڕبــوونەوەی زیــاتری دەســەڵات و شــەپۆلێکی نــوێی دیکتــاتۆریەت ئەکــرد. ڕژێــم لە نیــوەی دووەمــی هەشــتاکانەوە عێراقــی کردبــوو بە زینــدانێکی گەورە بە چــاودێریی دەیــان دامودەزگــای ســەرکوت و کوشتار. سوپای عێراق لە نیو ملیۆن سەرباز تێپەڕی کردبوو. صدام زۆر بە هۆشـــیاری و دیـــقەتەوە لە ١٩٨٧ بەدواوە خەریکـــی خۆئامادەکردن بوو بۆ پێشوازی لە قۆنـاغی دوای شـەڕ لەگەڵ ئێرانـدا. شـەڕ لە درێژەی خۆیـدا ئـاڵوگۆڕی زۆری بەسـەر عێراقدا هێنـابوو و ئیتر ئەمە عێراقی سـەرەتای هەشـتاکان نیە. جگە لەوەش ئێستا ئیتر دەرکەوتـووە کە شـەڕ مەترسیەک نیە بۆ سـەر دەسـەڵات لە عێراقدا. ئەمریکـا و ئەوروپـا بە تەواوی پشــتگیری صــدام ئەکەن و نــاهێڵن تەرازووی هێـز لە نـاوچەکەدا بگۆڕێـت بە قـازانجی ئوسـوڵگەرایی ئیســلامی کە ئەوکــاتە ئێــران نــوێنەرایەتیی دەکــرد. صــدامیش لای خـۆیەوە کلـک و گـوێی عەقڵـی سـەرچڵانەی نەتەوەیـی دوێنێـی خـۆی کــردووە وئەوەشــی بەدروســتی خوێنــدۆتەوە کە لە ڕەهەنــدی نێودەوڵەتیـدا، پشـت بەسـتن بە سـۆڤیەت بـۆ مـانەوە لە دەسـەڵاتدا، گرەوکردنە لەسەر ئەسپێکی ماندوو و لاواز بۆیە لەم ڕووەوە هەمـوو هێلکەکانی خستۆتە سەبەتەی ئەمریکاوە. بەکارهێنـانی چەکی کیمیـایی لە شـەڕ لەگەڵ ئێرانـدا، کە بە بـێ ڕەزامەنـدی یـا لانـیکەم چاوپۆشـی ئەمریکا مەیسەر نەئەبوو، چارەنووسی شـەڕەکەی بە قـازانجی عێـراق گۆڕی، چونکە سوپای ئەو وڵاتە هیچی تـر توانـای پێشـگرتنی نەمـابوو

بە پاسدارانی مێشک پڕکراو بە ئومێدی ڕەوانەکردن بۆ بەهەشت و فـــوودراو بە فتـــوای ئـــایەتوولڵلا خـــومەینی. گـــرتنەوەی فـــاو پـــاش لەدەســـتدانی لە گەورەتـــرین هێرشـــی ئێرانـــدا بـــۆ ســـەر عێـــراق و دوورخســـتنەوەی مەترســـیی کەوتنـــی بەســـرە، بەتەواوی تەرازووی هێزی بەقازانجی عێراق گۆڕی و خەونەکانی ئایاتوولڵلاکانی ئێرانی بۆ یەکجاری لە بیابانەکانی خوارووی عێراقدا لە گۆڕنا.

بەڵام ئەو سەرکەوتنە سەربازیانە بۆ عێراق نرخێکی گرانیان هەبوو. سـەرباری هـات وهـاواری صدام سـەبارەت بە درێژەدانـی هاوکـات بە سیاسـەتی شـەڕ و گەشـەی ئـابووریی ووڵات کە تـا ١٩٨٤یـش تـوانی پەیڕەوەیی لێ بکات، ئیتر ئـابووریی عێراق بەرەو داتەپین ئەڕۆیشت. نەختیـــنەی دراوی دەرەکـــی عێـــراق ئەوەنـــدە کەم ببـــوونەوە کە ئابووریناسان زەنگی ئیفلاسی مالیی عێراقیان لێ ئەدا.

لە کاتێکدا کە عێراق پێش دەسپێکردنی شـەڕ خـاوەنی پاشـەکەوتێکی دارایـی ٣٥ ملیـار دۆلاری بـوو، بەڵام بەشـایەدیی عبـاس النصـراویی ئابووریناسـی بەناوبـانگی عێـراق (زیـانە داراییەکـانی عێـراق لە شـەڕ لەگەڵ ئێراندا نزیکەی ٤٥٢.٦٠٠ ملیار دۆلاری ئەمریکي بوو). Abbas Alnasrawi, The Economy of Iraq. Oil, Wars, Destruction of Development and Prospects, 1950-2010.p 112

لە هـیچ قۆنـاغێکی مێـژووی نـوێی عێراقـدا، ئەوەنـدەی قۆنـاغی دوای وەسـتانی شـەڕی عێـراق-ئێـران، کـاریگەریە نەرێنیەکـانی ئـابووریی ڕەیعی و پشت بەستنی تەواو بە داهاتی نەوت لەسەر سەرجەم ژیـانی کۆمەڵایەتی بەرجەسـتە نەبۆتەوە. ئیتـر بنەماکـانی کۆمەڵگـای مەدەنـی حەفتاکـان و دەسـتکەوتەکانی مـودێرنیزەکردنی سـەرخان و ژێرخـانی وڵات، هەموو لـووش ئەدرێن و لەجێی ئەوان داڕووخـانێکی ئـابووری و کـۆمەڵایەتی و فەرهەنگیـی تەواو ڕووئەکـاتە عێـراق. لە ئاسـتێکی تریشدا، کەلێنی چینایەتی زۆر لە جاران زیاتر ئەبێت.

( لەبەرانبەر ٣٢ ملیۆنێر لەساڵی ١٩٥٨ و ١٠٠ لە ساڵی ١٩٦٨ دا ئەو ژمارەیە لە ساڵی ١٩٨٠ دا بەرزئەبێتەوە بۆ ٨٠٠ کەس. بەڵام سەرباری پاشەکشەی ئابووریی سەردەمی شەڕ لەگەڵ ئێراندا، لەسەروبەندی کۆتایی شەڕەکەدا، ژمارەی ملیۆنێرەکانی عێراق ٣٠٠٠ تێئەپەڕێنێت و زۆربەشیان پێکهاتوون لە بەڵێندەرەکانی هۆزی بێجاتی شاری تکریت). حازم صاغیة، سلطة صدام قیاما و حطاما. ص ١٨٢. هەڵتۆقینی ئەو ژمارە زۆرەی ملیۆنێر لە عێراقدا، لەکاتێکدایە کە هەژاریی ڕەها وڕێژەیی (الفقر المطلق والنسبي) گەیشتبوون بە ئاستێکی سەرسووڕهێنەری وا کە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا بێ وێنەبوو.

لە ١٩٨٦ بەدواوە هەموو پرۆژەکانی بیناسازی و پیشەسازیی گەورە و پرۆژەی تری ستراتیجی تووشی وەستان هاتن. ڕژێم دەستی کرد بە پەلەقاژەیەکی دەست وبرد بەڵام کورتبین و کەم کاریگەر لە چەند بواردا:

**یەکەم:** فشارهێنانی زیاتری عێراق بۆ وڵاتانی کەنداو بۆ سەندنی سەرانەی مالی بەتایبەتی کە هێرشەکانی ئێران بۆ سەر فاو و بەسرە، گەر سەربکەوتنایە، ئاسایشی ئەو وڵاتانە بە توونـدی ئەکەوتە بەر مەترسیەوە. عێراق ناوی سوپاکەی نابوو (پاسەوانانی دەروازەی ڕۆژهەڵات – حراس البوابة الشرقیة) کە مەبەستی دەروازەی ڕۆژهەڵاتی "نیشتیمانی عەرەب" بوو و ئەوەش بۆ ئیبتیزازی زیاتری میرنشینە دەوڵەمەندەکانی کەنداو بوو لە ڕووی داراییەوە. صدام هەمیشە ئەو منەتەی بەسەر میرنشینەکانی کەنداودا ئەکرد و ئەیووت گەر عێراق نەبێت ئێوە لە ٢٤ سەعاتدا لەلایەن ئێرانەوە ژێرەوژوور دەکرێن.

**دووەم:** ڕاگرتنی هەموو پرۆژەکانی دەوڵەت و دواخستنی هەموو پەیمانکاری و گرێبەستەکانی عێراق لەگەڵ هەموو کۆمپانیا

جیهانیەکـان بەهـۆی نەبـوونی سـەرمایەی دارایـی پێویسـت بـۆ خەرجکردن لەو بوارانە.
**سـێیەم:** دەرکردنـی یاسـاکانی فرۆشـتنی کەرتە ئـابووریە ناسـتراتیجیەکانی دەوڵەت بە کەرتـی تـایبەت لە گشـت بوارەکـان و سپاردنی تەواوی بازرگـانی دەرەکـی و نـاوخۆیی بە کەرتـی تـایبەت. بەم هەنگـاوەی ڕژێـم جـگە لەوەی کە خـۆی قوتـارئەکرد لە هەمـوو ئەرک و بەرپرسـیاریەک لەو بـوارانەدا، لە هەمـان کاتیشـدا بـنکە و پایگـای کـۆمەڵایەتی و سیاسـی خـۆی لەنـاو چینـی نـاوەنجی کۆمەڵدا بەهێزتـر ئەکـرد و ئـاڵوگۆڕی لە پایگـای ئـابووری سیسـتمی سیاسـیی وولاتـدا بەدی ئەهێنـا. جـگە لەوانەش، ڕژێـم بـۆ ڕاکێشـانی زیـاتری پشـتیوانیی ڕۆژئـاوا و خۆگونجانـدنی زیـاتر لە گەڵ ئەوان، دەستبەرداری ئەو سیاسـەتە ئـابووریە نیمچە سـۆڤیەتیە ئەبـووەوە کە بە مۆدێلی سەرمایەداریی دەوڵەتیی وولاتانی وابەستە ئەناسرایەوە.
وەکوو ڕاهێنان و خۆئامادەکردن بۆ قۆناغی دوای کۆتایی شەڕ لەگەڵ ئێرانـدا، تـا ئەهـات دەزگـای دەوڵەت بە مانـا کلاسـیکیەکەی، شـوێنەوارێکی نەئەمـا و ئەتـوایەوە لە نـاو حیـزب و حیـزبیش لەنـاو حاشـیەی سـەرۆک و ئەوانـیش لەنـاو خـودی سـەرۆکدا. بەو مانـایە ئەرکـی سیسـتمی سیاسـی زیـاتر وزیـاتر چڕئەبـوەوە لە دەزگـای حـوکمڕانی و ئـامرازی سـەرکوتدا و هەمـوو کەرەسـتەکانی تـری دەسـەڵات ئەبـوون بە دیکـۆر بـۆ بەرهەمهێنـانەوەی ئەو بەشـەی دەسـەڵاتی سیاسـی وبە ئەبەدی نیشـاندان وقبووڵانـدنی لای مرۆڤـی عێراقـی. ڕەنگـدانەوەی ئەم ڕاسـتیە بەچەشـنێک تـۆخ ئەبێـتەوە کە تەنـانەت سـەفارەتەکانی عێـراق لە ولاتانـدا بە پێـی ئەم کۆنسـێپت و سـتراتیجیە بونیـاد ئەنـرێنەوە نەک بە پێـی لـۆجیکی نۆرمـاڵی دیبلۆماسیەت و بەوجۆرە سەفارەتەکانیش لە دەرەوە ئەبن بە وەکری سیخوڕی و ڕاوکردنی کەسایەتیە نەیارەکانی ڕژێم لە هەرشـوێنێکی

دونیادا بن، یا بۆ کڕینی ڕۆژنامەنووس و میدیاکار لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و جیهانی.

نابێ ئەو ڕاستیەمان لێ ون ببێت کە مۆدێلی حوکمی شموولی لە عێراقدا، سەرباری ئەوەی کە پەیرەویی لە نموونەی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆسیالیستیی هاوپەیمانی ئەکرد، بەڵام بە مرونەتێکی زۆرەوە گونجێنرابوو لە گەڵ تایبەتمەندی وپێویستیەکانی کۆمەڵگای عێراق و سیستمی سیاسیی ئەم ووڵاتە، بۆیە نزیکایەتیی نوێی عێراق لە گەڵ ئەمریکا نە بە مانای گۆڕان بوو لە بنەماکانی مۆدێلی شموولیی دەسەڵات لە وڵاتدا و نە ئەمریکاش گرفتێکی لەوبارەوە هەبوو یا خوازیاری گۆڕینی ئەو مۆدێلە بوو.

بیری شمولیی بەعس کە صدامی بەرهەم هێنا و هەر خۆشی ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو لە نەشونماکردنیدا، لە ناو کۆمەڵگەی عێراقیشدا زەمینەی کۆمەڵایەتیی باشی هەبوو. کەلتووری عەرەبی–ئیسلامی کە بیر و فەرهەنگی سادەی هەموو خەڵک بوو، زەویەکی بەپیت بوو بۆ نەشونماکردنی ئەو تۆتالیتاریەتە. صدام پێویستی بەوە نەبوو لە سفرەوە و لە بناغەوە زەمینە بۆ سیستمی فکریی تازەی شمولیەت دابمەزرێنێت لەناو خەڵکدا، چونکە ئەو سیستمە زەمینەی باشی لە ئێستا و لە ڕابووردووی کەلتووریی خەڵکی عێراقدا هەبوو. ئەو تەنها ئاراستەکردن و شەن وکەوکردن و لە قاڵبدانەوەی پێویست بوو تا ئەو فەرهەنگە کۆمەڵایەتیە شموولیە (میللیەی) ناو خەڵک مشت و ماڵ بکات و بیخاتە خزمەت پرۆژە سیاسیەکەی خۆی. صدام و بەعس لە هەشتاکاندا لەو کارەدا زۆر سەرکەوتوو بوون.

بەو مانایە شمولیەت لە عێراقدا جگە لەوەی هەندێ لە ئامرازەکانی خۆی لە مۆدێرنیتەوە وەرگرت وبەرهەمی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوایی بوو، بەڵام نیوەکەی تری لە کەلتووری عەرەبی ئیسلامیی بەهێزی ناو خەڵک و کۆمەڵگای عێراقیەوە وەرگرت. ئەوش بۆ خۆی تایبەتمەندیی

سەرەکیی تۆتالیتاریزم بوو لە عێراقی ژێر دەستی صدامدا وهەڵگری هیچ ناکۆکیەکی ناوخۆیی نەبوو.
کۆنترۆڵکردنی بواری ئایدیۆلۆجی ورۆشنبیری، لەپاڵ کۆنترۆڵکردنی کایەی سیاسەت، خەسڵەتێکی سەرەکیی سیستمە شموولیەکانە کە صدام بە چڕ و پڕی لەم قۆناغەدا گەیاندی بە بەرزترین ئاستی خۆی. وەکوو هەموو دەسەڵاتێکی شمولی، صدام باش لەوە تێگەیشتبوو کە سیستمی دیکتاتۆری تەنها بە سەرکووت و داپڵۆسین کاری مەیسەر نابێت و بەبێ مۆنۆپۆلکردن وخۆماڵیکردنی بواری فکر ورۆشنبیری، بەمەرامی خۆی ناگات. مەبەستم لە بواری فکرو ڕۆشنبیری هەموو ڕەهەندە ڕووحی و مەعنەویەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیە بە هەموو ئامرازەکانی تێفکرین ودەق و نووسین و بینین و بیستنەوە. ئارەزووە دیکتاتۆری و تۆتالیتاریانیەکانی صدام تەنها بەوە تێریان نە ئەخوارد کە خەڵکی عێراق ژێردەستە بکات بە چەشنێک کە مانەوەی دەسەڵاتەکەی مسۆگەر بکات، بەڵکوو ئەو ئەیویست کە خەڵک دەسبەرداری هەموو خەون و خولیایەکی گۆڕانی سیستمی سیاسیش ببن و سەرلەنوێ ئاوی تۆبەی یەکجاری بکرێت بە سەریاندا و هۆشیاریی تاکی عێراقی لە بنەڕەتەوە فۆرمات بکاتەوە. ئەو بۆ ئەو مەبەستە تەنانەت دەستی دایە پرۆژەی نووسینەوەی مێژوو بۆ خزمەت بە پرۆژە سیاسیەکەی خۆی و بۆ نموونە فەرمانی دا کە لەسەر هەموو خشتێکی دیوارەکانی بابل ناوی خۆی بە بچووکی هەڵبکەنن.
صدام و حاشیە دەسەڵاتدارەکەی دەوروبەری جیاواز بوون لە حاشیە سیاسیەکەی سەردەمی هیتلەر. ئەوانەی دەوروخولی هیتلەر پێیان وابوو کە (هەرکە گوێم لە وشەی ڕۆشنبیری ئەبێ خۆبەخۆ دەست بۆ دەمانچەکەم ئەبەم). لەسەردەمی سەرەتای دەسەڵاتی نازیەتدا کایەی ڕۆشنبیری بواری لاوازی دەسەڵات و ژینگەی بەهێزی ئۆپۆزیسیۆن بوو. صدام لەهەشتاکانی عێراقدا لەگەڵ

دیاردەیەکی لەو چەشنە ڕووبەڕوو نەبوو. دەسەڵاتدارەتیی صدام، بەهۆی خەسڵەتە تایبەتیەکانی عێراقەوە، بە پێچەوانەوە، دەستی دایە گەورەترین پرۆژەی ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری. صدام بڕوای وابوو کە ڕۆشنبیری لەو بارودۆخەی ئەوسای عێراقدا ئەتوانێت، لەپاڵ ئامرازی سەرکوت و داپڵۆسیندا، ببێت بەکۆڵەکەیەکی تری مانەوەی دەسەڵاتەکەی. ئەو بە نیازی داڕشتنەوە و فۆرمۆلەکردنی شوناسێکی نوێ بوو بۆ عێراق. ئاخر لە ڕاستیشدا هەر وابوو، چونکە ڕۆشنبیریی بە مانا بەعسی – صدامیەکەی بەتەواوی بووبوو بە ئامرازێکی سەرکوتگەر کە ڕۆڵی کەمتر نەبوو لە دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات. نموونەکانی ئەدەبی قادسیەی صدام و گۆرانی و سروودی شەڕ وشانۆگەریەکانی ئەو قۆناغە و فێستیڤاڵەکانی مەربەد و هەموو جموجۆڵی کەلتووری و ڕۆشنبیری عێراق بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی هەشتاکاندا، ڕێک ڕۆڵێکی ڕووحی و مەعنەوی گەورەیان ئەگێرا لە بواری ڕووخاندن، تەپاندن، گێلکردن و گەوجاندن، بێزارکردن و هەراسان کردن، دەستەمۆکردن و ڕامکردن، بێ ئومێدکردن و بە کورتی تێکدان و شێواندن و سەر لەنوێ بنیاتنانەوەی سایکۆلۆجیی تاکی عێراقی. صدام لەم بوارەدا ئەو قسەیەی میشیل عەفلەقی پیادە دەکرد کە وتبووی (بەها ڕووحیەکان بنەمان بۆ هەموو شتێک. پاڵنەری ڕووحی، نەک کۆنترۆڵی ماددە دەکات، بەڵکوو دەیخوڵقێنێت).

ناوەڕۆکی ڕۆشنبیری و ژیانی ڕووحی و مەعنەویش، بەپێی ئەو پێویستیە سیاسیە ئاڵوگۆڕی زۆری بەسەرداهات و بگرە لە بنەڕەتەوە گۆڕا. قۆناغی شەڕ باشترین فرسەت بوو بۆ ئەنجامدانی ئەم ئاڵوگۆڕە لە لایەن صدام وحاشیەکەیەوە. ئیتر پیاهەڵدان و بە بتکردن و فیتیشکردنی سەرکردە ئەویش بەومانا گشتیە نا، بەڵکوو یەک سەرکردە کە ئەویش صدامە، بوو بەئەرک و ناوەڕۆکی ئیشی نووسەر و بەرهەمهێنی بەها کەلتووریەکانی وڵات. پیاهەڵدان بەشەڕ

و کوشتار و ئازایەتی و نەبەردی و بازووی تاکی سەربازی عێراقی، سەربازێک کە خۆی لە خۆیدا شتێک نیە جگە لە بەرجەستەبوونەوە و (تقمص) ڕووحی سەرکردە، بوو بە ڕیتمی باوی ئایدیۆلۆجیا ورۆشنبیریی عێراقی ژێر دەسەڵاتی صدام. نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە گووتاری ئایدیۆلۆجیی بەعسی صدامی لەم سەردەمەدا وەرچەرخانێکی نوێی بەسەردا دێت. لە جیاتی خۆبەستنەوە بە گووتاری تەسکی جارانی ناسیونالیستی و پان عەربیی بەعس، لەم قۆناغەدا صدام پێداگریی زیاتر لەسەر مێژووی عێراق و سەروەریەکانی ئەم وڵاتە و سەرکردەکانی وەکو نەبووخوزنەسر ئەکات وتاڕادەیەک خۆی دوورئەگرێت لە وتاری پر لە عەنتەریاتی نەتەوەیی عەرەبیی جاران.

پرۆسەی چڕبوونەوەی هاوکات وتەریبیی هەردوو دەزگای سەرکوت و ئایدیۆلۆجی وگۆرانیان بە دوانەیەکی لە یەک دانەبڕاو لە دوای جێگیربوونی صدام لە کورسیی سەرک کۆماریدا، لە کۆتایی هەشتاکاندا دەگاتە چڵەپۆپە و تەواوکەری یەک. لێرەدایە کە سەرکوت ئەبێ بە ئایدیۆلۆجیا و شوناسێکی خودیی دەسەڵات و ئایدۆیۆلۆجیاش لە جیاتی پۆتانسیێلە مەعریفی و عەقڵانیەکەی ئەبێ بە ئامرازێکی تری سەرکوت تا وای لێ دێت "سەرۆک" خۆشی ئەبێ بە ڕۆماننووس و خەونەکانی خۆی لە ڕۆمانی (زبیبة والملک) دا دائەڕیژێت. گشت ئەمەش لە کاتێکدایە کە چینی ناوەندیی زادەی ماوەی کورتخایەنی حەفتاکان کە میراتگری پرۆژە ڕینیسانسەکەی شەستەکانی عێراق بوو، لەژێر پۆستاڵی شەڕی ئێران – عێراق و دیکتاتۆریەتی ڕژێمدا، ئەپلیشێتەوە.

داتەپینی کایەی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی لە عێراقی کۆتایی هەشتاکاندا، لە پرۆسەیەکی خێرادا ڕەوتی سەرەو لێژبوونی بە ئاکام ئەگات. ڕۆشنبیریەکی بێ ناوەڕۆک، خاڵی لە هەر بەهایەکی ستاتیکی، دوور لەهەموو زام و ئازار و خەونەکانی خەڵک، خاوەنی ناوەڕۆکێکی

شەڕئەنگێز و توونـدڕەو، داپۆشـراو بە فۆرمێکی ڕووکەش و بەدەر لە هەر بەهایەکی مرۆیی، هـەژموون ئەکات بە سـەر کایەی ڕۆشـنبیریدا. بە کـورتیەکەی لە سـایەی ئەو بـارودۆخە سیاسـیەی وڵاتـدا ڕەوتێکـی ڕۆشـــنبیریی ڕەش و ڕووکەش پەرەئەســـێنێت کە چـــڕ ئەبێـــتەوە لە دەوری پیاهەڵـدان بە بەهاکـانی خێـڵ و تـایەفە و شـەڕ و کوشـتار و شـانازی بە ژمـارەی "شـەهید"ەوە، واتە ڕۆشـنبیرییەک کە کەسـایەتیی کڕنـۆش بەر و ماسـتاوچی و کـۆیلە و خـوڵامی سـەرکردە ئەکـات بە نمـوونەی پـالەوان و تـاکی عێراقـی ئەم سـەردەمە. نمـوونەی ئەم کارەسـاتە فەرهەنگـیە بەجـۆرێکە کە لە کۆتـایی هەشـتاکاندا خـانەی کاروباری ڕۆشنبیری گشـتی کە دامەزراوەیەکـی سـەرەکیی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری و ڕاگەیانـدنە، "پرۆژەیەکـی گەورەی فکـری" بڵاوئەکـاتەوە کە بـــریتیە لە ئینســـیکلۆپیدیایەکی گەورەی ١٩ جلـــدی ســـەبارەت بە "فکر"ی صدام حسین!

بەراوردکاریەکی سادەی نێوان دیواربەندی ئازادی (نصب الحريـة) کە دەستکردی جەواد سـەلیمە و بەرهـەمـی ژیـانی ڕۆشـنبیریی سـەردەمی دوای ١٤ ی تەمـووزی ١٩٥٨ە، لە گەڵ (قـوس النصـر)ی محمـد غنـي حکمـت وخالـد الرحالـدا کە بـۆ ستایشـکردنی شـەڕ لەگەڵ ئێرانـدا دروسـتکرا، جیـاوازیی گەورەی نـاوەڕۆک و بەهـا ڕۆشـنبیریەکانی ئەو دوو قۆناغەی کۆمەڵگای عێراقمان بەئاسانی بۆ دەرئەخات.

لەکاتێکدا (نصـب الحريـة) کـۆی پیکهاتەکـانی گەلـی عێـراق و خەبـاتی ئەوان بـۆ ئـازادی ئەکـا بە تێمـی سـەرکیی خـۆی لە چوارچێـوەیەکی ستاتیکیی بەرزدا، (قـوس النصـر) جگە لەوەی خـاوەنی هـیچ بەهـایەکی هـونەریی جـوان نـیە، سـیمبولی خواوەنـدی شـەڕ و مـاڵوێرانی ئەو سـەردەمەی عێـراق، واتە صـدام حسـینە، و ئەو ئەکـات بە نمـوونەی ئیلهام و ئایندە و پیرۆزترین بەهای مەعنەوی.

لەم قۆنـاغەدا کە مـن نـاوم نـاوە قۆنـاغی دەسـەڵاتی شـموولی بەو تایبەتمەندیانەوە کە لە چەند جێدا ئاماژەم پێداون، تیۆریی دەسەڵاتیش

به گشتی ئەگۆڕێت و ئیتر شەرعیەتی سیاسیی دەسەڵات لە یەک مانای تاقانەی تەسکدا کورت ئەکرێتەوە: کۆنترۆڵکردنی وڵات و سەپاندنی ئارەزووەکانی سەرکردە و بنیاتنەری عێراق کە صدام حسێنە و هیچی تر. بەو مانایە نە (وحدة، حرية، اشتراكية) نە شیعارە ناسیونالیستیە بریق و باقەکانی سەردەمی ١٩٦٨ – ١٩٧٩ جێگەی یەکەمیان نامێنێ وەکوو سەرچاوەی شەرعیەتی دەسەڵاتی سیاسی لە عێراقی ژێر دەسەڵاتی صدام حسێندا.

هەموو ئەوانەی لەمەوپیش ئاماژەیان پێدرا لەو ڕاستیە کەم ناکەنەوە کە صدام حسێن ڕۆڵەی شەرعی بەعس بوو و لە منداڵدانی ئەوەوە کەوتەوە. بەو تایبەتمەندیانەی بەعس لەو سەردەم و شوێنەدا، چاوەڕوانی ئەوەی حیزبی ناوبراو ئاراستە و چارەنووسێکی جیاواز لەوەی هەبێ کە دەسەڵاتی صدام نمایشی کرد، وەهمێکە و هیچی تر.

هەموو ئەم ئالوگۆڕە ناوخۆییانەی عێراقیش هاوکات بوون لە گەڵ دوایین قۆناغەکانی شەڕی سارد کە تیایدا ئۆردووگای سۆسیالیستی کەوتبووە قۆناغی کۆماوە. لە ئاستی جیهانیشدا، وەکوو دەساڵ دواتر دەرکەوت، کۆتایی هەشتاکان بەڕاستی بوو بە سەردەمی پێچرانەوەی لاپەڕەی حەکایەتە گەورەکان (السرديات الكبرى The Grand Narratives) کە مارکسیزم یەکێک لە بەهێزترین ئەو حەکایەتانە بوو.

ماشینە ئایدیۆلۆجیەکەی ڕژێمەکەی صدام زۆر بەووردی تاقیبی ئەو ئاڵوگۆڕ و جێگۆڕکێیەی سیستمی جیهانیی ئەو سەردەمەیان ئەکرد، بەڵام لە خوێندنەوەیاندا بۆ ئەو گۆڕانکاریانە تووشی هەڵەی کوشندە بوون. ئەوان پێیان وابوو کە پاشەکشە و تەسلیمبوونی گۆرباشۆف لەبەرانبەر ئەمریکادا بواری جووڵە و مانۆر بۆ صدام خۆش دەکەن. لە ماوەی ٨ ساڵی شەڕدا ڕژێم بەتەواوی بایدابوەوە بەرەو لای ئەمریکا و ڕۆژئاوا. بەڕاستیش ڕژێمەکەی صدام ڕۆڵی گەورەی بینی لە پێشگرتن بە تەشەنەی ئوسوڵگەرایی ئیسلامی ئێرانی و لای وابوو کە بە تەنها ئەوە پاسەپۆرتی چوونە ناو سیستمی نوێی جیهانیی پێ

ئەدا و ئەمریکــا پاداشــتی گەورەی ئەداتەوە و چاوپۆشــیی لە هــەر فراوانخوازیەکی ناوچەیی ئەو ئەکات.

جگە لەوەش صدام و دەوروبەرەکەی خوێندنەوەیان بۆ نەزمی نوێی جیهانی وابوو کە بەنەمانی سۆڤیەت حیکمەتی هەژموونیی ئەمریکاش لەق ئەبێ و ئەورووپا دەبێ بە جەمسەرێکی بەهێز و سەربەخۆ و ئەمانیش گەر دەرگای ئەمریکایان بە ڕوودا دابخرێت ئەوە دۆستە فەرەنسی و ئەڵمانیەکانیان دەرگایان بەڕوودا ئەکەنەوە. تەنها صدام تووشی ئەو وەهمە نەبوو، بگرە ئێمەی کۆمۆنیستیش لەم بوارەدا بە جۆرێکی تر تووشی هەمان وەهم بووین و مەنسوور حیکمەت پێداگریی زۆری لەسەر ئەو تێزە ئەکرد کە پێی وابوو قۆناغی داهاتوو ئەبێ بە قۆناغی چوونە ژێرپرسیاری هەژموونیی ئەمریکا وەکوو تاقە زلهێزی جیهانی. ئەو لە لێکدانەوەیدا پێیوابوو کە ئەم شکستەی بلۆکی سۆڤیەتی دەرگا ئەکاتەوە بۆ پەرەسەندنی خەباتی چینی کرێکار لە سەنتەرە ئەسڵیەکانی سەرمایەداری لە ڕۆژئاوادا.

ئەو خوێندنەوە نادروستەی ماشینە ئایدیۆلۆجیەکەی ڕژێم ڕۆڵی گرنگی بینی لەوەی صدام تووشی ئەو وەهمە بکات کە دەتوانێت بەئاسانی کوەیت داگیر بکات و بۆ تەشەنە نەکردنی ئاژاوە و لە ترسی خوڵقانی کارەساتی گەورەتر لە ناوچەی هەستیار و ستراتیجیی نەوتاویی کەنداودا، هەموو دونیا چاوپۆشی لێ ئەکەن و ناچار ئەبن کە لە گەڵیدا هەڵکەن.

هەرچی هێزە سیاسیەکانی بزووتنەوەی ناسیونالیستیە لە کوردستانی عێراقدا، ئەوان هیچ حسابێکیان نە بۆ ئەو ئاڵوگۆرە قووڵانەی عێراق و نە بۆ هەرەسهێنانی بلۆکی سۆڤیەت ئەکرد.

سەبارەت بە عێراق وتاری سیاسی و ئایدیۆلۆجیی هێزەکانی بزووتنەوەی ناسیونالیستیی کورد لەسەر ڕەوتی جارانی خۆی بەردەوام بوو. وتارێک کە پڕ بوو لە موفرەداتی سۆزداریی ڕووکەشی بێ ناوەڕۆک و خولانەوە بەدەوری تەشهیر بە

دیکتـــاتۆریەت و "ڕەفتـــار فاشـــی"بوونی بەعـــس و صـــدام. ئەوان خوێندنەوەیەکیان نەبوو بۆ ئەو عێراقەی کە خەریکە لەناو خۆڵەمیشی ئـاگری شـەڕی عێـراق – ئێـران و هەژمـوونیی صـدام حسـێنەوە، سـەرلەنوێ و بە تەرزێکـی جیـاواز لەدایـک ئەبێـتەوە. ئەم هێـزانە ئەم قۆناغەی شەڕیان لە ڕوانگەی عێراقەوە بەو مانایە دەرک پێ نەئەکرد کە ڕاهێنانێکە بۆ قۆناغی پێناسەکردنەوە وبەرهەمهێنانەوەی سیستمی سیاســـی و فەرمانڕەوایـــەتی لەم ســـەردەمە تـــازەیەدا بە پێـــی پیویســـتیەکانی سیســـتمێکی دەســـەڵاتداریێتیی ڕەهـــای (شـــمولی)ی سەرکردەی تاقانە لە بارودۆخێکی نوێی نـاوچەیی و جیهانیدا. هەمـوو خیتابی سیاسیی ئەو هێزە کوردیانە چەقی بەستبوو لەسـەر بەدخـویی و دڕنـدە خـویی صـدام و هیچـی تـر. ئەم هێـزانە بە وەسـتانی شـەڕ لەگەڵ ئێرانـدا غـافڵگیر ئەبـن و ئیتـر ئەو وەهمەیـان سـەبارەت بە سـەرکەوتنی ئێـران و سـتراتیجیەتی هاوپەیمـانی لە گەڵ ئەو وڵاتەدا دەبێ بە بڵقـی سـەرئاو و هێزەکەشـیان ئەبێ بە ئـاردی نـاودڕکی ئەو وەهمەی خۆیان.

سەبارەت بە بارودۆخی جیهانیش ئەمان تووشـی هەمـان بی ئاسـۆیی ئەبن.

هێزەکـانی بـزووتنەوەی کـوردایەتی لە عێراقـدا، خـاوەنی روئیـایەکی ستراتیجی نەبوون سەبارەت بە سیسـتمی هـاوچەرخی جیهـانی. ئەوان هەمیشـــە لە دەروازەی وابەســـتەیی بـــۆ دەوڵەتێـــک یـــا دەوڵەتـــانی نـاوچەکەوە، ئەویـش لە جێ وشـوێنێکی زۆر لاوازەوە، ڕوانیویـانە بـۆ هاوکێشە جیۆپۆلیتیکیە ناوچەیی و جیهانیەکان. وابەستەیی بۆ مۆسـاد یـا سـاواک یـا میـت یـا فەیلەقـی قـودس و ڕەمەزان دوایـین خـاڵی دووربینیی ئەوان بووە لە کرداردا.

لای ئەمـــان ئەو بـــوومەلەرزە جیهـــانیەی کە بەناوبـــانگە بە شکســـتی سۆسـیالیزم و ئۆردووگـای سـۆڤیەت، ئەوە ناهێنێـت نامیلکەیەکیشـی لەسەر بنووسن. خەسڵەتی چریکی و عەسکەرتاریەت بەچەشنێک زاڵە

بەسەر ئەنگیزەی سیاسەتکردن لای ئەمان کە هەموو مەسەلەیەکی فکری و سیاسی تەنها لەو کڵاورۆژنە تەسکەوە دەبینن. ئەمان ئامادەن تفەنگەکانیان لەم شانەوە بگوێزنەوە بۆ ئەو شان و سەرباری ئیدیعای سۆسیالیست بوون و شۆڕشگێڕبوون، ئەو چەکانە بخەنە خزمەتی هەر دەوڵەت و لایەنێکەوە کە ئامادە بێت لایەکیان لێ بکاتەوە.

هەموو هێزەکانی بزووتنەوەی کوردی کە لەبەرەی کوردستانیدا کۆببوونەوە، دووبارە لە ئێران بوونەوە بە ئاوارە و چاوەخواری (قەرارگای ڕەمەزان) ولەولاشەوە چاوەڕوانی ئەوەیان بوو کە ڕژێمی عێراق لایەکیان لێ بکاتەوە.

حەماقەتی صدام و لەشکرکێشیی ساویلکانەی بۆسەر کوەیت دەرگای بەختی بەسەر ئەم بزووتنەوە سیاسی – چەکداریە پەراوێزخراوەی دوای ئەنفالەکان ئەکاتەوە و لەو کاتەدا کە پەیوەست ئەبن بە بەرەی شەڕی ئەمریکا بۆ ڕزگارکردنی کوەیت وەکوو داشێکی لۆکاڵی بەدەستی ئەمریکاوە، لە هەمان کاتدا سەنگەریان لە میحوەری ئێرانەوە ئەگوازنەوە و لەو وابەستەییە ڕزگاریان ئەبێ و هەروەکوو پیشەی هەمیشەییان پەیوەست ئەبن بە بەرەیەکی نوێوە.

## ئەی چەپ چی کارە بوو؟

تـا داگیرکردنـی کوەیت لەلایەن صـدامەوە، چەپ هـیچ جموجـۆڵێکی لە ئاستی گشتیدا نەبوو.

مـــــاوەی ١٩٨٦ – ١٩٨٨ لە ئاســـــتی کوردســـــتاندا بە قۆنـــــاغی توونـدبوونەوەی هێرشـی ڕژێـم بـۆ سـەر کوردسـتان وپاشەکشـەی هەموو شێوازەکانی بەرگری دەناسرێت. بەئاشـکرا دیـاربوو کە بەعس پلانی جینۆسایدی لە کوردستاندا بەدەستەوەیە، بەڵام بەهۆی درێـژەی شــەڕ لەگەڵ ئێرانـدا، چـاوی دونیـای لەسـەرە وتەنهـا چـاوەڕوانی فرسەتی گونجاوە بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانەی.

ســـەرباری قووڵبــوونەوەی بــارودۆخی کــۆمەڵایەتی و سیاســـی لە کوردسـتاندا بـزووتنەوەی کۆمۆنیستی کەوتبـووە قۆنـاغی متبـوونەوە. جگە لە دەرکردنـی بەیاننـامەیەک لە سـاڵێکدا یـا وەرگێڕانـی بـابەتێکی حیزبی کۆمۆنیسـتی ئێران یا دەرکردنـی نـامیلکە یـا وتارێـک، گـرووپە کۆمۆنیستەکان دەرکەوتنێکی تریان لە ئاستی کۆمەڵدا نەبوو.

سەرەتای ١٩٨٨ ڕەوتی کۆمۆنیست و دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریـا پێموابێ سێ نامیلکەیان درەکرد کە بایەخێکی سیاسـیی گشـتیی نەبـوو و زیـاتر لە بەیەکـا هەڵپـژان ئەچـوو تـا گفتوگـۆیەکی فکـری لەسـەر بابەتەکـانی جەدەلەکە. ئەو نامیلکـانە لە ڕواڵەتـدا و بەنـاو دەربـارەی بەرنـامە بـوون، بەڵام لە چوارچێـوەی قسـەی گشـتی و خـولانەوە بەدەوری هەنـدێ مەقـولاتی گشـتیی وەکـو (عـام و خـاص و خـاص و عام) دا گیریان خواردبوو و کۆمەکیـان نەئەکرد بە ڕۆشـن بـوونەوەی هیچ گرێیەکی فکری یا سیاسیی کۆمەڵگا و بزووتنەوەکە.

سەرباری پەرەسەندنی دیکتاتۆریەت و بەردەوامیی شەڕ و هێرشی سیستماتیکی ڕژێمی ئەوکات بۆ سەر ژیان و گوزەرانی خەڵک لە لایەکەوە، و درێژەی ستەمی نەتەوایەتی تا ئەندازەی جینۆساید لەلایەکی ترەوە، لە ئاستی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا بۆشاییەکی سیاسی و پراتیکیی گەورە درێژەی هەبوو. ئەوەش لە کات و سەردەمێکدا بوو کە نەفرەت و بێزاریی خەڵک لە ڕژێم گەیشتبوو بە ئاستێکی بەرز.

ئەم بزووتنەوەیە نە لە ڕووی سیاسی وئەدەبیەوە، یانی ڕەخنە و پەردە هەڵماڵین لەسەر ناوەڕۆکی ئەو سیاسەتە ترسناکانەی ڕژێم و دیاری کردنی چوارچێوەیەکی سیاسی و تەکتیکی وفۆرمۆلەکردنی شیعار و داخوازیەکانی خەلک لە مەیدانە جیاجیاکانی خەباتدا (تەنها بە نووسین)، و نە لە بواری ڕابەرایەتی کردن ورێنوێنی کردن و بەشداری کردنی بەکردەوە لەو نارەزایەتیانەدا، سادەترین ڕۆڵی نەبوو. بزووتنەوەی کۆمۆنیستی تەنانەت یەک هەنگاویشی نەنا بەرانبەر بە کارەساتی ئەنفال یا کیمیابارانی هەڵەبجە و دێهاتەکان و خاپوورکردنی سەرتاپای کوردستان. جگە لەوەش لە بواری ڕێکخستنی خەڵک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەموو ستەم و زوڵمەی دەرهەقیان پیادە ئەکرێ، بەهەمان شێوە ئەم بزووتنەوەیە، بە تەواوی ئیفلیج و لە کۆمادا بوو.

لە ئاستی سەروساماندان و یەکخستنی ڕیزی کۆمۆنیستەکان و بنیاتنانی ڕێکخراوەیەکی سەرتاسەریی تێکۆشەری سیاسیش کە ئەو ئەرکانەی پێشوو ئەنجام بدات، بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بەهەمان شێوە ئیفلیج و داماو بوو.

ئەگەرچی بەشی ڕێکخراوی ئەو بزووتنەوەیە بەرجەستە ئەبوەوە لە ٣ ڕێکخراو یا گرووپدا کە بریتی بوون لە (ڕەوتی کۆمۆنیست) و (دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریا) و (بڵێسە)، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە خاوەنی هێز و پۆتانسیلێکی بەهێز و فراوانتر بوو. ئاستی ناتەبایی و

سیکتاریزم لە نێوان ئەم گرووپانە بە ڕادەیەک بوو کە ئامادە نەبوون سەربارى ئەو بارودۆخەى پێشوو سادەترین ڕایەڵ و پۆ و پەیوەندیی هاوبەش (هێشتا نەمووتووە خەباتى هاوبەش و دانانى بەرنامە و پلانى کارى هاوبەش) و هاوئاهەنگى لە ئاستێکى زۆر نزمیشدا بکەن. ڕەنگ بێ نەوەى نوێ و کەسانێک کە ئەوکاتە لە تەمەنى هۆشیارى فکرى وسیاسیدا نەبووبێتن ئێستا لایان سەیر بێ کە بڵێم، لەهەموو ئەو قۆناغەى ١٩٨٤ – ١٩٩١ دا تەنانەت یەک پەیوەندى، یەکتر بینین، نامە گۆڕینەوە یا مەشورەتێک لە نێوان لایەنە جیاوازەکانى ئەوەى پێى ئەڵین بزووتنەوەى کۆمۆنیستیدا ڕووى نەداوە، جگە لەو پەیوەندیە تاکە کەسیەى بەڕێکەوت هەبوو لەنێوان هاوڕێیانێکى بلێسە و حەیدەر هیدایەتدا کە کەسایەتیەکى ڕابەریى دەستەى پێشڕەوانى پرۆلیتاریا بوو.
ڕەنگ بێ کەسانێک هەبن پەرەسەندنى دیکتاتۆریەت بکەن بە بیانوو بۆ بوون و درێژەى ئەو دیاردە نێگەتیڤە، بەڵام هەر هێزە سیاسیەکانى سەر بە بزووتنەوەکانى تر لە هەمان بارودۆخدا پلان و بەرنامەى هاوکارى و هاوئاهەنگیی نێوان خۆیان پەک نەدەخست و نموونەش زۆرە و بەرەى کوردستانیش ڕێک لەو کاتەدا پێکهات و بەتاقیکردنەوەیەکى سەرکەوتوو ئەژمێردرێ لە ڕوانگەى هێزە پێکهێنەرەکانیەوە.
بەڕاى من ڕێگرى سەرەکى لەو بارەوە بریتى بوو لە خەسڵەتى گرووهى و سیکتاریستى و گۆشەگیرى و گیانى هەیمەنەپەرستیى بەهێزى ناو کۆمۆنیستەکان، کە کۆسپى سەرەکى بوو لەو بوارەدا.
لەڕووى سیاسیشەوە کۆمۆنیستەکانى کوردستانى عێراق بەهەموو باڵ و لایەنەکانیانەوە تووشى دەرد و پەتایەکى سەیر و دەگمەن هاتبوون کە لە کەم شوێنى دونیادا بەو زەقیە بەرچاو ئەکەوێت.
ئەوان خەبات لە دژى ڕژێم وتێکۆشان بۆ ڕووخاندنى ڕژێمیان بە چاوێکى کەم تەماشا ئەکرد و دەیان کرد بەجێى ناوناتۆرە و

مەخسەرە و گاڵتە پێ کردن و بەتەوسەوە ناویان نابوو (دژە ڕژێمی یا دژە حکوومەت) بەو مانایەی کە گوایە ئەوان تەنها ڕووخاندنی ڕژێم بە کەم ئەزانن و بە نیازن سەرجەم بونیادی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و فەرهەنگی سەرجم کۆمەڵ بڕووخێنن. ئەم دەرکە ناتەبا بوو لە گەڵ سادەترین لۆجیکی سیاسی. کۆمۆنیستەکان (بە ئێستاشەوە) و لە کاتێکدا توانای ڕێکخستنی نارەزایەتییەکی جەماوەرییان لە ئاستی شارۆچکەیەکی بچووک وگەڕەکێکیشدا نەبوو، بەبیانووی ئەوەی خەبات بۆ ڕووخاندنی سەرمایەداری و سەرجەم سیستمی کۆمەڵایەتی ناوەڕۆکی ئەرکی کۆمۆنیستی پێکدێنێت، ڕوویان وەردەگێڕا لە هەموو شێوازەکانی خەباتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بەتایبەتی خەبات بۆ پاشەکشەپێکردنی ڕژێم لە بوارێک یا لە چەند بوارێکدا و تا ئاستی ڕووخاندنی ئەم ڕژێمە کە لەو سەردەم و کاتەدا پارێزەری سیستمی چەوسانەوە و ستەمی سەرمایەداری و ماتۆڕی بەرهەمهێنانەوەی ئەو سیستمەیە. جگە لەوەش ڕووخاندنی ڕژێم ئەوکاتە دروشمی سەرەکی و ئامانجی یەکەمی خەڵک بوو. لە هیچ سەردەم و کاتێکدا شتێک نیە بەڕووتکراوەیی و پاککراوی و دابڕاو ناوی خەباتی چینایەتیی دژ بەسەرمایەداری بێت. ئەو خەباتە لە بوار و کەناڵە جیاجیا سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکان و لە شێوازی خەبات بۆ نان و خزمەتگوزاری و ئازادیی سیاسی و باشترکردنی گوزەران و ڕێگری لە پێشێلکردنی مافی ژنان یا قوتابیان یا لاوان یا جیاوازیکردن وستەم لەژێر پەردەی ئاین و نەتەوە و دەیان شێوازی جۆراوجۆر و ئاڵۆزدا، خۆیان دەرئەخەن. جگە لەوە خەباتی دژی ڕژێم نەک هەر ناکۆکی نیە لە گەڵ خەباتی گشتیی لەو جۆرەدا بەڵکوو خزمەتی پێ ئەکا و هێزی ڕابەری ئەو خەباتەش دەکا بەخاوەنی پایگا و ناوبانگی پێویست بۆ ئەنجامدانی.

لەو هەلومەرجەدا کە باسی دەکەم واتە نیوەی دووەمی هەشتاکان، بەهۆی تایبەتمەندیەکانی بارودۆخی ناوخۆیی عێراق و سیاسەتەکانی ڕژێمەوە، پاشەکشە پێکردن، پووچەڵکردن، بەپەرچدانەوەی ئەو سیاسەتانە (هەر ناوێکی تری لێ ئەنێیت) و گردکردنەوەی هەموو جۆگەکانی مەیدانە جیاوازەکانی خەباتی خەڵکی عێراق وپارێزگاری لە سەربەخۆیی ئەو خەباتە، و کۆکردنەوەیان لە ڕەوتێکی هاوبەشدا، مەسەلەی سەرەکیی کۆمەڵگای عێراق بوو و بەو پێ یەش ئەرکی دەسبەجێ وسەرەکیی کۆمۆنیستەکان بوو، کە نەک لە کردەوەدا هیچیان نەدەکرد بەڵکوو نەشیان ئەخستە بەرنامەی کاری خۆشیانەوە.

یەکێک لە هۆیە سەرەکیەکانی تووشبوونی کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراق بەم پەتایە، تێز و ڕوانگە سیاسیەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و ڕادیکالیزمە لە دونیا دابڕاوەکەی ئەوان بوو، کە ئێمە بەتەواوی مەفتوونی بووبووین. سەیرتر لەوەش ئەوەبوو کۆمۆنیستەکانی کوردستان عێراق زۆر لە دۆستە ئێرانیەکانیان ڕادیکالتر بوون لە پێشوازی کردن و هەڵگرتنی ئەو تێزانە وتەنانەت ململانێیەکی زۆریشیان لەناو خۆیاندا ئەکرد بۆ نیشاندان و سەلماندنی ئەوەی کێ ڕادیکالترە لە بواری هەزمکردن و تێگەیشتنی "قووڵتر" لەو تێزە سیاسیانە. تا ئەو جێیەش کە من ئاگاداربم ئەم دیدگا سەروو کۆمەڵایەتی و بێ پەیوەندە بە واقیعی ولات و سەردەمەکەوە، کە جێگەیەکی پایەدار وبڵاوی هەبوو لە ناو کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراقدا، یەکجاریش نەبوو بە جێی سەرنج و ڕەخنەی هاوڕێکانیان لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا.

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە کە سەرەڕای ئەو پێداگریە بەهێزەی کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراق و بەتایبەتی (ڕەوتی کۆمۆنیست) لە سەر گرنگی وبایەخدان و سەرقاڵی بە تیۆریەوە، تا ئێستا یەک لاپەڕە دەسکەوتی تیۆریشی لێ شین نەبووە.

بەڵام ڕیشــەی فکریـی ئەم دەرکە لـنگەو قـووچە یەک شـت بـوو: بـێ توانـایی لە تێگەیشـتنی پەیوەنـدیی دیـالەکتیکیی نێـوان حـاڵەتی دڵخـواز (مطلــوب) لەگەڵ حــاڵەتی شــیاو یــا کردەنــی (ممکــن)دا. ئەو دیــدگا ڕۆمانسیە شۆڕشگێڕە هەمیشە حاڵەتی یەکەم واتە دڵخواز – مطلوب ئەکا بە قیبلەنمای جووڵەو و چالاکیی خۆی. بەو پێ یەش لە پیشـەوە خۆی چەک ئەکا ودەستی خۆی ئەبەستێ لەوەی کە بتوانێ ببێت بە هێزێکی کاریگەر و ئاڵوگۆڕبەخش وخاوەن پایگا لەناو خەڵکدا.

لە بارودۆخێکدا کە خەڵک ڕۆژانە دەرگیری ململانێ وخەباتە بۆ مـاف و داخـوازیی واقیعیـی خـۆی، ئەو مـاف و داخوازیـانەی کە لە حـاڵەتی سروشـتیی ژیـانی سیاسـی و کـۆمەڵایەتی و ئـابووریی گەشــەی ئەو قۆنــاغەی کۆمەڵگــاوە ســەرچاوەیان گرتــووە، نەک زادەی خەیــاڵ و دۆگما و یۆتۆپیەکان بن، لەوکاتدا تێکۆشەرە کۆمۆنیستەکان سـەرقاڵی کەشف کردنی ڕادیکالترین ڤێرژنی (نوسخە) تیـۆرین. ئەوە وا ئەکا کە چارەنووسـی کۆمەڵگا لە شـوێنێک دیـاری ئەکرێ وپـلانە تیۆریەکـانی چەپـیش لە شـوێن و جێگـایەکی تـردا واتە تەنهـا لە مێشـکی ئەمانـدا، ســـەوڵ لـــێ ئەدەن. ســــەرەنجامی ئەو دیـــدگا و میتـــۆدەش بـــۆ سیاســەتکردن شــتێک نــابێ جـگە لە خــۆچەککردن و خــۆڕەتکردنەوە وتەریک کەوتن و گۆشەگیریی زیاتر.

ئەو میتـۆدە بـۆ سیاســەتکردن نەک ترسـناک بەڵکـوو کوشـندە و لە ئاستی خۆکوژیی سیاسیدایە. هێز و ڕێکخـراوی سیاسـی بە بڕیارنـامە و دەرکردنی فەرمانی (ئەبێ ٣٥ سەعات کار دەسبەجێ پیادەبکرێ) و نــابێ فـلانە شــت بکـرێ، هـیچ بەهـیچ ناکـات و ئەو (بڕیـار نـامە) و (قەتعنـامە) و (مەحکوم) کردنـانە تەنهـا ئەرشـیفی ڕێکخـراوەکە قەبەتـر ئەکەن و هیچی تر.

ئەمەوێ بگەڕێـمەوە و دیسـانەوە بڵـێم کە پەیوەنـدیی نێـوان ئەو دوو حـالەتە واتە  هەردوو حـاڵەتی دڵخـواز و کردەنـی (مطلـوب و ممکـن) یەکـێکە لە کیشــە بنەڕەتیەکـانی سیاســەت لە گشــتی تـرین ئاســتدا.

مارکسیستەکانی کوردستانی عێراق، لەسەرەتایی ترین هەنگاوی سیاسەتکردنەوە، خوازراو (مطلوب)یان کرد بە ئامانجی گەورە و بچووکی خۆیان نەک کردەنی (ممکن) بۆیە هەردووکیان لە دەستدا ونەدەستیان بەمیان و نە بەوی تریان گەیشت. عەقلیەتی سیاسیی زاڵی ناو کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراق لەو کاتەوە تا ئێستا، هەمیشە چاوڕوانیی خۆی لە ئاڵوگۆڕ و پێشهاتەکاندا لەسەر بناغەی دڵخوازتری (مطلوبترین) حاڵەت وبەرزترین و ئایدیاڵترین ئامانج بنیات ناوە.

ئەوەی ئێمە لە زەیندا پێمان باشە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لە واقیعدا هەیە یا لەوەی کە دەتوانین ئەنجامی بدەین. گەر لە دراوە واقیعیەکانی هەر دیاردەیەکەوە دەست پێ بکەین ئومێدی زۆر هەیە کە تا ئاستی حاڵەتی دڵخواز (مطلوب) گەشەی پێ بدەین ئەگینا هەمیشە لە جێی خۆمان ڕاوح ئەکەین، هەر چۆن کۆمۆنیستەکانی کوردستان هەمیشە لە جوغزێکی داخراودا ڕاوح ئەکەن.

بەو مانایە بینینی واقیع وەکوو خۆی زۆر جیاوازە لەگەڵ بینینی بەوجۆرەی ئاواتی بۆ دەخوازین.

بۆ نموونە تەنها لە کاتی وەرچەرخانە گشتیەکانی وەکوو (ڕاپەڕین، شۆڕش)دا کرێکارانیش وەکوو باقی خەڵکی، و جاری واش هەیە دوای هەموو خەڵک، دێنە ناو کایە و ململانێ سیاسیەکانەوە ئەگینا خامۆشی سیاسی و لە سیاسەت دووری، ڕەوتی سروشتی و ڕێسای هەمیشەیی ژیانی کرێکارانە. بە پێچەوانەوە ئەم خەسڵەت و دیاردەیە لای چینی ناوەندیی کۆمەڵ و ئیلیتی ڕۆشنبیری کۆمەڵ وانیە.

کرێکاران ئەو کاتەش کە لە ڕاپەڕین و شۆڕشەکاندا پێ ئەنێنە ناو گۆڕەپانی (سیاسەت)ەوە، بەپێی بالانسی نێوان هێزە سیاسیەکان ورەواجی ڕەوتە سیاسیە جۆراوجۆرەکانەوە، ئەکەونە بەرەی ئەم یا ئەو لایەن و بزووتنەوەی سیاسیی چالاک لە کۆمەڵدا و ڕەنگ بێ هەڵبژاردنی ئەم یا ئەو بەرە و بزووتنەوەیەش لەلایەن کرێکارانەوە

نەک لەسـەر بنـاغەی بەرژەوەنـدیی چینـایەتی بەڵکوو لە زۆر حاڵەتـدا (جـا ئەوە ڕاسـت بـێ یـا هەڵە بـابەتێکی تـرە) بەپێـی زۆر فـاکتەری تـر بێت.

کریکـاران هەرگیـز نەبـوونە بە چینێکـی خـاوەن ئامـانجی سیاسـیی هاوبەش و لە مێژووشدا نموونەی وا نەبینراوە.

کرێکارانی عێـراق لە مێـژووی هـاوچەرخی وڵاتەکەیانـدا لە قۆناغیکـدا بـوون بە هێـزی پیـادەی عبـدالکریم قاسـم (١٩٥٨) و حیزبـی شـیوعیی عێـراق بەڵام لە ١٩٦٨ بەدواوە کەوتـنە بەرەی بەعـس و بـزووتنەوەی قـومیی عەرەبـی. لە کوردستانیشـدا کرێکـاران لە قۆناغێکـدا بـوون بە هێـزی زەخیـرە و پایگـای شـیوعیەکان و دواتـر پـارتی بـووە بە هێـزی کاریگەر لە ناویاندا و ... تاد.

هەر بـۆیە پێـداگریی رۆمانسـی لەسـەر گـۆڕانی کرێکـاران بە چینێکـی سیاسـیی سـەربەخۆ و جیـاواز، ولەوەش واوەتـر بەهێزێکـی سیاسـی خـاوەن هۆشـیاریی شۆڕشـگێڕانە، کە ئەتـوانێ دونیـای چینـایەتی ژێرەوژوور بکات بەسەر چینەکانی تردا، جگە لە ڕیتۆریکێکی تیۆری و یۆتۆپی و دۆگمایەکی فکری و سیاسـیی بێ بنەمـا، هیچـی تـر نیە و مێژووی کوردستان و دونیاش شایەدی بوونی نموونەیەکی لەوجۆرە وەهمە نیە.

لە ڕاستیدا گۆڕینی چینی کرێکار لە چینێکەوە لە خۆیدا بۆ چینێک بۆ خـۆی (مـن طبقـة لـذاتها الـی طبقـة مـن اجـل ذاتهـا) وەکـوو فۆلکلـۆر و پەنـدێکی پێشـینانی لێهـاتووە وهـیچ وجـوودێکی واقیعیـی لە مێـژوودا نەبووە ولە مەقوولەیەکی دونیای زهن زیاتر، بوونێکی دەرەکیی نیە.

چینی کرێکاری چەکدار بە بیری کۆمۆنیستی تەنها خەون و وەهمێکی دونیای ڕۆشنبیرانی ناڕازیی چەپە.

ئەو ڕەوتەی کە لە گۆنگرەی دووەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانەوە بە کۆمـۆنیزمی کرێکـاری نـاوی دەرکـرد ڕەخـنەی سیاسـی و فکریـی لە ڕەوتەکانی تری چەپ لە دوو ووشەدا کورت کردۆتەوە کە بریتین لە

(چەپی حاشیەیی) بەمەرجێک خۆی حاشیەیی ترین دیاردە و ڕەوتی سیاسیی کۆمەڵگای عێراق و ئێرانە.
ئاکامەکانی ئەو تەرز ومیتۆدەی فکر و سیاسەتکردن بریتی بوو لە شپرزەییەکی فکریی بەردەوام و گۆشەگیریی کۆمەڵایەتیی گەورە. ئیتر ئەم بزووتنەوەیە، بەهۆی ئەو میتۆدەوە ئەرکی خۆی کورت دەکردەوە لە (ڕەتکردنەوە)ی دیاردە و هەڵوێست و سیاسەتی هەموو لایەک و هیچی تر، تا وای لێهاتبوو کە (ڕەتکردنەوە) بووبوو بە شوناسی لە ئاستی کۆمەڵدا.
ئەم دیدگایە سیاسەتکردنی وەکوو کردار وئەکتێکی واقیعی نەدەبینی کە سەرکەوتن و شکست، پێشڕەوی و پاشەکشە، دەسکەوت و خەسارەت، هێرش و سازش ...، ی تیایە.
بۆ نموونە هەر پێداگریەک لەسەر ڕووخاندنی ڕژێم یا داواکردنی داخوازیی لە بواری ژیانی ڕۆژانەی خەڵک، یا باشترکردنی ژیانی توێژێکی کۆمەڵایەتی لە سایەی دەسەلاتی فەرمانڕەوادا بە کەم بایەخ و سووک تەماشا ئەکرا و بە ڕیفۆرمیزم و خۆشباوەڕی وکورت بین ئەدرایە قەڵەم بێ ئەوەی خۆشی لە ئاستی "شتە گەورەکان" دا هیچی لە باردا بێت.
ئەوانە لە قامووسی فکری و سیاسیی ئەو چەپەدا بەلادان وتێنەگەیشتن لە مارکسیەت و شێواندنی ئوسوڵە بێگەردەکانی تیۆری ناوزەد ئەکران بێ ئەوەی بۆی بووبێت بە پرسیار کە ئەوانە نموونەی کێشەی واقیعیی ناو کۆمەڵگان و هێشتا ئاستی هۆشیاری و توانایی عەمەلی وهێزی کۆمەڵایەتیی ئەو چینی کرێکارەی کە ئەو کردوویەتی بە بتێک، زۆری ماوە بۆ بەدەسهێنانی تەنانەت بەشێک لەوانەش.
سەیر لەوەدا بوو کە ئەو حاڵەتە تراجیدیە نەک نەدەبوو بە جێی سەرنج و تێڕامان و ڕەخنە لەناو ڕیزەکانی ئەو بزووتنەوەیەدا بەڵکوو ئەو دابڕان و ڕوو وەرگێڕانە لە بەستەرەکانی کێشەی واقیعیی ناو

کۆمەڵگــا هەر لە هەڵکشــاندا بــوو. لەبەرانبەریشــدا کــاریگەریی بــێ بەشبوونی خەڵک و خەباتی ئەوان لە هێزێکی پێشڕەوی شۆڕشگێڕ، ئەو ڕۆڵەی کە قەرار بـــوو بـــزووتنەوەی چەپ بیگێڕێـــت، هەر لە قووڵبوونەوەدا بوو وە باجەکەشی تا دەهات قورستر دەبوو.

لەم قۆنــاغەدا بـزووتنەوەی چەپ بەنــاوی ســەرقاڵی بە کۆمــۆنیزمی کرێکاری و ڕادیکاڵبوونەوەی زیاترەوە، زۆر دەگمەن ئەچووە سـەر بایەخدان بەئەنجامدانی شیکردنەوەیەکی ڕۆشن و کۆنکریت سـەبارەت بە کۆمەڵگــای عێــراق، پیکهــاتە ئــابووریەکەی، قۆناغەکــانی گەشــەی کــۆمەڵایەتیی ئەم وڵاتە (بــۆ نمــوونە: دامەزرانــدنی جمهــوریەت، بەهێزبوونی بزووتنەوەی ناسیونالیستیی عەرەبی و کوردی، لاوازیی لیبرالیزم، پایەکانی دیکتاتۆریەت و توتالیتاریزم، غیابی دیموکراتی و پەرلەمانتاریزم پاش ڕووخانی پاشایەتی، کێشـەی نەوت و جێگەی لە ئابووریی عێراقدا، ئابووریی ڕەیعی  و دەرهاویشتەکانی، ئیسلاحات و شۆڕش و چۆنیەتیی ئەوانە لە عێراقدا، مەسـەلەی زەوی و جوتیاران و ... تاد). هەموو ئەوانەش لەکاتێکدا بوو کە ئەم بزووتنەوەیە جگە لە کار لە بواری فکر ودونیای خوێندنەوەدا هیچ پراتیک و سـەرقاڵییەکی تری نەبوو تـا بڵێین بە هـۆی سـەرقاڵیی بەوانەوە نـاپەرژێ و هەموو تواناکانی بۆ ئەو کارە عەمەلیانە تەرخان کردووە.

بەکــورتیەکەی، بــزووتنەوەی کۆمۆنیســتیی چەپــی هەشــتاکانی کوردســتانی عێــراق، کەمتــر هەڵگــری نیشــانەکان و پۆتانســیێلەکانی بزووتنەوەیەکی سیاسیی ڕیشەداری ناو کۆمەڵگا و کیشە واقیعیەکانی بوو. خـاوەنی هـیچ پایگـایەک نەبـوو لەنـاو هـیچ بەشـێکی کـاریگەری خەڵک، بێکاریگەر بوو لەسـەر ژیان و خەباتی هیچ چین و تـوێژێکی خەڵک لە مەیدانە فیعلیەکانی ململانێی ئەو ڕۆژگارەدا وەکوو: ململانـێ لە بەرانبەر سیاسەتی سەرکوتگەرانەی ڕژێم، خەباتی ڕۆژانەی خەڵک بــۆ ئــازادی سیاســی و مــافە دیموکراتیەکــانی، هەوڵــی خەڵــک بــۆ باشــترکردنی خزمەتگــوزاری و گوزەرانیــان، خەبــاتی خەڵــک لە دژی

سەربازگیری و ڕەشبگیری و دەیان مەیدان و بواری تری ململانێی ناو کۆمەڵگای کوردستان و عێراق.

**دیسانەوە (منع التجول) و... ئەنفال!!!**
**(وەکوو ڕەنگدانەوەیەک بۆ ویستی گەلی عێراقی**
**مەزن، ئەمرۆ سوپای چاونەترسی عێراق**
**دەستی کرد بەهەڵمەتی ئەنفال لەژێر**
**چاودێریی فەریقی ڕوکن سوڵتان هاشم**
**ئەحمەد.)**
**ڕاگەیاندنی یەکەمین هەڵمەتی ئەنفال کە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٠ لە ڕادیۆی بەغداوە بڵاوکرایەوە.**

بارەگای ڕێکخراوەکەی بەعسیەکان لە فولکەی کاوە کە پێی ئەووترا (شەهید عوسمان) ٤٠٠ – ٣٠٠ مەترێک لەماڵەکەمەوە دووربوو. کابرایەکی لۆمپەنی کەرکووکی هەبوو بەناوی "زاهیر" کە لە کەرکووک ماڵیان لە گەڕەکەکەمان بوو پیاوی ئەمن بوو و لەو بارەگایە دەوامی ئەکرد. نیگەرانی ئەوەبووم کە ئەو زاهیرە لە دەرچوون و هاتنەوەدا بۆ ماڵەوە شوێن پێم هەڵگرێت و ماڵەکەم دەسنیشان بکات، چونکە جارێکیان لای سەرا بینیم و ئەو زۆر شڵەژا و منیش خۆم لێ بزرکرد. ئەو وای ئەزانی کە منیش وەکوو براکانم پێشمەرگەم. وەکوو پێشتریش وتم ماڵی ئێمە شوێنی هەموو کۆبوونەوەکانی ناوەندیی بڵێسە بوو. ماڵی باوکی نەسرینی هاوسەریشم سێ کۆڵان لەولای خۆمانەوە بوو.
من گەر بەتەنها خۆم لە ماڵەوە بوومایە دەرگام لە کەس نەدەکردەوە. ڕۆژێکیان هەر خۆم لە ماڵەوە بووم لە دەرگا درا و چونکە لە تەنیشت دەرگای حەوشەکە بووم بە دیوی ناوەوە بەباشم نەزانی کە دەرگا نەکەمەوە. کەدەرگاکەم کردەوە لووتم تەقی بە دوو چەکداری

جەیشی شەعبیدا کە یەکێکیان کابرا گۆرانیبێژە خەمزەییەکە بوو کە پێموابێ ناوی عومەر خەمزەیی بوو. یەکسەر پرسیی پیشەت چیە و منیش وتم: مامۆستام، و ئەویش وتی: جەیشی شەعبیت کردووە؟ وتم: بەڵێ من لە کەرکووک جەیشی شەعبی ئەکەم، و بەوە وازیان هێنا و منیش بۆ ئەوەی بۆم دەرکەوێت کە ئایا بەتەنها لە دەرگای ماڵی ئێمەیان دا یا نا دوو هەنگاوێک دوایان کەوتم بینیم کە هەر ئەمان نین و لە هەموو ماڵەکانی دراوسێش هەمان شت دووبارە کراوەتەوە.

دیسانەوە دەنگۆی ڕەشبگیر و ماڵ گەڕان پەیدا بوو. مامۆستا ستاریش هات و ئەویش هەواڵەکەی پشتڕاست کردەوە بۆیە بڕیارماندا لە ماڵەوە نەمێنین. هەرچی شتی خۆم هەبوو شاردمنەوە و بەنەسرینی هاوسەرم وت: تۆ لە ماڵدا بمێنەرەوە و گەر پرسیاریان کرد بڵێ هاوسەرەکەم سەربازە و لە دەوامە بەڵام ناوی ڕاستەقینەی من مەڵێ. خانووەکەی ئێمە هی کاک بەکری حاجی عوسمان بوو کە وەکیلی پێڵاوفرۆشیی باتا بوو و خۆشی ماڵی لە تەنیشتمانەوە بوو. کاک بەکر خزمی نەسرینی هاوسەرم بوو.

ئەمجارەش دیسانەوە بە کۆپتەر بەسەر شاردا ئەگەڕان و مەفرەزە هاوبەشەکانی ئەمن و جەیشی شەعبی و حیزبیەکان ماڵ بە ماڵی شار ئەگەڕان و ئێمە لە جێیەکی باش خۆمان حەشاردا تا خۆرئاوای هەمان ڕۆژ هاتوچۆی کۆڵانەکان کرایەوە و منیش گەڕامەوە و نیگەرانی هەواڵی ماڵ بووم. گەیشتمە ماڵەوە نەسرین وتی: کاک بەکر ماڵی خۆیانی جێهێشتبوو بە ڕۆبێکەوە هاتبووە بەردەرگای ئێمە و وەکوو خاوەن ماڵ خۆی نیشان ئەدا و کە مەفرەزەکە گەیشتنە بەردەم ماڵی ئێمە لێیان پرسی ئەوە ماڵی تۆیە ئەویش وتی بەڵێ و فەرمووی لێکردن کە بێنە ژوورەوە بەڵام ئەوان، کە دیاربوو پێشتر لەناو بازاڕدا ئەویان بینیبوو، وتیان پێویست ناکات و بەوجۆرە ماڵی ئێمە نەگەڕابوون.

دیار بوو کاک بەکر گومانی هەبوو کە وەزعی ئەمنیم باش نیە و بەو بۆنەیەوە و بۆ پاراستنی من ئەو هەڵوێستە جوانەی نواندبوو.

خەڵکی کوردستان تاقیکردنەویەکی دوور و درێژیان لەگەڵ بەعسدا هەبوو. مێژووی پەیوەندیی گەلی کورد و بەعس بەئاگر و ئاسن و خوێن نووسراوە. لە ١٩٨٧ بەدواوە هەموو جموجۆڵەکانی بەعس نیشاندەری ئەوە بوون کە پلانێکی خوێناویی تر بەڕێوەیە. صدام لە ٢٩/ ٣ / ١٩٨٧ عەلی حەسەن مەجیدی دانا بە بەرپرسی لقی باکووری حیزبی بەعس و هەموو دەسەڵاتەکانی خۆی، واتە صدامی پێ سپارد. بەو مانایە هەقی دەرکردنی هەموو جۆرە فەرمانێکی هەبوو لە سنووری هەرپێنج پارێزگای کەرکووک و سلێمانی و هەلێر و دهۆک و مووسڵ. لە هەمان کاتدا هەردوو فەیلەقی ١ و ٥ لە کوردستاندا مۆڵدرابوون. جگە لەوانەش نزیکەی ٤٠٠٠٠٠ چەکداری کورد لە ژێرناوی (افواج الدفاع الوطني)دا ئامادە کرابوون و لە هێرشی ئەنفالەکاندا بەشداریی چالاکانەیان کرد.

لە بەهاری ١٩٨٨ تا پایزی ئەو ساڵە کوردستان بوو بە مەیدانی گەورەترین کوشتارگای خەڵکی سیڤیل کە ژمارەی قوربانیەکانی زیاتر ١٨٠ هەزار کەس بوو. ئەوەی لە کوشتاری گازی کیمیاوی دەرباز بوو بە وەجبەی هەزاران کەسی ڕەوانەی ئۆردووگا سەربازیەکانی دەوری کەرکووک و موسڵ کران و دوای بردنیان بۆ بیابانەکانی خوارووی عێراق وبەتاییبەتی لە عەرعەر و نوگرە سەلمان، زیندەبەچاڵکران.

ئێوارەیەکی سەرەتای مانگی حوزەیرانی ١٩٨٨ لە ماڵەوە سەیری تەلەفزیۆنمان ئەکرد کە لە ناکاو بەرنامە نۆرماڵەکانی بڕی و راپۆرتێکی بە وێنەوە بڵاوکردەوە لەسەر ڕاپێچکردنی هەزاران گوندنشینی ناوچەکانی گەرمیان کە لە چەمچەماڵ کۆکرابوونەوە لەژێر چاودێریی چەکدارە کوردەکان و دەزگاکانی ئەمن و

ئیستیخباراتدا. ئەوە یەکەمین کاروانی هێرشی بەدناوی ئەنفال بوو کە تا کۆتاییەکانی ئەو ساڵەی خایاند.
جەوی ترس و چاوەڕوانیی ئایندەیەکی نادیار تێکەڵ بووبوو لە گەڵ هەستی بێ دەسەڵاتی و نادیاریی داهاتوو. شارەکان پڕبووبوون لە سەدان هەزار خەڵکی لادێکانی کوردستان کە بە پێی ئینزاری دەزگاکانی کوشتاری بەعس بە سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی عەلی کیمیاوی دیهاتەکانیان چۆڵکردبوو. پێشتریش لە ٣/١٦ دا هەڵەبجە کیمیاباران کرابوو و نزیکەی ٥٠٠٠ کەس دەسبەجێ کوژران. ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی پێشمەرگە لە ماوی نزیکەی ٦ مانگێکدا هەموو لەلایەن سوپا و جاشەوە دەستیان بەسەردا گیراو پێشمەرگەی هەموو لایەنەکانی هێزە کوردستانیەکان کرابوون بە دیوی ئێراندا یا لە سەرسنوور گیریان خواردبوو.
هێرشی ئەنفال و جینۆسایدی خەڵکی سڤیلی کوردستان دوای وەستانی شەڕ لەگەڵ ئێرانیش لە ١٩٨٨/٨/٨ بۆ ماوەیەک بەردەوام بوو. لەساڵی ١٩٦١ەوە تا ئێستا کە بەعس و ڕژێمەکانی پێش ئەویش سیاسەتی ستەمی نەتەوەییان دەرهەق بە گەلی کورد جێبەجێ کردووە، کارەساتی وا خوێناوی ڕووی نەدابوو. یەکەم جار بوو لە مێژوودا وڵاتێکی ناسراو بە جیهانی سێیەم یا دواکەوتوو پەیدا بێت کە تاقە گوندێکی بە ئاوەدانی نەمێنێت. نامەوێ بچمە ناو وردەکاریی پرۆسەی ئەنفال و کیمیاباران و کوشتاری هەڵەبجەوە، چونکە بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە زۆریان لەسەر نووسراوە.
ئەنفال بە ڕۆشنی ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی تۆتالیتاریانەی دەسەڵاتی هەشتاکانی بەعس بوو لە عێراقدا. نیشاندەری پەرەسەندنێکی چۆنایەتیی نوێ بوو لە بەرانبەر گەلی کورددا کە ئەویش پەیڕەوی کردن بوو لە سیاسەتی (دوایین ڕێگە چارە)، واتە جینۆساید و قەلاچۆکردنی بە کۆمەڵی سەرتاپای گەلێک.

خەڵکی کوردستان تووشی شۆک بووبوون. هێزی پێشمەرگە و بەرپرسەکانیان هیچ جۆرە پلانێکیان نەبوو نە بۆ بەرگری لە خۆیان نە بۆ پارێزگاری لەخەڵکی لادێکانی ژێردەسەڵاتی خۆیان لە بەرانبەر ئەم هەڵمەتە گەورەیەدا. هێزە سیاسیەکانی شاخ نەک خوێندنەوە و پێشبینیان بۆ ئەم پەرەسەندنە نوێیەی سیاسەتی ڕژێم نەبوو، بەڵکوو بەشێکی زۆری هێزەکانیان خۆشیان بوون بەژێرپێوە و بەر شاڵاوی جینۆساید کەوتن. ڕژێم لەم هێرشەدا توانی بە مانۆرێکی سەربازیی چەند مانگە حوزووری سیاسی و چەکداری هەموو هێزە سیاسیە کوردستانیەکان لە نەخشە بسڕێتەوە و هاوکێشەکان بەسەریاندا ژێرەوژوور کات. ئەو هێزە کوردیانە خۆیان بووبوون بەبەشێک لە هاوکێشەی شەڕ و ململانێ لە نێوان عێراق و ئێراندا و بەوەش هۆکارەکانی کاولکاریی کوردستانیان قووڵتر ئەکردەوە.

هێزە کوردیە چەکدارەکان جگە لەوەی نەیانتوانی ستراتیج و پلانێک دابڕێژن لە بەرانبەر پیلانی هەڵمەتی دڕندانەی ئەنفالدا، ڕێگەشیان نەئەدا کە خەڵک خۆیان دەرباز بکەن. یەکێک لە سەرکردەکانی ئەو بزووتنەوەیە دان بەو ڕاستیەدا ئەنێت و ئەنووسێت: (ئێستا پاش تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر بەسەر ئەو ڕووداوانەدا، وادەزانم دەبوایە ڕێگە لە خەڵکی مەدەنی نەگیرێت بۆ خۆبەدەستەوەدان، یان لانی کەم ئازاد بکرانایە چی بڕیارێک دەدات و خۆی بەرپرسی سەرئەنجامەکەی بێت). محەمەد شاکەلی، لە بزوتنەوەوە بۆ حیزبی سۆسیالیستی کوردستان. ١٩٧٦ – ١٩٩٣. ل ١٩٤

فەزای ترس و کوشتار و تۆقاندن نووزەی لە خەڵک بڕیبوو وسەرتاپای کوردستان سیمای وڵاتێکی داگیرکراو لەلایەن هێزی سەربازیی وڵاتێکی تری بەخۆوە گرتبوو. پلانی ڕژێم ئەوەبوو کە بۆ ماوەیەکی دووردرێژ فایلی بزووتنەوەی چەکداری و پێشمەرگایەتی بپێچێتەوە و تارادەیەکی زۆر لەو پلانەیدا سەرکەوتووبوو. ئیتر هەموو خەڵکی کوردستان لە بەرەیەک و ڕژێم بە هەموو سوپا و

هێــزە چەکــدارەکان و دەزگاکــانی ســـەرکوتەوە لە بەرەیکــی تــردا وەســتابوون. تەرازووی هێــزی نێــوان ئەم دوو بەرەیە، بــێ ئەنــدازە لەبەرژەوەندیی ڕژێم گۆڕابوو. جگە لە قەبەیی ژمارەی قوربانیەکانی ئەم پەلامـارە، کـاریگەریە سیاســی و کـۆمەڵایەتی و سـایکۆلۆجیەکەی زۆر لەوە قووڵتر بوون.

کۆمەڵگـای نێـودەوڵەتی ســەرباری بڵاوبـوونەوەی دەیـان ڕاپـۆرت و دۆکیۆمێنــت، بێــدەنگیی تەواوی هەڵبــژارد و گــوێ و چــاوی خــۆی داخستبوو. دام و دەزگاکانی وەکوو نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتیی ئەوروپـا و هاوچەشـنەکانیان تەنـانەت لێکـۆڵینەوەیەکی هاکەزاییشـیان لەوبــارەوە نەکــرد. مــن خــۆم دوای ئاشــبەتاڵەکەی بــزووتنەوەی چەکداریی کوردستانی ١٩٧٥ ئەمە دووەمجارە کە کارەسات مرۆیی وا گەورە ببیـنم و ئەمەی ئەمجـارە لە هەمـوو ڕوویەکەوە بە تـایبەتی لە بواری ژمارەی قوربانیەکانی و ئەو برینە قووڵەی کە کردیە جەستەی گەلێکی بەدبەخت و چەوساوە، زۆر تراجیک تر بوو.

ئەمریکـا و ئەوروپـا سیاســەتێکی یەکگرتوانەیـان گـرتە بەر کە بریتـی بوون لە دەست شلکردن بۆ صدام حسین تا تاوانی ئەنفال بەبێ هـیچ لێپرسینەوەیەک لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە ئەنجـام بدات. ئەوان پاساوی ئەو سیاسـەتەیان بەوە دەدایەوە کە مەترسـیی هێرشـی ئێران و سەرکەوتنی بەسـەر عێراقدا کێشـەی سـەرەکیی ستراتیجی سیاسـەتی ئەوانە و لە ئەگەری سـەرکەوتنی ئێراندا ناوچەی کەنداویش دەکەوێتە بەر مەترسی ئێرانی ئیسـلامی. لەو ڕووەوە ئەوان وەکوو بەربەسـتێک ئەیـانڕوانیە عێـراق و بەهێزکردنــی صــدام لەو ململانێـیەدا نـاوەڕۆکی سیاسەتی ئەو قۆناغەیان بوو.

هەمـوو دەوڵەتەکـانی ڕۆژئـاوا بەڵگەی تەواویـان لەبەردەسـتدا بـوو کە عێراق جگە لەوەی گازی کیمیایی لە ئاستێکی فراوانـدا لە دژی خەڵکـی ســیڤیلی کوردســتان بەکارهێنــاوە، لە هەمــان کاتیشــدا بەشــێوازێکی سیستماتیک و لە ماوەیەکی درێژدا و بەشێنەیی هەڵمەتـی جینۆسـایدی

ئەنفالی ئەنجامداوە و تەنانەت ماوەیەک دوای وەستانی شەڕ لە گەڵ ئێرانیش ئەو هەڵمەتە بەردەوام بووە.
هەریەک لە نەتەوە یەکگرتووەکان، یەکێتیی ئەورووپا، پەرلەمانی زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، کۆشکی سپی و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، لە ورد و درشتی ئەنفال و کیمیابارانی بەعس لە کوردستاندا ئاگادار کرابوونەوە و هەموو بەڵگەکان بۆ مەحکووم کردنی صدام و ڕژێمەکەی سەبارەت بە کەیسی جینۆساید و بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراو بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان، لە بەر دەستدا بوو.
بەو مانایە چاوپۆشیی ئەمریکا و سەرجەم کۆمەڵگای نێودەوڵەتی فاکتەری کارساز بوو لەو تاوانانەی صدام و ڕژێمەکەی دەرهەق بە خەڵکی کوردستان ئەنجامیان دا.
جینۆسایدی ساڵی ١٩٨٨ هاوکێشەیەکی سیاسیی نوێ و زۆر لاسەنگی بە زیانی خەڵک لە کوردستاندا هێنایە ئاراوە. لاسەنگ بەمانای باڵادەستیەکی بێ وێنەی ڕژێم و دام و دەزگاکانی کە لە مێژووی هاوچەرخی کوردستاندا نموونەی نەبوو. لە ناوخۆی کوردستاندا، ترس و گومان و بێ باوەڕی و نەمانی متمانە و گیانی تێکشکان و ڕاکردن و بێ هوودەیی سیاسی، بوون بە سیمای سیاسیی زاڵی ناو کۆمەڵ. لە بەرانبەر ئەو هەڵمەتە گەورەیەی قڕکردنی مرۆییدا، هێچ بەرەنگاری و بەرپەرچەدانەوەیەک، لەناو هیچ بەشێکی خەڵکدا، ڕووی نەدا. یەکەمجار بوو لەدوای کوشتاری جوولەکەکان لە لایەن نازیەکانەوە بەو جۆرە دەیان هەزار کەس وەکوو مێگەلە مەڕ بێ ئیرادە و بێ پەرچەکردار بەرەو کوشتارگا ببرێن. گوتاری سیاسیی ئۆپۆزیسیۆن و هیچ هێزێکی سیاسیی تر، گوێگری بۆ نەمابوو. نموونەی وا لە مێژووی گەلانی دونیادا دەگمەن یان هەر نەبینراوە.

گەرچی وەستانی شەڕ لەگەڵ ئێران خۆی لە خۆیدا تەمێکی ڕەشی لەسەر ژیانی خەڵک ڕەواندەوە، بەڵام هەر زوو دەرکەوت کە ئەو هەڵپەیەی ڕژێم بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ لەگەڵ ئێراندا، لە ڕوویەکەوە ئەگەڕایەوە بۆ تامەزرۆیی صدام بۆ تەواوکردنی پلانی لەوەوپێشی بۆ ئەو کۆمەڵکوژیە گەورەیەی لە کوردستاندا بەرپای کرد. لەپاڵ ئەوەشدا، کۆتایی شەڕ و ئەو هاوکێشە نوێیەی باڵادەستیی ڕژێم لە کوردستاندا، خەون و ئاواتی ڕووخانی ئەوی بۆ ماوەیەک لە مێشکی خەڵکدا سڕیەوە و گەر داگیرکردنی کوەیت نەبوایە بۆ دەیان ساڵی تر هیوای ڕووخانی بەعس، جگە لە هیوایەکی مەعنەوی، هیچی تری لێ نەئەمایەوە.

وەستانی شەڕ لە بەشەکانی تری عێراقدا مانایەکی تری هەبوو. خەڵکی ئەو جێیانە بەتەواوی بەدەستی شەڕ و ماڵوێرانیەکانیەوە شەکەت بووبوون. هاوکێشە سیاسیەکانی ئەو ناوچانەی عێراق و میزاجی سیاسیی خەڵکەکەی جیاواز بوون لە هی کوردستان. مەسەلەی ڕووخانی ڕژێم نەبووبوو بە پرسێکی کۆمەڵایەتیی سەرتاپاگیر لەناو خەڵکدا و هاوڕاییەکی گشتی لەسەری نەبوو. ئەوە بەومانایە نەبوو کە خەڵک ئاواتیان بەوەها شتێک نەدەخواست بەڵکوو بەو مانایە بوو کە ئەوە لە ئەولەویات و پلانی ڕاستەوخۆی خەڵکدا نەبوو بەڵکوو تەنها وەکوو دروشمی کۆمەڵێک هێزی نەیاری بەعس مابۆوە.

لە کوردستانیشدا پرسی ڕووخاندنی ڕژێم گەرچی خواستێکی قووڵ و ئیستەرەمی خەڵک بوو بەڵام نە هێز وتوانای ئەوە هەبوو و نە لە هیچ بزووتنەوەیەکی بەرچاودا فۆرمۆلە بووبوو بۆیە خەڵک لە هەموو عێراقدا سەرباری قوربانیە زۆرەکانی ئەو ساڵانە، وەکوو ئەمری واقیع کەوتنە، هەوڵی تەداروکی ڕێکخستنەوەی ژیانی خۆیان بەپێی هاوکێشەکانی دوای شەڕ کە لە کوردستاندا بە مانای هاوکێشەکانی دوای کۆتایی دوو شەڕ و کارەساتێکی مرۆیی گەورەش بوو.

من کە ماوەی شەش ساڵە ژیانی ئیختیفا بەسەر ئەبەم هەستم ئەکرد ئەڵقەکانی دەورم هەرچی دێت تەسکتر ئەبنەوە. بواری درێژەدان بە کار و هەڵسووڕانی سیاسی بەجێی خۆی و بگرە ئێستا بواری درێژەدان بەمانەوەی فیزیکیش سەخت بۆتەوە بۆم. جگە لەوەش پاش هاوسەرگیری و لەدایکبوونی نینای کچم، ئەرک و بەرپرسیەتی خێزانیشم تا دێت زیاد ئەکەن. باوکم و شەش سەر خێزانی شەهید عادلی برام بە هەزاران چەرمەسەری بە ڕاکردوویی لە دەستی جاش و سوپا لەو دێهاتانەی قەرەداغ پەڕاکەندە بووبوون کە سەرباری باری دژواری ئەمنیی خۆم بە هەزار حاڵ دۆزیانمانەوە و هەموومان لەم خانووە دوو ژووریەی برایم پاشا بەبێ هیچ سەرپۆشێکی ئەمنی و دەرامەتێک ئەژین و من لێپرسراوەتیی هەموویانم لە ئەستۆیە. هەویە نەماوە تاقی نەکەمەوە و ئێستا نەوزادی برای نەسرینی هاوسەرم کە خۆشنووسە هەویەیەکی بەناوی ئەسیری ئازادکراوی شەڕی ئێرانی بۆم تەزویر کردووە.

لەو سەروبەندەدا نەک بواری هەڵسووڕانی سیاسی بۆ ئێمە بەتەواوی تەسک ببۆوە بەڵکوو مەترسی لەسەر ئایندەی ژیانیشمان تا ئەهات زیادی ئەکرد. ئێمەش کەوتبووینە حاڵەتێکی دیفاعی و چاوەڕوانییەکی ناچاریەوە. گەرچی وەکوو گرووپی بڵێسە بەردەوام بووین لە پەیوەندی و چالاکیە نۆرمالەکانی پێشوومان، بەڵام ئەم هێرشە کۆنەپەرست و دڕندانەیەی ئەمجارە سەرجەم هاوکێشەکان و ئەولەویاتەکانی گوڕیوە. وەکوو حاڵەتی دوای شەڕێکی گەورە و شکستێکی قورس ئێستا خەڵک خەریکە زۆر بە پارێزەوە هێواش هێواش جووڵەی تێ ئەکەوێتەوە. خەریکە گفتوگۆ و جموجۆڵ لەناو هەڵسووڕاوانی چەپیشدا گەرم ئەبێتەوە. ئەوە قەدەری سیاسەتکردنە لەم ولاتەدا و سەرباری هەموو قورساییەکان و سەختیەکان، تروسکایی ئومێد بەزیندوویی ماوەتەوە. پەیوەندیە ڕێکخراوەییەکانمان لە شارەکان و هەروەها ئەڵقەی ناوەندمان چالاک کردۆتەوە.

بۆ سازدانەوەی کۆنترۆڵی خۆی بەسەر بارودۆخی نوێدا، ڕاستەوخۆ دوای وەستانی شەڕ، ڕژێم بڕیاری ٧٣٦ ی دەرکرد کە ئەبوایە هەرچی ڕاکردووی سەربازی هەیە بچن بەدەنگی لێبوردنەوە و خۆیان حەواڵەی سەربازگەکان بدەن تا بەدوای ئەودا تەسریح بکرێن. کێشەی ئەمنیی من بەم جۆرە بڕیارانە چارەسەر نەدەبوو، بۆیە هیچی لە وەزعی من نەگۆڕی. ئیتر ئەو ژینگەیەش نەما کە بەهۆی زۆریی ڕاکردووی سەربازیەوە، کەسانی ڕاکردوو وداواکراوی سیاسیی وەکوو من سوودی لێ ببینن و وەکوو ماسی و ئاو تیایدا خۆیان حەشار بدەن. سەدان هەزار کەس بەو بڕیارە لە سزای ڕاکردن لە سەربازی ڕزگاریان بوو و تەسریح کران. دیار بوو ڕژێم خەریکی سازماندانەوەی ستراتیجیی ئەمنیی خۆیەتی لە کوردستاندا بۆ قۆناغی دوای ئەنفال و وەستانی شەڕ لەگەڵ ئێراندا. ئێمە زۆر کەم وەکوو ڕێکخراوی بلێسە دەرکمان بە توخمە نوێکانی بارودۆخی نوێ و هاوکێشەکانی ئەم قۆناغە تازەیە ئەکرد. ڕەوتی کۆمۆنیستیش بەهەمان شیوە ئەوانیش بەردەوام بوون لە تێڕوانینە کلاسیکیەکانیان وەکوو ئەوەی ئەو ئاڵوگۆڕانە ئەڵقەیەک بێت لە پرۆسەی نۆرماڵی دەسەلاتدارەتیی شێنەیی و قۆناغی ئاسایی سەرمایەداری و بۆرجوازی. هەموو ئەو وەرچەخان و (مستجدات)ەی دونیای سیاسەت لە وڵاتدا ڕاینەچڵەکاندین و بەردەوام بوین لە شیکردنەوەی بارودۆخی وولات بە میتۆدی ئاسایی جاران. لەڕێگەی هاوڕێ میقداد هادی وسەرچاوەیەکی ترەوە جاروبار ئاگاداری دەنگوباسی ڕەوتی کۆمۆنیست دەبووم و دیار بوو ئەوان هەمان ئەولەویاتی پیشوویان نەگوڕیبوو سەبارەت بە لەپێشبون و زەروورەتی یەکەمی بەرنامە وەکوو ڕەمزی سەربەخۆیی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و کرێکاری و ئەویش لەڕێگەی دراسەی مارکسیەت و خەباتی تیۆریەوە.

زۆری پێنەچو ڕژێم بڕیاری ژمارە ٧٣٦ ی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش – مجلس قیادة الثورة)ی هەڵوەشاندەوە

وڕایـــان گەیانــد کە ئەبــێ هەمـــوو ئەو کەســـانەی کە ئەو بڕیـــارە ئەیـانگرێتەوە سـەرلەنوێ بچـنەوە بـۆ خزمەتـی سـەربازی و خۆیـان بگەیەنـــنە یەکە ســـــەربازیەکانی جـــارانی خۆیـــان. لە گەلیشـــیدا پڕوپاگەنـــدەیەکی زۆریـــان بڵاوکـــردەوە کە هەرکەس دوای مـــاوەی دیاریکراو لە بڕیارەکەدا دەستگیر بکرێت لە بەردەم مالەکەی خۆیدا گولە باران ئەکرێت وخانووەکەشیان ئەڕوخێنرێت.
بەرەبەرە نیازەکانی ڕژێم و وردەکاریی ستراتیجیە ئەمنیە تـازەکەی سـەریان دەردەهێنا و ئەخرانە بـواری جێبەجێ کـردنەوە. سلێمانیش، وەکوو هەمیشـە، تاقیگای جیبەجێکردنـی ئەم سیاسـەتانەیە. دیسـانەوە جەوی تۆقانـدن و داپلۆسـین بەنـاو شـار و خەڵکـدا بڵاوبـووەوە. لە گەلیشیدا هەموو ڕۆژێک هەواڵی ڕەشبگیر و قەدەغەی هـاتووچۆ (منع التجـول) بڵاوئەبێـتەوە کە دیـاربوو دەزگـا ئەمنیەکـانی ڕژێـم بـۆ پێوانەکردن وزانینی کاردانەوەی خەڵک ونانەوەی تـرس و بشـێوی لە پشتیەوە بوون.
ئێمە چەند ڕۆژ لەمەوپێش کۆبوونەوەی ئەڵقەی ناوەندیی بلێسـەمان بەبەشـداریی مـن و لەتیـف و عوسـمان و سـتار ئەنجامـداوە. ئـێمە سـەرباری پەرەسـەندنی جەوی ڕاونـان و داپڵۆسـین پێمـان وابـوو کە بەرەبەرە وەزع بەرەوئـارامی ئەڕوا بەڵام ئەم ڕکـوودە سیاسـیەی ئەم جـارە جیـاوازە و زۆر ئەخایەنێت، مەگەر جموجۆڵێک لە شـوێنەکانی دەرەوەی کوردســتان ڕووبـدات و ئەم گـۆمی ئـارامی و خامۆشــیە سیاسیە بشڵەقێنێت. من جاروبار بۆ کـاری سیاسـی و ڕێکخراوەیی و کۆبـــوونەوە لەگەڵ دۆســـت و هاوڕێکـــانم ســـەردانی هەولێـــر و دووزخورمـــاتوو و کەرکـــووک ئەکەم یـــا ئەوان لەوێـــوە دێـــن بـــۆ ســـەردانیم. جاروبـــاریش هەر لەگەڵ عوســـمان و ســـتاردا پـــاش تەواوبـوونی کۆبوونەوەکـان لەگەڕانەوەی ئەوانـدا سـەردانی کەلارم ئەکرد.

ڕۆژێکی ئاخری مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٨٨ لەتیفی شێخ عومەر پێش هاتنەوەی نەسرین لەکار، بۆ ماڵی خۆیان گەڕایەوە، بەڵام زۆری پێ نەچوو بە شڵەژاوی خۆی کردەوە بە ماڵدا. زانیم شتێک ڕوویداوە و ئەو یەکسەر وتی: وەزع زۆر خراپە و ڕژێم هێزێکی زۆری لە کەرکووک مۆڵداوە و دەنگۆی ئەوە هەیە کە دوای تەواو بوونی ماوەی ئەم لێبووردنەی دوایی ڕەشبگیر و (منع التجول) لە سلیمانی بکرێت. لە درێژەی قسەکانیدا وتی: ئاگادار بە ومەسەلەکە بە جیددی وەربگرە. منیش وتم: تۆ پێت باشە چی بکەین؟ ئەو لە وەڵامدا وتی: گەر لەناو شار بمێنینەوە دەستگیر ئەکرێین وباشترە بڕۆینە دەرەوەی شار. منیش وتم: باشە سبەی کۆئەبینەوە و قسە لەسەر هەموو لایەنەکانی وەزعەکە ئەکەین و بڕیاری پێویست ئەدەین. ئەو بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە مەسەلەکە زۆر مەترسیدارە و ئەبێ خێراکەین ئەگینا دەرناچین. وتمان جەباریش بۆ سەردان هاتۆتەوە با بڕۆین سەرێکی ئەویش بدەین و مەسەلەکە لەگەڵ ئەویشدا باس بکەین و ئەوکاتە بڕیاریش ئەدەین. جەبار لەڕووی ئەمنیەوە وەزعی خراپ نەبوو و هیچ ئەمر قەبزێکی لەسەر نەبوو، کێشەی سەربازیشی نەبوو، چونکە ئەو تەسریح کرابوو. لەماڵی جەبار کە ئەوکاتە لەپشتی ماڵی باوکی لە مامۆستایان ماڵیان دانابوو کۆبووینەوە و دیسانەوە لەتیف مەسەلەکەی بۆ ئەویش باسکرد و جەباریش پرسیاری لە لەتیف کرد کە تۆ ڕات چیە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە وتی: بەپیی مەعلووماتی من مەسەلەکە زۆر ترسناکە و بەنیازی هەڵمەتی گەورەن، بۆیە من وابەباش ئەزانم کە لە شار بڕۆینە دەرەوە.

من هەڵمدایێ:

- بەڵام هەمــوو دەرەوەی شــارەکانی کوردســتان لە دەرەوەی شەســتیەکەوە کــراوە بەنــاوچەی قەدەغەکــراو، جــگە لەوەش هیچ ئاوەدانیەک نەماوە و دێیەکیش بەپێوە نەمـاوە هەرەوهـا ڕەبــایە و ســـوپا بە دەوری دێهـــاتە وێرانکراوەکانیشـــەوە دانــراون بــۆ چــاودێری. ئەی خەو، ئەی خــواردن؟ پاشـــان تـــاکەی لەوێ ئەمێنیـــنەوە؟ لەتیـــف گیـــان بەڕاســـتی ئەوە خۆکوژیە نەک خۆدەربازکردن.

جەبـاریش هـاتە سـەر ڕاکەی مـن وڕووی کـردە لەتیف وتـی: ئەوەی باسی ئەکەی عەمەلی نیە و بەهیچ جۆرێک ناکرێت. لەتیف هەر سوور بوو لەسەر قسەی خۆی و ئەیووت ئەتوانین لەناو کەلاوەی دیهاتەکان خۆمان حەشار بدەین تا چارێکی تر ئەدۆزینەوە وتەنانەت لە دواییدا وتـی: بـا بـڕۆین لە قەنـدیل جێـیەک بـۆ خۆمـان بـدۆزینەوە و لەوێ بمێنینەوە.

مــن پێشــنیاری ئەوەم کــرد کە بــا کــۆببینەوە و هەمــوو لایەنەکــانی مەســەلەکە و ئاکامەکــانی بــدەینە بەربــاس و قســەی خۆمــانی لەســەر بکەیــن وبانگەوازیشـــمان ڕووەو خەڵــک رابگەیەنـــین و جەبـــاریش لایەنگریی ئەو پێشنیارەی منی کرد و پێی باش بوو. دیار بوو لەتیف بەتەواوی کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەم هیستریا ئەمنیەوە کە شـاری گرتـۆتەوە و ئەو قسـانەی مـن بە جۆرێـک لە بەترانیـی سیاسـی تـێ ئەگات و بەبێ بایەخیەوە بێدەنگ بوو. پاش هەندێ بگرە وبەردەی تر نەگەیشتینە ئەنجام و من و لەتیف گەڕاینەوە و ئەو لە ڕێگا گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان.

من کە گەرامەوە هەواڵەکەم بۆ نەسرینی هاوسەرم باسکرد و ئەویش هیچ دەسەڵاتێک یا چارێکی شک نەدەبرد و وەکوو مـن دۆش دامـابوو تەنها ئەوەی وت کە هەرچی نووسین و کتێب هەیە لە ماڵدا مەیهێڵە و

بابزانین وەزعەکە بەرەوکوێ ئەڕوات. من جگە لە بڵاوکراوە و نامیلکە و کتابێکی زۆری قاچاغ و یاساغ دەمانچەیەکیشم هەبوو کە لەماڵدا شاردبوومەوە وتەنانەت بە نەسرینی هاوسەریشم نەووتبوو. کاتی خۆی لە ڕێی برادەرێکی مامۆستا ستارەوە تانکییەکی نەوتمان کردبوو بەجێی شاردنەوەی شتی تایبەتی خۆم. تانکیەکە لە ناوەوە کرابوو بەدووبەشەوە و نیوەی پڕ لە نەوت ونیوەکەی تری جیاکرابۆوە و لە ژێرەوە دەرگایەکی بۆ کرابوو کە بۆ ناوەوە بەپاڵ ئەکرایەوە. هەموو شتی خۆم بە دەمانچەکەیشەوە لەوێ ئەشاردەوە. خۆم بۆ خراپترین سیناریۆ ئامادکردبوو وشەوان زۆر بەترسەوە ئەنووستم و هەمیشە گوێ قوڵاغی دەنگوباسی ناو شار و هاوڕێ و ئاشنای خۆم بووم.

لەو ڕۆژانەدا کە ماوەی لێبووردنەکەی ڕژێم تازە تەواو بووبوو ڕۆژێکیان دەمەوعەسر بەتەنها لەحەوشە بچووکەکەی خۆمان دانیشتبووم کە لەدەرگا درا و کردمەوە ڕوانیم خوشکێکی لەتیفی هاوڕێمە کە بینیم سەیرم پێهات کە چۆن ماڵی ئێمە ئەزانێ. پاش دانیشتن و چاک و چۆنی وتی: کاک لەتیف سڵاوی هەبوو بۆت و ئەو هەزار دینارەی بۆت ناردۆتەوە کە پێشتر لێی وەرگرتووی. ئەو ئەوەندە دانەنیشت و ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت وهیچی تری نەووت.

ئەو شێوازە لە مامەڵەی لەتیفی شێخ عومەر بۆ من مایەی شۆک و نائومێدیەکی زۆر بوو. لەتیف زیندانیی سیاسیی خاوەن هەڵوێست و کەسایەتیەکی سیاسیی خاوەن ڕابووردوو و پێشتر ئەندامی ناوەندیی کارگەران و پاشان بە ئێمەوە پەیوەست بوو وەکوو ئەندامی ناوەندیی بلێسە و لە کۆبوونەوەکاندا بەشداریی چالاکانەی ئەکرد و گەرچی لەڕووی ئەمنیەوە لەلایەن دەزگاکانی ڕژێمەوە داواکراو نەبوو وتەنها کێشەی نەچوون بۆ سەربازیی هەبوو، بەڵام ڕۆیشتنی و جێ هێشتنمان لەم کاتە ناسکەدا تووشی نائومێدیەکی زۆری کردم.

مــاوەیەک دواتــر لەڕێ فەخرەددینــی خوشــکەزامەوە کەماڵیــان لە کەرکووک بوو و ماوەیەک بەهۆی ڕاکردن لە سەربازیەوە لە ماڵی ئێمە دەژیا و لەتیفی لە ماڵی ئێمە بینیبوو، پێم زانی کە لەتیف لەگەڵ ئەودا لە ســەربازگەی ڕاهێنـانی مووســڵ ســەربازە و خـۆی تەسـلیم کردۆتەوە. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئیتر لەتیفم نەبینیەوە.
کە عوسمان و ستارهاتن بۆ کۆبوونەوەی دەوریی ناوەندیی بلێسە مەسەلەکەم بۆیان گێڕایەوە و لای ئەوانیش مایەی سەرسووڕمان و نیگەرانیەکـی زۆر بـوو. ئێسـتا تەنهـا ئەم ســێ هــاوڕێیە لە ئەڵـقەی ناوەنــدیی بلێســەدا مــاوینەتەوە. لەتیــف ئەو ڕێــگەیەی هەڵبــژارد و جەبــاریش بــێ دەربڕینــی هـیچ ســەرنج یـا ڕەخـنە یـا ڕوونکـردنەوە دوورکەوتەوە لە ئێمە.

## ساڵی ١٩٨٩: ئێمە وئالوگۆڕەکانی عێراق وشکستی کۆمۆنیزم!!

بـارودۆخی عێـراق وئاڵوگۆڕەکـانی زۆر پـێش ئـێمە کەوتبـوون و ئەو شـێوە تێـڕوانین و شـێوازی کـارەی کە پەیڕەویمـان لـێ ئەکـرد بـۆ سیاسـەتکردن، تـا ئەهـات بـێ بەرهەمتـر دەردەچـوو. بـاس و گفتوگـۆ ودونیـای ئـێمە لەلایەک و شـانۆی سیاسـەت و کۆمەڵگـای عێـراق لەلایەکی تر بوون و هیچ نیشانەیەکی بۆچوونەکانی ئێمە لە کۆمەڵدا، نەدەبینـرا. ئەو پێداگریەی ئێمە لەسـەر ڕۆڵ و پـێگە و توانـایی چینـی کرێکـار، لە ئەرزی واقیـع و جیهـانی دەرەوەی مێشـکی خۆمانـدا ئەسـەرێکی دیـار نەبـوو. ئێمە بەتەواوی غەرقـی دونیـای ئایـدیۆلۆجی خۆمـان بووبـووین و ئەو ئایـدیۆلۆجیە بووبـوو بە قـۆزاخەیەک بەدەورمانـدا کە، گەرچـی بە فیزیکـی لە دونیـا واقیعـدا ئەژیـاین، بەڵام ڕێـی لە هەمـوو پەیوەنـدی و کـارلێکێکی چـالاکی لەنێـوان بیـر و هۆشـیاریی ئـێمە و جیهـانی دەرەوەمانـدا، بڕیبـوو. ئەوە دەردی هاوبەشـی هەمـوو گـرووپ و ڕێکخـراو و چـالاکوانە کۆمۆنیسـت و مارکسیەکان بوو بە جیاوازیی هەڵوێست و ئەولەویات و ناویانەوە.

ئەم قۆنـاغە هاوکـات بـوو لەگەڵ بـوومەلەرزە گەورەکەی ڕووخـانی یەکێتی سۆڤێەت و ئۆردوگای سۆسیالیستی.

ئەم ڕووداوە مانا وپەندی زۆری هەبوو بۆ هەرکەسێک کە بە جۆرێک خـۆی بە شـیوعی، کۆمۆنیسـت، سۆسیالیسـت و مارکسیسـت وچەپ پێناسـە بکـات. بەڵام کۆمۆنیسـتەکانی هـاوخەتی ئـێمە وەکـوو وشـترمرغێک کە سـەری خـۆی لە لمـدا ئەچەقێنێـت و بەوە پێیـوایە هەمـوو لەشـی شـاردۆتەوە، خۆمـان لادا لە شـیکردنەوەی هۆکـارە

ڕاستەقینەکانی ئەو شکستە. کۆمۆنیستەکانی کوردستانی عێراق بە پشتبەستن بە ڕاپۆرتێکی دوورو درێژی مەنسوور حیکمەت سەبارەت بەوەی ئەوە کۆمۆنیزم نەبوو کە ڕووخا، بەڵکوو سۆسیالیزمی بورجوازی بوو، وامانزانی ئیتر خۆمان پاراستووە لە ئاکامە وێرانکەرەکانی ئەو داڕووخانە مێژووییە. تێڕوانینی کۆمۆنیستەکان وابوو کە نەک ئەوەی ڕووخا سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم نەبوو بگرە لەدوورماوەدا ئەو شکستە بە قازانجی سۆسیالیزمە کرێکاری و مارکسیەکەی ئێمە ئەشکێتەوە. ئەو ڕەوتەی کە ئێستا ناوی کۆمۆنیزمی کرێکاریی لەخۆی ناوە لەو قۆناغەدا شاگەشکە بووبوو بەوەی کە شکستی ئۆردووگای سۆڤیەتی ڕاستیی تیۆریەکان و هەڵوێستەکانی ئەوی سەلماندووە نەک ئەوەی کە ئەوە سەرەتای بردنە ژێر پرسیاری هەموو ڤێرژن و نوسخەکانی کۆمۆنیزمە، بەوەی ئەوان و مارکسیشەوە.

ڕووخانی ئۆردوگایەکی گەورەی وەکوو بلۆکی سۆسیالیستی، موویەکی لە لەشی ئێمە نەبزواند بە ئاراستەی وردبوونەوە لەوەی کە ئەوەی بەسەر ئەو ئۆردوگایەدا هاتووە، سەرەتای قۆناغێکی زۆر دژوار و پڕ لە کۆسپ دەبێت بۆ کۆمۆنیزم لە دونیادا. ئێستا ڕێک و پڕاوپڕ مانای راستەقینەی ئەو قسەیە دەرئەکەوێ. هەموو ئەو شیکردنەوە و پێشبینیانەی مەنسوور حیکمەت ئەیکردن سەبارەت بە ماهیەتی سۆڤیەت وەکوو سیستمێکی سەرمایەداریی دەوڵەتی و ئەوەی کە کۆمۆنیزمی داهاتوو، کۆمۆنیزمی سادە و ڕاست و ڕەوانی چینی کرێکارە و قۆناغی هێرش بۆسەر کۆمۆنیزم بە بیانووی ڕووخانی سۆڤیەتەوە قۆناغێکی کورتخایەن و گوزەرە و.، تاد، بەرگەی ٢٠ساڵێکیان نەگرت.

کێشەکە ئەوە نیە کە تۆ چەند ڕەخنەی توند و ڕادیکال ئەگریت لە سەرمایەداری و ماهیەتی چینایەتیی ئەو نیزامە ئەدەیتە بەر ڕەخنە و ئەوانە هیچی ناتوانێت ماهیەتی پۆزەتیڤی هیچ مەنزوومەیەکی فکری

نیشــان بـدات. مەســەلەکە هەروا ســادە وئاســان نـیە و ئەوە کـورت بینییەکـی سیاسـی وفکـری گەورەیە. ڕەخنەگـرتن لە سـەرمایەداری و نیشــاندانی بارگــاوی بــوونی ئەو سیســتمە بە ســتەم و نــاعەدالەتی ئاســانترین کــارە. ڕەوت ومەنــزوومە فکریەکــان بەوە ئەخــرێنە ژێــر زەرەبینی تاقیکردنەوەوە کە خۆیان ئەیانەوێ چی بکەن، و چی بنێنە جێی ئەو نیزامەی کە ڕەخنەی لێ ئەگرن ومیکانیزمەکانی بەدی هاتنی بە ڕۆشنی دەسنیشـان بکەن. مەنسـوور حیکمەت و ئێمەی هـاوفکر و هاومەکتەبی، پێمان وابوو کە بە ئاسـانی ئەتوانین ئەسـتۆی کۆمۆنیزم و مارکسـیزم پـاک بکەینەوە لەو مێژووە پڕ لە دڵڕەقـی و بەربەریەی سۆســـیالیزم و کۆمـــۆنیزم کە لە ١٩١٧ – ١٩٨٩ لە لایەکــی دونیــا بەرقەرار بوو. پێمان وابوو کەبە نووکە قەڵەمێک و هەر بەوەی بڵێین ئەوەی لە ســۆڤیەت و ئۆردووگــای سۆسیالیســتی و چــین ڕوویــدا سۆســـیالیزمی مـــارکس نەبـــوو، قۆنـــاغێکی تـــر لە هەڵســـانەوە و بـووژانەوەی کۆمـۆنیزم دەسـت پـێ ئەکـاتەوە وکرێکـارانی دونیـا بە (لبیک!) دێنەوە سەر ڕێی ڕاست.

عەقڵی سـەلیم و سـاغڵەم ئەپرسـێت: گەر ئەوەی لە سـۆڤیەت لەسـەر بنــاغەی بیروبــاوەڕی مــارکس دانەمەزرا ئەی چــین، کوبــا، ئەلبانیــا، ڤێتنــام، لاوس و کەمبۆدیــا، کۆریــای بــاکوور، یۆغســلافیا، هەمــوو ئۆردووگای سۆسیالیستی ئەورووپای ڕۆژهەڵات چی؟

ئەو تێزەی کە ئێمە پێمـان وابـوو هەمـوو ئەو نمـوونە زۆرانە هیچیـان سۆسیالیسـتی ڕاسـتەقینە نـین خـۆی باشـترین بەڵگەیە بـۆ ئەوەی کە ئیتر سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم ناتوانرێت پیادە بکرێت.

گەر سۆسـیالیزم لە دە کـات و شـوێنی جیـاواز، بە دە مـۆدێلی جیـا، لەسەردەسـتی ڕابەرانـی بەتوانـا و جیـاواز، لە بـارودۆخی لەبـارتردا نەتوانرابێ پیادە بکرێت، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە هیچ شانسێکی تـری نیە بۆ پیـادەکردن، نەک بە پێچەوانەکەیەوە. لە ڕاسـتیدا ئەو لـۆجیکەی ئـێمە بـۆ ئەرگیومێنـت کـردن سـەبارەت بە سۆسـیالیزمی ڕاسـت و

چەوت، باشترین دیاری بوو کە بیدەین بە نەیارانی سەرسەختی کۆمۆنیزم.

پێداگری لەسەر ئەوەی کە ئەو نموونانە هیچیان سۆسیالیستی ڕاستەقینە نەبوون، لەجیاتی بەرگری لە ئیمکانیەتی دامەزراندنی جۆری ڕاستەقینەی سۆسیالیزم، ئەبێ بە بەڵگەیەکی تەواو بۆ نیشاندانی ئەستەم بوونی بەرقەراریی سۆسیالیزم.

جگە لەوە، ڕاستیەکەی من لەو باوەڕەدام کە گەورەترین خزمەتێک کە بە سەرمایەداری کرابێت خودی کۆمۆنیزم کردوویەتی.

چۆن؟

مێژووی پڕ لە ستەمکاریی کۆمۆنیزم تا داهاتوویەکی نادیار بووە هۆی سەرهەڵدانی بێ هوودەیی خەباتی کرێکاران و خەڵکی لە دژی سەرمایەداری. ئەوە سۆسیالیزمەکەی لینین و حیزبی بەلشەفی بوو کە هەم نان و هەم ئازادیشی لەکرێکارانی ڕووسیا و لایەکی دونیا زەوتکرد. ئەو سیستەمە ستەمکار و تۆتالیتاریستیەی لە یەکێتیی سۆڤیەتدا لەسەردەستی لینین بناغەکانی داڕێژرا وپاشان ستالین گەیاندی بە لوتکەی ستەمکاری، مەگەر تەنها لە ئەڵمانیای هیتلەریدا نموونەی هەبووبێت. ئایا ئەوە خزمەتکردن بەسەرمایەداری نیە؟ ئایا ئەوە پاڵی نەدەنا بە ملیۆنەها کرێکارەوە لە دونیادا کە بە ستەمی سەرمایەداری ڕازی بن مادام زوڵمی ئەمیان هێشتا سووکترە بە بەراوورد بەو هەموو ستەمەی بەناوی کرێکارەوە لە سایەی کۆمۆنیزمدا کراوە کە ئەمیان زۆر زبرتر و قورس و قەبەترە؟ ئایا سەرمایەداری خۆی توانی ئەو بێ هوودەیی و ترسە لە کۆمۆنیزم بخاتە دڵی ئینسانی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە؟ ئایا کەس ئەتوانێ قەناعەت بەکرێکارانی کۆریای باشوور بهێنێت بەوەی کە بۆ ئازادی و نان و خۆشگوزەرانیتان، وەکوو نموونەیەکی باشتر، چاو لە کۆریای باکوور بکەن؟ کەس ئەیتوانی کرێکارانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوای ئەوکات ڕازی بکات کە ئەوانیش خەبات بکەن بۆ سیستەمێکی هاوچەشنی

ئەوەی کە لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی سۆسیالیستیدا هەبوو کە خەڵک ژیانی خۆی ئەخستە گەورەترین مەترسیەوە تا بەسەر دیواری بەرلیندا ڕابکات بۆ بەرلینی رۆژئاوا؟ ئایا کەسیش ئەتوانێ دوای شکستی نزیکەی ١٠ مۆدێلی یەک لەدوای یەک ستەمکارتری سۆسیالیستی، مرۆڤی سەدەی ٢١ قەناعەت پێ بێنێت کە ئەوانە هیچیان سۆسیالیست نەبوونە و پشتیان بە مارکس و لینین نەبەستووە و دوای من بکەوە تا مۆدێلی یانزەهەم تاقی ئەکەمەوە؟

ئەوە چەند نموونەی کەمن لەو دیاریانەی کە کۆمۆنیزم بە خۆڕایی بەخشیویەتی بە سەرمایەداریی هەر بۆیە کۆمۆنیستەکان دوایین کەسن کە هەموو ڕەخنەگرانی مارکسیزم و کۆمۆنیزم بە خزمەتکردن بەسەرمایەداری تۆمەتبار و ناوزەد بکەن.

پروپاگەندەی سەرمایەداری ڕۆژئاوا پێویستی بە ئەرکێکی زۆر نیە بۆ گەڕان بەدوای بەڵگەدا بۆ لەکەدارکردنی کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم و تەنها گەڕان لە جوعبەکەی وڵاتانی سۆسیالیستی، لەسەردەمی لینینەوە، سەرچاوەیەکی گەورەیە بۆ پەردەهەڵماڵین لەسەر ماهیەتی ستەمکارانەی کۆمۆنیزم.

سەیر ئەوە بوو هیچ یەک لەو پێشهات و ئاڵوگۆڕ و وەرچەرخانانەی کە بە بەرچاومانەوە ڕوویان ئەدا، ئێمەی هان نەئەدا کە تێ فکرینێکی قووڵ بکەین و پیرۆزیی ئەو بتانە بەرینە ژێر پرسیارەوە و تێکیان بشکێنین، بەڵکوو بیانووی تیۆریمان بۆ دائەتاشی و خوێندنەوەیەکمان بۆ ئەدۆزیەوە بێ ئەوەی ئەو تیۆری و خوێندنەوانە درێژەیەک یا بەڵگەیەکیان لەدونیا و کۆمەڵدا هەبێت. ئیتر تۆمەت بەخشینەوە و سەروپۆتەڵاکی یەک شکاندن بەناچاری ئەبێ بە تەواوکەری ئەو میتۆدە داخراوەی سیاسەتکردن یاخو باشتر بڵێم سیاسەت ئەتککردن!!!

ئەم لایەن بەوی تر ئەووت ئەو کرێکاری نیە، ئەم ئەوی پەنای تۆمەتبار ئەکرد بە پۆپۆلیزم، ئەو هاوڕێ بە هاوڕێکەی خۆی ئەووت

هێشتا لە قۆناغی مارکسیزمی شۆڕشگێڕدا ماوەتەوە ئەو هاوڕێ پەنا دەستەکەی تاوانبار ئەکرد بەوەی بەهۆی جێگەی کۆمەڵایەتیەوە کۆمۆنیزمی کرێکاریی پێ هەزم و دەرک ناکرێ و دەیان وردە (خزعبلات)ی تری لەو چەشنە.

من سالانێکی زۆر دواتر و لەچوارچێوەی چاوخشاندنەوە و پیاچوونەوەیەکی هەمەلایەنە بەسەرجەم مەفهوومی سیاسەتکردن وفکری سیاسیدا، بەو ئاکامە گەیشتم کە ئایدیۆلۆجیی مارکسیزم وبەتایبەتی ئەو کۆپی و ڤێرژنەی ئێمە بڕوامان پێی بوو، ئەتوانێ، لەبری ئەوەی کلیلەکانی ئازادیی تیا بدۆزیتەوە، ببێت بەقەفەزێک کە خۆتیش تیایدا ئەبیت بە زیندانی. ئەو ئایدیۆلۆجیە، لەبری ئەوەی کۆمەکت بکات بۆ دۆزینەوەی ڕێگای ئازادیی ئەوانی تر، خۆشت تووشی گومڕاییەکی سەیر و ئاڵۆز ئەکات.

بەڵام مارکسیزم سەرباری ئەو ناوەڕۆکە خورافی وخەیاڵیەی، پۆتانسیل و هێزێکی سیحریی کەم وێنە و دەگمەنی هەبوو، بەتایبەتی لەو قۆناغانەدا. قابلیەتێکی جەماوەری بوونەوە و ڕاکێشانی عەقلی مرۆڤی سەوداسەری ئازادیی هەبوو کە کەم ئایدیۆلۆژیی تر خاوەنی ئەو توانا و پۆتانسیلە بوو. ئەڵبەتە ئێمە وامان ئەزانی و ئێستاش زۆر هەن وائەزانن کە ڕازی ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خودی مارکسیزم، بەڵام من بە پێچەوانەوە ئەڵێم وانیە.

مارکسیزم لە ژینگەیەکی مێژوویی تایبەتیی کات و شوێن و سەردەمدا گەشە دەکا و بەنەمانی ئەو ژینگەیەش ئەپووکێتەوە. ئەو ژینگەیەی مارکسیزم تیا بەهێزبوو چی لە ڕەهەندە زەمانیەکەیدا و چی لە ڕەهەند و بوعدە مەکانی و شوێنەکاندا، جارێکی تر دروست نابنەوە. ئەو ژینگەی گەشەسەندنەی کۆمۆنیزم لەڕووی زەمانەوە ئاڵۆزیەکان و پێکدادانەکانی قۆناغی سەرمایەداریی کۆتایی سەدەی نۆزدە وسەدەی بیستەم بوو. لە ڕۆژئاوادا سەرمایەداری وەکوو سیستمێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی هێشتا جێگیر و

داسەپاو و چەسپاو نەبوو. کرێکاران لەگەڵ هەژاریی ڕەهادا دەرگیر بوون. دیموکراسیەت هێشتا ئەو پانتاییە زۆرەی کۆمەڵگای دانەدەپۆشی و تا ناوەڕاستی سیەکانی سەدەی پێشوو لە زۆر وڵاتی ئەورووپی هێشتا مافی دەنگدانی یەکسان جێگیر نەبووبوو. لەئاسیا و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینیش کۆلۆنیالیزم و ستەمکارییەک کە ڕۆژئاوا لەو وڵاتانە سەپاندبووی، ژینگەیەکی باشی بۆ برەودان بە مارکسیزم و بەریقە سیحراویەکەی ڕەخساندبوو. لە ڕووسیاشدا ئەوە ستەمکاری ودەسەڵاتی ڕەهای قەیسەریەت بوو کە مارکسیەتی کردبوو بە ڕێگایەکی سیحراویی سەرنجڕاکێش بۆ ڕزگاری و هەرکە بەلشەفیزم و کۆمۆنیزم سیستەمێکی لە قەیسەریەت زۆردارتری بەرهەمهێنا و لینین وستالین لە پاڵتۆکەی مارکسەوە، وەکوو دوو کاراکتەری نموونەیی ستەمکاری مودرین هاتنەدەر، ئەوکات خەڵکی ڕووسیا زانیان تووشی چی تاریکستانێکی مێژوویی بوون.

کۆمۆنیزم هەر لە سەرەتاوە و لە ژینگەی سەرمایەداریی چلەکانی سەدەی نۆزدەدا بە دروشمی (کرێکاران جگە لە زنجیرەکانیان هیچی تریان نیە لە شۆڕشدا لەدەستی بدەن)، هاتە سەر شانۆی سیاسیی کۆمەڵگای ئەورووپی. ئەو جیهان بینی و گوتارە سیاسیە بۆ ئەو سەردەمە بەریق و جەزابیەتی تایبەتی خۆی هەبوو. لەو سەردەمەدا کرێکاران لە قۆناغێکی سەخت و سەرەتاییدا ئەژیان. ئەو وێناکردن و تەسویرە سەبارەت بە چینی کرێکاری ئەو سەردەمە بەتەواوی ڕاست بوو، چونکە ئەوان (ئەو کاتە) هێچیان نەبوو تا لەدەستی بدەن، بەڵام لەماوەی ٥٠ سال دواتری گەشەی سەرمایەداری و ئەو بوار و فرسەتانەی بۆ ئەو چینە ڕەخسا وئەو دەسکەوتانەی کە بەخەباتی خۆشیان بەدەستیان هێنا، جێگە و شوێنی کۆمۆنیزمیش ئاڵ و گۆڕی بەسەرداهات. لە سەرەتای سەدەی بیستەوە، لەسەر بناغەی ئەو ئالوگۆڕە گەورانەی بەسەر کۆمەڵگای سەرمایەداریی ئەورووپی و کرێکاراندا هاتن، لە دەروونی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیشدا، ئالوگۆڕی

ڕیشـــەیی ڕوویانـــدا. دابەشـــبوونی ئەو بـــزووتنەوەیە بە بـــاڵی کەمایـەتییەکی ڕادیکـاڵ و زۆرینەیەکـی ڕیفۆرمیسـت لە ئەورووپـا، و کەمینەیەکـی مەنشـەفیک (ڕیفۆرمیسـت) و زۆرینەیەکـی ڕادیکـاڵ لە ڕووسیا، ڕەنگدانەوەی ئەو قۆناغە تازەیەی کۆمۆنیزم بوو.
گەشەی سـەرمایەداریی ئەوروپا و بەهرەمەندبوونی چینی کرێکار لە جێیەکی کـۆمەڵایەتی و سیاسـیی بەهێـز، فتیلـی کۆمـۆنیزمی دەرهێنـا وزەمینەی گەشەکردنی لێ سەندەوە، چونکە کرێکاران چیتر ئەو چینە نەمان کە (جگە لە زنجیرەکانیان هیچی تریان نەبێ کەلەدەستی بدەن).
هەرچی ڕووسیایە، بەپێچەوانەوە، هەم زۆرداریـی قەیسـەریەت و هەم هەژاریەک کە دواکەوتـوویی سـەرمایەداری و سـەرەتایی بـوونی ئەو سیسـتمە ئـابووری و کـۆمەڵایەتیە بەرهەمیـان هێنـابوو، ژیـنگە و زەمینەی بۆ کۆپییەکی ڕادیکـالی کۆمـۆنیزم ئەڕەخسـاند و هەژاری و نەبـوونی دیموکراسـی و سـوونەتەکانی، مەنشـەفیزم و ڕیفۆرمیزمیـان لاوازتـر ئەکـرد. بەردەوامیـی ئەم پرۆسـەیە وا ئەکـات کە دواتـر کۆمۆنیزم مەڵبەندەکانی بگوێزرێتەوە بۆ ئاسیا و لە ١٩٥٠ – ١٩٧٠ دا خـوارووی ڕۆژهەڵاتـی ئاسـیا ببێـت بە ژیـنگە و مەڵبەنـدی سـەرەکی گەشە و کارلێکی کۆمۆنیزم، چونکە لەوێش چینی کرێکار و خەڵکێک پەیدابوون کە (جگە لە زنجیرەکانیان) هیچی تر شک نەبەن.
ئەوە زۆر بە کورتی پاکانە زەمانی و مەکانیەکانی برەوسـەندنی بیری مارکسـی بـوو. ئەمڕۆ ئیتر ژینگەی لەوجۆرە شـوێنەوارێکی ئەوتـۆی نەماوە. گەرچی ستەمی سەرمایەداری بەدەیان شـێوازی تـر درێژەیـان هەیە، بەڵام مارکسیزم دوای شکستی هەموو مۆدێلەکانی سۆسـیالیزم و ئەو هەژاری ودەزگا سـتەمکاریە بێ وێنەیەی لە منالّدانی شۆڕشـی ئۆکتـۆبەرەوە لەدایـک بـوو، ئەو شانسـەی لەدەسـتدا کە جـارێکی تـر ببێـتەوە بەسەرپۆشـێکی تـری دڵـڕفێن وجەززاب بـۆ خەبـات لەدژی ستەم و دۆزینەوەی ڕێگەی ئازادی.

## مەترسیی سەرلەنوێ، ماڵ گوێزانەوەی سەرلەنوێ!!

ماوەیەکی زۆر بوو لەم خانووە مابووینەوە. خانووەکەش جگە لەوەی بچووک بوو باوکیشم لەگەڵماندا ئەژیا. ئەویش هاتوچۆی زۆر بوو و شارەزاییشی لە نهێنی کاری نەبوو و میوانیشی ئەهات. منیش بەهۆی کاری ڕێکخستن و کۆبوونەوەی زۆر و سەردانی هاوڕێی زۆرەوە، چی هی ناو شار و چی لە شارەکانی ترەوە، جگە لە ڕەشبگیریی بەردەوام و توونـدبوونەوەی سەرکوت و زۆربوونی سیخوڕ و پیاوخراپ، بڕیارمدا بگوێزینەوە.

مامۆستا ستاریش تازە لەگەڵ "ئەمیرە"دا کە ئەویش کرێکاری ئەلبیسە و هاوڕێ نەسرین بوو هاوسەرگیریان کردبوو. ئەوان یەکەم ماڵیان لە بەختیاری دانا. بەتەگبیری هاوبەشی هەردوولا خانوویەکی دووقاتی تازەمان لە زەرگەتە بە کرێ گرت. ئێمە لە قاتی خوارەوە وئەوانیش لە قاتی سەرەوە بوون. بەهۆی ئەوەی کە هەردوولامان لەهەمان ڕێکخراودا کارمان ئەکرد و پەیوەندیی ڕێکخراوەییشمان پێکەوە بوو ئێرە لە زۆر لایەنەوە گونجاو بوو و لە هەندێ ڕوویشەوە باش نەبوو، چونکە منیش و ئەوانیش زۆر نهێنی و مەسەلەمان تووشی پێکدادان ئەبوو. ئەو ماوەیەش بوو کە من و مامۆستا و نەبەز خالید هەر سێکمان لە یەک شانەدا چالاکیمان ئەکرد.

نینای کچم تەمەنی بووبوو بەیەک ساڵ. نینا لە ١٣/ ٥/ ١٩٨٨ لەدایک بوو. لەگەڵ نەسریندا لە پیشەوە بڕابووینەوە لەسەر ناوەکەی، چونکە بۆ نەسرینم گێڕابووەوە کە نەجاتی گیانبەختکردووی هاوڕێم، ئاواتی

ئەوە بوو کە کچێکی ببێت و ناوی بنێ نینا، بەڵام ئەو ئاواتەی نەهاتە دی.
نەسرین دەستی کردبووەوە بە دەوام لە کارگەی ئەلبیسە وکە ئەو ماڵی جێ ئەهێشت بەهۆی گریانی نیناوە دراوسێکان ئەیانزانی من هەمیشە لە ماڵەوەم. بۆیە لەبەر دووریی زەرگەتە لە شار و لە ماڵی باوکی نەسرین و هەروەها بۆ ئەوەی نینا نزیک بێت لە نەنکی، دیسانەوە بڕیاری ماڵ گوێزانەوەماندا.
خەسووم هاوکاریی زۆری کردین و لە کۆڵانێک لەولای خۆیانەوە، لە برایم پاشا، خانوویەکی گەورەتری بۆ پەیداکردین. بە تاقیکردنەوەی خۆم و گرتنی خانووەکەی هەولێریشمان من زۆر سڵم ئەکردەوە لە موختاری گەڕەکەکان و دوای گوێزانەوەمان ئینجا خەسووم وتی: ئێرە جێیەکی خۆشە و ئەوە کاک عارفی موختاری گەڕەکیش لە کۆڵانەکەتاندایە. وتم: بەشەرەفم بمزانیایە نە ئەهاتمە ئێرە، بەڵام ئەو ونەسرینیش دڵنیایان کردمەوە کە ئەو کاک عارفە پیاوێکی باشە، بەڵام من هەر دڵم کرمێ بوو لەو مەسەلەیە.
بەرەبەرە ئێرەش وەکوو جاران بووەوە بە جێی کۆبوونەوە ومەڵبەندی کارەکانمان و هیچ چارێکی تریشمان نەبوو بەڵام زۆر ئاگاداری ئەوەم ئەکرد کە کێشەی ئەمنیم بۆ دروست نەبێتەوە کە ناچارم بکات بەگوێزانەوەی سەرلەنوێ. دووکانێکی بچووک بەدەم خانووەکەمانەوە بوو نەبەزی هاوڕێم بەکرێ گرتی و کردی بەدووکانی وردە فرۆشی کە بۆ چاودێریی دەوروبەر وئەمنیەتی ئێمەش باش بوو. هەر لەو سەروبەندەشدا نەبەز لەگەڵ "شەونم"دا هاوسەرگیریان کرد، بەڵام هەر لە بەختیاری لەگەڵ ماڵی باوکی نەبەزدا ئەژیان. لەڕێی نەبەزیشەوە لە کاتی خانووەکەی پێشوومانەوە دوکتۆر "کامەران قەرەداغی" بوو بە هاوڕێمان. کامەران لەگەڵ "نیاز"ی خوشکی نەبەزدا هاوسەرگیریان کردبوو و نیازمان پێشتر ئەناسی بەهۆی هاتووچۆی ماڵی باوکیەوە. پەیوەندیی سیاسیمان

لەگەڵ کامەراندا لەسەر بناغەی گفتوگۆبوو سەبارەت پرسەکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و بارودۆخی عێراق و کەمتر شوناسی ڕێکخراوەییمان بۆ ئەهاتە پێشەوە. لەڕێگەی نەبەزیشەوە بیروبۆچوونی کامەرانم زیاتر ئەناسی و جاروباریش لە کۆبوونەوەی خێزانیی هەموومانـدا گفتوگۆی سیقۆڵیمان ئەکرد و پەیوەندیەکانمان پتەوتر ئەبوو، بەڵام هەر لە چوارچێوەی سیاسیدا مابۆوە. ئاگادار بووم لەوەی کە کامەرانیش گرووپێکی مارکسین کە دواتر زانیم ناویان (پرۆژە)یە و لەگەڵ ڕەوتی کۆمۆنیستدا زۆر نزیک بوونەتەوە و پاشان بە کۆمەڵ پەیوەست بوون بە ڕەوتەوە. چەند جارێکیش لە بۆنەی کۆمەڵایەتیدا "نەریمان"ی برای دوکتۆر کامەرانم ناسیبوو.

پاش لەدایکبوونی نینا هەستێکم لا دورست بووبوو کە ئەم شێوە ژیانەی من سەختیی زۆر بۆ ئەویش و دایکیشی دروست ئەکات و هەمیشە هەوڵم ئەدا کە باری ژیانی ئەمنی و سیاسیی خۆم نەبێت بە قورسایی بەسەر ئەوانەوە. بەڵام هیچ هەوڵێک نەیئەتوانی ئەو هیوایەم بەدی بهێنێت. گوزەرانمان لە ڕووی دارایـیەوە خراپ نەبوو. من لەلایەن هاوڕێکانمەوە کرێ خانووەکەم دابین بووبوو. نەسرینیش داهاتێکی کەمی هەبوو جگە لەوەی کە دایکم پێش مەرگی بڕێک پارەی بەزۆر داپێم منیش لەڕێی هاوڕێکانمەوە بە سوود ئەوپارەیەم خستبووە کارەوە. عوسمان و ستاریش جگە لەوەی هاوڕێی نزیک و هاوبەندی ئەبووغرێب بووین دووکانی زێڕینگەرییان هەبوو و ئەوانیش پشتیوانیان ئەکردم. لە دوای هاوسەرگیری و لەدایکبوونی نینا و بەوهۆیەوە کە ئیتر هەم ئەمە ژیانمە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ یا تا ئەم ڕژێمە لەسەرکاربمێنێت، وهەم بۆ ئەوەش کە باڵانسێک دروست بکەم لە نێوان ژیانی تاسەر ئیختیفا و ژیانی کۆمەڵایەتی و خێزانیم، جۆرێک ئاڵوگۆڕم لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆمدا پێکهێنا.

لە ئێستادا لە ڕووی سایکۆلۆجیەوە بیرم لە کۆتایی هاتنی ئەم ژیانی ئیختیفایە نەئەکردەوە بەڵکوو هەوڵم ئەدا کە چۆن هەمان ژیان

ڕێکبخەم و باڵانسی نێوان بوونەوەرە سیاسیەکە کە خۆمم لەگەڵ بوونەوەرە کۆمەڵایەتیەکە کە نەسرین و نینا و خۆمم، ڕابگرم. ژیانی هاوسەرگیری و خێزانیشمان ژینگە و پەردەیەکی باش بوو بۆ داپۆشینی زۆر کون و کەلەبەری ژیانی سیاسی و لەبیربردنەوەی ژیانی ئیختیفام. بەڵام ئەو ژیانە کۆمەڵایەتیە نوێیە زۆر لایەنی نێگەتیڤیشی هەبوو و تەنانەت جاروبار مەترسیشی هەبوو کە ئەبوایە بە دیقەتەوە ئاگاداری بم، چونکە درێژە کێشانی وەزعی ئەمنیم و شارە وشار و شوێن گۆڕکێی زۆر، بە حوکمی درێژیی ئەو ماوەیە و فراوانبوونی پەیوەندیە سیاسیەکانم، جگە لە پەیدابوونی تۆڕێک پەیوەندیی تازەی دوای هاوسەرگیریم، نەئەبوو بیرم بەرێتەوە کە من ئێستاش بەدواوەمەن و وەزعی ئاسایشی وڵاتیش خراپتر بووە نەک باشتر. وا ڕاهاتبووم کە بڕۆیشتینایە بۆ هەرماڵێک و سەفەری هەر شار و شوێنێکم بکردایە، بەتەنها بوومایە یا بە خێزانی، یەکەم شت چاوم ئەگێڕا بۆ دەریچە گونجاوەکانی ئەو ماڵ و شوێنە و ئەگەڕام بۆ باشترین ڕێگەی دەربازبوون لەحاڵەتی ڕوودانی هەر مەترسیەکدا. ئەوە بووبوو بە بەشێکی نورماڵی کەسایەتی و جموجۆڵم کە پێویستی بەوە نەئەکرد کە کەسێک بیرم بێنێتەوە. بە کورتیەکەی خووەکانی سەگەکەی باڤلۆفم گرتبوو.

لە ئێستادا کە ڕکود و خامۆشی بەسەر بزووتنەوەی چەپدا زاڵ بووە، ئێمە جگە لەکاری ڕۆتینیی کۆبوونەوە و گفتوگۆ، چالاکیەکی ترمان نیە گەرچی پەیوەندیە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانمان وەکوو خۆی ماوە وبەردەوامە. ئەڵقەی ناوەندیی بلێسە هەر ئەو سێ کەسەی جارانین.

سەرتاپای کوردستانیش خامۆشیەکی سیاسیی تەواو داپۆشیوە. لە مێژووی نوێی کوردستاندا هیچ سەردەمێکی وا خامۆشی سیاسی و نەبوونی هیچ جموجۆڵێک نەبینراوە. ئۆپۆزیسیۆن، بە سیاسی و چەکدارەوە، بەتەواوی لاوز کراوە. هیچیەک لە بزووتنەوە و هێزە

سیاسییەکان جووڵەیەکیان نییە لە بواری جووڵاندنی شەقام و لەبەرانبەر ئەو هەموو ستەم و زوڵم و زۆرداریەی ڕژێم کە هەموو سنورێکی تێپەڕاندووە، بەڵکوو ڕێکخراوەکانیشیان یا لەبەر زەبری دیکتاتۆریەت هەڵوەشاونەتەوە یا تووشی ئاشبەتاڵ و نائومێدی بوون. بزووتنەوەی چەپیش جووڵە و دەرکەوتن و تەفاعولێکی نیە لە گەڵ پێویستیەکانی سەردەمدا و لە هیچ شوێنێکەوە دیار نیە.

شوێنەکانی تری عێراقیش لێرە باشتر نین. لە خوارووی عێراق لە ڕێی سەربازگیری و ڕەشبگیری وماڵوێرانی هەشت ساڵی شەڕەوە، ڕژێم بە تەواوی باڵادەستبووە و هیچ ناڕەزایەتیەکی خەڵکی ناتوانێ سەردەربێنێ یا هیچ جووڵەیەکی سیاسیی دژ بەڕژێم بوونی نیە. هێزە سیاسیە شیعیەکان هەموو لە ئێران مۆڵیان داوە و بوونە بە دەستکەلای ستراتیجیەتی ئێران لە عێراقدا.

گشت ئەوانە بواری مانۆریان بۆ ڕژێم خۆشکردووە. صدام و دارودەستەکەی بەناوی بونیادنانەوەی عێراقەوە کەمپەینێکی چەواشەکاری و لەچاوەڕوانی هێشتنەوەی خەڵک و مێشک شتنەوەیان بەڕێخستووە. دەوڵەت بەتەواوی ئیفلاسی کردووە و نرخی نەوتیش کە تەنیا سەرچاوەی دەرامەتی عێراقە دابەزیوەتە ئاستی ١٥ دۆلار. بێزاری و ناڕەزایەتیی خەڵک لەوپەڕیدایە، بەڵام لە ناخیاندا پەنگی خواردۆتەوە و سام و ترسی ڕژێم ڕێ بەدرەبڕینیان نادات. بەرەی خەڵک ماندوو ولاواز و پەراکەندە و خاوەنی ئیرادەیەکی لاوازە و بەرەی دەسەڵات سەرگەرمی نەعرەتە کیشانی سەرکەوتنە. ڕژێم زۆر بە سیستماتیک ئەیەوێ هەیبەتی دەزگاکانی وەکوو سوپا و ئامرازەکانی تری داپڵۆسین لە خۆیان سامناکتر وێنا بکات تا خەڵکی پێ چاوترسێن بکات. ئەمڕۆ لە بواری سەرکوت و داپڵۆسین و دیکتاتۆریەتدا جیاوازیەک نەماوە لە نێوان کوردستان و بەشەکانی تری عێراق و ئاشی دیکتاتۆریەت لە هەموو شوێنێک وەکوو یەک بەوپەڕی هێزەوە ئەگەڕێ و خەڵک ئەهاڕێت. بەکورتی عێراق لەسەر

بەرمیلێک باروت وەستاوە و گەر تا دوێنێ بە بیانووی شەڕەوە ڕژێم ئەیتوانی هەموو داخوازی و مافەکانی خەڵک بخاتە لاوە، ئەمڕۆ ئەو بیانووەش نەماوە.

ناکۆکیی بەرەی خەڵکی هەموو عێراق لە لایەک و ڕژێم لە لایەکی تر، تابێت قوولتر ئەبێتەوە. خەڵک چاوەڕوانیان زۆرە کە چاکسازی بکرێت، چونکە ژیان وگوزەرانیان لە ئاستێکی زۆر خراپدایە و سەرکوتگەریی بێ وێنەش تەنانەت دوای نەمانی بیانووی شەڕیش، تەواو هەراسانی کردوون. لە بەرامبەردا ڕژێم لە ڕووی دارایی و ئابووریەوە تووشی ئیفلاس بووە و وڵاتانی کەنداو و جیهانی دەرەوەش چیتر ئامادەی کۆمەکی دارایی و ئابووری نین پێی. هەموو ئەو بارودۆخە دەستیان داوەتە یەک و قەیرانێکی گەورەی ئابووری و کۆمەڵایەتی وسیاسیان دروست کردووە.

هیچ نیشانەیەک لە گۆڕانی نارەزایەتیی پەنگەوەخواردووی دەروونی خەڵک نابینرێ بۆ بزووتنەوەیەکی سیاسی- جەماوەریی گشتی. هێچ پلاتفۆرم و بەدیلێک لە لایەن هیچ هێز و لایەن و هاوپەیمانیەکی سیاسی یا حیزبیەوە لە ئارادا نیە. لە کاتێکدا هەموو پێویستیە بابەتیەکانی تەقینەوەی قەیرانی ئابووری و کۆمەڵایەتیی لە وڵاتدا لە ئارادایە، بەڵام بەهۆی بۆشایی بەدیلی سیاسی، جا لە بەرەی ڕاست یا چەپی کۆمەڵگاوە بێت، ئەو خامۆشیەی جەماوەر لە عێراقدا بەردەوامە. ئاستی هۆشیاریی خەڵک لە نزمترین پلەیدایە. ڕووتێکردنی خەڵک بە دواکەوتوویی و خورافات و دەیان دیاردەی تر، ئاکامێک و دەرهاویشتەیەکی سروشتی ئەو بارودۆخەن. ئەوانە بواری مانۆر و درێژەی سەرکووت و کەڵبە نیشاندانیان بۆ ڕژێم ڕەخساندووە و خۆیان ئەزانن کە لەسەر چ بەرمیلێک لە باروت دانیشتوون کە تەنها بردنەسەری گێچی سەرکوت ئەتوانێ پێش بە تەقینەوەی بگرێت. ئەوە ئەو حاڵەتانەیە کە لە فکری سیاسیدا پێی ئەووترێت: قەیرانی گشتی!! خەڵک بە دونیایەک لە داخوازی و ئاوات و ئارەزووی

پەنگەوەخـواردوو و چەپێنـراو و جەڕێنـراوەوە لەلایەک ولەولاشــەوە ڕژێمێکی سەرتاپا چەکدار و بارگاوی بە گیانێکی تۆتالیتاریانی بەهێز کە جـگە لە ســەرکوت هـیچ توانــایەکی دارایـی و ئـابووریی نـیە بـۆ وەڵامدانەوە بەو هەموو چاوەڕوانیەی خەڵک!!

ڕژێـــم بـــۆ ئامرازێـــک ئەگەڕا تـــا ئەو قـــین و نـــاڕەزایەتیە زۆرە پەنگەوەخـواردووەی دەروونـی خەڵکـی پـێ تەنفـیس بکـا تـا ڕێ لە تەقینەوەی بگرێت.

## داگیرکردنی کوەیت

داگیرکردنـی کوەیـت بە کۆمەڵێـک بـڕ وبیـانووی بـێ بـنەوانەوە ئەو ئـامرازی تەنفیسـە بـوو کە ئەندازیارانی سیاسـەت و صـدام لە عێراقدا دۆزیانەوە. ئەم داگیرکردنە پیادەکردنێکی زەقی میتۆدی هەڵمەت بردن بوو بۆ پێشەوە بۆ چارەکردنی قەیرانە ناوخۆییەکان.

شـەوی یەکی ئـاب هەنـدێ هـاوڕێی خـۆم بە خێزانـی لە کەرکـووکەوە میوانمان بوون ولەبەر گەرما لەسـەربان نووسـتبووین. مـن فێرم زوو لەخەوهەسـتم. بەیـانی پـێش ئەوەی کەس لەخەوهەڵسـێت ڕۆیشـتم لە سەموونخانەیەکی نزیکیماڵمان سەموون بکڕم. بینیم ڕادیۆ بەدەنگی بەرز باسـی (ڕزگـارکردنی کوەیـت) و (گەڕانەوەی فەرع بـۆ ئەسـڵ) ئەکات. زانیم قەومـاوە و هـاتمەوە بەپەلە هاوڕێکانم لەخەو ڕاپەڕان و هەواڵەکەم بۆ باسکردن. زانیم کە ئەمە سـەرەتای قۆنـاغێکی نـوێیە لە عێراقـدا و کەس نازانێـت کە گەمێـی شـڵەقاوی دوای ئەم ڕووداوە، لە کوێدا لەنگەر ئەگرێ وئەگیرسێتەوە.

میوانەکانمـــــان هەر ئەو ڕۆژە گەڕانەوە. بـــــۆ ئێـــــوارە بەرەبەرە ووردەکـاریی پێشـهاتەکان دەرئەکەوتـن و ڕۆژنامەکـانی دەوڵەت دوای نیوەڕۆ ئەگەیشتنە سلێمانی. سەروسیمای میلیتاری بەشارەوە دەبینرا. گەڕانــی مەفــرەزە بە شـــەقامەکاندا زیـــادی ئەکـــرد. مقۆمقــۆی زۆر کەوتبوە ناو خەڵکەوە و دیسـانەوە هەوری چڵکنی شـەڕ و کوشـتار و نەڕەنەڕی دەزگــا میـدیاییەکانی ڕژێـم بەرزبـوونەوە. تەنهــا بــکەر و شـــیکەرەوە و ئاراســـتەکەری ڕووداوەکـــانی وڵات و ئەم پێشـــهاتە گەورەیەش، هەر خودی ڕژێم و دەزگا حیزبی و میدیایەکانێتی. نەهیچ

ئۆپۆزیسیۆنێک نە دەنگ و ڕەنگێکی میدیایی جیاواز هەیە تا گوێبیستی بیت و بەراووردی نێوان سیناریۆکانی پێ بکەیت. دەزگاکانی میدیای ڕژێم ڕاهاتوون لەسەر چەواشەکاری و درۆ، بۆیە ناکرێ پشتیان پێ ببەسترێ بۆ کێشانی وێنەیەکی دروست یا نیمچە دروست لەسەر بارودۆخەکە. میدیا و سەرکوت یەکتریان تەواوئەکرد و مرۆڤی عێراقی چەند قین و نەفرەتی لە دەزگاکانی سەرکووتی ڕژێم هەبوو، بەهەمان ئەندازەش لە میدیاکانی. نەڕەی تەلەفزیۆن و موزیعە دەنگ ڕەقەکانی گوێی مرۆڤ کەڕ ئەکا. دەمێک بوو صدام لەسەر ڕەواڵی سیستمە شمولیەکانی جیهان و بەتایبەتی ئەورووپای سۆسیالیست میدیای کردبوو بە دیوی دووەمی دەزگای سەرکووت.

ئەم هەنگاوەی ڕژێم هەموو فایلەکانی سیاسەتکردنی لە ناوخۆی عێراق و ناوچەکە و بگرە جیهانیشدا تێکەڵ بە یەک کرد و قەیرانەکەی بردە ئاستێکی زۆر قووڵتر.

سوپای گاردی کۆماری زۆر بەئاسانی لە ماوەی ٥ کاتژمێردا کوەیتی داگیر کرد. ئەم هەنگاوەی بەشێک بوو لە خوێندنەوە کورت بینەکانی صدام ودەوروبەرەکەی سەبارەت بە دونیای دوای نەمانی شەڕی سارد. ئەڵقەیەکی تر بوو لەوەهمەکانی صدام و مغامەراتە دۆنکیشۆتیەکانی ئەو. بەڵام ئەمجارە هەم گۆڕەپانی شەڕەکە و بابەتی شەڕکردنەکە جیاواز بوو هەم کات و سەردەمەکەش وەکوو سەردەمی شەڕی ساردی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا نەبوو. دونیای یەک جەمسەریی ئەمڕۆ هیچ بوارێکی بۆ مانۆڕی صدام نەهێشتبۆوە.

ئامانجی صدام لە داگیرکردنی کوەیت زۆر شت بوو. عێراق لە دوای شەڕ لە گەڵ ئێراندا ڕووبەڕووی دەیان کێشە ئەبۆوە. خاوەنی ١ ملیۆن سەرباز بوو کە هەم بووبوو بە بارێکی قورس و هەم بە جێی مەترسی لە هەر وەرچەرخان و ئاڵوگۆڕێکدا. جگە لەوە عێراق سەدان ملیار دۆلار قەرزاربوو. ئابووریەکەی تێکشکا بوو. نرخی نەوت لەبازاڕدا گەیشتبوو بە نزمترین ئاست. زۆربەی شارە سنووریەکان

وێران کرابوون. ئابووریەکەی ئیفلیج بووبوو. گشت ئەوانە و ئاگری ژێرخۆڵەمێشی نارەزایەتیی خەڵک بەرانبەر بە ڕژیم لە کوردستان و خوارووی عێراق، ماتریاڵەکانی ئەزمەیەکی کۆمەڵایەتیی قووڵیان سازکردبوو کە پێویستیان بە بیانوویەک هەبوو بۆ دامرکاندنەوەیان. داگیرکردنی کوەیت، لەڕوانگەی ڕژێمەوە، ئامرازێک بوو بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە.

ئەو ماوەیە تاقیبکردنی دەنگوباس و هەڵوێستە جیاوازە نێودەوڵەتیەکان تەنها لەڕی ڕادیۆی بی بی سی وئیسرائیل و مۆنتی کارلۆ ودەنگی ئەمریکاوە مەیسەر دەبوو. ڕژێم گەورەترین هەڵمەتی سیاسی و دیبلۆماسی و میدیایی دەسپێکرد. لەناوخۆشدا، لەترسی تەقینەوەی بارودۆخەکە، ڕژێم ئامادەکاریی بۆ سەرکوت زیاد کردبوو و فەزای ترسی بە تەواوی سەپاندبوو.

بیانووهێنانەوەی زۆر لایەن و هێزی ناسیونالیستی و چەپ و سۆسیالیستی جیهانی و ناوچەیی بۆ داگیرکردنی کوەیت لەلایەن صدامەوە و ڕازاندنەوەی ئەم تاوانەی بەناوی (پاڵەوانی نەتەوەی عەرەب) و (سیمبولی بەربەرکانێ لەگەڵ ئیمپریالیزم و دارودەستەکانی)، یا پیاهەڵدان بەم سیاسەتەماڵوێرانکەرەی وەکوو کردەیەک لە پێناوی دابەشکردنی ڕەواتری سامانی جیهانی عەرەبی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەندەکاندا یا ڕازاندنەوەی ئەم داگیرکاریە وەکوو خزمەت بە پرسی فەلەستین؛ گشتیان چوونە خانەی پشتگیریی ئەو ڕژێمە دیکتاتۆر و داگیرکەرە و سووربوونی خودی صدام لەسەر گلدانەوەی کوەیت و بەسووک تەماشاکردنی مەترسیەکانی ئەم هەنگاوە ودەرئەنجامەکانی.

هاوکیشەیەکی سیاسیی تەواو جیاواز لە چاو ڕۆژی پێش ٢/ ٨ دا دروست بووبوو.

خەڵک بە حەساسیەتێکی سەیرەوە وبە دیدێکی تێکەڵ لە ترس و ئومێدەوە چاودێریی ئاڵوگۆڕەکانیان ئەکرد. ترس لەسەرکەوتنی ڕژێم

لەم مانۆرەیــدا و باڵادەســت بــوونی کە بەمانــای درێــژەدان بــوو بەسـەرکوت و کوشـت و بڕی تـا سـاڵانێکی نادیـاری تـر و ئومێـدیش بەوەی کە ئەم ســەرچڵی و ڕیســکەی کە صــدام کردوویەتــی ببێــتە بیــانوویەک بــو لەنــاوبردنی لەلایەن کۆمەڵگــای نێــودەوڵەتیەوە و پێچانەوەی تەمەنی ئەم بەڵایە.

میزاجــی سیاســیی خەڵــک لەم قۆنــاغەدا ڕەنگــدانەوەی ســەرجەم بارودۆخی ئەو چرکەساتە و قۆناغی پێش ئەم پێشهاتە تازەیە بوو. خەلکی عێراق بەگشتی، گەرچی هەتا سەر ئێسقان قین لە دڵ بوون بەرانبەر بە ڕژێم، بەڵام ڕووداوە خوێناویەکانی دەیەی هەشتاکان بە تەواوی هێـزی لەبەر بڕیبــوون. ئەوان ئامــادەبوون پێشــوازی لەهەر لایەن و دەولەتێک بکەن بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی کە خۆیان پێیان نەئەکرا، واتە ڕووخـانی ڕژێم، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە چی جێی ئەگرێتەوە. بە کورتی یەک شت بەڕوونی و ڕێکی ئەبینرا ئەویش ئەو ڕاستیە بوو کە بەرەی خەڵک لەم پێشهاتەشدا ڕۆڵێکیان نیە و ئەم وەرچەرخـانە گەورەیەش بە بەبێ ڕۆڵـی ئەوان یەک لا ئەبێـتەوە جـا بەباش یا خراپ ئەوە مەسەلەیەکی ترە.

داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە لەسەر چەند وەهمێکی سیاسیی صدام دامەزرابوو:

**یەکەم:** ئەمریکـا و ڕۆژئـاوا پێویسـتیان بە صــدامێکی بەهێـزی دوای ســەرکەوتن بەســەر ئێرانــدا هەیە و بــۆ ڕێگــرتن لە بڵاوبــوونەوەی شــەپۆلی ئوســـوڵیگەرایی ئیســـلامی پێویســـتیان بەو هەیە، بــۆیە چاوپۆشی لەم داگیرکردنە ئەکەن.

**دووەم:** گەر ئەمریکـا پەلامـاری سـوپای داگەرکەری عێـراق بـدات لە کوەیت، جەماوەری عەرەب وموسوڵمان لە هەموو جیهاندا ڕائەپەڕن و پەلامـاری ئەمریکـا و دەوڵەتە هاوپەیمانەکـانی ئەدەن و شــیرازەی ئەو نیـزامە سیاسـیە جیهـانیە تێکـدەچێت کە خەریـکە دوای کۆتـایی شەڕی سارد لە قازانجی ئەمریکا پێک دێت.

**سێیەم:** داگیرکردنی کوەیت مەسەلەیەکی ناوخۆیی ناو جیهانی عەرەبی و ئەو وڵاتانەیە و ئەمریکا کاری بەوە نیە .

صدام چەند هەفتە پێش پەلاماری کوەیت لەدیداریدا لەگەڵ ئیپریل گلاسپیی باڵوێزی ئەمریکا ئەوەی لێبیستبوو.

**چوارەم:** فایلەکانی ڕاگرتنی دەرچوونی نەوت لە کەنداو و بوومەلەرزەی بازاڕی نەوت و گرانیی نرخی دەتوانن کێشە بخەنە ناو حکوومەتەکانی ڕۆژئاواوە و سەرەنجام ببنە مایەی دەستهەڵگرتن لە هێرشی سەربازی بۆ سەر عێراق.

**پێنجەم:** دەها فایلی تری وەکوو مەسەلەی فەلەستین هەڕەشە لە ئیسرائیل و ..تاد، لە بەردەستی صدام دا بوون کە پێی وابوو کە ئەتوانی بەهۆیانەوە داگیرکردنی کوەیت بکات بە ئەمری واقیع و بیسەپێنێت بە سەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا کە ڕەنگ بێ تەنها بە سەپاندنی هەندێ سزای ئابووری وبازرگانی و ئیدانەکردن وازی لێبێنن.

ڕژێم دەستی کردەوە بە ڕەشبگیری خەڵک بۆ سەربازی و ڕەوانەکردنیان بۆ شەڕی کوەیت.

گرووپی بڵێسە بەرەو پووکانەوە ئەچوو و بە حوکمی ڕۆژگار لەهەموو لایەکەوە پاڵەپەستۆ دەیخنکان. باس و جەدەلی سیاسی لەناو خەڵکدا زیندووبوونەوە. ئێمە بەلامانەوە گرنگ بوو کە گوێ بیستی هەڵوێست و سیاسەتی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ببین کە لەو قۆناغەدا بەتەواوی لەژێر هەژموونیی باڵی کۆمۆنیزمی کرێکاریدا بوو. لەناو ناوەندەکانی تری بزووتنەوەی کۆمۆنیستیش جموجۆڵ و گفتوگۆ و ئامادەکاری چووە ئاستێکی بەرزتر. هێزە سیاسیە کوردستانیەکانی شاخیش کە لەبەرەی کوردستانیدا کۆببونەوە و لە ئێران گیرسابوونەوە، کەوتنەخۆ. بەگشتی فەزایەک دروست بووبوو کە خەڵک ئومێدیان پەیداکردەوە بە بەدیهاتنی ئاڵوگۆڕێک لە عێراقدا کە لانی کەم کەمێک لە قورسایی سەرکوت و عەسکەرتاریەت و

ڕەشبگیر کەم بکاتەوە گەرچی مەعلووم بوو کە هەر ئاڵوگۆڕێک بێتەدی دەبێ بەهۆی پەلاماری عێراق لەلایەن ئەمریکاوە بێت. جەوی سیاسیی خامۆش و بێ ڕەقیب بوونی ڕژێم خەریک بوو ئەگۆڕا بە جۆرێک لە چاوەڕوانیی ڕووداني ئاڵوگۆڕی گەورە لە وڵاتدا. گۆڕینی ئەم هاوکێشەیە کە بریتی بوو لە باڵادەستیی تەواوی ڕژێم لەناو عێراقدا و پاشەکشەی بەردەوام و دۆش دامانی خەڵک کە سیمای سیاسیی تا ئێستای عێراقە، بە ئاراستەی توونددبوونەوەی ململانێ و بەربەرەکانێی خەڵک لەگەڵ ئەم ڕژێمەدا، بەڵام لە پەنای شەڕی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەگەڵ عێراقدا، ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر ئەبوو.

بۆ ئێمە کە تا ئەوکاتە وەکوو گرووپێکی چەپ درێژەمان بە خەباتی سیاسیی خۆمان دابوو مەعلووم بوو کە شێوەی کاری تا ئێستا، لەهەردوو ڕەهەندی چۆنایەتی و چەندایەتیەوە، کارساز نیە. بەڵام خاڵی پۆزەتیڤی بلێسە بۆ ئێمە ئەوە بوو کە بوو بە چوارچێوەیەک بۆ هێشتنەوەی زیندووی پەیوەندییەکی سیاسیی فراوان کە لە قۆناغی داهاتوودا بەباشی خستمانە گەڕ بەتایبەتی لە ڕاپەڕیندا.

لە درێژەی گفتوگۆ و چالاکیەکان و پەیوەندیەکانمدا لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێ و کەسایەتی چەپ لە دوومانگی دوای داگیرکردنی کوەیتدا، هەستم بە جمووجۆڵ و ئامادەییەکی باش دەکرد لەناو بزووتنەوەی چەپدا. هەر ئەو جموجۆڵەی ئەو ماوەیە و دەیان کۆبوونەوە گەیاندمی بە کۆمەڵێک سەرەنجامی سیاسیی نوێ. لەلایەکەوە جموجۆڵێکی گەرم و بەهێز لەناو چەپدا و لەسەر زەمینەی نوێی دوای داگیرکردنی کوەیت پەرەی ئەسەند. لەولاشەوە کێشەی عێراق لەگەڵ ئەمریکا و سەرجەم کۆمەڵگای نێودەوڵەتی قووڵتر دەبوونەوە و بە ئاراستەی هەڵگیرسانی شەڕ هەنگاویان دەنا. سەرباری سەرکووت و داپڵۆسینیش ئامادەیی خەڵک بۆ کەڵک وەرگرتن لەهەر فرسەتێک کە لەم قەیرانە نوێیەوە سەردەربێنێت، زیادی ئەکرد. کێشەی سەرەکیی لەبەرەی خەڵکدا پشت بەستنی بێ

ئەملاوئەولا بە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بوو کە ڕۆژانە بانگەوازی خەڵکیان ئەکرد بۆ ڕاپەڕین لە دژی صدام و ئەوکاتە ناویان نابوو هیتلەری سەردەم و گەورە دیکتاتۆری دونیا. لەبەرەی چەپیشدا نارۆشنی و ئاڵۆزی زۆر بوو. عێراق و ئاڵوگۆڕەکانی بووبوو بە سەنتەری قۆناغێکی تری ئاڵوگۆڕی جیهانی لەپاش شکستی ئۆردووگای سۆسیالیستی. کۆمۆنیزمی کرێکاریی ئێران لەگۆشەنیگای سەرکۆنەکردنی نیزامی نوێی جیهانی ورسواکردنی ئەمریکا وەکوو ئەندازیاری ئەو نیزامە هەڵوێستەکانی دیاری ئەکرد. سەبارەت بە عێراق نە بە ئاشکرا و نە دووقۆڵی لەگەڵ ئێمەدا، پێشبینیی هیچیان نەئەکرد و بە کێشەیەکی ئەوتۆیان نەدەژمارد لەم قەیرانەدا. تەنها پێداگریان لەسەر شەڕی چاوەڕوانکراوی ئەمریکا لەسەر عێراق و مەحکوومکردنی هەڵوێستی ئەمریکا و شەڕ بوو وسەبارەت بەماهیەتی ڕژێمی عێراق و چی لەبەرانبەریدا بکرێت ورەوتی ڕووداوەکان لەناو ئەم وڵاتەدا چۆن ئەبێ، خوێندنەوە و قسەیەکیان نەبوو. ئەمان خۆگرێدانەوەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی و کوردستانیان بە ڕۆژئاواوە مەحکووم ئەکرد، بەڵام سەبارەت بەعێراق هیچ هەڵوێستێکیان وەرنەدەگرت. لە کوردستانی عێراقیشدا گەرچی زۆربەی چەپەکان لەژێر کاریگەریی حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا هەڵوێستیان وەردەگرت، بەڵام پەیڕەویکردنی کۆمۆنیستەکانی عێراق لە کۆمۆنیزمی کرێکاریی ئێران بەمانای دەست بەتاڵی و پاسیفیزم بوو سەبارەت بە بارودۆخی ناوخۆی عێراق، چونکە ئەوان هەڵنەگیرسانی شەڕ و پووچەڵکردنەوەی هەوڵەکانی ئەمریکایان کردبوو بە میحوەری سیاسەتی خۆیان.

لە بەرامبەر ئەو بارودۆخەدا، ئێمە بێ ئەوەی ناکۆکیەکانی ئەو سیاسەتەی کۆمۆنیزمی کرێکاریمان لاڕۆشن بێت و هەڵوێستێکی لێوەربگرین، پێمانوابوو کە ئەوە ئەرکی ئێمە خۆمانە کە سەرەتا هەڵوێستێکی ڕۆشن سەبارەت بە قەیرانی دوای داگیرکردنی کوەیت و

پێشـبینیکردنی ڕووداوەکـان دیـاری بکەیـن و سیاسـەت و تـاکتیکی خۆمان لەوبارەوە ڕۆشن بکەینەوە.
بـۆ ئەو مەبەسـتەی سـەرەوە مـن پلاتفـۆرمێکم نووسـی کە شـیکردنەوەیەکی هەمەلایەنەی ئەو پێشـهات و ئـاڵوگۆڕە سیاسـیانەی لەخۆئەگرت. ئەو بابەتەم وەکوو دۆکیۆمێنتێکی سیاسی و بەرنامەیی ئامادەکرد. بەشی یەکەمی شیکردنەوەی بارودۆخی سیاسیی عێراق و قەیرانەکانی دوای وەستانی شـەڕ لەگەڵ ئێران و داگیرکردنی کوەیت و هۆکارەکانی لەخـۆئەگرت. بەشـی دواییشـی بریتـی بـوو لە بەدیلـی خەڵکی کوردستان لەبەرانبەر ئەو باردودۆخە وبانگەواز بۆ ڕاپەڕینی جەمـاوەری و خسـتنەڕووی ئامـانج و داخوازیەکـانی خەڵـک لەو ڕاپەڕیـنەدا. بەداخەوە ئێسـتا ئەو پلاتفـۆرمەم لا نەمـاوە، بەڵام لەژێـر تـایتڵی (نـان، کـار، ئـازادی؛ حکـوومەتی شـوورایی) دا پـوختە و کۆکرابۆوە. ئەڵبەتە تەنها بۆ مێژوو دەبێ ئەوە بڵێم کە من سەرەتا لە جێی حکوومەتی شوورایی (حکوومەتی دیموکراتی) م دانابوو، بەڵام پـاش بڵاوکـردنەوەی وەکـوو پێشنووسـێک بەنـاو کـۆڕ و کـۆمەڵێکی زۆری چەپـدا و ڕەخنەگـرتن لە شـیعاری (حکـوومەتی دیمـوکراتی) گـۆڕیم بە (حکـوومەتی شـوورایی). ئەو پلاتفـۆرمە کە بەڵگەنـامەیەکی ورد بوو بۆ دیاریکردنی سیاسـەت و تـاکتیکی شۆڕشگێڕانەی چەپ و جەمـاوەری خەڵکـی کوردسـتان لەو قۆنـاغەدا بـوو بە نـاوەڕۆکی هەڵسـووڕانی ئەو سـەردەمەمان و لەئاسـتێکی بەرینـی بـزووتنەوەی چەپدا بوو بەمایەی گفتوگۆ و سەرنج وپێشوازی لێکرا.
ئەو پلاتفۆرمە بـوو بە شوناسـی سیاسـیی هاوڕێیـانێکی زۆر و تیایـدا کۆمیتەکـانی ڕاپەڕینمـان وەکـوو گونجـاوترین شـێوازی گردبـوونەوەی جەماوەری بۆ ئەو قۆناغە دیاریکردبوو.
بڵێسە بە هەمان ئەو چوارچێوە ڕێکخراوەیـەی جاران نەمایەوە و ئەو ماوەیە لەسەر بناغەی ئەو پلاتفۆرمە هێزێکی زۆری کـەوادری چەپی لـێ کۆببـووینەوە. لـەو ماوەیـەدا بـە کردەیـی مـن و نەبـەز خالیـد و

مامۆستا ستار وەکو کەسانی سەرەکی لێپرسراوێتی بلێسەمان کەوتبووە ئەستۆ. پاشان لە گەڵ هاوڕێیانێکی وەکوو جەبار مستەفا و ڕێبوار ئەحمەدیش لەسەر بناغەی ئەو پلاتفۆرمە نزیک بووینەوە و ئەوانیش هەندێ پەیوەندیی تریان هەبوو بەتایبەتی بە مەحفەلێکی ترەوە کە تایەر حەسەن و هەندێ هاوڕێی خۆی پێکیان هێنابوو.

لەپەنای ئەم ئاڵوگۆڕانەدا تا دەهات ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕ لە عێراقدا زیادی دەکرد و خەڵکیش خۆی بۆ فرسەتێکی وا مەلاس دابوو کە لە دژی ڕژێم ڕاپەڕین بەرپا بکات.

لەمانگەکانی ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەردا دوای زنجیرەیەک دانیشتن و گفتوگۆ ئەو گرووپەی ئێمە لەسەر بناغەی پلاتفۆرمی (نان، کار، ئازادی؛ حکوومەتی شوورایی) لە گەڵ ئەو دووگرووپەی تایەر و جەبار و ڕێبواردا ڕێکەوتین لەسەر یەکگرتنی خۆمان و ڕێکخستنی ڕیزەکانمان لە ژێر ناوی (یەکێتی خەباتی کۆمۆنیزمی کرێکاری) دا.

چالاکیەکانمان زۆر فراوان وچڕ ئەبووەوە و دەستمان کرد بە کەمپەینێکی فراوان لەناو بزووتنەوەی چەپدا کە بەرهەمی زۆر باشی لێکەوتەوە. لە پەنای ئەوەشدا و پێ بە پێی توونددبوونەوەی ئاڵوگۆڕەکان، ناکۆکیەکانی نێوان بەرەی خەڵک و دەسەڵات قووڵتر و بەهێزترئەبوونەوە. هەموو هێز و بزووتنەوە سیاسیەکان لە سێ بەرەدا خۆیان ئامادە ئەکرد.

**یەکەم:** هێزەکانی بەرەی کوردستانی کە نفووزێکی ڕێکخراوەیی ئەوتۆیان لەشارەکاندا نەمابوو وتەنها پشتیان بە ئیعتیبار و نفووزی سیاسیی جاران و پاشماوەی هێزێکی کەمی پێشمەرگە ئەبەست کە ئاوارەی ئێران بووبوون. بەڵام بەرەی کوردستانی پەیوەندییەکی فراوانی بەستبوو لەگەڵ سەدان سەرۆک جاش و چەکداری ڕژێم بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەولاوازیەی پێگەیان لەشارەکاندا و بەناوی پێداگری لەسەر (یەکگرتویی کورد) ولە ژێر پەردەی (لێبووردنی گشتی)، هێزێکی زۆریان لەناو ئەوانەدا ئامادەکردبوو.

**دووەم:** بزووتنەوەی چەپ گەرچی پەراکەندە بوو، بەڵام هێزی زۆر بوو و لە شارەکاندا لەناو خەبات و بەرگریی خەڵک لەدژی ڕژێمدا مابوونەوە و سەرباری ئیختیفا و سەرکووت و ئیعدام، نفووز و پێگەیان لە شارەکانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێر زۆر بوو. بوونی چەپ لەناو خەڵکدا و تێکەڵیان بە ئازار و خەبات و دەردی خەڵکەوە وقوربانیەکانیان لەو ڕاستایەدا، دەستمایەیەکی سیاسیی و مەعنەویی گەورەی ئەمان بوو.

**سێیەم:** ئیسلامیەکان هێزێکی لاوازی تازەی شانۆی سیاسی بوون کە بە پشتیوانیی ئێران و دەست تێکەڵی لە گەڵ ئیسلامی کەنداو و ئەفغانستاندا خەریک بوو دەهاتنە سەرشانۆی سیاسەتکردن لە کوردستاندا. بزووتنەوەی ئیسلامی بووبوو بە هاوکاری هێزە کوردستانیەکان و لە بەرەی کوردستانیدا ئەندام و هاوپەیمانی ئەوان بوو. ئەمان لەو قۆناغەدا لە ناو خەڵکدا کەمترین پایگایان هەبوو بەڵام ئەندامەتیان لە بەرەی کوردستانی و دەستگرۆییان لە لایەن ئێران و هێزە ناسیۆنالستیەکانی کوردستان بوو بە چەترێکی باش بۆیان بۆ هاتنە سەر شانۆی سیاسەت.

هەر لەو سەروبەندەی قووڵبوونەوەی ئەزمەی داگیرکردنی کوەیتدا، ڕەوتی کۆمۆنیستیش سیاسەت وتاکتیکی خۆیان لەژێرناوی (ئەرکە دەسبەجێکانمان) دا بڵاوکردەوە.

لە پایزی هەمان ساڵدا و بەهۆی هەندێ هەڵە و خەلەلی ئەمنیەوە ڕژێم لە سلێمانی هێرشێکی فراوانی لە دژی هێزە مارکسیەکان دەسپێکرد و زیاتر لە هەشتا کەسی سەر بە (ڕەوتی کۆمۆنیست) لەلایەک و پاشماوەی ئەندامانی (دەستەی پێشڕەوانی پرۆلیتاریا) و (پرۆلیتاریای کۆمۆنیست) دەسگیرکران.

ماوەیەک پێش دەستگیرکردنی لەم گرتنەی ئەمجارەدا، د. کامەران قەرەداغی بەڵینی پەیداکردنی هەویەیەکی تەزویری پێدابووم. دووهەفتەیەک بەر لەدەستگیرکردنی و لەسەر داوای ئەو بۆ

ئامـادەکردنی ئەو هەویەیە لەسـەردانێکی خێزانـی بـۆ مـاڵی ئەوان لە ئازادی، وێنەیەکی خۆمم پێدا و هێشتا چاوەڕوانی هێنانەوەی بووم کە ئەو لەمـاڵەکەی خۆیـدا پەلامـاردرا و دەسـتگیر کـرا. مـن پەیوەنـدیی سیاسیی نزیکم لەگەڵ کامەران دا هەبوو. لە ڕێگەی برادەرەکانیەوە بە شـێوەی ناڕاسـتەوخۆ ئاگـادارکرامەوە لە دەسـتگیریەکەی و وەڵامیـان نـاردبوو کە ئاگـام لەخـۆم بێـت. ڕاسـتیەکەی مـن لام سـەیر بـوو کە هاوڕێکانی بەپەیوەندیی من و ئەو ئەزانن و هەستم کرد کە دیسـانەوە ئەبێ بگوێزمەوە، گەرچی کامەران هەویەی ڕێکخراوەیی منی نەئەزانی چـی جـای ئەوەی لەدەمـی خـۆمەوە بیسـتبێتی. بەڵام ئەو وێـنەیە و نـاردنی پەیـامی هاوڕێکـانی بە ناڕاسـتەوخۆ بـۆم گەیانـدمی بەو قەنـاعەتەی کە دیسـانەوە بگـوێزمەوە. لە تـووی مەلیـک خـانوویەکی ترمان پەیداکرد کە تا ڕاپەڕین لەوێ ماینەوە. ئەمە پێنجەم خانوو بـوو کە دوای هاوسەرگیری لە ١٩٨٧ بەدواوە بگوێزمەوە بۆی.

بەدوای دامەزرانـدنی (یەکێتیـی خەبـاتی کۆمـۆنیزمی کریکـاری)دا ئـێمە ئەرکی خۆمان لە دوو بواری سەرەکیدا ئەنجام ئەدا:

**یەکەم:** جێگیرکردنـی ئەو پلاتفـۆرمە کە بنـاغەی بەرنـامەی سیاسـی – تاکتیکیی ئێمە بوو لەناو جەماوەری کوردستاندا.

**دووەم:** پێکهێنـانی کۆمیتەکـانی راپەڕیـن لە شـارەکانی کوردسـتاندا و گەر کرا لەشارەکانی تری عێراقیشدا.

لە مـاوەیەکی کەمـدا بەسـەرکەوتوانە چەنـدین کـۆمیتەی راپەڕینمـان بە دەسپێشـکەریی کـادر و هەڵسـوڕاوەکانی ڕێکخراومـان لە گەڕەکەکـانی سـلێمانی پێکهێنـا. گەرچـی هاوڕێیـانی ڕێکخـراوی ئـێمە کەسـانی دەسپێشخـەر بوون بـۆ پێکهێنـانی ئەو کۆمیتانـە، بەڵام پێکهاتەیـان نەک تەنهـا تەسـک نەبووبـۆوە بەهاوڕێکـانی ئـێمە، بەڵکـوو تەنـانەت جگە لەکەسـانی کۆمۆنیسـت و چەپـی سـەربەخۆ کەسـانی ئـازادیخواز و شۆڕشگێڕی تریشی تیا بوو.

له سلێمانی هاورێیانی وەکوو نەبەز خالید و مامۆستا ستار وشەونم محمود و ئەمیرە سدیق و خالیدی مەلا عەلی و فەرهاد فەرەج و شیخ وەهاب و لەتیفی برای شەهید نەجات وجەبار مستەفا و شیرین موراد ونەسرین خوارەحم وجەباری سەرشەقام و عەزیز شەریف و تایەر حەسەن و برایم محمد ومن و دەیانی تر، بەوپەڕی هێزمانەوە لەو کۆمیتانەدا هەڵئەسووڕاین. تۆڕی کۆمیتەکان تا ئەهات فراوانتر ئەبوەوە و لە شارەکانی کەرکووک و هەولێریش کۆمیتەکان بە هەوڵی کەسانی وەکوو وەستا جەلال و دلێر لەهەولێر و ئازاد مەجید و ڕێبوار ئەحمەد و دەیان هاورێی تر لەو دوو شارە دامەزران و تا ئەهات نفووزیان زیادی ئەکرد. پێش لێدان لە عێراق، کۆمیتەی باڵای راپەڕینمان دامەزراند، وەکوو بەرزترین ئۆرگان بۆ سەرپەرشتیی کۆمیتەکانی ڕاپەڕین لە شارەکانی کوردستان. پلان و بەرنامەمان بریتی بوو لە خۆشکردنی زەمینەکانی ڕاپەڕینی چەکدارانە و سوودوەرگرتن لەهەر هەل وبۆشاییەک کە بەهۆی هێرش بۆسەر عێراق بۆ دەرکردنی لە کوەیت دێتە ئاراوە. بەشێک لە پلاتفۆرمی کۆمیتەکان بۆ دوای ڕاپەڕین بریتی بوو لە دامەزراندنی شووراکان وەکوو ئۆرگانی بەرگری لە دەستکەوتەکانی راپەڕین و ڕێکخستنی ڕیزی جەماوەری خەڵکی کوردستان و بەرگری لەدەسکەوتەکانیان لە بەرانبەر بە ڕژێم وهەروەها پێشگرتن لەوەی کە بەرەی کوردستانی دەسەڵاتێکی نامۆ بە بەرژەوەندی و خواستی خەڵک بەسەریاندا بسەپێنێت.

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێم کە بەهۆی یەکتر قەبووڵ نەکردن و خەسڵەتی گرووهی و سکتاریستیەوە، سەرباری ئەو قەیرانە گەورەیەی کە لە دوای داگیرکردنی کوەیتەوە عێراقی گرتبۆوە، هیچ نزیکایەتی و پەیوەندی و یەکتر بینینێک لە نێوان هێزە کۆمۆنیستەکاندا، ڕێکنەخرا. لەداگیرکردنی کوەیتەوە تا ڕاپەڕین کە دەکاتە هەشت مانگ، عێراق بوو بە مەڵبەند و بابەتی گەورەترین

ئـاڵوگۆڕ و پێکدادانی سیاسـی، بەڵام کۆمۆنیسـتەکانی عێـراق ئامـادەی کەمترین ئاستی هاوکاری  وهاوئـاهەنگیی ڕاسـتەوخۆ یا ناڕاسـتەوخۆ نەبوون لەناوخۆیاندا.

ئەم بـارودۆخەی نێـوان ڕیکخـراوە کۆمۆنیسـتیەکان تـا سـاڵی ١٩٩٣ درێـژەی کێشـا کە ئەو سـاڵە هەموویـان پـێکەوە حیزبـی کۆمۆنیسـتی کرێکاریی عێراقیان دامەزراند.

## شەڕی گەردەلوولی بیابان!!!

پاش ناوەندگیریی نێودەوڵەتیی زۆر کە دواترینیان هەوڵی یۆری بریماکۆفی دیبلۆماتکاریی بەناوبانگی ڕووسی و نوێنەری گۆرباشۆف بۆ لای صدام بوو، هەمو ڕێگەکان بەبنبەست گەیشتن و مەسەلەی ڕاگەیاندنی شەڕ بوو بە مەسەلەی کات و سەعات.

هەموو خوێندنەوەکانی صدام و ئەڵقە ڕاوێژکارە نزیکەکەی بوون بە بڵقی سەرئاو و شەوی ١/١٦ / ١٩٩١ گەورەترین هێرشی سەربازی بەهەموو جۆرە چەک و تەکنۆلۆجیایەک لەلایەن ٣٣ دەوڵەتی هاوپەیمانەوە دەستی پێکرد.

من ئەو ماوەیە بۆ چاودێریی وردی هەواڵەکان هەمیشە ڕادیۆیەکم لە تەنیشت خۆمەوە دائەنا و دوایین هەواڵەکانم لە رادیۆی دەنگی ئەمریکا و ئیسرائیل وبی بی سی و ومۆنتی کارلۆ و ئێرانەوە دەبیست. خەڵکێکی زۆر لە شارەکانی کەرکووک وبەغداوە ڕوویان کردبووە سلێمانی. ئەو شەوە ماڵی خوشکم کە بە خێزانەوە لە کەرکووک ڕایان کردبوو لای ئێمە بوون. دوای نیوەشەو بەهۆی لێدانی عێراقەوە خەبەریان کردمەوە و یەکسەر لە ڕادیۆکەمەوە، کە بردبوومە ناو جێگای نووستنەکەم، بەدەنگی (عطية ميخائيل) ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا هەواڵی هێرشی ئاسمانیی بۆ سەر بەغدا وشارەکانی خوارووی عێراق و کوەیت ڕاگەیاند.

قۆناغی یەکەمی شەڕ بە بۆمبارانی ئاسمانی و ڕۆکێت بارانی بەغدا و شارەکانی تری عێراق دەستی پێکرد. ئەو بۆمب و ڕۆکێت بارانە تەنها سەربازگە و شوێنە ستراتیجیە سەربازیەکانی نەکرد بە ئامانجی

خۆی بەڵکوو ویڕای ئەوانە ژێرخانی وڵاتەکەی ویران کرد. پێئەچوو کە ئەو ویرانکردنەی ژێرخانی عێراق بەشێک بێت لە پلانێکی دەستی ئەنقەست بۆ ئیفلیج کردنی ئەم وڵاتە. ئەم زنجیرە هێرشە کە چەندین هەفتەی خایاند، بوو بە هۆی کاولکردنی ئێستگەکانی وزەی کارەبا، تۆڕی ڕێگە و بان وپردەکان، کۆمپانیاکان و کارگەکان، نەخۆشخانەکان، دامەزراوە نەوتیەکان و پاڵاوگەکان، کۆگا و عەمارەکان و... تاد.
ڕۆژی ١٩٩١/٢/٤ هێرشی زەمینیی سوپای ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت دەستی پێکرد. تازە بە تازە عێراق ڕایگەیاند کە بە پێی بڕیاری ٦٦٠ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتووەکان هێزەکانی دەکشێنێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە لە ١٩٩٠/٨/١ دا لێی بوون. هێزی سوپای عێراق بوون بە ژێر پێوە و کەمترین بەرگرییان نەکرد. ڕۆژی ٣ /١٩٩١/٣ عێراق بە فەرمی ملی بۆ هەموو بڕیارەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان شۆڕکرد و سوڵتان هاشم وەکوو نوێنەری فەرمیی عێراق، لە خەیمەی سەفوان، لە گەڵ شوارتزکۆفدا، بەڵگەنامەی تەسلیمبوونی ئیمزا کرد.
ڕادەی کاولکاریی عێراق بەجۆرێک بوو کە ئەندامانی لیژنەی نێردراوی نەتەوە یەککگرتووەکان کە لە پاش شەڕەکە بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی عێراق ڕەوانە کرابوون لە ڕاپۆرتەکەیاندا نووسیبوویان: (پێویستە ئەو ڕاستیە بووترێت کە هیچ شتێک لەوانەی کە لەوە پێش بینیومانە یا خوێندوومانەتەوە نەیئەتوانی مێشکمان ئامادە بکات بۆ بینینی ئەو ویرانیەی لەم وڵاتەدا بەرچاومان کەوت. ئەم شەڕە بەشێوەیەکی نزیک لە وێنەیەکی ناو ئەفسانەکان، ئەم کۆمەڵگای عێراقەی کاولکردووە کە تا ١٩٩١ تا ئەندازەیەکی زۆر کۆمەڵگایەکی شارستانی و پێشکەوتوو بوو. ئەم شەڕە عێراقی گێڕایەوە بۆ پێش قۆناغی پیشەسازی). ئامارەکانی ویرانکردنی عێراق مرۆڤیان سەرسام ئەکرد: بۆ نموونە ڕادەی بەرهەمهێنانی ووزەی

کارەبا دابەزی بۆ ٤ ٪ (چوار لە سەد)ی پێش شەڕ واتە گەڕایەوە بۆ ئاستی ١٩٢٠!!!!

گەرچی صدام بەمەبەستی چەواشەکاری ئەم شەڕەی ناونا (دایکی جەنگەکان – أم المعارک) بەڵام لە ڕاستیدا شەڕی (گەردەلوولی بیابان) لە ناو خەڵکی عێراقدا ناوی نرا (دایکیماڵوێرانیەکان – أم المهالک).

دۆڕانی عێراق لەم شەڕەدا تەنها تێشکانێکی سەربازیی کلاسیک یا شکستێکی سیاسیی ڕژێمەکەی نەبوو، بەڵکوو بوو بەهۆی گێڕانەوەی عێراق وەکوو وڵات و کۆمەڵگایەک بۆ قۆناغێکی تاریک کە تا ئێستاش ئاکامەکانی لە هەموو بوارێکدا کارلێک دەکات.

بە پێچەوانەی چەواشەکاریەکانی صدام و ڕژێمەکەی سەبارەت بەوەی کە گێڕانەوەی کوەیت بۆ سەر عێراق دەرگا ئەکاتەوە بۆ قۆناغێکی نوێ لە خۆش بژێوی و گەشەی وڵات، عێراق پێی نایە ناو تاریکترین قۆناغەکانی مێژووی کۆن و نوێی خۆی. بۆ نموونە عێراق، جگە لە قەرزەکانی سەردەمی شەڕ لەگەڵ ئێراندا، کەوتە ژێر باری دانەوەی قەرز بەبڕی ٣٢٠ ملیار دۆلاری تری ئەو کاتە. تێکڕای داهاتی تاکی عێراقی لەساڵێکدا داتەپی بۆ ٣٠٩ دۆلار لەکاتیکدا بڕی هەمان داهات لەساڵی ١٩٧٩دا گەیشتبوو بە ٤٢٠٠ دۆلار.

کاریگەریە ناوچەیی و جیهانیەکانی شەڕی (گەردەلوولی بیابان)، لەوە کەمتر نەبوون.

ئەمریکا کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی بەسەر ناوچەی پڕ لەنەوتی کەنداودا زۆر لەجاران بەهێزترکرد. وڵاتانی ناوچەکە زیاتر ڕۆچوون بۆ ناوجەرگەی ستراتیجیی ئەمریکی. هیچ دەوڵەتێکی تر لەوەدوا بۆی نەبوو لە خەتی سووری ستراتیجیی ئەمنی وسەربازی و سیاسیی ئەمریکا دەرچێت. ئەوروپا و یابان زیاتر لە جاران و لە پەیوەندیەکی ناهاوسەنگتردا بەئەمریکاوە بەسترانەوە. بەکورتیەکەی سیستمی سیاسیی جیهانیی نوێ ڕێک بەقەد و باڵای ئەمریکا بڕابوو و مامانی

لەدایکبوونی ئەو سیستمە دڵخوازەی ئەمریکاش شەڕی (گەردەلوولی بیابان) بوو. ئەمریکا ئەم قەیرانە ناوچەییەی کە بەهۆی ملهوڕی و گەوجیی صدامەوە سەری هەڵدا، کرد بە بیانوویەک بۆ بەدیهاتنی ئەو هەموو ئامانجانە کە هیچ پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان نەبوو بە ناوەڕۆکی قەیرانەکەوە کە بریتی بوو لەداگیرکردنی کوەیت و دەیان نموونەی تری لەو چەشنە قەیرانانە لە مێژوودا ڕوویاندابوو، بێ ئەوەی ببن بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی وا بەوهەموو ئاکامەوە.

## بوومەلەرزەکەی ڕاپەڕین!!!

ماوەی نێوان دەستپێکردنی شەڕی (گەردەلوولی بیابان) هەتا ڕاپەڕین بۆ من، ماوەی زۆرترین سەرقاڵی و ڕاکەڕاک بوو لە نێوان سلێمانی و کەرکووک و هەولێر. کۆمیتەکانی ڕاپەڕین ئیشیان بەباشی ئەڕۆیشت و تا دەهات خەڵکی زیاتر لە دەوریان کۆئەبوونەوە. کۆمیتەی باڵای ڕاپەڕین لە سلێمانی کە لە نوێنەرانی کۆمیتەی ڕاپەڕینی گەڕەکەکان پێکهاتبوو، کۆبوونەوەی بەردەوامی خۆی ئەکرد. دوایین کۆبوونەوەمان لە ماڵی نەبەز خالید کرد کە ئەوکاتە ماڵی سەربەخۆی خۆیان لەنزیکی یاریگای چوارباخ دانابوو. پلانی ڕاپەڕینمان دانابوو. پەیوەندیمان بە کۆمیتەکانی ڕاپەڕینەوە لە کەرکووک و هەولێر بەهێز بوو. بە پێچەوانەی سلێمانیەوە کە ١٤ کۆمیتەمان لە گەڕەکەکاندا دامەزراندبوو، لە هەولێر و کەرکووک ژمارەی کۆمیتەکان لەچەند دانە زیاتر نەبوون. کۆمیتەی سەرشەقام لە سلێمانی لە هەموویان بەهێزتر و خاوەن پێگەی جەماوەریی باشتر بوو. لەویَ کەسانی وەکوو خالیدی مەلا عەلی لێبوو، کە هەم خاوەنی نفووزێکی جەماوەریی زۆر بوو، هەمیش توانایی و شارەزاییەکی زۆری لەبواری خەباتی چەکداریدا هەبوو، جگە لەوەی کەسێکی خاوەن ئیرادە و بەهێز بوو.

لەکۆمیتەکانی ڕاپەڕیندا چەند کێشەمان هەبوو:

١/ چەکمان زۆر کەم بوو. بڕیارماندا کە پەیوەندیەکی فراوان بکەین بۆ پەیداکردنی چەک. دەوروبەرمان ڕاسپارد کە لە ڕیگەی ئەو کەسانەی کە سەربازن و لە شەڕی کوەیت ڕایان کردوە و چەکیان

هێناوەتەوە، هەوڵی پەیداکردنی چەک بدەین. خالیدی مەلا عەلی بەو جۆرە چەکێکی لە کورێکی گەڕەکی شیوی قازی پەیداکرد. من دەمانچەیەکم هەبوو و جگە لەوەش ئیسماعیل جەباری ڕومانەیەکی لەکەرکووک پەیداکردبوو کە لە لەشی یەکێک لەخۆشکەکانیدا شاردبوویەوە تا گەیاندی بە من لە سلێمانی. بەرەبەرە تاکوتەرایەک چەکمان دست ئەکەوت، بەڵام زۆر کەم بوون بۆیە پلانەکەمان ئەوەبوو کە هەوڵ بدەین لەیەکەم ڕۆژ و سەعاتەکانی ڕاپەڕیندا زۆرترین چەک پەیدا بکەین.

٢/ پارە و پێویستیی دارایی ئەو کۆمیتانەش کێشەیەکی ترمان بوو. هاتوچۆی شارەکان و ناوشار و گرتنی سەیارە بەکرێ بۆ کاری تایبەت و تێچووی ڕۆژانی کۆبوونەوەکان کە جاری وا بوو ١٥ کەس لەماڵێکدا بەنان خواردن و مانەوە خەرجی لەسەر ئەو ماڵە زۆر ئەکەوت و هەمووش دەستکورت بوین، بەڵام هەموو پشتمان بەستبوو بە گیرفانی خۆمان.

٣/ سەرباری دڵسۆزی و گیانی فیداکاریی ناو هاوڕێیانی کۆمیتەکان، ئەمانزانی بۆ ڕۆژانی ڕاپەڕین و دواتریش پارێزگاری لە شووراکان، هێزی چەکدارمان پێویستە، بەڵام کادری شارەزامان لەو بوارەدا کەم بوو.

٤/ پەیوەندیی نێوان شارەکان لەو ئاستەدا نەبوو و من هاتوچۆی کەرکووک و هەولێرم ئەکرد و لەبەر ئەرکی زۆر و مەترسیی هاتووچۆیش کەمتر بە پێی پێویست ئەمپەرژایە سەر ئەو ئەرکانە.

٥ / کەمی شارەزایی لە بواری ڕابەریکردنی جەماوەری لە ئاستی عەمەلی و فراوانی وادا. ئێمە یەکەم جار بوو لەو ئاستە جەماوەریە فراوانەدا ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتییەکی وا گەورە ببینەوە.

٦/ کەمی ئامادەیی تەکنیکی و تەداورووکاتی و دانانی پلانی ١، ٢، ٣ و لەبەرچاوگرتنی سیناریۆ جیاوازەکان لە حاڵەتی سەرکەوتن یا

شکستی ڕاپەڕیندا یا لەبەرچاوگرتنی سیناریۆ بۆ پێشهاتی جۆراوجۆر کە بەتایبەتی لە ڕۆژی یەکەمی راپەڕیندا دێنە پێشمان.
٧ / لە پلانەکەماندا بۆ ڕاپەڕین تەنها بیرمان لە لایەنە سیاسیەکەی مەسەلەکە کردبۆوە و زۆر وردەکاری و هونەری شۆڕش و ڕاپەڕینە چەکداریەکانمان لەبەرچاو وون بوو.
٨/ سادەترین هاوئاهەنگی نەبوو لە نێوان ڕێکخراوە و گرووپە چەپەکاندا. ئێمە وەکوو (یەکێتی خەباتی کۆمۆنیزمی کرێکاری) کە پلانی دامەزراندنی کۆمیتەکان و بەرنامەی (نان، کار، ئازادی؛ حکوومەتی شوورایی) مان دارشتبوو، لەگەڵ هیچ یەک لە گرووپ و لایەنەکانی تردا سادەترین پەیوەندیمان نەبوو.
٩/ هیچ بڕیار و ڕێنمایی وتەگبیرێکی تایبەت ورۆشنمان نەکردبوو سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ هێزەکانی بەرەی کوردستانیدا کە ئەوانیش هێزی بەشدار بوون لەڕاپەڕیندا و خاوەنی پێگە و بنکەی جەماوەریی خۆیان بوون. ئەمە دواتر سەرئێشە و کێشەی زۆری بۆ هاوڕێیانی ئێمە دروست ئەکرد بە تایبەتی گەر دەستدرێژیەکانی ئەوان و گیانی کۆنترۆلکردنی ڕاپەڕین و چنینەوەی دەسکەوتەکانی لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی حیزبی لە لایەن ئەوانەوە لەبەرچاوبگرین.
١٠/ نارۆشنیە سیاسیەکانی ئێمە کە سەرچاوەکەیان ئەگەڕایەوە بۆ خوێندنەوەی ناواقیعیمان بۆ هێزە کۆمەڵایەتیەکان وتێنەگەیشتنی دروست لە توخمە جیاوازەکانی ئەم ڕاپەڕینە. زۆربەی هێزە چەپەکان بە ئاشکرا ناکامڵی سیاسیان پێوە دیار بوو کە لە دروشم و داخوازی و فۆرمی ڕێکخراوەیی و هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگی ئەدایەوە. زۆر شیعاریان بە عاتیفی و چاولێکەرانە بەرزئەکردەوە بێ ئەوەی ئاکام و درئەنجامەکانی بە باش یا خراپ لێکبدرێتەوە، وەکوو دروشمی ٣٥ سەعات کار یا چەکدارکردنی گشتیی خەڵک بەتایبەتی مەعلووم بوو کە گەر بەڕاستی ئەو دروشمە جێبەجێبکرایە ئێمە خۆشمان نەمان

ئەتوانی ئەو هێزە چەکدارە زۆرە ڕابەرایەتی و ڕێکخراو بکەین، ئیتر چی بەزم و فەوزایەکی لێ ئەکەوتەوە، ئەوە کەمتر بیرمان بەلایدا ئەچوو.

**١١/** کەمترین پلانی عملی و ڕێکخراوەیی و پەیوەندیمان هەبوو لە ئاستی شارەکانی وەکوو بەغدا یا خوارووی عێراقدا.

هەواڵەکانی ڕاپەڕین لە خوارووی عێراق و بەتایبەتی لە شاری بەسرە هێز و تینێکی زۆری بە خەڵک و بە ئێمەش بەخشی.

بەهەرحاڵ ئێمە ڕۆژی ٥/ ٣/ ١٩٩١ جەولەیەکمان بەناو شاردا کرد وبەئاشکرا هەستی ئەوەمان بۆ دروست بوو کە ڕۆژی تەقینەوەی ڕاپەڕین مەسەلەی چرکە و سەعاتە و هیچی تر. ڕژێمیش دیسانەوە بە شیوازە کلاسیکیەکەی خۆی هێزی مەفرەزە تایبەتەکان و جەیشی شەعبی و پۆلیسی لە سەر شەقامەکان بڵاوەپێکردبوو.

قسەیەک سەبارەت بەوە بڵا بووەوە کە ٣/٦ لە گەڕەکی گاورانەوە خۆپیشاندان وەکوو هەنگاوی یەکەمی ڕاپەڕین دەست پێ ئەکات، بەڵام ئەوە هەر قسە بوو ونەهاتەدی.

دەنگۆی ڕاپەڕینی ڕانیە لە ٦ / ٣ لە کاتێکدا بڵاوبووەوە کە ئێمە دوایین کۆبوونەوەی لیژنەی باڵامان لە ماڵی نەبەز کرد. سەبارەت بە دەنگوباسی ڕانیە شتێکی ئەوتۆمان نەئەزانی و هەمان ڕۆژیش هەواڵی ئەوە هات کە لە ئۆردووگای باینجانیش لە بازیان خەڵک پەلاماری سەربازگەکانی ڕژێمیان داوە لەو ناوچەیە.

ئێمەش لە کۆبوونەوەی ٦/ ٣ دوایین پیاچوونەوەمان بە بڕیار و ئامادەییەکانی خۆماندا کرد و بڕیاری دەستپیکردنی ڕاپەڕینمان لە ٧ / ٣ دا. لەهەمان کاتدا دیار بوو لە زۆر لاوە ڕێکەوتنێکی گشتی بە ئۆتۆماتیکی سەبارەت بە ئەو ڕۆژە هەیە بۆ دەستپێکردنی ڕاپەڕین لە سلێمانی وئەوەی ڕانیەش هێندەی تر بوو بە هۆکار بۆ دیاریکردنی ئەو ڕۆژە. غەریزەی سیاسیی خەڵکی سلێمانیش، بۆ ئەو ڕۆژە تەواو ئامادەبوو بۆ ڕاپەڕین.

لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاری ئەوە درا کە بەیانیی ڕۆژی ٧/ ٣ کۆمیتەی سەرشەقام دەستبکەن بە گردکردنەوەی جەماوەر و پەلاماری مەڵبەندەکانی ڕژێم لەقۆڵی خۆیانەوە و کۆمیتەی زەرگەتەش بەهەمان شێوە و ئێمەش، من و جەبار مستەفا و تایەر حەسەن ئەرکمان ئەوەبوو کە لە بەری سەرەوە وە لە برایم پاشا یا لەو دەوروبەرەوە بە هاوکاریی دۆست و هاوڕێی تر پەلاماری خۆمان دەست پێ بکەین.
ئەو گرووپەی ئێمە بڕیاری ئەوەمان دا کە سبەی لەماڵی باوکی نەسرینی هاوسەرمەوە لە برایم پاشا یەک ببینین و ئەرکی خۆمان ئەنجام بدەین. ئێمە لە ماڵی خۆمان لە تووی مەلیک نەماینەوە و شەو لە ماڵی باوکی نەسرین ماینەوە. ئەو شەوە لەماڵی باوکی نەسرین ڕامگەیاند کە سبەی ڕاپەڕین دەست پێ ئەکات و ئێمە سەرپەرشتی کۆمیتەکان ئەکەین. من لەبەر گورج و گۆڵی، پانتۆڵێکی کاوبۆم بۆ بەیانی ئامادەکرد لە ترسی کەوتنی چاویلکەکەشم لە بری پەتی تایبەت تەلێکم لە چاویلکەکەم بەست تا لەڕاکردندا لێم نەکەوێت.
لەگەڵ نەسرینی هاوسەرمدا دوو قۆڵی کۆبوویینەوە کە ئەویش ئەندامی یەکێتی خەبات و ئەندامی کۆمیتەکانی ڕاپەڕین بوو. من داوام لێکرد کە سبەی لەگەڵ مندا نەیەت، چونکە ڕاستیەکەی نەمئەزانی چیمان بەسەردێت. پێم وت: تۆ خۆت بگرە و لە وەجبەی یەکەمدا مەیە دەرەوە، بەتایبەتی لەبەر نینای کچمان کە هێشتا تەمەنی ٢ ساڵ و ١٠ مانگ بوو، ولە دڵی خۆمدا ئەترسام کە هەردووکمان بەجارێک تیابچین. ئەو پاش بگرە و بەردەیەک ڕازی بوو، بەڵام ڕۆژی دواتر زانیم کە بە دوای مندا ئەویش دەرچووبوو، دەوری نیوەڕۆ لەسەرا یەکمان گرتەوەو ئەو لەسەرای سلێمانی چەکێکی کلاشینکۆفی دەستکەوتبوو.
دوای نانخواردنێکی سەرپێی بەیانیی ٧/ ٣ جەبار و تایەر پەیدابوون ویستم نەسرین و نینا جێ بهێڵم وبڕۆین کە لە دەرگا درا و نەسرین وتی کوڕێکە داوای تۆ ئەکات. کە ڕۆیشتمە بەردەرگا بینیم شوانە بوو

کە پێشـــتر ئەمناســـی. خالیــد و نەبەز لەبەر کەمـــی تەمەن ئەویـــان هەڵبژاردبـوو تـا ڕەوانەی لای ئـێمەی بـکەن و پەیـامی ئەوەیـان پیـا ناردبوو کە بۆچی ئێوە لای خۆتـانەوە دەسـتان پێ نەکردووە چونکە ئـێمە فشـاری زۆرمـان لەســەرە و لە مـاڵی موستەشـار و مەفـرەزە خاسـەکانی خەبات و سـەرکارێزەوە هێرشـی توونـدمان ئەکرێتەسـەر. منیش بەشوانەدا پەیامی خۆم ناردەوە بۆ ئەوان کە ئێمە چاوەڕوانی ئەوە نەبـووین ئەوان وا زوو دەسـپێکەن و ئـێمەش ئێسـتا دەسـت پـێ ئەکەین. هـاتمەوە ژوورەوە پەیامـەکەی خالید و نەبەز و هاوڕێکانیانم بۆ جەبـار و تـایەر بـاس کـرد و بەخێرایـی هـاتینە دەرەوە. بەجـادەی برایم پاشادا خواربووینەوە، بەڵام کەس نەدەهاتە دەرەوە و تـا ئەهـات دەنگـی تەقەش زیـادی ئەکـرد و لەگەڵ ئەوەشــدا نیگەرانیــی ئــێمە سەبارەت بە سەرکەوتن یا شکستی ڕاپەڕین زیادی ئەکرد و زۆریش نیگەرانــی هاوڕێکــانی سەرشــەقاممان بــووین. تــا دەوری فلــکەکەی خـوارەوەی جادەی بـرایم پاشـا هـاتین، بەڵام بێ سـوود بـوو و کەس نەدەهــاتە دەرەوە و لەوێ لە دوورەوە "ئــاوات ســەعید"م بینــی کە بە تەنها و بەپێ بەرەو ئـازادی سـەردەکەوت و هەسـتم کـرد لەم رۆژەدا ئەویش خەریکی چیە. من ئەوم تەنها بە شێوە دەناسی. هێندەی نەبـرد بینیمان سەیارەی سـەربازی لە نێوان هەر ۲۰۰ مەترێک دوو چەکدار لەمبەر وئەوبەری شەقامی برایم پاشا دائەبەزێنێ وسـەیارەکان بەرەو لای بینـای زانکـۆ ئەڕۆن. ئـێمە سـێقۆڵی بەپەلە بڕیارمانـدا بـڕۆین بـۆ مەجید بەگ چونکە پێ نەئەچوو کە لێرە خەڵک بێنەدەرەوە. لەبەر ئەو چەکدارانەی رژێم کە لەبەرچاومـان دادەمەزران بەکۆڵانە باریکەکـانی خــوارەوەدا خۆمــان گەیانــدە مەجیــد بەگ. لە ســەرەتای شــەقامەکە تووشمان بوو بە "خالیدی سەید مەجید" کە هاوڕێی سـەردەمی منـاڵیم بـوو و ئەو چەنـدین سـاڵ پێشـمەرگەی یەکێتـی بـوو، بەڵام مـن هـیچ ئاگـاداری ئەو نەبـووم و نەم ئەزانـی چکـارەیە و چـۆن بیـر ئەکـاتەوە بەڵام دیـار بـوو دەمـێکە وازی لە یەکێتـی وپیشـمەرگایەتی هێنـاوە و

ئەویــش کەســـایەتیەکی کۆمۆنیســـت و پێشـــتر لە بەرەی ڕزگـــاریی زەحمەتکێشـــاندا بـووە. ئەو مـاڵی لەو دەورە بـوو و بـۆ ئەنجامـدانی هەمـان کـار، واتە کۆکردنەوەی خەڵـک بۆ راپەڕین، هـاتبوە دەرەوە و چەند کەسـی تـری لەگەڵـدا بـوو. خالید بە بینینەوەی ئێمە گەشـایەوە بەڵام زۆر تووڕەبـوو لەوەی کە خەڵـک بەدەمیـانەوە نـایەنە دەرەوە. منیش هاوڕێکـانی خـۆم ئاگـادارکردەوە کە خالید کێیە و هاوکـارێکی باشــی ئــێمە دەبێــت. هەمــوو پــێکەوە بەرەو ســەرەوەی شــەقامەکە بەرەولای شــوێنی وەســتانی پاســەکانی گەڕەکەکە بەڕێکەوتــین و خالیـدمان ئـارام کـردەوە و دەسـتمان کـرد بەبـانگەوازی خەڵـک بـۆ ڕاپەڕیـــن و هـــاتنەدەرەوە لە ماڵەکانیـــان و بەشـــداری لەم ڕۆژە مێــژوویەدا. ســەرەتا خەڵــک زۆر بەکەمــی بەدەممــانەوە دەهــاتن وئەوەشی دەهات هەرزەکار بوون و لە دەستی کەس و کاریـان ڕایـان ئەکـرد تـا بـێن بـۆ لای ئـێمە. هەسـتێکی زۆر تـایبەتم هەبـوو کە تێکەڵەیەک بوو لە خۆشی سەرکەوتن و هـاتنەدیی ئـاواتێکی لەمێژینەم کە دوایـــی هـــاتنی دەســـەڵاتی دیکتـــاتۆریەت بـــوو لەلایەک، لەگەڵ هەسـتێکی بەهەمـان ئەنـدازە بەهێـز لە ترسـی شکسـت وتیـاچوون و دڵەڕاوکێ. ترس لە شکست و لەژیانی خۆم هەستێکی ڕاستەقینەیە کە بەڕای مـن ئەبـێ بەوپەڕی راسـتگۆییەوە باسـی بـکەم. زۆریـنەی ئەو کەسـانەی یـادەوەریی لەم چەشـنە ئەنووسـنەوە جـورئەتی دەربڕینـی ئەو هەسـتە تێکەڵەیـان نـیە، بـۆیە میسـداقیەتی گێڕانەوەکەیـان ئەبـێ بەجێـی گومـان. هێشـتا ڕژێـم بەهەمـوو جەبەرووتـی خـۆیەوە مـاوە. بەرەبەرە خەڵک بەدەم بانگەواز و دروشمەکانمانەوە دەهاتن.

بانگەوازەکانمـــان ســـێ بەش بـــوون: بەشـــێکیان بـــۆ هانـــدان و بردنەســـەری وورەی جەمـــاوەر بـــوو تـــا میزاجـــی شۆڕشـــگێڕانەیان بەرینەسەر و یارمەتیان بدەین کە بێنە ڕیزی ڕاپەڕینەوە، دووەمیـان ئەو سیاســـەت و دروشـــمانە بـــوون کە ســـەربەخۆیی خەبـــات و ئامانجەکـانی خەڵکیـان ڕوون ئەکـردەوە وەکـوو دروشـمی (نـان، کـار،

ئازادی، حکوومەتی شوورایی). بەشی سێیەمیشیان وتاری حەماسی بوون سەبارەت بە تاوانەکانی ڕژێم وەکوو ئەنفال و ئیعدام و ڕاگوێزانی دیهاتەکان و بۆ بەرزکردنەوەی ورەی خەڵک بەدەنگی بەرز هاوارمان ئەکرد: کە ڕاپەڕین هەموو عێراقی گرتۆتەوە و ئێستا لە شەقامەکانی بەغداشدا خەڵکی شۆڕشگێڕ پەلاماری دەسەلات ئەدەن و مژدی سەرکەوتنی یەکجاری نزیکە وهاتنە مەیدانی ئێوە چۆک بەم دوژمنە دەدات و ئەوان لاواز و ئێمە بە یەکگرتوویمان زۆر بەهێز دەبین.

هەر ئەو بەیانیە "شیرین موراد"ی هاوسەری جەباریش گەیشتە لامان و بەئیرادەیەکی بەرزەوە بەشداریی هەموو پەلامارەکانی ئەو یەکەم سەعاتە سەختەی ڕاپەڕینی کرد. لەو ناوچەیەی ئێمە شیرین یەکەم ژن بوو کە بێ سڵەمینەوە بێتە مەیدانی ڕاپەڕین.

ژمارەی خەڵک زیادی ئەکرد و بەرە بەرەش ئەو گرووپە سێ کەسیەی ئێمە و "خالید مەجید" وەکوو ڕابەریی ڕاپەڕین لەو گەڕەکە دەرکەوتین وخەڵک بۆ پرسیار و ڕا و مەشوەرەت ڕوویان تێ ئەکردین. ئێمە هیچ ڕووپۆش یا قیناعێکمان نەپۆشیبوو و تەنانەت بە ناوی ڕاستەقینەی خۆشمانەوە بانگی یەکمان ئەکرد کە ئەوە هەڵەیەکی زەق بوو. لە یەکەمین کۆبونەشەوە وتبوومان کە باشتر وایە هەموو بە بەرگی مەدەنی و بە ناوی کۆمیتەکانی ڕاپەڕینەوە بەشداریی بکەین وەکوو هێزێکی خەڵکی و جەماوەری تا هەوڵ و تێکۆشانمان بۆ پێشمەرگە و هێزەکانی بەرەی کوردستانی نەنووسرێت. لەوکاتەدا ئێمە داوامان لە خەڵکەکە کرد کە سەرسووچی شەقامی مەجید بەگ لەگەڵ شەقامە گشتیەکەدا ببەستن و بە تەنەکە و بەرمیلی خاشاک و بەرد شەقامەکەیان بەست وەکوو ئامادەکاریەک بۆ پێشگرتن بە ماشینی سەربازی و چەکداری ڕژێم گەر هێرشیان هێنایە سەرمان. گرووپێکی خەڵکیشمان ڕاسپارد کە چاودێریی ئەملاو ئەولا بکەن.

نمــوونەی دوو دیمەنــی سەرنجڕاکێشــی ئەو ڕۆژەم هەرگیــز لەیــاد ناچێت:

- هــاوڕێیەکی نابینــام هەبــوو کە کــاتی خــۆی لە کەرکــووک شــیوعی بــوو، بەڵام لەبەر بــاری گــوزەران لە ئەوقافەوە مەعاشی مەلایەتیشی هەبوو بەناوی "مەلا لەتیف". من بە ئیختیفا لە سلێمانی سەردانیم ئەکرد و هاوسەرگیریی کردبوو و لە شوققەکانی قامیشان ئەژیا. لەو ڕۆژە سەختەدا ئەو پیــاوە داوای لەهاوســەرەکەی کردبــوو کە بیبــات بــۆ بەشداری لە ڕاپەڕین و من ئاگام لێنەبوو تومەز ئەو لەکاتی قسەکردنمدا بەدەنگمدا ناسیبوومیەوە وهاوسەرەکەی نارد کە بڕۆم بۆلای. ئەو دیمەنە زۆر کاری لێکردم و سەرباری هەوڵی زۆرم لەگەڵیدا کە بڕواتەوە بۆ ماڵەوە کەچی ئامادە نەبوو ولەگەڵ خەڵکدا بەشداریی ئەو ڕۆژ و ساتەسەختەی ڕاپەڕینی کرد.

- لە هەمان کات و شوێندا کە سەرقاڵی قسەکردن و ڕێنوێنی خەڵک بووین کچێکی گەنج پەنای بۆ من هێنا کە بــراکەی داوای لــێ دەکــرد بەشــداری ڕاپەڕیــن نەکــات و ئەیویست بەزۆر بیباتەوە بۆ ماڵەوە. ئەو کچە بەهەڵەداوان لە دەستی براکەی هاتبووە پشتی من وبراکەشی دیار بوو خەمی ئەوی بوو دەیووت ئیمە خانەوادەی شەهیدین و با بێتەوە لە گەڵمدا، کەچی کچە ئەوەندە دڵگەرم بوو ئامادەی ئەوە نەبوو کە ئەو خەڵکە لەو ساتە ترسناکەدا جێبهێڵێت. من بەکوڕەکەم وت: وازی لێ بێنە باخۆی بڕیار بدات وگەر خۆی ویستی با بڕواتەوە ماڵەوە، ئەگینا لێیگەڕێ با لێرە بمێنێتەوە و کچەش بەو قسانە زۆر گەشایەوە و سەرەنجام

مـایەوە و پێمـوابێ جـگە لە شـیرینی هاوسـەری جەبـار ئەو
دووەم ئافرەت بوو لەو شوێن و ڕۆژەدا لەوێ.

نزیکەی ١٠٠ کەسێک کۆبوونەوە لەدەورمان کە زۆربەیان لە تەمەنی لاویدا بوون و زۆربەیان لەخوار تەمەنی ئێمەوەبوون. هێشتا خەڵک سڵیان لە یەکتر دەکردەوە لە ترسی ئەگەری شکستی ڕاپەڕین و کەشف بوونیان لای دەزگاکانی ڕژێم. ئێمە بووین بەجێ متمانەی خەڵک و جاروبار گەر شتێکی تایبەتی هەبوایە یەکێک ئەمانی بردە لاوە تا بە تەنهایی ئاگادارمان بکات. کوڕێک هات لەگەڵ من و خالیددا کەوتە قسە وتی من ئاگادارم کە هەندێ پێشمەرگەی یەکێتی لە ماڵێکدان بەچەکەوە و ئەوانیش بۆ بەشداریی ڕاپەڕین خۆیان ئامادەکردووە. ئێمە بەو کوڕەدا پەیاممان بۆ ئەوانیش نارد کە بێن و بەناوی کۆمیتەکانی ڕاپەڕینەوە داوامان کرد کە پەیوەست بن بە خەڵکی ڕاپەڕیوەوە، بەتایبەتی ئێمە چەکدارمان پێویست بوو. کوڕەکە وەڵامەکەی ئەوانی هێنایەوە کە وتبوویان "ببورن ئێمە تا ڕێنوێنیی خۆمان نەبێت نایەین" و بەوجۆرە خۆیان دزیەوە سەرباری ئەوەی کە وەڵاممان دانەوە کە ئێستا ڕۆژی ڕاپەڕینە و ئەبێ ئەوانیش ڕێنوێنی لە خەڵکی ڕاپەڕیو وەرگرن، بەڵام بێسوود بوو و هەر نەهاتن.

بەدوای ئەوەدا کوڕێکی تر من و تایەری بردە لاوە و پێی وتین کە کەسێکی پیاوی ڕژێم کە بە ئیشارەت نیشانی داین بۆ چاودێریی خەڵک هاتووە و زۆریش پێداگریی لەسەر ئەوە کرد ئەو کەسە نەزانێ کە ئەو ئێمەی لەو بارەوە ئاگادارکردۆتەوە. من و تایەر ڕۆیشتینە گیانی کوڕە و داوای هەویەمان لێی کرد ئەویش دەفتەر خدمەی سەربازیەکەی نیشانداین و کەوتینە لێکۆڵینەوە لەوەی بۆ هاتووی بۆ ئێرە و چ کارەیت و لەو کاتەدا وێنەیەکی عدنان خەیروڵڵامان لەناو دەفتەر خدمەکەیدا بینی وبۆمان دەرکەوت کە سەروکاری لەگەڵ ڕژێمدا هەیە ئەگینا کێ خۆشی بەچارەی کەسی وادەهات. تایەر

دەفتەرخـدمەکەی دڕان و دایەوە بە نـاو چاویـدا و پـاش هەڕەشـە و ئەوەی کە مەعلووماتی تەواومان هەیە چیە و بۆچی هـاتووە لەو نـاوە دەرمانکرد.

بەدوای ئەوەدا بڕیارماندا هێرش بەرین بۆسـەر تەواریەکەی بەرامبەر زانکۆی سلێمانی کە بەرامبەر دەرگا سـەرەکیەکەی زانکۆ بـوو لەسـەر سـووچەکە. ئـێمە لە پێشـــەوە و خەڵکـیش بە هوتـاف و دروشـمەوە بەدوامـانەوە بـوون و لەو کـاتەدا ژمارەمـان نـزیکەی ٢٠٠ کەسـێک ئەبـوو. لەوکـاتەدا جەبـار وتـی مـن ئەڕۆم لەوبەرەوە هەنـدێ هـاوڕێی تری خۆمان هەیە ئەوانیش دێنم کە یەکێکیان "عەلی پێنجوێنی" بوو کە لە ئیـدارە محەلیـی سـلێمانی کـاری ئەکـرد و زۆری پـێ نەچـوو عـەلی هات وپەیوەست بوو پێمـانەوە. لەوکـاتەدا و پـێش گەیشـتن بە شـەقامە سـەرەکیەکە لە کـۆڵانێکی بچـووکەوە پیاوێـک بە دەمـامکێکەوە هـات بـۆلام و بـردمیە لاوە بـۆ قسـەکردن منـیش تـایەرم ئاگـادارکردەوە ولەگەڵ کـابرادا کە دوو کەسـی تریشـی بەدواوە بـوو بە حەزەرەوە ڕۆیشـتم و پاشـان ئەو وتـی: ئـێمە چەکـداری خەفـیفەین و ئامـادەین بەشدار بین لەگەڵتاندا بەچەکی خۆمـانەوە. منیش پێشـوازیم لێکـرد و پرسیم: ئەتوانی تفەنگێکیش بۆ من بهێنی؟ بەڵام دیار بـوو ئەو متمـانە بە من ناکات و منیش زۆر لەسـەری نەڕۆیشـتم و تـا ئەو هـاتەوە مـن تایەرم ئاگارادرکردەوە لەوەی کە وریـا بـین نەوەک کـابرا بـۆ لێدانمان ڕاسپێردرابێت.

بەو هێزە زۆرەی خەڵکەوە گەیشتینە سەرجادە گشتیەکە بە ئاراسـتەی یاریگـاکەی تەنیشـت دائیـرەی ئـاوەکە کە نووسـابوو بە تەواریەکەوە. هەرکە گەیشتینە ناوەڕاستی شـەقامەکە لە تەواریەکەوە دەسـتیان کـرد بەدەسرێژ لێمان. خەڵکەکە خۆمان دایە پەنـای دیوارەکـان و ئەو چەنـد چەکدارەی لای ئێمەش دەستیان کرد بەوەڵامـدانەوەی تەقەکـانی ئەوان و بـــەوەش متمـــانەم بەو چەکـــدارانە زیـــاتر پەیـــدا کـــرد. ئـــێمە لە چەکدارەکان جیا نەئەبووینەوە هەم بۆ ئەوەی بتوانین تەگبیر بکەیـن و

هەم تا ئەوان نەڵێن کە ئەمانە کورِ وکاڵی شارین و بە یەک دوو تەقە ڕائەکەن و بەوەش متمانەی ئەوانمان ڕاکێشا. پۆلیسەکانی تەواریەکە پێشبینیی ئەوەیان نەئەکرد کە بەتەقە وەڵامیان بدرێتەوە و وایان ئەزانی کە خۆپیشاندانێکی بێ چەکە و پاش هەندێ تەقە و پێکدادانی هەردوو لا تەقەیان وەستان و ئێمە خۆمان کرد بەناو بینایەی دوو قاتی مەخفەرەکەدا و لەوێ پۆلیسەکان چەکیان دانا و دیاربوو کە پێشبینیی شتێکیان کردبوو، چونکە هەریەکە جلی کوردیی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و دوای سەرزەنشتکردنێکی توونددیان کە بۆچی تەقەتان لێمان دەکرد، ووتمان بەپەلە بڕۆنەوە بۆ ناو ماڵ ومنداڵی خۆتان وتەنانەت یەک چەکیش مەبەن. پۆلیسەکان پێش ڕۆیشتن، لە قاتی سەرەوە مەشجەبی مەخفەرەکیان نیشاندابن و من لەوێ بووم بە خاوەنی کلاشینکۆف و تاقمی خۆم. زۆربەمان یەکەم جارە کە چەک بگرینە دەست، ئەویش لەم جۆرە هاوکێشە نابەرابەرەدا.

بۆ مێژووش ئەوە بڵێم کە پێش گرتنی یەکجاریی تەواریەکە و لەوکاتەدا کە تەقە وەستابوو، عەلی ئیدارە محەلی لەبەری مەلعەبەکەوە بەڕاکردن ڕۆیشتە ئەوبەرەوە و پەلاماری وێنەیەکی گەورەی صدامی دا کە لە بەر دەرگای زانکۆدا دانرابوو. ئەوجۆرە وێنانە (دیواربەند – جدارية) لە زۆر شوێنی حکوومیدا دائەنران و لە فاییەر دروستکرابوو. عەلی بۆکسێکی توونددی لەوێنەکە دا و بەدەستی کونی کرد و جارێکی تر ڕایکێشایەوە و وێنەی گەورە دیکتاتۆری هێنایە خوارەوە و ئەوەش ئەوەندی تر حەماسەی خەڵکەکەی ورووژاند.

پێشتر خەڵک بۆ پشتیوانیی ئێمە نەیاندەوێرا بێنە دەرەوە، بەڵام ئێستا کە ئەوناوە پاککراوەتەوە هەزاران کەس بەربوونەتە کۆگاکانی ناو کۆمەڵگەی دائیرەکان بۆ تالانکردن و تەنانەت مەحەجەرەی قەراغ شەقامەکانیش هەڵئەکەنن. بەڕاستی ئەو دیمەنانە ورە ڕووخێن و قێزەون بوون.

ئێمە کە ئێستا ژمارەمان تادێ زیاتر ئەبێت، ڕووی هێرشمان کردۆتە بارەگای بەدناوی ڕێکخراوی بەعسیەکان کە بەناوبانگە بە (شەهید عوسمان). لەزۆر گەڕەکی شارەوە دەنگی تەقە دێت. لەم بارەگایەوە تەقەیەکی زۆرمان لێکرا و تەنانەت چەکی دۆشکەشیان بەکارهێنا. لە دووکانەکانی ئەوبەرەوەی ئەو بینایە لە نزیکیی کەمتر لە ٣٠٠ مەترەوە ئیمە تەقەمان لەوان ئەکرد و ئەوان زۆر بەهێزتر وەڵامی تەقەکانیان ئەدایەوە. لەوێ زۆری نەمابوو بەر دەسڕێژێکی گولە بکەوم و کوڕێکی تر لە نزیکمەوە بریندار بوو کە بردمانە پەنای ڕیزە دووکانێکی ئەونـاوە. هەر لەو شوێنەدا چاوم کەوت بە "د. ئەکرەمی میهرداد" کە لەوەوپێش جارێکی تر بەهۆی شەهید نەجاتەوە لەناو بازاڕ بینیبووم و دواتر و تا ئێستا بووین بە هاوڕێی نزیک. لێرە ژمارەی چەکداری بەرەی خەڵکی ڕاپەڕیو زۆر بووبوو ولە گرتنی ئەم مۆڵگەیەی بەعسیەکاندا بەتایبەتی ئارپیجیەک ڕۆڵی کاریگەری بینی لە ڕووخانی ورەی چەکدارەکانی ڕژێم لەناو بیناکە. من بە جەماعەتەکەی دەوروبەری خۆمم وت: کە ئێوە بە وریاییەوە تەقە بکەن تا من ئەڕۆم لەو مزگەوتەی ئەوبەرەوە لە بڵندگۆکەوە قسەیان ئاراستە ئەکەم تا خۆیان بدەن بەدەستەوە. کوڕێکی گەنج لەگەڵمدا هات بۆ مزگەوتەکە ناوی "هەڤاڵ" بوو کە لەوێدا ناسیم ودوای ڕاپەڕین زانیم کە خزمی نەبەزی هاوڕێمە. دیار بوو هەڤاڵ بۆ پارێزگاری لە من لە گەڵمدا هات بێ ئەوەی بیناسم. مەلای مزگەوتەکە ئامادەی هاوکاری نەبوو لەگەڵماندا و بەنیوە زۆر بە پێلاوەوە خۆم کرد بەژووردا و بۆ ئەوەی لە کۆڵی ببمەوە مەلا بڵندگۆیەکی سەفەریی داپێم کە تاقیمان کردەوە ئیشی ئەکرد، بەڵام پاتریەکی قورسی لەگەڵدا بوو کە بەهەردووکمان هەڵمان گرت و تا گەڕاینەوە و من هێشتا بەعەرەبی چەند قسەی کورتم وەکوو بانگەواز و داوای خۆبەدەستەوەدانم تەواو نەکرد، چەکدارەکانی بارەگاکە بەڕیز

هاتنەدەرەوە و هەندێکیان فانیلەی عەلاگەیان کردبوو بەئاڵای سپیی خۆبەدەستەوەدان.
ئەوکاتەی کە لەگەڵ هەڤاڵدا ڕوومکردە مزگەوتەکە و پێش گرتنی ئەو بارەگایە لە ڕێگا دوو نووسەری بەناوبانگی شارم بینی کە لەو هەموو هەرا و گۆڵمەز و شەڕ و فەرتەنەیەدا لەبەردەم ماڵێکدا، ئەویش بەملەتاتکێ و لەدوورەوە بەدەم جگەرەکێشانەوە، تەماشای خەڵکەکەیان ئەکرد، بێ ئەوەی تووخنی ئەونـاوە بکەون. منیش هەڵمدایێ وتم: بۆ ناڕۆنە ناو ئەو خەڵکە؟ هیچ نەبێ وتارێک، قسەیەکی حەماسی یا شیعرێکیان بۆ بڵێن، خۆ ئێوە لە کۆڕەکاندا باسی ئەدەبی مولتەزیم و بەرگری و چی وچی ئەکەن وئەوە عەرز و ئەوە گەز. ئەوان هیچ وەڵامێکیان نەدامەوە و کشانەوە بۆ ناو ماڵەکە.
ئەم دیمەنەی لای ئێمە لە زۆربەی گەڕەکەکانی تری شاردا درێژەی هەبوو و لەهەموو لایەکەوە شەپۆلی خەڵکی ڕاپەڕیو بەرەو سەنتەری شار ئەهاتن، بەڵام هێشتا بەیەک نەگەیشتبووین.
گرتنی بارەگای شەهید عوسمان سەرکەوتنێکی گەورەی ئەو قۆڵەی لای ئێمەوە بوو. هێشتا ئێمە دەستمان بەسەر ئەو بارەگایەدا نەگرتبوو و تەقە مابوو کە هەزاران کەس لەبەری برایم پاشاوە هاتبوونە دەرەوە و وەکوو شانۆگەریەکی هاوینە و کراوەی زیندوو تەماشای شەڕەکەیان ئەکرد و دەستخۆشیان لە خەڵکی ڕاپەڕیو ئەکرد. لەگەڵ گرتنی ئەو بارەگایەدا بوو بەهەرا و چەپڵەڕێزانێکی زۆر گەورە، کە وەکوو ڕاگەیاندنی سەرکەوتن وابوو، ئێمە و خەڵکەکەی بەری برایم پاشا وەکوو لێشاوێکی گەورە تێکەڵ بووین. دیار بوو ئیتر تەرازووی شەڕ بەتەواوی لە قازانجی ڕاپەڕین شکاوەتەوە و گرتنی یەکجاریی شار و پاککردنەوەی لە دەیان ساڵ دەسەڵاتی نەگریسی دیکتاتۆریەتی بەعس تەنها مەسەلەی کاتە و هیچی تر. خەڵکێک کە تا ئەم بەیانیە هەستیان ئەکرد تا داهاتوویەکی نادیار لە زیندانێکی گەورەدان، ئێستا خۆری ئازادیان لێ هەڵات.

سـەرباری شـەکەتیی زۆر بەڵام ئاگـام لە هـیچ شـتێک نەمـابوو، جگە لەسـەرکەوتنی مێژوویـی ئەو ڕۆژەی بەرەی گەل بەسـەر یەکێـک لە زۆردارترین وستەمکارترین ڕژێمەکانی مێژوودا. مـن وا بـۆ نـۆ سـاڵ ئەڕوات ژیانی ئیختیفا بەسەر دەبەم و چەندین ئەمر قەبزم بەدواوەیە. چەندین کەس وهاوڕێم لەم ڕێیەدا گیانیان بەختکرد. خەیاڵ بردمیەوە بۆ یـادی ئەو هاوڕێیـانەم کە چۆن سـەریان نـایەوە و ڕۆژی ئـازادیی ئەمڕۆیان بەچاو نەبینی.
پاشـان لەفلکەی کـاوەوە بەرەوەخـوار بـووینەوە بەرەو فلکەی سـجنی سـەرەوە کە پۆلیسـەکان هێشـتا خۆیـان نە ئەدا بەدەسـتەوە. لەنـاو فلـکەکەی سـەرەوەی سـجندا پەیـکەری شـێرێک هەبـوو کە ئەوێـم بەنزیکتـرین و قـایمترین خـاڵ دانـا و لەوێـوە دامەزرام و سـەدان کەسیش بەدەوری بینایەی سجنەکەدا کەوتنە گولەبارانی پۆلیسخانەکە و ئەوەندەی نەبرد ئەوێش گیرا و بەگرتنی سجنی سەرەوە دوایین ئاسەواری چەکداریی ڕژێم لە بەشی ئەم لایەی شارەوە پاککرایەوە و ئیتـر لەگەڵ هەزاران کەسـدا بەهوتـاف و وتـنەوەی دروشـمی سەرکەوتنەوە بەشەقامی پیرەمێرددا ڕوومان کردە سەرا و دیار بوو ئەوێش پاککرابۆوە و جەماوەری ڕاپەڕیوی شـاری سلێمانی، هەموو لەوێدا بەیەک گەیشتن و ئاهەنگی سەرکەوتنیان ئەگێڕا.
مـن نزیکەی ١٠٠ مەترێک مـابوو بگەم بەسـەرا کە چاوم بەنەسرینی هاوسـەرم کەوت کە وتـی: دوای دەرچـوونی تـۆ بەمـاوەیەک منـیش خـۆم پـێ نەگیـرا و هـاتمە دەرەوە و تـا ئێسـتە لەم دەورە لە گەڵ خەڵکەکەدا بووم و لەسـەرا کلاشینکۆفێکی دەستکەوتبوو. مـن چونکە چەند ڕۆژی پێشتریش سەرقاڵی کۆبوونەوە و قسـەکردن بووم و ئەو ڕۆژی یەکەمەی ڕاپەڕینـیش زۆر هـاوارم کردبـوو دەنگـم بەتەواوی نووسـابوو و قسـەم بەزەحمەت بۆ ئەکرا. پـاش چـاوگێڕانێکی خێرا بەسەر دیمەنی سەرای ئازادکراودا گەڕاینەوە بۆ ماڵی باوکی نەسرین وکـات نزیکەی ١ی دوانیوەڕۆ بوو. لە شـەڕ و پەلامـاری لای شـەهید

عوسمانەوە هاوڕێکانم لێ بزربوو. ئەمزانی ئەبێ وچانێک بدەم تا هێزێکم بەبەردا دێتەوە بۆ دوای نیوەڕۆ و ئیشی زۆرمان هەیە کە لەمەودوا چاوەڕێمانە.

هەرکە گەیشتمە ماڵەوە تایەریش پەیدا بوو، پاش وچانێک ڕوومان کردە سەرشەقام بۆ بینینی هەواڵی هاوڕێکانی ئەوێمان.

سەربازگەکانی دەوری شار وەکوو معەسکەر سەلام و تانجەرۆش لەلایەن خەڵکەوە گیرابوون. خالیدی مەلا عەلی هاوڕێمان بە سەیارەیەکەوە لەگەڵ چەند هاوڕێی تردا چووبوون چەکێکی زۆریان لە سەربازگەکەی تانجەرۆوە هێنابوو و بە سەر خەڵکی گەڕەکەکەدا دابەشیکردبوون. بەبینینی خالید و هاوڕێکانی ئەوێ زۆر خۆشحاڵ بووم و هەندێ ووردە تەگبیرمان کرد و بڕیاری کۆبوونەوەیەکی تری کۆمیتەی باڵای ڕاپەڕینمان دا تا لەسەر چارەنووس و داهاتووی کۆمیتەکان و ئەرکەکانی داهاتوومان قسەبکەین. کۆبوونەوەکە خرایە ماڵی نەبەز لە چوارباغ بۆ ئێوارەی ٣/٨.

دوای نیوەڕۆ لەسەرشەقامەوە ڕۆیشتین بۆ ماڵی جەبار بۆ گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە. هەر ئەو ڕۆژە تا ئێوارەکەی بارەگای فیرقەی سەربازی سلێمانی کە ناسراوە بە حامیە، لە لایەن خەڵکەوە پاک کرایەوە. ئێمە لەبەر سەرقاڵی زۆر ئەو ڕۆژە ئاگامان لە دونیای دەرەوەی سلێمانی نەمابوو. جۆرێکیش لە فەوزا و بی بەرنامەیی بە کارەکانمانەوە دیار بوو.

بەوجۆرە ڕۆژی ٧/ ٣ جگە لە ئەمنە سوورەکە، هەموو شوێنەکانی شار گیران. هەرچی لەو دەیان بنکەی حیزبی و مۆڵگەی جەیشی شەعبی و حامیە و دائیرەی ئەمنەکان یا ئەو پیاوانەی ڕژێم کە لە ماڵەکانیان یا لە مۆڵگەکانیاندا دەستگیر نەکرابوون، هەڵاتبوون ولە بینای ئەمنە سوورەکەدا خۆیان کۆکردبۆوە. بەو مانایە ئەوەی خۆی گەیاندبووە ئەوێ تاوانباری لەوجۆرە بوون کە یا هێشتا ئامادەیی و ئومێدی بەرگری و سەرکوتی ڕاپەڕینیان لە مێشکدا مابوو یا زۆر

تاوانبار بوون و کەڵکی ئەوەیان نەبوو خۆیان رادەستی جەماوەری ڕاپەڕیو بکەن. هیچ نیشانەیەکیش لەئارادا نەبوو بۆ ئەوەی کە ڕژێم لە کەرکـووکەوە یـا لە ئاسـمانەوە هەوڵێـک بـدات بـۆ فریـاکەوتنی ئەو پیاوانەی خۆی کە ئێستا لە ئەمنەسوورەکەدا خۆیان حەشارداوە.

لەهەمـان کاتیشـدا ئەمـنە سـوورەکە پڕبـوو لە زینـدانیی سیاسـی لە هەمـوو لایەنەکـان کە بەشـی زۆریـان ئەو کەسـایەتیە کۆمۆنیسـتانە بـــوون کە لە هەڵمەتێکـــی ڕژێمـــدا دوای داگیرکردنـــی کوەیـــت دەستگیرکران و ژیانیان لەوپەڕی مەترسیدا بوو. بەشێکی زۆری ئەو زیندانیانە وەکوو "میقداد هادی" و "د. کامەران" و "نەریمان"ی برای و "جەمال چاوشین" هاوڕێی نزیکم بوون.

هەمـــوو ســـەرانی حیزبـــی و لێپرســـراوانی دەزگاکـــانی ئەمـــن و ئیسـتیخبارات و موخـابەرات و یەکە ئیـداریەکانی وەکـوو پارێزگـا و جێگـــرەکەی و قایمقـــامی قەزای ناوەنـــدی ســـلێمانی و ئەفســـەرانی پلەبەرزی حامیە و دەیان کەسی تری ئەڵقە لەگوێ ولێپرسراوی ڕژێم لەو شـوێنەدا، لە لایەن هەزاران کەس لە خەڵکـی چەکـداری راپەڕیـو، ئـــابڵووقەدرابوون.. دیـــار بـــوو ئەو پیـــاوانەی ڕژێـــم هیوایـــان بە ڕزگاربوون و فریاکەوتنیان هەبوو. بەتەواوی نەیان ئەزانی لەدەرەوە چی ئەگوزەرێت و چۆن لە ٦ سـەعاتدا دنیـا بەسـەریاندا ژێرەوژوور کـرا. جـگە لەوەش ئێسـتا کە هەمـوو لەوێ کۆبـوونەتەوە و لەژێـر فشـاری ڕێکخـراوی شـوعبەی سلێمانیدا کە سـەرکردەکانیان لەو ژێر زەمینەدان، ناچـارن تـا دوایین دڵۆپی خـوێن شـەڕ بکەن یـا ئومێدی ئەوەیان هەیە کە ئەمان شـەڕی بەرگری بکەن تـا ڕژێم لە کەرکووک وە یـا بەغداوە فریایـان ئەکەوێت. وێنەی دیمەنەکـان بۆ ئێمەش دیـار نەبـــوو، بەڵام بەوەدا کە ئەوان، تەنـــانەت پـــێش ئەوەی ڕاســـتەوخۆ دەوری بیناکە بگیرێت، کەوتنە هاویشتنی بۆمبی هاوەن بە کوێرانە بۆ ناو ماڵانی شارەکە، دەرکەوت کە ئومێدی دەربازبوونیـان هەیە ئەگینـا بـــۆ وا دەســـتی خۆیـــان پـــیس ئەکەن و هـــیچ بوارێـــک بـــۆ لـــێ

خۆشبوونیشیان ناهێڵنەوە. ئەگەرێکی تر ئەوەبوو کە لەبەر زۆریی تاوانەکانیان گەر بشیان زانیبایە تێکدەشکێن و هیچ ئومێدێکیشیان نەمابایە، تا دوایین دلۆپی خوێن دەستیان لەتاوان دەرهەق بە خەڵک بەرنەدەدا، چونکە جگە لە مەرگ هیچ ڕێگەیەکی تریان بۆ ڕزگاربوون بۆ نەمابۆوە.

هیچ دەنگێکی پێشمەرگە و حیزبە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانی نیە.

من ئەو ڕۆژە تا نزیکی شەشی ئێوارە و دەستبەسەراگرتنی تەواوی ئەم دوایین مۆڵگەیەی ڕژێم لەگەڵ خالید و هەندێ هاوڕێی ترماندا لەوێ بووین. گرتنی ئەم دوا قەڵایەی سیمبولی ستەم و ئیعدام و داپڵۆسین، گەرچی لەشارێکیشدا بێت، هێمای سەرکەوتنێکی گەورە و زەنگی هەڵهاتنی ڕۆژگارێکی نوێ و پڕ لە ئومێد و سەرفرازی بوو.

هەرچی هێز وتوانا بێت لە لەشمدا نەمابوو. سەرباری هەستێکی زۆر بەهێزی بەختەوەری بە هاتنەدیی ڕۆژی ئاوابوونی تەمەنی ڕژێمێک کە زیاتر لە بیست ساڵە تالاوی مەرگ و کوێلەیەتی ئەکات بە گەرووی خەڵکدا، بۆ منێکیش کە لە ساڵی ١٩٨٢ بەدواوە تا ئەم چرکەساتە سێبەری مەرگ بەدیارسەرمەوە بوو، ئەم ڕۆژە مانایەکی چەندان بەرابەر قووڵتری هەبوو، وهەر بۆیەش مێشکم و بیرم ئاگایان لە ماندووبوونی جەستەم نەمابوو.

ئەبوایە لێرەوە و بەو جەستە ماندوو و شەکەتەوە یەکسەر خۆم بگەیەنمە شوێنی کۆبوونەوەی ئەمشەو لە ماڵی نەبەز لە چوارباخ. لەسەر شەقامی گشتی سەهۆڵەکە دەستم لە سەیارەیەک ڕاگرت و لەبەردەم بیناکەی حەسیب ساڵح دابەزیم تا لەوێوە بەپێ بڕۆم بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە. هەموو گیانم دووکەڵ و ئارەق و تۆز و خۆڵ بوو. بیرم کەوتەوە کە ماڵی "سروەخانی" خزمم کە مامۆستای ئامادەیی بازرگانی سلێمانی بوو و کاک "ڕەشید عارفی" باوکیان کە سەرکردەیەکی شیوعی بوو و لە سەرەتای هەشتاکاندا لە سێدارە

درابوو، لەم دەوروبەرەن وباشترە بڕۆم هەم لەم هەلایەدا هەواڵێکیان بزانم و هەم پێش کۆبوونەوەکە وچانێک بدەم. ماڵی ئەوان لە بەغداوە دوای لە سێدارەدانی باوکیان هاتبوونەوە سلێمانی و ئەوانیش وەکوو خێزانێکی شیوعی لە ئاڵوگۆڕە سیاسیەکانەوە نزیک بوون. کە لە دەرگام دا و بەو وەزعە شێواوەوە منیان بینی سەریان سووڕما، بەڵام زۆر دڵیان کرایەوە بەو سەردانە ناوەختەم. دەنگم نووسابوو و بەدەم نانخواردنەوە لە گەڵ ئەواندا هەندێ لە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە مێژوویيەمان باسکرد و پاشان ڕوومکردە ماڵی نەبەزی هاوڕێم بۆ بەشداریی کۆبوونەوەکە و بڕیاردان سەبارەت بە کۆتایی قۆناغی کۆمیتەکانی راپەڕین و دانانی پلانی ئەڵقەی لەمەودوا.

لە کۆبوونەوەکەدا کە ژمارەیەکی زۆر بەشداربووبوون، من دەنگم نووسابوو وقسەم بۆ نەئەکرا. خالیدی مەلا عەلی لەتەنیشتمەوە بوو، ناچار شتێکی گرنگ لە گفتوگۆکاندا ببوایە بە کورتی ئەمنووسی و ئەو لە جیاتی من ئەیخوێندەوە.

دوای کۆبوونەوەکە خۆم گەیاندە ماڵی باوکی نەسرین لە برایم پاشا و لەوێوە گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان لە تووی مەلیک. لە ڕۆژی پێش ڕاپەڕینەوە ماڵی خۆمانم نەدیبوو.

ئەو شەوە بە جەستەی شەکەتمەوە و بەدەم گێڕانەوەی شریتی بیرکردنەوە لە دە ساڵی ڕابووردووی پڕ لە هەڵبەز و دابەز و ڕاکەڕاک، پر لە دڕک و داڵ و گیانبەختکردنی گەلێک هاوڕێ، و دوو برا، و مردنی دوای حەسرەتێکی زۆری دایکم، وئومێدی هاتنەدیی ڕۆژی ئازادی و یەکسانی و خۆشگوزەرانی و ڕەوینەوەی یەکجاریی تەمی چڵکنی دیکتاتۆریەت و ستەم و....... خەوێکی قووڵ بردمیەوە.

**سەرچاوەکان:**


١/ Abbas Alnasrawi, The Economy of Iraq. Oil, Wars, Destruction of Development and Prospects. 1950-2010.

٢/ Eric Davis, Memories of State: Politics History and Collective Identity of Modern Iraq.2005.

٣ / Ofra Bengio, The Kurds of Iraq. Building a State Within a State. 2012.

٤/ الثقافة الجديدة. العدد ٢٣٠. تشرين الثاني ١٩٩١.

٥/ حازم صاغية، بعث العراق. سلطة صدام قياما و حطاما. ٢٠٠٣.

٦/ فالح عبدالجبار، دولة الحزب الواحد.٢٠٠٨.

٧/ غسان شربل، العراق من حرب الى حرب. صدام مر من هنا. ٢٠١٠.

٨/ سالار ڕەشید، مێژویەک لە یادەوەریدا. دیدار سەبارەت بە مێژووی چەپ و کۆمۆنیزمی نوێ لە کوردستاندا. ٢٠١٥. ٩/ محەمەد شاکەلی، لە بزووتنەوەوە بۆ حیزبی سۆسیالیستی کوردستان. ١٩٧٦-١٩٩٣.



شەهید عادل کەریم (١٩٥١-١٩٨٥).



گریانی پێشمەرگەیەک لە ئاشبەتاڵی بزوتنەوەی چەکداریی کوردستانی عێراق ساڵی ١٩٧٥.



وێنەی ئەو خانوەی تێیدا دەژیایین لە کەرکوک پێش ئەوەی هەڵبێیین، لە سەرەتایی ساڵانی هەشتاکاندا.




زیندانی ئەبوغرێب.




کتێبخانەی تەحریر لە بەغدا، یەکێک لەو کتێبخانانەی کە بەشی زۆری سەرچاوەکانی خوێندنەوەمان لێ پەیدا دەکرد لە سەرەتایی ساڵانی هەشتاو سەردەمی خوێندی زانکۆدا.



شەهید ئیحسان کەریم لە نێو کۆمەڵێک پێشمەرگەی یەکێتی، بە پێوە دەستی چەپ، یەکەم کەس.



شەهید ئیحسان لە نێو کۆمەڵێک لە پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتیمانی، شەهید ئیحسان شۆفێرەکەیە.



شەهید عادل کەریم یەکەم کەس دەستی ڕاست، و شەهید ئیحسان کەریم یەکەم کەسی دەستی چەپ، لە نێو کۆمەڵێک پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی.



باوکم و ژوانی کچی شەهید عادل، سەرەتای ساڵانی هەشتاکان، قەمچوغە.



شەهید ئیحسان و کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی، ناوەڕاستی هەشتاکان.




وێنەی گۆڕی هەردوو شەهید، لە گوندی دێلێژە.



یەکێک لە وێنەکانی سەدام حسێن و جەلال تاڵەبانی.




لە ڕاستەوە، من و هەردوو هاوڕێ: (جەبار مستەفا)، (لەتیف شێخ عومەر).



نەجات و چنور سەرەتایی ساڵی ١٩٨٧




لە گەڵ ( جەبار مستەفا) ساڵی ١٩٩٦ لە سیدنی.




نەجات.



خالیدی مەلا عەلی ئەندامی کۆمیتەی باڵایی ڕاپەڕین و ڕۆڵی باڵایی گێڕا لە یەکەمین ڕۆژی ڕاپەڕیندا لە شاری سلێمانی، دواتر لە تەموزی ١٩٩١ لە پەلاماری سەر سەرادا شەهید بوو.



بەردەرکی سەرا، ڕاپەڕینی ئاداری ١٩٩١





شوێنی ئیختیفاکەم لە هەولێر لە گەڕەکی (بەلاشاوا)، لە ساڵی ٢٠١٩ گەڕامەوە و سەردانێکی ئەو ماڵەم کرد، لە گەڵ کاک (عەبدوڵا حاجی سمایل).



لە گەڵ هەر دوو هاوڕێ: ( عوسمان محەمەد) و (فوئاد سادق).



سالآنی دواتر لە گەڵ د. کامەران قەرەداخی



نەبەز خالید ئەندامی ناوەندیی یەکێتی خەباتی کۆمەنیزمی کرێکاری، یەکێک لە ڕابەرانی کۆمیتەی باڵای ڕاپەڕینی ناو شاری سلێمانی و ڕۆڵی باڵایی هەبوو لە هەڵگیرسانی ڕاپەڕیندا.



باوکم لە گەڵ چوار لە کچەکانی شەهید عادل، کۆتایی نەوەدەکان.



پۆلا (سەلمان)، لە گەڵ چوار لە کچەکانی شەهید عادل.




لە گەڵ نینا و وارتاندا، زانکۆی سیدنی ساڵی ٢٠١٩.




ساڵی ٢٠١٢ و دوای پێنج ساڵ لە ژیان ئاوایی نەسرین، لە گەڵ جێنی
هاوسەرگیریم کرد.

له ساڵانی ڕابووردوودا زۆر وتراوه و نووسراوه لەسەر تاوانەکانی ڕژیمی پێشووی عێراق و سەدام حسێن. من نیازم نیه شتێکی ئەوتۆ بڵێم لەو بارەوە، چونکە هەرچی بڵێم ڕەنگبێ دووبارەکردنەوەی زانیاری و گێرانەوەی ڕووداوگەلێک بن کە زۆر وتراونەتەوە. ئەوەی من تیشکی دەخەمە سەر یادەوەریەکانی خۆمە وەکوو کەسێکی چەپی چالاک لە بزووتنەوە و خەباتی ئەو قۆناغە و ڕاکردوو لە دەستی دەزگا داپلۆسێنەرەکانی ڕژێمی عێراق و داواکراو لە لایەن دەزگای مرۆڤکوژی ئەمنەوە. لەلایەکی تریشەوە بەهۆی بیروڕای جیاواز وچالاکی سیاسیمەوە وەکوو هەڵسووڕاوێکی سیاسی چەپی ڕەخنەگر لە ڕێباز و کردەوە سیاسیەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان زوو کەوتمە بەر پەلاماری ئەوانیش کە لەژێر ناوی شۆڕش و پێشمەرگایەتیدا لە ساڵانی هەشتاکاندا، دەیانی وەکوو من بوون بە ئامانجی ڕاونانیان.

لەپاڵ ئەوەشدا هەوڵ ئەدەم لە پەنای گێڕانەوەی وێستگە و قۆناغەکان و سەرگوزەشتەی چالاکی خۆمدا، بەدیدگایەکی ڕەخنەگرانەی تەواوەوە، کە ڕەنگدانەوەی ئاڵوگۆڕە فکری و سیاسیەکانی دواتری ژیانی منە، ئەو قۆناغەی بارودۆخی سیاسیی عێراق و کوردستان و بزووتنەوەی چەپی مارکسیی کوردستان، بخەمە ژێر نەشتەری شیکردنەوەوە.

